



# زانستی سیاسی

د. حسین بشیریه

و: باباعەلی مێهرپەروەر



دەزگای وەرگێڕان
خاوەنی ئیمتیاز: حەسەن ئەحمەد مستەفا
سەرنووسەر: مقداد شاسواری

ناوی کتێب: زانستی سیاسی
نووسینی: د. حسین بشیریە
وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە: بابا عەلی مێهرپەروەر
بەرگ و دیزاینی ناوەوە: ئاگری باڵەکی
تایپ: شەفیع رەوشەنی
تیراژ: ١٠٠٠
نرخ: ٥٠٠٠ دینار
چاپ: یەکەم - هەولێر ٢٠٠٩
چاپخانە: رۆژهەڵات ـ هەولێر
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە (٢٥٥٩) ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ

ناونیشان:
هەولێر/ راپەرین

## سەرەتا

لەو کومەڵگایەدا کە هاوبەشیی و کێبەرکیی سیاسی لە پەرەسەندن دایە و کومەڵانی خەڵك بەگەرم و گوڕی لە مەیدانی تێکوشانی سیاسی دا بەشداری دەکەن، پێویستی بە فێر کردنی مەدەنی بە شیوەیەکی روو لە گەشە دەردەکەوێ.

مەبەست لە فێرکردنی مەدەنی، گواستنەوەی ئەو زانیاری و روانگەیانەیە بە کومەڵانی خەڵك کە ئەوان هەرچی زیاتر بۆ بەدەستهێنانی پلە و پیگەی شارومەندی کومەڵگاکانی خەڵك سالاردا ساز و ئامادە بکا، بابەتی سەرەکی فێرکردنی مەدەنی لەو زانیاری و ئاکایی یانە پێك دێ کە لە زانستی سیاسەتدا لە دەوری یەك خڕ دەبنەوە. ئەگەر بکرێ بڵێین کە سروشتی سیستمی سیاسی لە هەر وڵاتیك دا بەستراوەتەوە بە تێروانینی زۆرینەی خەڵکەکەیەوە، لەوەها حالەتیکدا فیرکردنی زانستی سیاسی لە پانتایی یەکی بەرینتر لە ناوەندە زانستی و زانکویەکان، دەتوانی بەسەر سروشتی سیستمە سیاسیەکاندا کاریگەری دابنی. سیستمە سیاسیە مودیرنەکان لەهەر چەشنیك بن پێویستی یان بە پشتگیری و دەنگی ئەرینی زۆرینەی خەڵکەکە هەیە کە وابووپاسینیزمی سیاسی و خەریك بوونی بیری کومەڵانی خەڵك بە کاروباری پێوەندیدار بە ژیانی تایبەتی یەوە، هەم پلەی شارومەندی وەك بەهرەیەکی مەدەنی سیاسی دادەبەزینی، هەم لە پەرەگرتنی باری گشتی ژیان پێشگیری دەکا. فێرکردنی مەدەنیو سیاسی و دانی زانیاری پیویست لەوانەیە بتوانی پێش لە پەرەگرتنی بارودوخیکی وەها بکا. تەنانەت ئەو کاتەش کە زۆرینەی خەڵك لە مەیدانی سیاسی دا ئامادەن و چالاکی دەنوینن، پیویستی بە فیرکردنی مەدەنی و سیاسی هەر درێژە دەکێشی و لەوانەشە توندتریش بێ، لەبەر ئەوەی کە زۆرینەی سیاسی و فیکری،کاتی وا هەیە مەیل بۆ لەبەرچاو نەگرتنی مافی کەمینەکان و بە وتەی هیندیك لە رەخنەگران، دیکتاتوری زۆرینە دەست کەمیکی لە دیکتاتوری کەمینە نیە. کەوابوو مەبەست لە فیرکردنی مەدەنی ئەوەیە کە خەڵك بۆ بەشداری لە ژیانی سیاسی دا بە شیوەیەکی دیموکراتیك بار بێنی.

لە لایەکی دیکەوە لە دەوڵەتە مودیرنەکاندا، سیاسەت وانەکانیش پیویستیان بە فیرکردنی سیاسی هەیە.

لەو سەردەمەدا سیاسەتوانی وەك پیشەیەکی تایبەتی سەیر ناکرێ، زانیاری بە شارەزایی و پسپوری نیە، بەڵکوو لە دیموکراسیەکانی ئیمرۆژەدا، کومەڵانی خەڵك لانی کەمی مەرجەکانیان ببێ دەتوانن بنچینە پارلمانەکان و لەویشەوە بنچینە نێو دەوڵەتەکان. لەگەڵ ئەوشدا یاسادانان، هەڵوێستی سیاسیو بریار وەرگرتن لە مەیدانی سیاسەت دا پێویستی بە هیندێك زانیاری کارناسانە هەیە. کەوابوو سەرکەوتن لە پوستە سیاسی یەکاندا بە مانای بێ نیازی لە فێربوونی زانستی سیاسی دا نیە، بەتایبەت لەبەر ئەوەی دەوڵەتە مودیرنەکان دامەزراو و پێکهاتە گەلێکی ئالۆزیان هەیە و بەرێوەبردنیان سانا نیە، هەروەها فێربوونی مەدەنی بۆ سیاسەتوانان پێویستە، تا بویان دەردەکەوێ کە سیاسەت و حکومەت پێشیەکی تایبەتی نیە کە تەنیا قازانج و بەرژەوەندی دەسەڵاتدارانی لەبەرچاو بێ، بەڵکوو سیاسەتوانانی راستەقینە دەبێ بتوانن بەرژەوەندی گشتیش لەبەرچاو بگرن و ئیرادەی گشتیان لە پشت بێ.

بە لەبەرچاو گرتنی ئەوانەی کە باسمان کرد، مەبەستی فێرکردنی زانستی مەدەنی، هەم تیوری و زانستی و هەم ئەخلاقیە و لەودا هەم هاوڵاتیان و هەم سیاسەتوانان جیی سەرنجن. ئێستا مەبەستی سەرەکی لە فێرکردنی زانستی سیاسی لە بواری گشتی دا، هەم پەروەردەکردنی هاوڵاتیان بۆ ژیانی مەدەنی و سیاسیو هەم فێرکردنی سیاسەتوانان بۆ بەرێوەبردنی ئەرکە تایبەتیەکانیان بە باشترین شێوەی گونجاو دەبێ ببێ. لە چەرچی نویدا چی دی سیاسەت لەنێو کوشكو قەڵاکانی حکومەتی دا بەرتەسك ناکرێتەوە، بەڵکوو بەشێك لە ژیانی گشتی یە، هەربۆیە فێرکردنی مەدەنی و سیاسی هاوڵاتیان بە تایبەت لاوەکان ئەو دەرەتانەیان بۆ پێك دێنی کە خۆیان بۆ تێ رامان و بیرکردنەوە لە کاروبارەکان و سیاسەتە گشتی یەکان و بەشداری لەچارەسەرکردنیان دا، ئامادە بکەن.

لە نووسینی ئەم کتێبەی بەردەستان ئەم مەبەستانە لەبەرچاو بوون، وەها مەزندە دەکرێ کە لەگەڵ پەرەگرتنی بەشداری و کێبەرکێی سیاسی لە ئێران دا، فێرکردنی زانستی سیاسی لانیکەم وەك یەکێك لە پێویستیە گشتی یەکانی خوێندکاران و تەنانەت قوتابیانی لێ دێ.

* * *

لە دوورە دیمەنێکی گشتی دا دەکرێ زانستی سیاسەت بەسەر دوو بواری سەرەکی دابەش بکرێ: یەکێك زانستی سیاسی تیوری یان ((سرۆشتی)) و دووهەم زانستی سیاسی [بەکردەوە] یان بنیات نراوی [تأسیسی]. زانستی سیاسی یان سرۆشتی کومەڵێك داواکاری مێژووی،

کومەڵناسانە و سایکۆلوژیانە و مرۆڤ ناسانەیە سەبارەت بە هەڵس‌وکەوتی سرۆشتی مرۆڤ لە بواری سیاسەت دا. ئەنگیزەی کرداری سیاسی، شێوەی پێکهاتنی جورەها دەسەڵاتداریەتی سروشتی وەك زاڵ بوونی گەلان بەسەر یەکترا، دەسەڵاتی دیکتاتوران و زاڵمان بەسەر هاولاتیانی مل کەچ، زاڵ بوونی گرووپە بە دەسەڵاتەکانی ئابووری، قەومی، رەگەزی و هتد... بەسەر گرووپەکانی دیکەدا. دەسەڵاتی دەوڵەتەکانی بەهێزتر بەسەر دەوڵەتەکانی لاوازدا و هەر روالەتێکی دیکە لە دەسەلات و زاڵ بوون کە لە [سروشت] ی کۆمەڵگا و سیاسەت دا بگونجێ.

بەڵام زانستی سیاسەتی بە کردەوەیان بنیات نراو هەمان لێکۆڵینەوە و دیراسەکردنی گشتی و مێژووی سەبارەت بەهەر چەشنە سیستمی سیاسی سروشتی و هەڵس‌وکەوتی دەسەڵاتخوازانە نیە، بەڵکوو زانستێکی وردتری دەربارەی چونیەتی پێکهێنانی سەقامگیری سیاسی، رێکخستنی پێوەندی نێوان دەوڵەت و هاولاتیان، سنووری دەسەڵاتەکان و ماف و ئەرکەکانیان، چونیەتی گۆڕینی داخوازەی گشتییەکان، بە سیاسەتە گشتیەکان، چونیەتی دەستەبەرکردنی رەوایی و سیستمە سیاسیەکان، رێکخستنی پێوەندیەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت، پێوەندییەکانی دەسەڵاتەکانی حکومەتی، پێش گرتن لە کۆبوونەوەی دەسەڵات و گەندەڵی‌و دارمانی سیاسی، چونیەتی گۆڕینی کۆمەڵە بەرینەکانی وەك پارلمانەکان بە دامەزراوەی بریادەر، چۆنیەتی پێکهێنانی ئیئتیلافە سیاسیە سەقامگرتووەکان، شێوەی کەم کردنەوەی کەلینە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان‌و پێکهێنانی دوستایەتی و هاوپەیوەندی لە بواری یەکەی سیاسی، شێوەی بەرێوەبردنی گرینگترین ئەرکە تایبەتیەکانی حکومەتی، باشترین شێوەی بەرێوەبردنی کارباری گشتی‌و شتی لەو بابەتانەیە.

ئەوەی کە لەوانەیە لە ژێر ناوی زانستی سیاسەتی بە کردەوەو بونیاتنراودا بیهێنین ، هەر ئەو بابەتانەیە کە زۆرجار لەژێر باسی سیستمی دیموکراسی لێك دەدرێتەوە. [زانستی پەتی "دەقیق"]ی سیاسەت بەم واتا لەبەرامبەر زانستی گشتی تری سیاسەت بە واتای سروشتی تیورەکەی رادەوەستێ. وا دێتە بەرچاو کە بۆ سوودبەخش کردنی زیاتری لێکۆڵینەوە سیاسیەکان لە ئێران دا دەبێ لە کاتی وتنەوەی ئەم بەشە، ئەم جیا کردنەوە لەبەرچاو بگیردرێ. دەبێ جگە لەسەرەتا پێویستیەکان، بەشی زۆری ئەوی کە زانستی سیاسەت وەك وەك زانستی سروشتی باس دەکرێ، لەگەڵ لایەنی فەلسەفی، مێژوویی و کۆمەڵناسانەکەی، لە قۆناخی

کارناسی دا لابرێ و بۆ دیراسە و لێکۆڵینەوەی پسپۆرانەتر تەرخان بکرێ. لەبەرانبەردا زانستی بەکردەوە بنیاتنراو کە لە هەمان بواری لێکۆڵینەوەی سیستمی دیمۆکراسی دا جێی دەبێتەوە و هەمان زانستی سیستمی دیموکراسی یە، وەك چوارچێوەی سەرەکی دیراسەی کارناسی قەبوول بکرێ.

هەر بەو جورە کە شارەزایی تەواو لە فەلسەفەی یاسا، کۆمەڵناسی، یاسا و مێژووی یاسادا پێویستیەکەی بێ ئەم لاوئەولا بۆ دیراسەی کارناسە لەو بەشەدا نیە، زانستی سیاسەتیش دەبێ بیاڤی سەرەکی دراساتی خۆی لەدەست، دەست تێوەردانی لێکۆڵینەوەی فەلسەفی، کۆمەڵناسانە و مێژوویی رزگار بکا. هەروەك وتمان ئەم بیاڤە لەگەڵ بیاڤی دیراسەی دیمۆکراسی، کەمو زۆر وەك یەکی لێهاتووە، چوونکە نەتەنیا و بنەما و یاساو ریساکانی دیمۆکراسی لە هەموو شوێنیك بنەما و یاساو ریسای سیاسەت دانی پێدانراوە، بەڵکوو دێموکراسی وەك سیستم یان چارچێوەی دەسەڵات، پێوەندیەکانی لە خۆیدا پرش وبڵاوو نارێكوپێك وبێ قەوارەی بواری ژیانی سیاسی لە شۆناسێکی تایبەتی دا دیاری دەکا و دەیاخاتە بەرچاووبە ناوی بابەتی شۆناس دەیاخاتە مەیدان. جیاوازی نێوان ئەم دوو جورە زانستە، سیاسەتی تیوری یان سروشتی (هەروەك زانستی کیمیا) لەگەڵ تەواوەتی جیهانی سروشتی سیاسەت رووبەروویە، لەبەرانبەردا زانستی سیاسەتی بۆنیات نراو (هەروەك دەرمان سازکردن) بەکەڵك وەرگرتن لە زانستی گشتی سەبارەت بە جیهانی سروشتی سیاسەت، بۆ پاراستنی سەقامگیری و سلامەتیی قەوارەی سیاسی و رێکخستنی پێوەندی دەوڵەت لەگەڵ هاوڵاتیان، هەوڵ دەدا. لەسەر ئەم بنەما ئەم کتێبە لە دوو بەش پێك هاتووە. لە بەشی یەکەم دا بابەتە سەرەکییەکانی زانستی سیاسەتی تیوری هێناوەتەوە بەرباس و لە بەشی دووهەم دا بنەماکانی زانستی سیاسەتی بۆنیات نراو وەك زانستی سیستمی دێموکراسی شی دەکرێتەوە.

زانستی سیاسەت بە دوو مانای ورد و قەبە دەبێ کاری پێ بکرێ. زانستی سیاسەت بەمانا وردەکەی لەگەڵ سیستمی سیاسی یان حکومەت و دامەزراوەکانی حکومەتی و سیاسەت و کردەوەکانیان و شێوەی بەکارهێنانی دەسەڵات و بەڕێوەبەری کاروبارەکانی کۆمەڵگا پێوەندی هەیە، لە کاتێکدا زانستی سیاسەت بە مانا قەبەکەی لەگەڵ زەمینەی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتی سیاسی، دەسەڵات بە واتای گشتی و کۆمەڵایەتیەکەی، دامەزران، ئیدامەکاریی، و لەنێو چوونی حکومەتەکان، هەڵسوکەوتی سیاسی بەتاك و کۆمەڵ، دامەزراوە سیاسیەکانی نادەوڵەتی (NGO) وەك رێکخراو و گرووپە دەست رویشتووەکان، پێوەندی نێوان دەسەڵاتەکان، هزرو فەلسەفەکانی سیاسی (لەگەڵ تەئکید لەسەر بیری ئازادی، عەدالەت و یەکسانی) پێوەندی هێزە کۆمەڵایەتیەکان یان کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ ژیانی، سیاسی، فەرهەنگی سیاسی، هەڵسوکەوتی جەماوەری، مێژووی سیاسی یان دیپلوماسی و ئابووری سیاسی نەتەوەیی و نێودەوڵەتی پێوەندی هەیە.

هیندێك لە نووسەران هەوڵیان داوە بە لەبەرچاو گرتنی مەیدانی بەربلاو و لقە جوراوجورەکانی زانستی سیاسی، سیستمی سیاسی وەك بابەتێکی دەست نیشان کراو و قایم وپتە و ناوەندی ئەو زانستە بسەلمینین. لەگەڵ ئەوەش دا وا دێتە بەرچاو کە زانستی سیاسەت ناوەند و بناخەیەکی هەتا هەتایی نەبێ و هەروەکوو زۆر لە زانستەکانی دیکە زانستێکی چەند ناوەندی بێ، ئەوەی کە کام لەم بابەتە ناوەندیانە، وەك بابەتی سەرەکی زانستی سیاسەت بناسرێ، بەستراوەتەوە بە مەیل و بۆچوونی بیرمەندانی سیاسی، کێشەی گرینگ لەهەر سەردەمێك دا، کاریگەریی زانستەکانی دەوروبەر و پشتیوان و زۆر هۆکاری دیکەی هەیە. هەر بۆیە لە لێکدانەوەی جوراوجوردا، زانستی سیاسی وەك زانستی تایبەت بە دەسەڵات، دەوڵەت، هەڵسوکەوتی سیاسی، بڕیاردانی سیاسی، بەڕێوەبەریی کاروباری گشتیو...هتد. ناسراوە.

## پلە و پێگەی زانستی، سیاسەت

سەبارەت بە پلە و پێگەی زانستیی زانستی سیاسی چەند خاڵ جێی سەرنجە: لەو سەردەمەدا مەبەست لە زانست، ئەو زانستەیە کە بتوانێ ئەو پێوەندیە سەقامگرتوانە لە نێوان دیاردەکانی جیی باسی خۆیدا، بدۆزیتەوە و بگا بە یاساگەلێکی گشتی، بەواتایەکی دیکە زانست لە

پێوەندی (علت و معلول)ی نێوان دیاردەکان قسە دەکا. شیکردنەوەی زانستی بە شێوەی سەرەکی شیکردنەوەیەکی هۆکاری یە، تەنیا ئەو کاتە زانستێك دەگاتە قۆناخی تیوری کە پشتی بە شیکردنەوەیەکی هۆکاریانە و زانستی بەستبێ و دەتوانێ بە پێی یاسا دوزراوەکان داهاتووش لێك بداتەوە. بەو حاڵەش لەوانەیە نەکرێ بوترێ کە هیچ زانستێك بەو قۆناخە لە سەلمێندراوی تەواو گەیشتبێ. هەرچەند دەتوانێ بوترێ کە هیندێك لە زانستەکان بۆ نموونە زانستە سروشتیەکان، بە هۆی ناوەرۆکی بابەتەکە و جۆرو شێوەی خۆی، زیاتر لە زانستەکانی دیکە وەك کۆمەڵناسی و زانستی کۆمەڵایەتی بە سەلمێندراوی رێژەی دەگەن. هەوڵدان بۆ بە زانستی کردنی سیاسەت لە بەرهەمی نووسەرە کۆنەکان لە ئەرەستوە بگرە تا ماکیاولی و هابز بەرچاو دەکەوێ، بەڵام بە زانستی کردنی سیاسەت بە شێوەی زانستە سروشتیەکان هەر لە سەدەی نوزردە و بیستەم دا گەیشتوەتە لووتکەی خۆی.

ئیگوست کونت، دامەزرێنەری زانستەکانی کۆمەڵایەتی نۆی، زانستەکانی لە دوو تەوەرەوە را پلەمەندی دەکرد. یەکەمیان تەواوەتی [کلیت] و ئەوەی دیکە پێکهاتە. بۆ نموونە ماتیماتیك تەواوەتێکی کامیلی هەیە، لە کاتێك دا کە کۆمەڵناسی، زانستێکی تێکەڵاو و پشتی بە شۆناسی هۆکارە جوراوجورەکان بەستووە. یاسا و بریارەکانی زانستە ماتیماتیکان گشتین. بەڵام یاسا و بریارەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان گشتی نین. بە واتایەکی دیکە، ماتیماتیك، زانستی ئینتزاعی یە بەو مانا کە بابەتەکانی دەقاودەق کاری زەینی مرۆڤە، لە کاتێکدا کە زانستی سروشت یان زانستی کۆمەڵ لەگەڵ چەندین بابەتی دیکەی ئاڵۆز و چەند لایە و راستەقینە رووبەروویە. هەروەها لە زانستە کۆمەڵایەتیەکان و سیاسی دا، بەپێچەوانەی زانستی سروشتی جیاوازیەکی بە تەواوی نێوان زەینی و چاودا مومکین نیە و لە نێوان ئەو دووانەدا تێکەڵ بوون هەیە. بابەتە زانستیەکان زۆرجار لە ژێر تیشکی چوارچێوە تیوریەکاندا دیاری دەکرێن و دەناسرێن.

## بە کەڵکی و گرینگیی زانستی سیاسی

زانستی سیاسەت هەرچەند لە نیهایەتدا سەبارەت بە کردەی سیاسییە و هەڵسوکەوتی تاکەکان، کۆمەڵگاکان و دەوڵەتەکان لێك دەداتەوە، بەڵام وەك لقیك لە زانست لە بواری کردەی سیاسی دا سەربەخۆیە و لەوبارەوە ئەوانەی زانستی سیاسەتیان خوێندوە، بۆ نموونە بە

پێچەوانەی زانستەکانی هیندسە، مەرج نیە رو بکەنە پیشەی سیاسی. زانایانی سیاسی ناچار نین ببنە سیاسەتوان و سیاسەتوانانیش مەرج نیە بە شێوەی فەرمی زانستی سیاسەت بخوێنن. بەگشتی زانست یەکێك لە سەرچاوە لاوەکیەکانی بەدەست هێنانی دەسەڵاتی سیاسی لە هەموو کۆمەڵگاکاندایە، لەبەرانبەردا خاوەنداریەتی زەوی و خانووبەرە، بازەرگانی و پیشەسازی، هی ئەوانەن کە پێگەیەکی بەهێزی کۆمەڵایەتیان هەیە وەك مەلاکان، نەجیب زادەکان، جەیش یان ئەوانەی رێکخراوەگەلێکیان لە پشتە بۆ نمونە تاقمە بەدەسەڵات و قسە رۆیشتوەکانو حیزبە سیاسیەکان، وەك بنەما سەرەکیەکانی بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی حیسابیان بۆ دەکرێ.

ئێستا کە زانایانی سیاسی هەرچەند لەوانەیە لە رووی سیاسی و بە کردەوە کاریگەریەکی زۆریان نەبێ، بەڵام بیاڤێك لە تێکۆشانی مرۆڤایتی دەکەنە بابەتی لێکۆلینەوە و دیراسە کردنی خۆیان کە دیاری کەری زۆر بواری دیکەی ژیانی مرۆڤایەتی یە، سیاسەت و گۆرانکاریەکانی سیاسی لەسەر هەموو ژیانی کۆمەڵایەتی کاریگەری هەیە. بە بریارێکی نادروست و هەڵە لەوانەیە شەر، شۆرش، کودیتا یان ریفۆرم بێتە کایەوە، کە هەموو بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، دینی، فیکری تاکیی تاکەکان گۆرانی بەسەردا بێ.

گەشە و پەرەگرتنی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بە هۆی چاکسازی سیاسەتوانە گەورەو مەزنەکان مومکین دەبێ، هەروەك شەر و گەندەڵی و فەسادی کۆمەڵایەتی لە بێ کیفایەتی، دەروون پیسی دەسەڵاتداران سەرچاوە دەگرێ، هەروەها هاولاتیان بە زۆرە ملی ئەندامی رێکخراویکن کە ناوی حکومەتە و هەموو هەڵسوکەوت و قۆناخی ژیانیان لە نێو وەها رێکخراوێکدا دادەرێژرێت و دیاری دەکرێ و یاساکانی حکومەتی چوارچێوەی تێکۆشان و ژیانی هەمووان دەست نیشان دەکا و تاك هەر کە لەدایك بوو دکەوێتە بەر دوورە دیمەنی دەسەڵاتی حکومەتی: سەرژمێری دەکرێ، پێناسەی پێ دەدرێ، دەبێ پێرەوی لە یاسا جوراوجورەکانی حکومەتی بکا، دبێ لە قوناخە جوراوجورەکانی ژیانی خۆیدا مل کەچی دەسەڵاتە جیاوازەکان بێ. حکومەتەکان لە هەموو شوێنیك لە سیاسەت دانانی ئابووری، و پلان و بەرنامە دارشتنی فێرکردن، پەرەپێدانی شارنشینی، دابین کردنی پێوەندی دا... هتد نەخشی بەرچاویان هەیە. کەوابوو سیاسەت لەگەڵ تەواوەتی ژیانی مرۆڤەکان لە کۆمەڵگادا تێکەڵە و سەرەکیترین هۆکاری ژیانی مرۆڤە.

## پێشینەی زانستی سیاسەت بە واتای نۆی

پێشینەی تێکۆشان بۆ بنیات نانی زانستی سیاسەت دەگەرێتەوە بۆ قۆتابخانەی سەلّماندن خوازیی [اثبات گرایی] ئیگۆست کونت EGOST CONT لەسەدەی نوزدەهەم. سەلّماندن خوازی [اثبات گرایی] شۆرشێك بوو بە دژی تێروانینی متافیزیکی، ئاینی و ئەخلاقی لە زانستدا و بریارە فەلەسەفی و ئەخلاقیەکانی بە بیّ کەلّك و بیّ مانا دەزانی و هەر ئەو بریارانەی کە چاو بیسەلّماندایە بە زانستی دەژمارد. سەلّمێنەران گەشەی زانستە سروشتیەکانی بە ئاکامی رزگاری لە چەنگ یاسا و ریسا دەست و پیّ گرەکانی تیروانینی متافیزکی دەزانی و بە شوێن کەلّك وەرگرتن لەو شێوازیی زانستە سروشتیەکان لەبواری دیراسەی کۆمەلاّیەتی و سیاسی یەکاندا بوون. لایەنگرانی سەلّماندن لەم روانگەوە بەیەك بوونی هەموو زانستەکان و یەك بوونی شێوازە زانستیەکان بروایان هێنابوو. ئیگوست کۆنت لە کتێبی زانستی سیاسەتی سەلّمێندراوی خۆیدا، بەلّگەی هێناوەتەوە کە زانستی سیاسی لە هەلّسەنگاندن لەگەلّ زانستی فیزیا، فیزیای کۆمەلاّیەتی یە و هەموو بەو پیی یە وەك زانستی فیزیا لەگەلّ دیاردە پر جوولّەکان [Dynamic] بیّ جوولّەکان [Static]

لە کۆمەلّگادا رووبەروویە. کۆنت پێی وابوو کە توانیەتی یەکێك لە یاسا بنەرەتیەکانی گوورانی [تکامل] مێژوو بخاتە دەستی خۆی و ئەویش یاسای گوورانی [تکامل] مێژوو و زیهن و زانست لە سیّ قوناخی ئایینی، فەلسەفی و زانستیدا بوو.

بە شێوەی گشتی لە قۆتابخانەی سەلّماندن خوازی، بایەخی بریاراتی زانستی لەسەر بنەمای نیشانە بەچاوبینراوەکان دەکریّ بسەلّمێندریّ میراتی سەلّماندن خوازی لە زانستی سیاسی لە سەدەی بیستەم دا، گەیشتە قۆناخی مەیل بۆ کردار. لەم رانگەشەوە خۆلادان لە تێروانینی بەها و بەرەوا زانین و رووکردنە لای پێداهەلّگوتن، پلەبەندی و دۆزینەوەی یاسا گشتیەکانی زالّ بەسەر هەلّسوکەوتی سیاسی، کوکردنەوەی ئاکامەکان، چاولێکردن و ئەزموون و پێوانەکردن بە شێوەی سەرەکی زانستی سیاسی نویّ دانراون. لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دا قۆتابخانەی شیکاگۆ لە ئەمریکا زانستی سیاسی بۆ ولاّتانی نویّ پەرەپیّ دا و باسی ئەزموونی لە دەسەلاّت و شێوەی بەکارهێنانی، هەلّسوکەوتی بەکۆمەلّ، میکانیزمەکانی دەست نیشان کەری هەلّسوکەوتی سیاسیو... وەك باسی سەرەکی لەو زانستەدا لێك درایەوە. پاش شەری

دووهەمی جیهانی گەلێك مەیلی زانستی و ئەزموونیی جوراوجور لە زانستی سیاسیدا وەدەرکەوتن کە لە هەموان گرینگتر روانینی سیستمەکان، روانینی کرداری و روانینی کردەوەی ئاوەزمەند بوون.[١]

## بابەت و مانا سەرەکیەکان لە زانستی سیاسیدا

بە بۆچوونی ئێمە گرینگترین بابەتی زانستی سیاسەت، دامەزراوەی دەوڵەتە. باس لە سەرچاوەی دەوڵەت، جۆرەکانی دەوڵەت لە مێژوودا، رێکخراوی نێوخۆیی دەوڵەتەکان، بنچینەکانی دەسەلاتی دەوڵەت و درێژەکێشانی، هۆکانی لەنێوچوون و رووخانی دەوڵەتەکان دا تا شێوە و هۆی شۆرشەکان و ململانی بۆ تاپوکردنی دەسەلاتی دەوڵەت، شێوەی دامەزراندنی دەوڵەتە کۆنەکان و مانای دەوڵەتی ئیدئال، بابەتی سەرەکی زانستی سیاسی بەمانا گشتیەکەیتی.هەموو لقەکانی زانستی سیاسی لە روانگەی تایبەت بە خۆیانەوە، لەگەڵ دیاردەی دەوڵەت رووبەروون. فەلسەفەی سیاسی باس لە دەوڵەتی ئایدئال دەکا و باس لە عەدالەت، چاکی، ئەخلاق، یەکسانی و ئازادی وەك بابەتە سەرەکیەکانی فەلسەفەی سیاسی دەبەستیەوە بە چەمکی دەوڵەتی ئایدئاڵ. کۆمەڵناسی سیاسی باس لە پێوەندی نێوان دەوڵەت لەگەڵ هێز و دامەزراوە کۆمەلایەتیەکان دەکا و لە دەلاقەی کۆمەڵگا، فەرهەنگ و سیستمی ئابوورییەوە بۆ دەوڵەت دەروانیٚ و بایەخ بە بنەما کۆمەلایەتیەکانی دەسەلاتی سیاسی دەدا.

دەکرێ بلێین کە زانستی سیاسی راستەوخۆ چاو دەبڕێتە دەوڵەت و دیخاتە سەنتەری لێکۆڵینەوەی خۆیەوە، لە کاتێك دا کە لقە فەرعیەکانی ئەو زانستە بە چاوێکی دیکە و تایبەتەوە دەروانیٚنە دەوڵەت یان لایەنێکی تایبەتی دەخەنە بەر لێکۆڵینەوە. بۆ نموونە مافە سەرەکیەکان، پێکهاتەی رواڵەتی پێوەندی دەسەلاتی دەوڵەتەکان شی دەکاتەوە و لە دەستوور و پێوەندی سێ دەسەلاتەکەی حکومەتی دەدوێ.

بە شێوەی تایبەتی تر گرینگترین بابەتی زانستی سیاسی، دەسەلاتی دەوڵەتی یە. هێندێك لە خاوەن نەزەرەکان مانای بەربلاوی دەسەلات لە بوارە جوراوجورەکانی دا بە بابەتی زانستی سیاسی دەزانن. بەلام ئەم بۆچوونە سنوورەکانی زانستی سیاسەت لە رادەبەدەرو بەرین دەکەنەوە. لەگەڵ ئەوە کە دەسەلات لە مانا گشتیەکەی دا بەرادەی دەسەلاتی دەوڵەتی هەست

---

[١] بۆ ئاگاداری زیاتر چاو لە بەشی روانینەکانو شێوازەکان بکەن

پێکراو و جێکەوتوو نیە. هەروەها دەسەڵاتی دەوڵەتی پێوەندی بە شێوەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بە گشتی یە. لە کاتێکدا کە دەسەڵاتەکانی دیکە وانین. دەسەڵاتی دەوڵەتی پێوەندی لەگەڵ بڕیار و مل کەچی بۆ بڕیار هەیە کەوابوو ئەگەری مل بادان و گیرە و کێشەش لە ئارادایە. ئێستا بە کورتی ئیشارە بە گرینگترین چەمکەکان لە زانستی سیاسی دا دەکەین.

## دەوڵەت

دەوڵەت سەرەکیترین چاوگەی پێوەندی دەسەڵات و دەسەڵاتداریەتی یە کە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا بوونی بۆە.

لێرەدا مەبەست لە دەوڵەت بە مانایەکی بەرینتر لە دەزگاکانی یاسادانان و بەرێوەبەریی حکومەت دا دەخەینە روو. گرینگترین لایەنی دەسەڵاتداریەتی دەوڵەت، لە کۆمەڵگادا دانان و بەرێوەبردنی یاسایە. دەسەڵات، سەرچاوەی کەڵك وەرگرتنی دەوڵەت، حکومەت کوێ دەمودەزگای پێویست بۆ بەرێوەبردنی دەسەڵاتداریەتی و دانی بڕیار، و سیاسەت کوێ کرداری دەوڵەتە. دەوڵەت ئا بەجۆرە مانایەکی دەرهێنراو و ناکەسیەتی یە کە بە وتەی مارکس وبر "پاوانی بەکارهێنانی دەسەڵاتی رەوای" لە سەرزەمینیکی تایبەتدا پێ یەو لەنێو کۆمەڵێك لە دەوڵەتەکانی دیکەدا کە تایبەتمەندی دەسەڵاتداریەتیان هەیە هەڵکەوتووە. دەست رویشتوویی دەوڵەت وەك دەسەڵاتداریەتی لە نێوخۆی وڵاتدا تاقانە و بێ هاوتایە. دابەش کردنی دەسەڵاتداریەتی بە مانای دابەش کردنی دەوڵەتە.

دەوڵەت لە هەر کۆمەڵگایەکدا سەرچاوەی قازانجی گشتییە هەرچەند لایەنی ئەخلاقی، ئایینی و ئابووری هەیە، بەڵام لە بنەڕەتدا دامەزراوەیەکی ئەخلاقی ، ئایینی و ئابووری نیە، بەڵکوو ئەرکی تایبەتی جوراوجوری هەیە، بۆ نموونە پاراستنی ئەمن و ئاسایش، پارێزگاری لە مافە سروشتیەکانی تاکی نێوکۆمەڵ، دابین کردن و پاراستنی هاوپێوەندی کومەڵایەتی، دابین کردنی لانی کەمی خوشگوزەرانی و ئاسوودەیی و ... هتد. لە هێندێك لە روانگەکانی دەوڵەتدا ( هەروەك باس دەکرێ) لەسەر لایەنی زۆردارانەی دەوڵەت پێ داگیراوە. هێندێك ریالیستی سیاسی و مارکسیستەکان، دەوڵەتیان وەك ئامرازی زۆرداری لێکداوەتەوە. هێندێکی دیکە دەوڵەتیان لەبنەڕەتدا دامەزراوەیەکی حقووقی و خاوەنی دەسەڵاتی یاسایی بە حیساب هێناوە. لە لێکدوانەکانی ئەم دواییانەدا، دەوڵەت وەك دامەزراوەی دابین کردنی خوشگوزەرانی

و ئاسایش وەسف کراوە. بەڵام هەروەك دەبینین، دەوڵەت دیاردەیەکی چەند لایەنە و ئاڵۆزە و تاقە بناخەیەکی نیە. لە بۆچوونە کۆنەکاندا زۆرجار هەوڵ دەدرا دیاردە جوراوجورەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی یەك لەوان دەوڵەتیان بە مانای یەك پێکهاتە یان تاقە بناخە دابەزینن و هەموو لایەنەکانی لەو بناخەدا بدوزنەوە. بەڵام لە بۆچوونەنوێ کاندا دیاردە کۆمەڵایەتییەکان خاوەن تایبەتمەندی یەکی نەرمو پلاستیك ئاسا، فورم هەڵگر، چەند لایەنە، چەند سەنتەری و قابیل گوران لێك دەدرێنەوە.

## دەسەڵاتداریەتی

دەسەڵاتداریەتی لە روانگەی حقووقی و سیاسیی کلاسیك بەواتای بەرزترین پلەی توانایی لە دەوڵەتدایە کە لەوانەیە لەیەك تاك دا (پادشای رەها) و یان لە کۆمەڵێکی تاکەکان دا (بۆ نموونە پارلمان) خۆ بنوینێ. لە روانگەی کلاسیکەوە کەسایەتی شیاو بۆ دەسەڵاتداریەتی سەرتر لە یاسا و بۆ خۆی سەرچاوەی یاسا و بەدوور لەهەر چەشنە سنووردار بوونێکی یاسایی چاوی لێ دەکرا. پارلمانیش لە دەوڵەتی مودیرندا هەر بەم واتا بۆ خۆی سەرچاوەی یاسایە. کەوابوو دەسەڵاتدار (حاکم) کەسێکە یان دامەزراوەیەکە کە سەرتر لە بریاری ئەو بریارێك نەبێ. یاسا بریاری کەسایەتی یان دامەزراوەی شیاوی دەسەڵاتداریەتی یە. هەر بۆیە لە دێموکراسیەکاندا دەسەڵاتداریەتی هی پارلمانە. دەسەڵاتداریەتی بە لەبەرچاو گرتنی ئەخلاقیات یان بەرژەوەندی گشتی لەوانەیە سنووردار بێ، بەڵام بە پێی پێناسەکەی ناتوانێ خۆی لە چوارچێوەی یاسای لە خۆی سەرتر بەرتەسك بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هێندیك لە رەخنەگران و لایەنگرانی دێموکراسی ئایدال وتوویانە کە لەم لێکدانەوەیەدا دەسەڵاتداریەتی حقووقی و دەسەڵاتداریەتی سیاسی تێکەڵ بووە. پارلمان خاوەن دەسەڵاتداریەتی حقووقی یە، بەڵام دەسەڵاتداریەتی سیاسی کە بەسەر شێوازی بەکارهێنانی دەسەڵاتداریەتی حقووقی چاودێری دەکا، بۆ خەڵك دەگەرێتەوە، واتا دەسەڵاتداریەتی لەدەست خەلکدایە. رەخنەی لەم بابەتانە بۆ پێشگرتن لە رەها بوونی دەسەڵاتداریەتی حقووقی هاتوونەتە ئاراوە. بەڵام دەسەڵاتداریەتی حقووقی پارلمان ناچار نیە رەها ببێ، بەڵکوو لە دەستوورەکانی ئێستادا بە لەبەرچاو گرتنی دامەزراوەکانی پێوەندی دار بە دابەش کردن و چاودێری دەسەڵاتەکانی حکومەتی، بە هیچکام لە دەسەڵاتەکانی دەسەڵاتداریەتی مافی رەها نەبەخشراوە، بەڵکوو دەسەڵاتداریەتی بۆ خۆی دابەش

بۆوە. بەم پێی یە دەسەڵاتداریەتی لە دەستووردا شاردراوەتەوە. دەسەڵاتداریەتی بە مانای حقووقی نێونەتەوەیش کەڵکی لێ وەردەگیرێ و مەبەست ئەوەیە کە، ئازادی سیاسی و حقووقی تاقانەو یەکپارچە خاوەن دەسەڵاتداریەتیەیە. بە بێ لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ئەم دەسەڵاتداریەتیە نێوخۆیی یەی بە پێی دەستوور و جیاکردنەوەی هێزەکان دابەش کرابێ یان نا.

## سیاسەت

سیاسەت بە گشتی بە مانای کرداری بڕیار وەرگرتن و بەرێوەبردنی بۆ تەواوتی کۆمەڵگایە. کەوابوو لە سیاسەتدا کردار، بکەر و بابەتی کردار بوونی هەیە. بکەری کرداری سیاسەت، حکومەتە یان دامەزراوەکانی بڕیاردەر و بەرێوەبەریی دەوڵەتن. بابەتی کردار، گرووپەکان، تاکەکان و بەشە جوراوجورەکانی جەماوەرن. دەوڵەت بۆ وەرگرتنو بەرێوەبردنی بڕیارەکانی وەك سیاست، پێویستی بە دەسەڵات و پاساوی دەسەڵاتیش واتا دەسەڵاتداریەتی، رەوایی و ئایدولۆژیا هەیە. دەسەڵاتیش سەرچاوەی جوراوجوری هەیە. سیاسەت وەك وەرگرتن و بەرێوەبردنی بڕیار لەگەڵ هەموو کاروبارێکی کۆمەڵایەتی رووبەروو دەبێ. کەوابوو دەکرێ لە سیاسەتی ئابووری، فەرهەنگی، توێژینەوەو دارایی دەوڵەتەکان باس بکرێ. بەواتایەکی دیکە ناوەروکی بڕیارەکان سنووردار نیە. شێوازی وەرگرتنی بڕیار و بەرێوەبردنی وەك گەوهەری سیاسەت و بڕیاردەری گرینگ نیە، بەڵکوو جوراوجوری لە سیاسەت دا واتا بناخەی پلەبەندی جورەها سیستمی سیاسی پێی گرینگە. سروشتی یە مێتودی بڕیاردان لە دێموکراسیەکان و دیکاتوریەکان دا جیاوازن. بەرێوەبردنی بڕیارەکان پێویستی بە دەسەڵات و دامەزراوەکانی زۆر تەوەر هەیە. دەسەڵات، زۆر، دەست رۆیشتوویی، زەخت و...هتد، ئامراز و دەستەمایەی سیاسەتن. بە بێ دەسەڵات، سیاسەت و حکومەت واتا وەرگرتن و بەرێوەبردنی بڕیارەکان مومکین نیە. هەروەها "سووژەکان"ی کردەی سیاسەت واتا خەڵك بە هۆی زۆر و دەسەڵات و دەسەڵاتداریەتی و رەوایی شاراوە لە بڕیارەکان دا، پێرەویان لێ دەکەن. دامەزراوە سیاسی یەکان، کاناڵەکانی وەرگرتن و بەرێوەبردنی بڕیارەکان و کردارگەلی سیاسین. لەبەر ئەوەی کە سووژەی[بابەت] کردەی سیاسەت، کۆمەڵگایە، سیاسەت، تێکۆشانێکی بەکۆمەڵە. سیاسەت هەموو کات پێویستی بە دوو یان چەند ئاکتەر هەیە و وەك تێکۆشانێکی هەرەوەزی و

کۆمەڵایەتی لە نێوخۆی یەکە گەلێکی کۆمەڵایەتی تایبەت، وەك عەشیرە، شار، دەوڵەت ـ شار، دەوڵەتی نەتەوەی و وڵاتدا خۆ دەنوێنی.

## حکومەت

حکومەت هەم بە مانای هەڵسان بە حوکم کردن و هەم بە مانای کومەڵە دامەزراوەی بەرێوەبردنی حوکم و بریارەکان دەوترێ، هەر بۆیە سەبارەت چەمکێکی پەتی تر دەوڵەت مانایەکی عەینی تری هەیە. ئەرکە تایبەت و سەرەکیەکانی حکومەت، دانانی یاسا و بەرێوەبردنیەتی، دابەش کردنی ئەرکەکان لە نێوان دامەزراوەکانی حکومەتی بەندە بە پێکهاتەی حکومەتەوە. دەزگای ئیداری یان بووروکراسی بەشێکی سەرەکی لە حکومەت پێك دێنی. لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت و دەزگا حکوومیەکانی نوێ جگە لە ئەرکە تایبەتە سەرەکیەکان واتا دانانی یاسا و بەرێوەبردنی یاسا بە مەبەستی پاراستنی ئاسایش و ئارامی و دابین کردنی عەدالەتی دادوەری، ئەرك گەلێکیشی لە پیوەندی لەگەڵ گەشە کردن و دابین کردنی خوشگوزەرانی کۆمەڵایەتی لە ئەستو گرتووە.دابین کردن و سەرفی خەرج و مەخاریجی گشتی ومیزانیە [بوجە] دانان، دابین کردنی داهاتەکانی حکومەتی لە سەرچاوە جوراوجورەکان و بەرێوەبردنی خزمەتگوزاری کە قازانجی هەموانی تێدا بێ، بەشێك لە پروسەی حکومەت لە هەر کومەڵگایەکدایە. وەك ئاماژەی پێکرا، هیندێك جار وشەی حکومەت بە شێوازی حوکم کردن و بەرێوەبردنی کومەڵگایش مانا دەکرێ. حکومەت لەوانەیە بە شێوەی پاوانخوازانە و دیکتاتوری و یان بە شێوازی یاسایی و مەرجدار خۆ دەربخا، لەم مانادا، شێوەی بەرێوەبردنی دەسەڵات و چلونایەتی پێوەندی نێوان دامەزراوە حکوومیەکان و گرووپە کومەڵایەتیەکان مەبەستە. حکومەت بەم مانایە رژیمی سیاسیشی پێ دەوترێ.

## میللەت [نەتەوە]

دەوڵەتی نەتەوەی گرینگترین یەکەی ژیانی سیاسی لە جیهانی مودیرندایە. لە رابردوودا ئیمپراتوورەکان، عەشیرەتەکان و دەوڵەت ـ شارەکان تاکە سەرکیەکانی ژیانی سیاسی بوون، بەلام میللەت لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ هیندێك واتا وەك شار و عەشیر. وەك یەکەیەکی ژیانی سیاسی، واتایەکی ئالۆزترە و سەبارەت بە ئیلمنت (Element) و تۆخمە پێکهێنەرەکانی

جیاوازی بیرورِا هەیە. خاوەن راکان، تۆخم و ئیلمنتە پێکهێنەرەکانی میللەت لە هیندێك شتی وەك بوونی یەك پێکهاتەی سیاسی، فەرهەنگ و زمانی هاوبەش، پێشینەی مێژووی هاوبەش دا دەبیننەوە. نەریتی فیکری شورشی فەرانسە سەرچاوەی یەکێك لە بۆچوونە سەرەکیەکان سەبارەت بە هۆکاری پێکهێنەری میللەتە. بە پێ ئەو نەریتە تایبەتمەندی سەرەکی میللەت ناگەرێتەوە بۆ یەکیتی فەرهەنگی یان زمانی، یان قەومی، بەڵکوو یەکیتی لە پێکهاتەی سیاسی دایە، یەکێك لە شورشگێرانی فەرانسە وتوویەتی: "میللەت کومەڵێك لە تاکەکەسانە کە لە ژێر چەتری حکومەتی یاسایەکدا ژیان دەکەن". کەوابوو دروست بوونی میللەت پێویستی بە دروست بوونی دەوڵەتە و چەمکی دەوڵەت وپێکهاتەی سیاسی بە پێ عەقل و مەنتیق و لە روانگەی مێژوویی یەوە پێشتر لە میللەتە.

لەبەر ئەوە کۆمەڵە مرۆڤێك کە لە نێوان سیستمێکی سیاسی بەرزتر لە قەوم و عەشیرەدا دەژین، یەك میللەتن. لەئاکامی بوونی وەها سیستمێك دا بەرژەوەندی یەکی هاوبەش لە نێوانیاندا پەیدا دەبێ و هەست بە ئەرك و ئەمەکداری هاوبەش سەبارەت بەو سیستمە خۆ دەردەخا. ئەزموونی سەدەی بیستەم و هاتنە کایەی دەوڵەتە نەتەوەییەکانی پاش ئیستعماریش ئەم خوێندنەوەی سیاسیە پشت راست دەکاتەوە. لانی کەم ئەمە کە رێکخراو وپێکهاتەی سیاسی هەر بەو رادەیە لە پێکهێنانی ناسنامەی نەتەوەیی دا کاریگەری هەیە کە قەومیەت لە پێکهێنانی دەوڵەتدا کاریگەرە.

خوێندنەوەی دووهەم خوێندنەوەی فەرهەنگی یە. هیندێك لە نووسەرە ئالمانیەکان وەك نوفالیس و فیختە هۆکارەکانی فەرهەنگی و زمان بە هۆکاری سەرەکی پێکهێنەری میللەت دادەنێن. بە بووچوونی ئەوان مرۆڤ بە پێی سروشت لە نێوان میللەتەکاندا دابەش بوون، نە بە پێی بوونی دەوڵەتەکان. تایبەتمەندی سەرەکی ناسنامەی نەتەوەیی، زمانە کە نەریتەکان، سیمبولەکان، حیکایەتەکان و مێژوو و فەرهەنگی هاوبەشی هەر گەلێك لە خۆ دەگری. بەواتایەکی دیکە ناسنامەی نەتەوەیی لەم خوێندنەوەدا سروشتی، حەقیقی و نەپساوەیە. دیارە لێرەدا میللەت لەگەڵ قەوم تێکەڵ بووە و لەوانەیە لە نێو دەوڵەتێك دا چەندین میللەت بوونی هەبێ.

خوێندنەوەی سێهەم خوێندنەوەیەکی گشتی ترە کە لە ئاستی دوو روانگەی سیاسی و فەرهەنگی سەرتر دەکەوێ و لەهەمان کاتدا تایبەتمەندی ئەو دوانەش دەپارێزرێ. بە پێی

خوێندنەوەی سێهەم نابێ تایبەتمەندیە میللەت لە نێو ناسنامەی فەرهەنگی و قەومی دا بدۆزرێتەوە. بۆ دروست بوونی ناسنامەی قەومی، تایبەتمەندیە فەرهەنگیەکان پێویستن، بەڵام ناسنامەی نەتەوەیی سەرتر لە ناسنامەی قەومی و فەرهەنگی یە و بوونی چەندین قەومیەت لە نێو دەوڵەتدا، نابێ بەرگری لە پێکهاتنی ناسنامەی نەتەوەیی بکا. لە لێکدوانەوەی فەرهەنگی دا، زۆر لە هۆکارەکانی مێژوویی کاریگەر لە پێکهێنان و دروست کردنی میللەتدا لەبەرچاو ناگیردرێن.

ئیرنست رنان نووسەری فەرانسەوەی لەوەها روانگەیەکەوە خوێندنەوەی قەومی ـ فەرهەنگی دەخاتە بەر رەخنە.

بە بووچوونی ئەو، هۆکاری دروست بوونی ناسنامەی نەتەوەیی بوونی مێژوویەکی هاوبەش لە رەنجو ئازارەکانی هەمووان و بیرەوەریە هاوبەشە مێژوویەکانە، کەوابوو ناسنامەی نەتەوەی تەنیا لەسەر بنەمای قەومیەت، زمان، سەرزەوی هاوبەش و رێکخراوی سیاسی، دەوڵەت پێک نایە. لە لایەکی دیکەوە مەرجی سەرەکی دروست بوونی ناسنامەی نەتەوەیی پەیدا بوونی ئیرادە و ویستی پێکەوە ژیانە. لە کاتی بوونی وەها مێژوویەك و بیرەوەری گشتی و وەها ئیرادەی هاوبەشێك خەڵك سەرەڕای جیاوازی فەرهەنگی و قەومی زمانی نەتەوەیەك پێك دێنن.

## دەسەڵات

دەسەڵات کۆمەڵێك سەرچاوە و ئامرازی زۆردارانە و نازۆردارانەیە کە حکومەتەکان بۆ بەرێوەبردنی ئەرکە تایبەتیەکانی خۆیان کەڵکیان لێ وەردەگرن و لێی سوودمەند دەبن. پاراستنی سەرچاوەکانی دەسەڵات، دابەشکردنیان و ململانێ بۆ بەدەستهێنانیان لە گرینگترین باسەکانی زانستی سیاسی یە. سیاسەت هەر بە مانای بەکارهێنانی سەرچاوەکانی دەسەڵات بۆ بەرێوەبردنی ئیش و کار و پێوەندیدارەکان بە حکومەت و بەرێوەبردنی کۆمەڵگا نیە. بەڵکوو سیاسەتوانان دەبێ لەسەر ئەو سەرچاوانە لەگەڵ رکەبەر و موخالیفانی خویشین ململانێ و کەڵەوەکێشی بکەن. لە نێو زانستی سیاسی ئەو سەردەمەدا دابەش کردنی ئەرکەکان بە روونی ئەنجام دەدرێ. ئەو بەشە لە باسی سیاسەت و حکومەت کە بە ململانێ و گێرە و کێشە و تێکوشان بۆ دەست بەسەر راگرتنی سەرچاوەکانی دەسەڵات لە رێگای شۆرش و راپەڕین یان

شێوەکانی دیکەی خەبات و هەڵبژاردن پێوەندی پەیدا دەکا، لە لقی سیاسی کۆمەڵناسی سیاسی دا لێك دەدرێتەوە. لەبەرانبەردا ئەو بەشە کە بە سیاسەت بە مانای بەرێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگا و پاراستنی رێك و پێکی و ئاسایش و بەرێوەبردنی سیاسەتە جوراوجورەکان پێوەندی پەیدا دەکا لە لقی "زانستی سیاسەت"دا دێتە بەرباس. بە واتایەکی دیکە دەسەلات گرینگترین مانای رێکخستنی سیاسەت و زانستی سیاسی یە. پرۆسەکان و کاروبارێك کە لەواندا تۆخمێك لە دەسەلات یان هەوڵدان بۆ دەست پێ راگەیشتنی لە ئارادا نەبێ، ناوی سیاسەتی لەسەر دانانرێ. لەگەڵ ئەوەش رێکەوتنێکی وا لەسەر سروشتی دەسەلاتی سیاسی بوونی نیە. یەك لەو پرسیارە گرینگانە کە لەو بوارەدا دێتە ئاراوە، ئەمەیە کە ئایا دەسەلاتی سیاسی چەندایەتیەکە بۆ ئەژمار دەبێ یان چۆنیەتیەکە کە هەر لە پێوەندی لە نێوان گرووپە کۆمەلاتیەکان دا دەردەکەوێ، ئایا دەسەلاتە سیاسی یە جوراوجورەکانی ئابووری، کۆمەلایەتی لەگەڵ یەکتر جیاوازی گەوهەری یان هەیە و یان بە پێوانەیەکی هاوبەش بۆ دیراسە کردن دەبێ؟ ئایا لە نێوان ئەندامانی " بنەماڵەی دەسەلاتی سیاسی" بۆ نموونە دەسەلاتداریەتی، زۆرداری، دەست رۆیشتوویی و...هتد جیاوازی گەوهەری لە ئارادایە؟.

سەبارەت بەمەی کە دەسەلات چەندی یە یان پێوەندی یەکی کۆمەلایەتی، لە زانستی سیاسەتی مودیرندا باس گەلێك هاتوونەتە ئاراوە. دزە کردنی رەوشت ناسی و چەمکەکانی زانستە سروشتیەکان بۆ نێو زانستە کۆمەلایەتیەکان باس گەلێکی لەو بابەتەی هەڵگیرساندوە. لە فیزیادا،دەسەلات یان هێز و وزە بۆ نموونە لە لەشی مرۆڤدا، لە ئەسپدا یان لە مەکینەدا رادەیەکە دەکرێ هەڵی سەنگینی و مەزندەی بکەی. هێز و وزە لە زانستی فیزیادا وەك توانایی خستنە جووڵەی شتێکی خۆراگر لە مەودایەکی دیاری کراو و لە ماوەیەکی دیاری کراودا پێناسە دەکرێ. هێزی ئەسپێك وەك یەکەیەکی پێوانەیی بۆ توانا و هێزی مەکینەکان دانراوە. سەیارەیەك بە بڕی دە ئەسب دەتوانێ شتێکی خۆراگر کە کەمتر لە دە ئەسب هێزی خۆراگری بێ، بجولێنێ.

بەلام کێشەی سەرەکی لە زانستی سیاسی دا ئەمەیە کە ناتوانرێ بۆ تاکەکان یان گرووپەکان و یان دەوڵەت چەندی یەکی دیاریکراو لە هێز و توانا دەست نیشان بکرێ. پێوەندی دەسەلات لە سیاسەت دا پێوەندی یەکی ساکار نیە، بەڵکوو هێزەکان و گرووپەکان بەسەر یەکتردا توانا بەکار دێنن، واتا ناتوانرێ دوو کەسایەتی سیاسی لەوانی دیکە جودا بکەیتەوە و

پێوەندی دسەڵاتەکەیان لەگەڵ یەکتر مەزندە بکەی. کەوابوو لە زانستی سیاسی دا، دەسەڵات نەوەك تایبەتمەندیەکی گەوهەری و دەروونی سیاسەتوانان، بەڵکوو وەك تایبەتمەندی پێوەندی نێوان ئەوان لێك دەدرێتەوە. ئێستا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئەگەر دسەڵاتی سیاسی پێوەندی بێ، بە چ پێوانەیەك دەتوانرێ هەڵ بسەنگێندرێت. خاڵی سەرەکی و سەرەتایی ئەمەیە کە دەسەڵاتی سیاسی لە هەنگاوی یەکەم دا هەر لە دەرفەتێکی دیاری کراو و لە پێوەندی لەگەڵ کێشەیەکی دیاری کراودا دەکرێ هەڵسەنگێندرێ. بۆ نموونە دەسەڵات یان هێزی زۆرینەی پارلمان لە هەڵپیچاندنی ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیرەکان و یان لە بەکار هێنانی دەسەڵاتی ئەنجوومەنی وەزیران لە راکێشانی نەزەری زۆرینەی پارلمان سەبارەت بە سیاسەتیکی تایبەت دەکرێ قسەی لێ بکرێ. لە هەنگاوی دووهەم دا دەتوانرێ دەسەڵات یان هێزی هەر سیاسەتوانێك لە پێوەندی لەگەڵ دەسەڵاتی گرووپەکان و سیاسەتوانانی دیکە سەبارەت بە کاروباری جوراوجور هەڵ سەنگێندرێ. هۆکاری جوراوجور لە مەزندە کردن و هەڵسەنگاندنی دەسەڵاتی سیاسیدا کاریگەریان هەیە و لەو هۆکارانە دەتوانین ئاماژە بە وانەی خوارەوە بکرێن.

١) لە بواری بەکارهێنانی دەسەڵات: واتا ئەوەی کە لە ئاکامی بەکار هێنانی دەسەڵات لە لایەن سیاسەتبەدەستەوە چ ژمارەیەك لە تاکەکان یان گرووپەکان دەکەونە ژێر کاریگەری.

٢) بازنە و بواری دەست رۆیشتوویی (دەسەڵات): بەو مانا کە چ رادەیەك لە هەڵس و کەوت و کردەوی ئەو کەسانە یان گرووپانە دەبنە بابەتی بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتە.

٣) ئاکامی دەسەلات: بەکارهێنانی دەسەڵات وانیە هەموو جارێك ببێتە هۆی نارەزایەتی ئەوانەی دەسەڵاتیان بەسەردا بەرێوە دەچێ، بەڵکوو زۆرجار پێویستی ولآمدەریی بە ویستی تاکەکانە. کەوابوو دەبێ چاو لە بەکارهێنانی دەسەڵات (هێز) بکرێ کە چ رادەیەك لە رەزامەندی لە لای ئەو کەسانە دەسەڵاتتیان بۆ بەکار هاتووە پێك دێنی. دیارە هیندێك کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵات (هێز) وەك سەرکووتی موخالفەکان بەهۆی حکومەت دەبێتە هۆی نارازی بوون.

٤) برەی کاریگەری دەسەڵات: بەو مانا کە لە ئاکامی بەکارهێنانی هێز چ رادەیەك لە هەڵس و کەوتی ئەو کەسانە دا کە دەسەڵاتیان بۆ بەکار هاتووە گۆڕانی پێکهێناوە.

٥) دەرئەنجامەکانی دەسەڵات: بەومانا کە کاتێك دەسەڵات بەکار دەبرێ، هەروەك زیخێك بخرێتە نێو ئاو، شەپۆلێك دەخاتە ڕێ و لەرینەوەیەك لە دوورە دەست پێك دێنێ.

٦) کەرەسەکانی دەسەڵات: دەسەڵات لەوانەیە بە هێزی کەرەسەکانی توند و تیژانە، کەرەسەی یاسایی یان کەرەسەی ئایدولۆژی و فەرهەنگی بەڕێوە بچێ.

٧) تێچووی دەسەڵات: بەڕێوەبردنی هەر دەسەڵاتێك تێچوویەکی هەیە واتا لەگەڵ ئەوەی ئیمکاناتێکی نوێ پێك دێنێ، ئیمکانات و سەرچاوەگەلیکێش لە نێو دەبا. لەوانە تێچووی بەڕێوەبردنی دەسەڵات هەر مادی بێ ( وەك مەسرەفی دراو یان وزەی هێزە چەکدارەکان) و یان رۆحیش بێ (وەك دابەزینی رەوایی دەوڵەت)

بەپێی ئەوانەی سەرەوە ئەو فورمولەی ژێرەوە دروست دەبێ:

$$P(xa.yb)_MY/X(a,b)=P(xa.yb)$$

لەم فورمولەدا دەسەڵات = M، بەکارهێنانی دەسەڵات=y،ئەوانەی دەسەڵاتیان بەسەردا دەکرێ = x کردەوەی جیی چاوەروانی =a کەرەسەی دەسەڵات= b ئەگەرەکان = pr

نموونە: ( نەبوونی خیتابەی سەرۆك کۆمار و دەنگی (نەرینی نوێنەرەکان)pr- (خیتابەی سەرۆك کۆمار و دەنگی ئەرینی نوێنەرەکان)pr =(خیتابەی سەرۆك کۆمار و دەنگی وئەرینی بە دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ وڵاتێکی بیانی) پارڵمان/ سەرۆك کۆمار = دەسەڵات

( نەبوونی خیتابەی سەرۆك کۆمار و دەنگی نەرینی نوێنەرەکان)

بابەتی سەرەکی لە فورمولی دەسەڵات بەم شێوە هەر ئەم ئەگەرەی کاریگەریە تی یە. لەگەڵ ئەوەش نەك هەر هەمووکات ئەم هۆکارانە ناسیاری تەواویان لەسەر نیە بەڵکوو زۆر هۆکاری نەناسراوی دیکەش لە ئارادان.

هەروەك باس کرا، دەسەڵات وەك چەمکی پێوەندی، لەگەڵ چەمکەکانی دیکە وەك دەسەڵاتداریەتی، دەست رۆیشتووی و رێبەری پێوەندی هەیە. وەك پاشتر باسی دەکەین، دەسەڵاتداریەتی هێز رەوایە و بەمانای مافەوە، بەستراوەیە. رێبەری وەك یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەی دەسەڵات پێویستی بە تایبەتمەندی کەسیەتی رێبەران و دوستایەتی و خۆشەویستی شوێن کەوتوانی هەیە. بەڵام دەسەڵات و دەست رۆیشتوویی لەوە کە دەبنە هۆی گۆڕینی هەڵس وکەوت وەك یەکن. لەگەڵ ئەوەش دەتوانرێ بوترێ کە لە جیاوازی ئەو دوانەدا دەسەڵات گۆڕانی بەربلاوتر پێك دێنێ، لە دەوڵەت و دامەزراوەکانیدا کۆ دەبێتەوە و گرنتی جێ بە جێ

بوونی هەیە لە حالێکدا دەست ڕۆیشتوویی و "نفـوز" بـە هـۆی دامـەزراوە کۆمەڵایـەتی و ناحکومیەکانیشەوە بەڕێوە دەچیێ، گرنتی جیێ بە جیێ بوونی نیە و لە پلەی یەکـەم دا لەسـەر ڕوانگەی لایەنی دەست بەسەردا ڕۆیشتوو کاریگەری دادەنیێ و دەرئەنجام ئەمە کە سەبارەت بـە نفووز یان دەست ڕۆیشتووی زیاتر لەسەر مەبەستەکان ڕێك دکەون تا سەبارەت بە دەسەڵات.

## دەسەڵاتی دەوڵەتی و توانایی کۆمەڵایەتی

دەسەڵاتی دەوڵەتی جورێکی تاقانەیە، لەبەر ئەوە هەرچەند دەسەڵات لە هەموو قـوژینیکی کۆمەڵدا، وەك تۆز بڵاو بوەتەوە و لە پێکهاتەی بنەماڵە، گرووپەکان و دامەزراوەکانی دیکـەدا دەست دەکەویێ، بەڵام دەوڵەت لە سەرانسەری کۆمەڵگادا کەڵك وەرگرتن لە توانـایی (سلطه)و دەسەڵاتی ڕەوای لە پاوان دایە. لە هەر وڵاتێکدا یـەك دەوڵەت،بـەڵام بـە میلیـون بنەماڵـە و هەزاران گرووپ و دامەزراوە هەیە. کەوابوو دەسەڵاتی دەوڵەتی بەرزترین جۆری تواناییو هێـز لەهەر کۆمەڵگایەکدایە و بابەتی سەرەکی زانستی سیاسی پێك دێنی، هەرچەندە دیـارە دەبـیێ پێوەندی دەسەڵاتی دەوڵەتی لەگەڵ جۆرەها دەسەڵاتی کۆمەڵایـەتی ( دەسـەڵاتی گرووپـەکان، دامەزراوەکان و چینە کۆمەڵایەتیەکان)یش دیراسە بکریێ. دەسەلاتی دەوڵەتی لە حکومـەت و دامەزراوەکانی دا دەردەکەویێ و خۆ دەنوێنیێ، بەڵام دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی هەمووکات ئاشکرا و هەسـت پێکـراو نیـە، هەرچـەند لەوانەیـە دەسـەڵاتی دەوڵـەتی لـە چوارچـێوەی دەسـەڵاتە کۆمەڵایەتیـەکاندا بەرتەسك و کۆ کرابێتەوە.هەربۆیە دەبـیێ لـە نێـوان دەسـەڵاتی دەوڵـەتی و توانایی کۆمەڵایەتی دا جیاوازی دابنریێ.

## ململانی دەسەڵات

ململانی بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی یـەکێك لـە لایەنە سـەرەکیەکانی ژیـانی سیاسی یە. پێش لەسەرهەڵدانی دێموکراسی و ململانی سیاسی بە شێوەی سەرەکی توند و تیژ و بۆ پێش بینی کردن نەدەبوو، بەڵام لە دێموکراسیەکاندا ململانی تایبەتمەنـدی ئاشـتیخوازانە پەیدا دەکا و زۆرتر لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە بەڕێوە دەچیێ. هێندیك لە بنەڕەتدا سیاسـەتیان بـە مانای گۆڕینی ململانی بە ڕێکەوتی و تەوافوق و کۆ دەنگی پێناسە کردوە.

زانایانی کۆمەڵایەتی هۆی سەرەکی ململانێیان لە چەندان هۆکار وەك سروشتی توورە بوونی مرۆڤ، بۆنیاتی خاوەنداریەتی تایبەت، کەمی سەرچاوە، دەسەڵاتخوازی سروشتی، هەست کردن بە نەبوونی ئاسایشی تاکدا و... هتد زانیوە. دەروونناسی فرویدی روونکردنەوەی ئاڵۆزی سەبارەت بە هۆکارەکانی ململانێ تێدایە. فروید سەرچاوەی هەڵس وکەوتەکانی ئادەمیزاد بە خۆنەویست [ناخوداگاە] دەزانێ و دوو سروشتی سەرەکی خۆشەویستیو عیشق و مەرگی وەك هۆکاری سەرەکی هەڵسو کەوتی مرۆڤ لەقەڵەم دەدا. سروشتی ( غریزە) عیشق و خۆشەویستی بناخەی ژیان، بۆ نیات نان، هاوکاری، شارستانیەت و خۆش ویستنی بنەماڵە و مرۆڤایەتیە. سروشتی (غریزە) مرگ بناخەی مەیل بۆ لای وێران کردن، شەڕ، ململانێ، و رکەبەری و توورەیی یە. ئەفلاتوون بۆ هۆی سەرەکی ململانێ سیاسی لە نەبوونی سەرچاوەی دڵخواز و یان لە " خیری سنووردار" دادەگەرا. خیری سنووردار وەك دارایی دەسەڵات شتێکە کە بەرادەی پێویست بۆ رازی کردنی هەمووان بوونی نیە و چوونە سەری پشکی [سهم] بەشێك لە کۆمەڵگا دەبێتە هۆی دابەزینی پشکی بەشەکانی دیکە. دەوڵەتە گەندەڵ و فاسیدەکان لە روانگەی ئەفلاتوونەوە، ئەوانە بوون کە لەسەر ئەو خیرانە راوەستابوون و لە ئاکامدا هەمووکات لە هەل و مەرجی ئاژاوەو ململانێ و شۆرشدا دەژیان. لە سیستمەکانی دیکتاتوری، ئەشرافی، کەمینە و دێموکراسی دا ململانێ لەسەر خیرە سنووردارەکان گۆرانی رژێمەکان لە رێگای شۆرشو ڕاپەرینەوە لێ دەکەوتەوە.

ئەرەستوو هۆی سەرەکی ململانێ لە نایەکسانی و هەوڵ بۆ یەکسانی یان لە بالادەست بوون دا دەدی. ئەوانەی کە لە کەسانی دیکە لە خوارترن خوازیاری یەکسانی لەگەڵ ئەوان دان و ئەوانەی کە کەسانی دیکە یەکسانن لە هەوڵی چوونە سەرترن و لێرەوە ململانێ و کیشمەکێش لە کۆمەڵگادا دەست پێ دەکا. بە بۆچوونی ئەرەستوو ئەوانەی کە لە یەك لایەکەوە لەگەڵ خەڵکانی دیکە یەکسان نین خوازیاری ئەوەن کە لە هەموو باریکەوە، یەکسان بن، ئەم رۆانینە خۆی بەشێك لە روانینی گشتی ترە کە هۆکاری سەرەکی کێشە کۆمەڵایەتیەکان لە زیاد بوون یان تەقینەوەی داخوازیەکان دا دەبینێ. ئالکسی دوتوکویل نووسەری فەرانسەوی کە لەکەبوونی داخوازەکان لە کۆمەڵگای فەرانسەدا بە هۆکاری سەرەکی کێشەی راپەڕین دەزانێ. مارکس و ئینگلس سەرچاوەی کێشە و ململانێ کۆمەڵایەتی و سیاسی لە خاوەنداریەتیو ملکداری تایبەت و جیاوازی قازانجی مادی نێوان چینەکانی کۆمەڵایەتی دا دەدۆزنەوە. لە

روانگەی ئەوانەوە کێشە چینایەتیەکان گرینگترین جۆری ململانی لە کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی دایە و ئامانجی نیهایی دەست بەسەرداگرتنی سەرچاوەکانی دەسەڵات و کەرەسەی بەرهەم هێنانە.تۆماس هابز فەیلەسووفی بەریتانیایی سەرچاوەی سەرەکی کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان لە هەوڵی مرۆڤەکاندا بۆ پاراستنی خۆی و بەربەرەکانی لەگەڵ هەرەشەی مەرگی زوورەس دا دەزانی. بۆیە ژیان لە چاو ئەوەوە تێکۆشانێك بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات بوو کە هەر لە مەرگ و نەماندا کۆتایی پێ دەهات. هیندێك لە پارێزکارە هاوچەرخەکان، ململانی سیاسی بە نیشانەی منداڵی نەتەوەکان دادەنێن، وتوویانە کە کاتێك ویستە منداڵیەکان بەسەر تاکەکان یا خۆ گرووپەکاندا زاڵ ببێ ئەو جۆرە کەسانە یان دەوڵەتانە ناتوانن لە بازنەی قازانجە سنووردارەکانی خۆیان تێ پەڕن و لە ئاکامدا کێشە ساز دەبێ. لەگەڵ ئەوەش لە کۆمەڵگا پێشکەوتوەکانی ئەو سەردەمەش دا ململانی سیاسی سروشتی یە کە روودەدات هەرچەند شێوازی ئاشتیخوازنەتریشی پەیدا کردوە.

## توانین، بە دەسەڵاتی ( اقتدار)

توانین، دەسەڵاتێکی رەوا، یاسایی و جێی پەسەندێکە کە دەشی لە هەلۆمەرجێکی گونجاودا ملی بۆ راکێشری و گۆیرایەڵی لە بەرانبەردا نیشان بدرێ، لە بەدەسەڵاتی دا جورە پاساو دان و تەوجیهە کردنێك شاردراوەتەوە کە ئەوی لە شێواز و قەوارەی دەسەڵاتی پەتی دەردێنی و بۆ دەسەڵات بەسەردا سەپاوەکان دا بیکاتە جێی رەزامەندی. هەر بۆیە دەگوترێ لە توانایی و و بەدەسەڵاتی بۆ شوێن کەوتوان و مل کەچان خەسڵەتی دەرەوەیی نیە. دەسەڵاتی باوك لە بنەماڵەدا لە جۆری توانینە (اقتدار) لەبەر ئەوە، بە هۆی جوراوجور پاساو دەکرێ و وەریش دەگیرێ. وەك دەوڵەت، دەسەڵات، لەبەر یاسایی بوون، نەریتی بوون، تێکەڵ بوون لەگەڵ ئایین و شتی دیکە دەگۆرێ بە توانایی و بەدەسەڵاتی. هەر بۆیە توانایی سنووردارتر لە دەسەڵات و هێزە و ناتوانێ سنوور و هەل و مەرجی رەخسانی خۆی واتا یاسا، نەریت، ئایین، عورف و... هتد وەلابنێ. داوای مافی خوایی شاکان لە رابردوودا دەسەڵاتی ئەوانی دەگۆرێ بە توانایی. لەم سەردەمەش دا حکومەتە خەڵك سالارەکان (دێموکراتیك) دەسەڵاتێك لەسەر رەزامەندی و مافی دەسەڵاتداریەتی خەڵك لێك بدرێتەوە، بە توانایی دەژمێردرێ. دیموکراسی بۆ خۆی رەوشت

و شێوازێکە بۆ گۆڕینی دەسەڵات بە دەسەڵاتی بە گشتی چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتی وەك بناخەی حکومەت لە چەرخی نوێ دا، تەنیا کاناڵ بۆ بەرهەم هێنانی بەدەسەڵاتی یان توانایی بە حیساب دێ. لەم روانگەوە سیاسەت بە واتای تەواوی وشە لەگەڵ چەمکی بەدەسەڵاتی یان توانایی پێوەندی هەیە، نە چەمکی دەسەڵات. هۆنەری سیاسەتوانان، لەبەرهەم هێنانی توانایی یان بە دەسەڵاتی لەو هێزانەیە کە بوونیان هەیە. سیاسەتوانان بە لەدەست دانی دەسەڵاتەکەیان، وانیە کە توانایی خۆیان لە دەست بدەن، هەروەك ئەوەی کە کاتێك دەسەڵات دەکەوێتە دەستیان وانیە بە دەسەڵات و خاوەن توانایی بن. بەدەسەڵاتی هەروەك فەیلەسووفە سیاسیە کلاسیەکانی رۆژئاوایی وەك هابز و لاك و رۆسو پێیان وابوو کە بناخەی دەسەڵاتداریەتی دەوڵەتە و بەو ناوە هەر بە هۆی رەزامەندی ئەو کەسانە کە دەسەلاتیان بەسەردا دەکرێ (خەڵك) دێتە کایەوە تا کاتێك درێژە دەکێشی کە لە چوارچێوەی یاساکانی پێویست بۆ پاراستنی گیان و ماڵ و ئازادی و ئاسایش و ئاشتی خەڵك بەرێوە دەبرێ.

توانایی یان بەدەسەڵاتی بەم واتایە دوو روخساری هەیە: یەکێك ئەوەی کە لە بواری ئەمر (حوکم) و دەسەڵاتداریەتی دا خۆ دەنوێنی ئەوەی دیکە بە شێوەی گویرایەڵی و مل کەچی خەڵك لە یاساکان دەردەکەوێ. لەم روانگەوە، پێکهاتنی دەسەڵات لە خۆیدا بە واتای سەقامگیر و دامەزراوەکەی پێویستی بە جێکەوتوویی بە دەسەڵاتی یە. بە بێ توانایی ناتوانرێ بڕیار و حوکمگەلێك کە لە روانگەی یاسایی یەوە دەبێ بێ ئەملا و ئەولا جی بە جێ بکرێ، بدرێ. دسەڵاتە سیاسیە کۆمڵایەتیە جوراوجورەکانی بە بێ توانایی سەرچاوەی کێشە و ناارامی و ناسەقامگیری لە ژیانی سیاسیدان. لە سەردەمی نوێ دا ئەوانەی کە رەوایی دەسەڵاتی خۆیان سەرتر لە ئیرادەی خەڵك دەزانی تووشی قەیران بوون، تەنیا رێگە بۆ بەرهەم هێنانی توانایی و بەدەسەڵاتی، پەنا بردنەوەیە بۆ دەسەڵاتی خەڵك.

## رەوایی

چەمکی توانایی لەگەڵ چەمکی رەوایی، هەروەك دیتمان پێوەندی یەکی نیزیکی هەیە. رەوایی هەر ئەوە نیە کە دەوڵەت لە روانگەی حقووقی یەوە دەولەتێکی یاسایی یە بەڵکوو پێوەندی بە وەرگرتنی لە لایەن خەڵکەوە هەیە. باسی رەوایی دەگەرێتەوە بۆ باسێکی کۆنتر لە فەلسەفەی سیاسی دا واتا باسی بەرعوهدە بوون و ئەمەکداری و بەڵێن و یان ئەرکی سیاسی

هاولاتیان له شوینکەوتنی حکومەتدا. رەوایی سیستمە سیاسیەکان لەم روانگەوە بە هەست کردن بە بەرپرسایەتی و بەرعوهدە بوونی تاکەکان سەبارەت بە گویرایەلّی لەوان بەستراوەتەوە. بەناوبانگترین باس سەبارەت بە رەوایی لە نێو بەرهەمەکانی ماکس وبر، کۆمەلّناسی ئالمانی پەیدا دەبیّ. بە بۆچوونی ئەو " دەولّەت پێوەندی دەسەلاّتی مرۆڤە بەسەر مرۆڤدا، پێوەندیەك کە بە هۆی توندوتیژی رەوا ( واتا ئەو توندوتیژیە کە بە رەوا دەزانریّ) پشتیوانی دەکریّ. بۆ ئەوەی دەولّەت بەردەوام بیّ، تاکەکانی ژێر فەرمان دەبیّ گویرایەلّی ئەو توانایی یە کە دەسەلاّتەکانی باو بۆ خۆیان دایان ناوە، بن. بە شێوەیەکی گشتی تر دوو روانگە سەبارەت بە چەمکی رەوایی سیاسی هەیە، یەکەم روانگەی فەلسەفی و ئەوەی دیکە روانگە کۆمەلّناسانە. فەیلەسووفە سیاسیەکان پێوانگەلێکی جوراوجوریان بۆ رەوایی دەولّەتەکان خستوەتە روو لەوانە: "عەدالەت" "میانرەوی یان نەرمکیشی" و "کەرامەت" ، کە دەکریّ لە فەلسەفەی سیاسی کلاسیکدا ناوی لیّ بەریّ. لەم روانگەدا ئەم تایبەتمەندیانە وەك توخمی (عنصر) حەقیقی و دەروونی حکومەت وێنا دەکران، بەلاّم روانگەی کۆمەلّناسانە، رەوایی دەولّەت لە روانگەیەکی دەرەکی واتا لە روانگەی هاولاّتیان چاو لیّ دەکریّ. وبر، سیّ جوری سەرەکی رەوایی لە روانگەی کۆمەلّناسانەی باس کردووە، یەکەم رەوایی نەریتی، دووهەم رەوایی کاریزمایی و سێهەم رەوایی یاسایی. بە وتەی وبر، دەسەلاّتی نەریتی بە دەسەلاّتی رابردووی هەتا هەتایی واتا دەسەلاّتداری ئەو نەریتانەیە کە بە هۆی دان پێنان و وەرگرتن لە دێرزەمانەوە، پیرۆزی یان پەیدا کردوە، جورە سەرەکیەکانی بەدەسەلاّتی و رەوایی نەریتی، باوك شاهی و باوك سالاری بوون. رەوایی کاریزمایی بە دەسەلاّتییەکە کە لە ئاکامی میهربانی و بەخشینی لەرادەبەدەر و شەخسی یە،دوستی و خۆشەویستی رەهای شەخسی و باوەڕی شەخسی سەبارەت بە تایبەتمەندیی قارەمانی و پالّەوانی و تایبەتمەندیەکانی دیکەی رێبەری تاك. سەرئجام دەسەلاّتی یاسایی بە پێی باوەڕ بە بەهای یاساکانی دانراوەکان پەیدا دەبیّ و پشتی بە شایستەیی و لێهاتووی بەرێوەچوون بەستوە.

## نفووز یان دست رۆیشتوویی سیاسی

دست رۆیشتووی چەمکێکی لاوازتر و لە هەمان کاتدا بەرینتر لە چەمکی دەسەلاّت و بە دەسەلاّتی سیاسی یە. لە کۆمەلّگای ئێستادا گرووپەکانی کۆمەلاّیەتی، ئەنجوومەن و

یەکێتییەکان، ڕاگەیەنە گشتییەکان، دامەزراوە ئایینی یەکان، کەسایەتیە زانستییەکان، تاکەکان و بنەماڵەگەلی دارا و ... هتد، دەست ڕۆیشتووی (یان بە واتایەکی دیکە خاوەن نفووزن)، هەرچەندە دەسەڵاتی سیاسی یان نیە، دەسەڵاتدارانی سیاسیش لە پلەی جوراوجوردا لەباری سیاسی وەدەستیان دەروا. بەڵام دەست ڕۆیشتووی سیاسی گەرەنتی بەڕێوەبەری یاسایی نیە و زۆرجار لە پشتی پەردەی سیاسی ڕوودادە. هەر بۆیە دیراسەی زانستی لە سەری زۆریش سانا نیە، دەست ڕۆیشتووی جوراوجورە و پلەی بەرزو نزمی هەیە. دەسترۆیشتوویی گرووپە ماڵیەکان ڕوونتر و بەرچاوتر لە دەست ڕۆیشتووی گرووپە فیکری و حزبیەکانە. کاریگەری دەست ڕۆیشتووی لەوانەیە لە کورت خایەن یان درێژخایەندا ئاشکرا ببێ سوود وەرگرتن لە هیندێك سەرچاوە وەك پێگەی کۆمەڵایەتی و دارایی دەتوانێ دەست ڕۆیشتوویەکە زیاتر بکا. بە پێی پێوانەی جیاواز چەند جور لە گرووپە دەست ڕۆیشتوەکان دەکرێ ناو ببرێ. گرووپە دەست ڕۆیشتوەکانی نەریتی و مودیرن بە پێی جوری پێوەندی نێوان ئەندامان واتا پێوەندی شەخسی و ڕووبەڕوو یان بە فەرمی و ڕێکخراو پێناسە کراون. هیندێك گرووپە دەست ڕۆیشتووەکانیان بە پێی شێوازی کردەوە بە گرووپی دیفاعی یان هێرش بەر دابەش کردوون. لە دابەشکردنێکی دیکەدا بە نیسبەت خاڵی هاوبەش لە گرووپە قازانج ویستەکان و گرووپی ئایدولۆژیایی باس کراوە.

## سنوورەکانی زانستی سیاسی

زانستی سیاسی کە بابەتە سەرەکیەکەی دەوڵەتە، سنوورگەلی هاوبەش و جارجار ناروونی لەگەڵ لقەکانی دیکەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان دا هەیە. هیندێك لەم لقانە لە راستیدا، زانستە پشتیوانەکانی زانستی سیاسین یان هاوسنووری ئەو بە حیساب دێن. لەگەڵ ئەوە هەر زانستێك پشتیوان یان هاوسنووری نێوان لقەکانی پێك دێنی. بۆ نموونە کۆمەڵناسی وەك زانستی پشتیوانی زانستی سیاسەت مەودای نێوان لقی کۆمەڵناسی سیاسی پێك دێنی. هەر بەو شێوە دەکرێ لە فەلسەفەی سیاسی، دەروونناسی سیاسی و ئابووری سیاسی قسە بکرێ. هەریەك لەم لقانە نێوان (بەشی) لە دوورە دیمەنی چەمکەکان و شێوازی کاری زانستی پشتیوان بۆ ژیانی سیاسی و دولەت دەروانن. بۆ نموونە دەروونناسی سیاسی هزریمەیلی بۆ لای دەروونناسی رێبەران و پێرەوان یان دەروونناسی دەسەلاتدار و دەسەلاتخوازە و بنەماکانی شوناس و کەرەسەی کارەکەی خۆی لە دەروونناسی و بابەتی دیراسەکەی خۆی لە زانستی سیاسی وەردەگرێ. هەروەها ئەو بەشە لە یاسا کە مافی گشتی پێی دەڵێن و بە پێچەوانەی مافی تایبەتی کە چاوی لە پێوەندیەکانی یاسایی نێوان تاکەکانە، لە پێوەندی دەوڵەت لەگەڵ تاك و دەوڵەتەکان لەگەڵ یەکتر لە روانگەی یاساییەوە دەروانێ،لقی نێوان بەشی یاسا و زانستی سیاسی کە جارجار لە رابردوودا بە غەڵەت ئەوەیان وەك "یاسایی سیاسی" ناودەبرد. هەر بەو شێوە بوارێك کە لە نێوان مێژوو و سیاسەتدا رادەوەستی، واتا بواری مێژووی دیپلوماسی بوارێکی نێوان بەشی یە. رێژەی زانستی سیاسی لەگەڵ زانستەکانی پشتیوان و زانستەکانی نێوان بەشی لە هێمای خوارەوە رەسم کراون ئێستا بە هیندێك لە زانستەکانی نێوان بەشی ئاماژە دەکەین.

زانستەکانی نێوان بەشی




زانستەکانی پشتیوان

## فەلسەفەی سیاسی

فەلسەفەی سیاسی نە بە مانای مێژووی ئەندیشەگەلی سیاسی، بەڵکوو بە مانای بیرکردنەوە لە سیاسەت بە شێوەی فەلسەفی، بە تێگەیشتن و روونکردنەوەی حەقیقەتو سروشتی بڕیار و ئەمر کردن، گوێرایەڵی و شوێن کەوتن، پێویستی و ئامانجی نیهایی کۆمەڵگا و دەوڵەت، هۆکارەکانی هەبوونی دەوڵەت و دانی باشترین شێوە بە قەوارەی ژیانی سیاسی مرۆڤ بە مەبەستی دابین کردنی ئامانجە سەرەکیەکانی ژیان واتا عەدالەت، یەکسانی و ئازادی یە، هەرکام لە قوتابخانە فەلسەفیەکان لە سیاسەتدا بە پێی شێوازی تایبەت بۆ خۆی بابەتە ناوبراوەکان شی دەکەنەوە. پشت بەستن بە بەڵگە هێنانەوەی ئاوەزمەندانە لە فەلسەفەی سیاسی ئەرەستوودا، لەسەر بەڵگە هێنانەوەی هەلینجراو و مەنتیقی لە فەلسەفەی تۆماس هابز، بەسەر ئاوەزەی سەلیم و مافی سروشتی لە فەلسەفەی سیاسی جان لاك ویان ئاوەزەی گشتی لە فەلسەفەی سیاسی هێگل لەو رەوشە سەرەکیانەی فەلسەفەی سیاسی بوون.

فەلسەفەی سیاسی لە بناخەدا ئیشەکانی لەسەر بنەمای گومانگەلێك (فرضیات) سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ دەست پێ دەکا. جیاوازی بۆچوونی فەیلەسووفەکانی سیاسی سەبارەت بە کاروباری ژێرخانی سروشتی مرۆڤ لە دەوری چوار تەوەرەدا خولّ دەخوا.

یەکەم ئایا مرۆڤ سروشتەکەی بوونەوەرێکی تاك خواز یان کۆ خوازە؟

دووهەم ئایا مرۆڤ سروشتەکەی بوونەوەرێکی سیاسی (مەدەنی)یە یان ناسیاسی؟

سێهەم ئایا مرۆڤ بە پێ سروشت بوونەوەرێکی ئاوەزمەند و ئازادە یان بێ ئاوەز و بێ ئیختیار (مجبوور)ە؟

چوارەم ئایا مرۆڤ لە بناخەدا توانایی گەشەکردنی هەیە یان نا؟

ئەگەر سەرەتاکانی (مقدمات) هەرکام لەم روانگانە پەسەند بکەین، ئەوکات بە پێی بنەماکان دەبێ ئەو دەرئەنجامانەش کە لە هەرکام لە روانگەکانەوە سەبارەت بە سروشتی دەوڵەت، بەڵگەکانی ئامریەت و گوێرایەڵی و ئامانجە نیهایەکانی ژیانی سیاسی کە "استنباح" دەکرێ یان هەڵئەخینرێت وەربگرین. بەڵام گرینگترین کێشەی فەلسەفەی سیاسی باس لە سروشتی دەوڵەتە. هەر لێکدانەوەیەك لە سروشتی دەوڵەت لێکدانەوەیەکە سەبارەت بە ئامانجە نیهایەکانی ژیانی سیاسی، باشترین قەوارەی دەوڵەت و شێوەی دەست پێ راگەیشتنی

بە شوێن خۆدا دینێ. لە نیهایەتدا فەلسەفەی سیاسی باس لە کاروباری وەسفکردنی سروشت و سەرچاوەی دەوڵەت کە جێی باسی زانستی سیاسەتیشە، بە شێوەی جۆراوجۆر بە کێشەکانی پێوەندیدار بە بەهاکان و ئامانجی نیهایی ژیانی سیاسی و باشترین قەوارەی حکومەت پێوەند دەدا. کەوابوو بیرکردنەوە لەوەکە دەوڵەت دیاردەیەکی ئورگانیك و ئاکامی گەشەکردنی لە بنەماڵە بۆ گوند، بۆ شار و کۆمەڵگای مەدەنی یە و یان ئەمەکە دیاردەیەکی سازکراو و ئاکامی پەیمانی کۆمەلایەتی نێوان تاکەکانە، هەرکام بۆچوونی جیاواز سەبارەت بە کێشە سەرەکیەکانی فەلسەفەی سیاسی واتا گوێرایەڵی، رەوایی، ئازادی، مافەکان و.... هتد بە شوێن خۆیاندا دێنن.

بیرکردنەوە سەبارەت بە باشترین قەوارەی حکومەت لە نیهایەتدا بە گرینگترین کێشەی فەلسەفی سیاسی دەژمێردرێ. هەرکام لە فەیلسووفە سیاسیەکان لەسەر بنەمای خوێندنەوەیەك لەئامانجی نیهایی جێگەی پەسەند بۆ ژیانی سیاسی بە شوێن دۆزینەوەی پێوانەیەك بۆ دیاری کردنی ئاستی پەسەند کراوی قەوارەی حکومەت بوون. بۆ نموونە رادەی شارەزایی بەسەر راستیەکاندا لە فەلسەفەی ئەفلاتوون، رادەی دابین کردنی زانست و فەزیلەت و بەرژەوەندی گشتی لە ئەندیشەی ئەرەستوودا، رادەی دابین کردنی ئەمن و ئاسایش لە فەلسەفەی سیاسی هابز و رادەی دابین کردنی لانی زۆری شادی بۆ لانی زۆری ژمارەی خەڵك لە قوتابخانەی رەسەنایەتی سوودمەندیدا، هەرکام پێوانەیەکی جیاوازن بۆ دەست نیشان کردنی باشترین قەوارە لە حکومەت، بە شێوەی گشتی دەکرێ بوترێ کە گرینگترین کێشەی فیکری فەیلەسووفە سیاسیەکان، گەڕان بۆ شوێن بنەمایەك بۆ عەدالەت یان دادپەروەری یان یاسای عادیلانە لە کۆمەڵگادا بوە. مشت و مڕی فەیلەسووفە سیاسیەکان، سەبارەت بە دادپەروەری بە هۆی لێکدانەوەی بە سێ مانای جیاواز بووە. هێندێك دادپەروەری و عەدالەتیان لە یەك شتدا دیوەتەوە، هێندێك لە بەرچاوگرتنی لێهاتووییان بە مەرجی سەرەکی داناوە و هێندێکی دیکەش دابین کردنی پێویستیەکانیان بە پێوانەی دادپەروەری داناوە.

## مرۆڤ ناسی سیاسی

ئەم لقە وەك بیاڤی زانستێك نێوان مرۆڤناسی فەرهەنگی و زانستی سیاسەت پیك هـاتووە، لەگەڵ هیندێك لە قوولترین بابەتگـەلی سیاسـی لـە کۆمـەڵگای سـەرەتایی و پێشکەوتوودا رووبەروویە. لە رۆانگەی زۆربـەی مرۆڤناسانی سیاسـی هـەموو بوارەکـانی ژیـان کـەم و زۆر تایـەتمەندی سیاسیان هەیە و ژیـانی کۆمەلایـەتی بـە گـشتی کۆمـەلێك لـە پێوەنـدی هێـز، دەسەلات و ململانی یـە. هەربۆیـە دیراسـەی پێوەنـدی دەسـەلات لـە پێکهاتـەی بنەماڵـە و رێکخراوەکانی خزمایەتی، عەشیرەتی و دامەزراوەکانی ئایینی دا بایـەخێکی تـەوایان هەیـە. یەکەمین بەرهەمی گرینگ لە مرۆڤناسی سیاسی دا کتـێبی " فریـدریش ئیـنگلس" لـە ژێـر سەردێری سەرچاوەی بنەماڵە، خاوەنداریەتی تایبەتی و دەوڵەت (١٨٤٤) بوو.

هەنووکە دیراسە کردن لە پێوەندیەکانی دەسـەلات لـە دوو تـوێی پێکهاتـەی بنەماڵـەیی، عەشیرەتی، رەگەزی و.... هتد بە تایبەت لەو ولاتانە کە لە قۆناخی پێـشەسازیدان، بـە دڵـی مرۆڤناناسانی سیاسی یە. ململانی و گۆرانەکانی سیاسـی لـەم جـۆرە ولاتانـەدا پێوەندیـەکی نزیکی لەگـەڵ پێکهاتـەکانی نـاوبراو هەیـە. بەتایبـەت بـاس لـە دەرئەنجامـەکانی سیاسـی، قەومیەت، و ململانی قەومی باسی سەرەکی مرۆڤناسی سیاسی یـە. هەسـتی ئەمەگناسـی و وەفاداری بۆ گرووپی قـەومی یـان شـوێنی لـەدایك بـوون و فەرهـەنگی ناوچـەیی لـە هـەل و مەرجێکدا بایەخ و کاریگەری سیاسی دەبێ کە ریزبەندیـە سیاسـیەکان و کێـشە قەومیـەکان یەکتر بەهێز و توندتر بکەن.

گرووپە قەومیەکان خاوەن تۆر گەلێك لە خزمایەتی، پێکهاتـەی سیاسـی ـ کۆمەلایـەتی و فەرهەنگی تایبـەت بە خۆیانن و خۆیان بە پێی ئەو جورە چەمکانە پلەبەندی دەکەن و پێناسەی پێ دەبەخـشن. بـە زەق بوونـەوەی پێناسـەکانی قـەومی، ئەگـەری ململانـی سیاسـی نێـوان قەومەکانی زیاد دەبێ. نایەکسانی بۆ کەڵك وەرگرتن لەسەرچاوە جوراوجورەکـانی دەسـەلاتی سیاسی، کۆمەلایەتی و فەرهەنگی، کێشە قەومیـەکان زیاتر دەکا. بەم مانا مرۆڤناسی سیاسی ئیتر هەربۆ کۆمەڵگا سەرەتایەکان نیە، بەڵکوو خوازیاری دیراسە کردنی لایەنەکانی قـەومی و ناوچەیی لە سیاسەتی ولاتانی مودێرنیش دایە.

لەگەڵ ئەمەش بابەتی کلاسیکی سەبارەت بە مرۆڤناسی سیاسی هەروەها قەوارەی سیاسی پێش لە (پێکهاتنی) دەوڵەتە. دەوڵەتەکان بە درێژایی مێژوو جێگەیەکی سیاسیە پڕ ئەژمار و پرش و بڵاوەکانیان گرتوەتەوە و هەرکام ژمارەیەکی زۆر لەوانەیان لە نێوخۆیاندا تواندوەتەوە. جورەها قەوارە و شێوە لە حکومەتە سەرەتاییەکانی پێش لە دامەزراندنی دەوڵەتە رێکخراوەیی یەکان بوونیان هەبوە. کۆمەڵ گەلی مرۆڤی بە شێوەی سەرەتایی لە رێگایی راو و کۆکردنەوەی خوراددەمەنی ژیاون. بە شوێن ئەوەدا بوو کە کشت و کاڵ وماڵیی کردنی ئاژەڵ بوو بە رێگای سەرەکی گوزەرانی مرۆڤەکان. هیندێك لە شێوە سەرەتاییەکانی ژیان هێشتا لە لای ئیسکیموکان، ئوسترالیایە رەسەنەکان و عەشیرەتە ئەفریقاییەکان درێژەی هەیە. یەکەمین قەوارەی رێکخراویی ژیانی سیاسی لە چوارچێوەی عەشیرەتدا خۆی نواند. عەشیرەتەکان زۆربەیان گەروك بوون و لەم بارەوە سەقامگیری کۆمەڵایەتیان نەبوو. بەو حاڵەش پێکهاتەی دەسەڵات لە نێویاندا لەسەر بنەمای پێوەندی خزمایەتی بوو. بە نیشتەجێ بوونی کۆمەڵانی خەڵك و پەرەگرتنی کشت و کاڵ، سامان و دەسەڵاتی سیاسی بەرەو چڕ بوونەوە چوو و شێوە سەرەتاییەکانی باوك سالاری و باوك شاهی خۆی گرت. گواستنەوەی دەسەڵات لەم کۆمەڵگایانەدا بە شێوەی میراتی جێ بە جێ دەکرا و دەسەڵاتی سیاسی هەمووکات لە نێو بوومەلێلێك دا لە سیحر و رەمزدا پێچرا بوویەوە. بەو حاڵەش دەسەڵاتی سیاسی بێجگە لە خزمایەتی لەسەر لێهاتوویی لەشەڕدا و بە بوونی هێزی بانتر لە سروشتیش (مافوق طبیعی) بەسترا بوویەوە. پێکهاتەی دەسەڵات لەم کۆمەڵگایانەدا زۆرجار لە دەوری سەرۆکی عەشیرە یان بنەماڵەی گەورەدا خڕ ببوویەوە. هۆکاری جۆراوجۆر بۆ تێپەڕ بوون لە شێوە سەرەتاییەکانی حکومەت بۆ دەوڵەتە رێکخراوەیی یەکان یارمەتیان دا، لەوانە: سەرکەوتنەکان لە شەڕ و پەرەگرتنی جوغرافیایی دەسەڵاتی عەشیرەتەکان، بەرهەمهێنانی زیاتر لە مەسرەف لە بەروبوومە کشت و کاڵیەکان لە ئاستێکی بەربڵاودا، زۆربوونی حەشیمەت، پەرەگرتنی نایەکسانیەکانی کۆمەڵایەتی، بەرفراوان بوونی بازەرگانی و زیادبوونی شارەکان.

## دەروونناسی سیاسی

بابەتی دەروونناسی سیاسی لێکدانەوەی کاریگەریی کەسایەتی تاکەکان لەسەر سیاسەتە. بەتایبەت گرینگی دەروونناسی لە بڕیار دانە سیاسیەکاندا جێی سەرنج پێدان بوە. بەو حاڵەش هەمە چەشنی قوتابخانەکانی دەروونناسی، بوەتە هۆی هەمەچەشنی لە دەروونناسی سیاسیش دا. بۆ نموونە بە پشت بەستن بە دەروونناسی فروید یان ئادلر، دەروونناسی گەلێکی سیاسی جۆراوجۆر دەکەوێتە بەردەست. بەو حاڵەش لە روانگەی زۆر لە دەروونناسمانی سیاسی ئەوەی کە هەڵس وکەوتی تاکەکان دیاری دەکا، نەك "خودی" راستیەکە، بەڵکوو گۆمانێکە کە ئەوان لەراستی هەیانە. لە بڕیار وەرگرتنە سیاسیەکانیش وا وێنای (تصور) سیاسەتوانان لەراستیی کاروبارەکان (کەبۆ خۆی بەشێك لە کەساتیەکەیانە) بەسەر بڕیارەکانیاندا کاریگەری یەکی دیار و بەرچاوی هەیە.

دەروونناسی سیاسی بەگشتی لەگەڵ تایبەتمەندیەکانی دەرونناسانەی سیاسەتوانان بەرەورووبە. باوەر بەخۆ، هەست کردن بە تاوان، هەست کردن بە ئارامی و ئاسایش یان ناثارامی، عاشقی خۆ بوون، "ئیگو"ی Ego (خۆ بە زلّ زانی) بەهێز یان لاواز و .... لە تایبەتمەندیەکانی جێی سەرنجی دەروونناسی سیاسی یە. لە روانگەی هیندێکیانەوە سیاسەت بە تایبەت بۆ ئەو کەسایەتیانە سەرنج ڕاکێشە کە لە سەردەمی منداڵی یان مێرمنداڵیدا! هەستیان بە نامیهرەبانی، بێ باوەری، گاڵتە پێ کردن لە لایەن کەسانی دیکەوە کردوە. ئەو جۆرە کەسانە دەیانهەوێ دەسەڵات بگرنە دەست تا قەرە بووی بێ باوەری و نائەمنی خۆیان بکەنەوە. لە بەرانبەردا هیندێك دەروونناسانی سیاسی لەسەر ئەو باوەرەن کە سیاسەت و حکومەت بۆ کەسانێك سەرنج ڕاکێشە کە باوەر بە خۆ بوونێکی بەهێزیان تی دایە و دەتوانن لە بەرانبەر مەترسیەکانی ژیانی سیاسی دا راوەستن. دیارە لەوانەیە سیستم گەلی سیاسی داخراو و کراوە کەسایەتی جوراوجۆر بۆ لای خۆیان راکێشن. دەروونناسی رێبەرانی سیاسی لەسەر سێ کولّەکە راوەستاوە، یەکەم ناسینی ئۆگری (ئەنگیزە) شەخسی، دووهەم شێوەی بەسیاسی بوونی ئەو ئۆگریانەیە و سێهەم پاساو دانیان بە پێی بەرژەوەندی گشتی. لەسەر ئەم بناخە هەڵس و کەوتی سیاسی رێبەران بریتی یە بە کردەوە دەرهێنانی ئوگریەکانی دەروونی و گیروگرفتەکانی شەخسی کە ئەوانیان لەسەردەمی منداڵیەوە بە خۆیەوە خەریك کردوە.

یەکێك لە پێشرەوانی دەروونناسی سیاسی، هارولد لاسول بوو کە تایبەتمەندی سەرەکی کەسایەتی سیاسی لە ئۆگری بە دەسەڵات دەزانی. لە روانگەی ئەوەو دەسەڵاتخوازی بە هۆی هەست بە بی کیفایەتی و ڕەزیل کراوی و خۆزگە بۆ ڕێز و حۆرمەتێکە کە لە بنەماڵەدا نەهاتوەتە دی و لە کۆمەڵگا بۆ بەختەوەری خۆی دەگەڕێ.

## کۆمەڵناسی سیاسی

بابەتی کۆمەڵناسی سیاسی لێکدانەوەی پێوەندی نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵایەتی و گۆڕەپانی ژیانی سیاسی یە. لە خوێندنەوەی نوێتردا کۆمەڵناسی سیاسی مەیلی بۆ لای لێکدانەوەی پێوەندی نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەتە. کۆمەڵگای مەدەنی وەك کۆمەڵی لە هێزەکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان، بنەمای سەرەکی کۆمەڵناسیی سیاسی یان دەوڵەت پێك دێنی. لەم رووانگەوە بۆ روونکردنەوەی سرشت، کردەوە و پێکهاتەی دەوڵەت دەبێ لە ئاستە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا، ئابووری و فەرهەنگی دا بگەڕیی. دەوڵەت وەك مەیدانی کردەوە و تێکۆشانی سیاسی، بابەتی زانستی سیاسەتە،بەڵام بۆ خۆی لەنێو کۆڕێك لە هێزەکان و دەسەڵاتە کۆمەڵایەتیەکان دا هەڵکەوتوە کە لە پێکهاتنیدا کاریگەرن و ئەم باسە لە کۆمەڵناسی سیاسی دا دەکرێتەوە.

کۆمەڵناسی سیاسی لە سێ پلەدا دەکەوێتە بەرباس: یەکەم پلەی تاکەکەسی کەلەودا نەخشی هۆکارە جۆراوجۆرەکان لە هەڵس و کەوتی سیاسی تاك لێك دەدرێتەوە و ئەم بوارە لەزانست لەگەڵ بواری کردارناسی زۆر نزیکە. دووهەم لە پلەی بەکۆمەڵ و گرووپ کە لەودا نەخش و دەستڕویشتووی گرووپەکان، ڕێکخراوەکان و دامەزراوە مەدەنیەکان لەسەر سیاسەت و کردەوەی دەوڵەت لێك دەدرێتەوە. و سێهەم پلەی دەوڵەتە کە خۆی وەك مەیدانی سازان و بەربەرەکانی نێوان هێزەکان و چینەکانی کۆمەڵایەتی دیراسە دەکرێ. نەخشی هێزە کۆمەڵایەتیەکان یەك لەوان چینەکانی ئابووری، کاروباری کۆمەڵایەتی، ئایین و مەلایەتی، رووناکبیران، ئەقوام و کەمینەکان لە مەیدانگەلی جۆراوجۆری ژیانی سیاسی دا دەکەونە چەقی سەرنج پێ دانی کۆمەڵناسی سیاسی.

هەروەها لێکدانەوەی جورەها سیستمی سیاسی لەسەر بناخەی پێودرەکانی کۆمەڵناسانە واتا لە رووی شێوەی پێوەندی دەوڵەت لەگەڵ گۆمەڵگای مەدەنی لەم لقەدا جیی گرتووە.

لەئاکام دا لە شێوە جۆراوجۆرەکانی پێکهاتەی دەوڵەت دا وەك دوڵەتی چینایەتی (کۆرپوراتیسم) Corporatism، دەوڵەتی لیبرال، توتالیتر، فاشیست، پوپولیست و.... باس دەکرێ. لەگەڵ ئەوەش لە نەخشی کەڵێنە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی وەك کەڵێنی چینایەتی، کەڵێنی ردگەزی، تەمەنی، کەڵێنی نێوان نەریت و مۆدیرنیتە و نێوان ناوەند و دەوروبەر و.... لە پێکهاتەی حیزب و گرووپەکان و ریژیمەکانی سیاسی بە درێژە باس دەکرێ هەڵ و مەرجی مێژووی و کۆمەڵایەتی قەوار بەستنی سیستمە سیاسیەکانیش لە بابەتە سەرەکیەکانی کۆمەڵناسیی سیاسی یە.

## ئابووری سیاسی

بابەتی ئابووری سیاسی بە مانا نوی کەی لێکدانەوەی کێشەگەلێکە کە جێی باسی هەردووك زانستی سیاسەت و زانستی ئابووری یە. بە شێویەکی وردتر ئابووری سیاسی بە شوێن تێگەیشتنی پێوەندی دوولایەنە لە نێوان هێزە سیاسی و ئابووریەکان و کاریگەری ئەو پێوەندیانە بەسەر ساز بوونی سیاسەتە ئابووریەکانە. هەروەها کاریگەری بارودۆخی ئابووری لەسەر حکومەتگەلی هەڵبژاردەی خەڵك لەم بەشەدا لێك دەدرێتەوە. سەرکەوتنی حکومەت لە سیاسەتە ئابووریەکاندا رەوایی و ئەگەری هەڵبژاردنەوەی دووبارەی زیاتر دەکا. لە ئەدەبی توێژینەوەی لەئارادا بەڵگە دەهێنرێتەوە کە خۆشەویستی و رەوایی و حکومەتەکانی هەڵبژاردە لە ژێر کاریگەری نیشانە گرینگەکانی ئابووری وەك، ئاوسان، بێ کاری، نەبوونی بالانس لە دەرکەوتەکان و... دایە. یەکەکی دیکە لە کێشە گرینگەکانی باس لەم بارەوەیە کە تا چ رادەیەك بارودۆخی ئابووری وڵاتەکان دەرئەنجامی سیاسەتەکانی دەوڵەت و تا چ رادەیەك لە ئاکامی ئەو هۆکارانەیە کە بەدەر لە کۆنترۆڵی وەك بازارە جیهانیەکان. هەروەها نەخشی هۆکارەکانی سیاسی لە پێکهاتنی سیاسەتە ئابووریەکان لە چەقی سەرنجی ئەم لقە لە زانستدا هەڵکەتووە. بەتایبەت سیاسەتگەلی ئابووری مەزن (کلان) جێگەی سەرنجە. بۆ نموونە دەگوترێ کە دەوڵەتەکان زۆر جاریش لە هەڵبژاردن بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشەویستی خۆیان هەڵ دەستن بە پێکهێنانی بارودۆخی گەشەی ئابووری لە رێگایی جۆراوجۆرەوە، یان ئەوەی کە دەوڵەتەکان لە مانگەکانی سەرەتای دەست بەکار بووندا بەپەلە دەست بەجێ بەجێ کردنی بەڵێنە مالیەکانیان دەکەن، بەلام پاش ماوەیەك هەڵس وکەوتەکەیان دەگۆڕن. پێوەندی

ئایدولۆژی حزبی لەگەڵ مەسایلی ئابووریش کەوتووەتە بەر توێژینەوە. زۆرجار حزبە چەپەکان حەزیان لە چارەسەری کێشەی بێکاری یە، ئەوە لە کاتێکدایە کە حزبە راستەکان زیاتر لە هەوڵی چارەسەری کێشەی ئاوسان دان.کەوابوو پێوەندی ئایدولۆژی سیاسی و سیستمی ئابووری گرینگیەکی تایبەتی هەیە. ئابووری سیاسی بەم مانای نویّ یە لەگەڵ ئابووری سیاسی بە مانا کۆنەکەی کە رواتینێکی مارکسیستی یە لە سیاسەت، بیّ گۆمان جیاوازی هەیە.

## حەشیمەت ناسیی سیاسی

حەشیمەت ناسی سیاسی وەك لقێك نێوان بەشیی بە لێکدانەوەی دەرئەنجامەکانی سیاسی گۆرانکاریەکانی جەماوەری، هۆکارە سیاسەیەکانی ئەو گۆرانکاریانە و سیاسەتەگەلی حەشیمەتی دەوڵەتەوە خەریك دەبیّ. هەندێك لە حەشیمەت ناسە سەرەتاکانیش باسیان لە "حەشیمەت لە ئاستی گونجاودا" لە رووی سیاسەوە کردبوو. دیارە ئەم لقە لە زانستی سیاسی نێوان بەشیی وەك لقێك جیا لە حەشیمت ناسی و کۆمەڵناسی سەربەخۆ نەبووە. لەوانەیە هۆی ئەم کارە بگەرێتەوە بۆ ئەوەی پێوەندی نێوان حەشیمەت و سیاسەت ساکار و راستەخۆ نیە. بەڵکوو گۆرانکاریەکانی حەشیمەتی لە رێگای بوارگەلی ئابووری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دەگویزرێتەوە بۆ بواری سیاسی. لە نێوان رادە یان گەشەی حەشیمەت لە وڵاتێکدا و سەقامگیری سیاسی یان بیچمی سیستمی سیاسی لەوێدا ناکریّ پێوەندیەکی روون بدۆزرێتەوە. لەم رۆژگارەدا حەشیمەتی زۆر دەسەڵاتی سەربازی و سیاسی وڵاتەکەیان زیاد ناکەن. پێوەندی نێوان لاویی یان پیری حەشیمەت و ئەوگری بە ئایدۆلوژی گەلی سیاسی رادیکاڵ یان پارێزگارانەیش ناسەلمێندریّ.

کێشەی تەقینەوەی حەشیمەت لە وڵاتانی روو لە گەشەدا تەنیا لە یەك رۆانگەوە ناوەروکی حەشیمەتناسانەی هەیە، لە کاتێکدا لە روانگەیەکی دیکەوە دەکریّ بوتریّ کە سەرچاوەی سەرەکی کێشەکە دەگەرێتەوە بۆ نایەکسانی کۆمەلایەتی و سیستمی دابەش کردنی ئابووری.

هەروەها پێوەندی نێوان پێکهاتە و رادەی حەشیمەت لەگەڵ سەقامگیری دێموکراسی زۆریش روون نەبوەتەوە. لەگەڵ ئەوەش دا لە هەندێك توێژنەوەکاندا لە کاریگەری پیری حەشیمەت لەسەر کەم جووڵەیی کۆمەڵایەتی تەئکید کراوە. لەو وڵاتانەدا کە حەشیمەتەکەی لە گرووپە قەومی و ئاییینی یەکانی جۆراوجۆر پێکهاتوون، زیادکردنی حەشیمەت کاریگەری

سیاسی ئاشکراتری بوە. لە لوبنان زیادکردنی حەشیمەتی موسـلمانەکان هاوکێشەی سیاسـی تێك دا و لە ئاکامدا بارودوخی کریستانەکان کەوتە ژێر پرسیار. هەروەها کوچە نێونەتەویەکان لەسەر پێکهاتەی حەشیمەت و بەتایبەت حەشیمەتی کەمینەکانی قەومی کاریگـەری دەبـێ و ئەمەش بە نورەی خۆی لەوانەیە دەرئەنجامی سیاسی هەبێ.

## ژئوپولیتیك و جوغرافیای سیاسی

بابەتی ژئوپولیتیك دیراسـەی بنـەماکانی جوغرافیـایی دەسـەڵاتی دەوڵەتەکانـە. نەخـشی تایبەتمەندیـەکانی سـەرزەویـنی، ئـاو و هـەوا (کـەش) سەرچـاوەکانی سروشـتی، شـوێنگەی جوغرافیایی، تایبەتمەندیەکانی حەشـیمەتی و فەرهـەنگی لەسـەر قـەوارە و هـەڵس و کـەوتی سیستمی سیاسی جێگەی باسی ئەم لقە لە زانستی سیاسی یە. هەروەها لەبەر ئەوە هەرکام لە دەوڵەتەکان بەشێك لە فـەزای جوغرافیـای سیاسـی جیهـان پێـك دێـنن، بـاس لـە پێوەنـدی نێونەتەوەیی لەم رۆانگە تایبەتیەوەش دەکەوێتە بەرباس. دیارە جۆغرافیایی سیاسی لقی نێوان بەشـی یـە و دەبـێ هۆکـاری جۆراوجـۆر لــە لێکدانــەوەی خــۆی دا رەچــاو بکــا. یەکێك لە دامەزرێنەکانی ئەم لقە لە سەرەتاکاندا، فریـدریش راتـزل (١٩٠٤ــ١٨٤٤) زانای ئاڵمانی بوو. بە بۆچوونی ئەو دەوڵەت هەروەك ئۆرگانیسم لە شوێنی جوغرافیایی خـۆی ئـیش دەکا و تایبەتمەندی ئەم شوێنە (محیط) لەسەر دەسەڵاتی دەوڵەتەکان کاریگەری بەرچاوی هەیە. یـەکێك لـە پێـشەنگەکانی ژئوپولیتیـك، نووسـەری بریتانیـایی هـالفورد مەکینـدر (١٩٤٧ـ١٨٦١) بوو کە لەسەر ئەو بروایەدا بوو کە چارەنووسی مێژووی جیهان لـە بارمتـەی شەری هێزی زەوینی لەگەڵ هێزی دەریایی دایە. ئەو ناوەندی سەرزەوینی کیشوەری ئورووپـا ـ ئاسیای وەك دڵی جیهانو دەسەڵاتی جیهانی بە حیساب دەهێنا و دەسەڵاتە دەریاییـەکانی لـە مەترسیدا دەدی. هەرچەند پاشتر لەگەڵ گەشەی هێزی هەوایی لـە بایـەخی هێـزی دەریـایی و زەویتی کەم بوە.

بۆ خوێندنەوەی نوی لە ژئوپولیتیك دەبێ لـە جوغرافیـایی سیاسـی ئێـستاکەدا بگـەرێی. بابەتی جوغرافیـای سیاسـی لێکدانـەوەی کێـشەکانی [مەسـایلی]جیهـان لـە دورە دیمـەنی جوغرافیایی یە. سـەرهەڵدانی ناوەنـدی نـویی دەسـەڵاتی جیهـانی، گرینگـی سەرچاوەکانی سروشتی و کانزایی سەبارەت بە دەسەڵاتی سیاسی و پێوەندی "باکوور" و "باشـوور" یـەکێك

له باسەکانی جوغرافیای سیاسی مودیرنه.هەروەها باس لـه گرینگـی مەسـایلی سـنوورەکانی سیاسی و ناوچه سنووریەکان، هێزی دەریایی، هێـزی زەویـنی، ناوەنـدە سیاسـیەکان و لـەنێو چوون یـا سـەرهەڵدانی دەسـەڵاتەکان و یـان ناوەنـدەکانی قورسـایی دەسـەڵات لـە روانگـەی جوغرافیایی و... جێی باسی جوغرافیای سیاسی یه.

سەرهەڵدان و دەرکەوتنی رێکخراوەکانی ناوچەیی، پێکهاتەی دەوڵەته فیدرالیەکان، گرینگی سیاسی رۆژ له دوای رۆژی قوولایی ئوقیانووسەکان و فەزای ولاتـەکان، مەسـایلێکی نویٚ لـه یاسای دەریاکان، مەسایلی تایبەت به حکومەتـه ناوچـەیی یـەکان و پێوەنـدی ئـەوان لەگـەڵ حکومەتی ناوەندی، پەردەگرتنی کوچ وکێشەکانی دیکه بواری دیراسـەی جوغرافیـای سیاسـی نوییٚ بەرین کردوەتەوە.

## بایولوژی سیاسی

لەم روانینه و رەوشته تارادەیەك نویٚ که بـۆ دیراسـەی ژیـان و هەڵسوکەوتـه سیاسـیەکان دوزراوەتەوە، له مانا و میتودگەلی توێژینـەوەی بایولوژی کەڵك وەردگیردریٚ. گۆڤاری سیاسەت و زانستی بایولوژی له ئامریکـا نوێنـەری سـەرەکی ئـەم روانـین و بۆچـوونەیە، لـە روانگـەی بایولوژی سیاسی، هەڵس و کەوته سیاسی یەکانی مرۆڤ وەك دەسەڵاتخوازی، ترس لـە بیگانـه، پێرەوی خوازی و... له ژێر کاریگـەری پێکهاتـەی ژنتیـك و تایبەتمەنـدی بـایولوژی ناسانەی مرۆڤن. هەر بۆیه له رۆانگەی بایولۆژیستەکانی سیاسـی دەتـوانریٚ بـه دەسـتکاری کـردن لـه ئەرکەکانی فیزیولوژیکی جەستەی مرۆڤ، هەڵس و کەوتەکانی کۆمەڵایەتی سیاسی یەکەی ژێرو روو بکریٚ. هەروەها له روانگەی بایولۆژی سیاسی یەوە نیـشانەکانی فیزیولـۆژی وەك لێـدانی دڵ، یـان پالەپەسـتۆی خـوێن، و بـاقی جووڵـەکانی دیکـەی جەسـتەی مرۆڤـ دەکـریٚ بـۆ هەڵسەنگاندن و مەزنده کردنی هـەڵس وکەوتـه کۆمەڵایـەتی و سیاسـی یـەکان کـەڵکی لـیٚ وەربگێردریٚ. لەگەڵ ئەوەی هەندێك له دەستکەوتەکانی بایولۆژی سیاسی وەك مەسایلی روون و شەفاف جێی پەسەندی زانایانی سیاسی یه بەڵام ئـەم روانینـە (نگـرش) پێـشکەوتنی زۆری نەبوە.

## روانین و مێتۆدەکان لە زانستی سیاسی دا

هەروەك پێشتر ئاماژە پێکرا، سیاسەت، حکومەت و دەوڵەت دیاردەگەلیکی فرەلایەن و ئاڵۆزن و دەتوانرێ یەکی لەو لایەنانە دەست چین بکرێو وەك بابەتی سەرەکی زانستی سیاسی بکەوێتە بەرباس. هەروەها بەوپێیە کە چ لایەنێك لە سیاسەت و دەوڵەت هەڵبژێردرێ، میتود و شێوەگەلی جۆراوجۆر بۆ دیراسەکردنی بواری حکومەت دەکەوێتە دەست میتود و بۆچوونەکانی زاڵ لە توێژینەوە کۆنەکان سەبارەت بە سیاسەت زۆرتر مێژووی، یاسایی، فەلسەفی و ئەخلاقی بوون، بەڵام ئەو هەوڵانە کە بۆ بە زانستی کردنی سیاسەت لە سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم دا درا، روانین و میتۆدەکانی زانستی جۆراوجۆر بۆ دیراسە کردن دۆزرایەوە. ئێستا بە کورتی ئاماژە بە گرینگترین روانین و میتۆدگەلی نوێ لە دیراسەی دیاردە سیاسیەکان دا، دەکەین.

## ئاکار خوازی [رفتارگرایی]

ئاکارخوازی یەکێك لە بۆچوونە باوەکان لە زانستی سیاسەت لە نیوەی سەدەی بیستەم لە رۆژئاوادا بوو وەك دژکردەوەیەك لە بەرانبەر زاڵ بوونی روانینی یاسایی و رواڵەتی و فەلسەفی و ئەخلاقی لە دیراسەی سیاسی سەری هەڵداوە و تا رادەیەك کاریگەری لەسەر پێکهاتنی زانستی سیاسەتی مدیرندا بوە. لە روانگەی ئاکارخوازان، یەکەی سەرەکی دیراسە لە زانستی سیاسی دا هەڵس و کەوتی سیاسی یە. هەڵس وکەوتی سیاسی لە مانا بەربڵاوەکەیدا کردە و روانینێکە کە لە چوارچێوەی دامەزراوە سیایەکاندا پەیدا دەبێ. گرینگی هەڵس و کەوتی سیاسی لە نورم گەلی حقووقی ـ سیاسی لەم روانگەوە زیاترە، چوونکوو بەئەوەی کە بە کردەوە روو دەدا. ئاماژە دەکا. لەم جۆرە کۆ کردنەوەی زانیاری و دەسکەوتە ئاماری و ئەزموونی و چەندایەتی سەبارەت بە هەڵس و کەوتی سیاسی وەك گرینگترین شێوازی توێژینەوە لە سیاسەت دا لێك دەدرێتەوە. هەر لە رێگەی ئەم زانیاریانەوە دەکرێ لە هەڵس و کەوتی سەرەکی سیاسی وەك ئاگارگەلی هەڵبژاردن و سیاسەتدانان و گۆیرایەڵی و پێرەوی و یاخی بوون و شورش تێ بگەی.

مەبەستی سەرەکی لەوەها لێکدانەوەیەك گەیشتن بە یاسای گشتی یان هاوپێوەندی ئاماری یە. بەشوێندا گەران وکوو کۆکردنەوەی زانیاری بەمەبەستی رێك وپێك کردنی بابەتی

لێکۆڵینەوە و لەئاکامدا گەیشتن بە بۆچوونی گشتی، میتۆدی سەرەکی ئاکارخوازی لە زانستی سیاسەتدا بوە. ئاکارخوازان بە پێی فەلسەفەی زانستی وادانراوە کە دەتوانرێ بێ لەبەرچاوگرتنی روانگە و چوارچێوەی بۆچوون راستەخۆ بۆ لای زانیاریە ئاماریە کاڵەکان بچی و بیان ناسێ و لێك بدایتەوە. بەبۆچوونی ئەوان تیسوری پاش تەواو بوونی کاردا دی نە لەسەرەتادا، لەگەڵ ئەوە ئاکار خواری لەگەڵ هەرچەشنە مەیلی ئەخلاقی، راسپاردەیی و نورمی لە دیراسەی سیاسی دا موخالف بوە. لە روانگەی ئاکارخوازان نێوان بڕیاراتی راستەقینە و بڕیاراتی رواڵەتی جیاوازیەکی بنەڕەتی و ئاشکرا هەیە و زێهنی توێژەر دەتوانێ خۆی لە خۆدی توێژینەوەکە دوور رابگرێو بە پشت بەستن بە بینین و ئامار و ژمارەکانی بابەتی بەردەست لێکۆڵینەوەکە بناسێ.بەمجورە لە روانگەی رەخنەگران نەخشی زیهن و ئیرادەی مرۆڤ و توێژەر(محقق) و لە روانگەی گشتی تر دەست تێ وەردانی زیهنیەت و عەینیەت لە گۆرەپانی کۆمەڵگا و سیاسەتدا چاوی لێ دەپۆشرێ. هەروەها بە پێی بۆچوونی رەخنەگران، ئاکارخوازی زانستی سیاسەتی لە هەرچەشنە توخم و ئیلمینت و مەیلی ئەخلاقی، مرۆڤ خوازانە، قازانج ویستانە و کردارخوازانە بەتاڵ دەکا. شێوازی ئاکاریی لە زانستی سیاسەتدا لەسەر بنەمای جیاوازی دانان لە نێوان تیور و ڕا و زانیاری راوەستاوە. بە بێ زانیاری ڕا و بۆچوونەکان پووك و بێ ئاکامن. بە بێ دەست کەوتنی زانیاری ناتوانرێ سەبارەت بە راستەقینە بوونی تیوریەکان (نظریە) قسە بکرێ. بە بێ تیوری هەر لەگەڵ کۆمەڵێك زانیاری پرش و بڵاو بەرەو روو دەبین. چەمکە نەزەرییەکان دەبێ تا ئەو رادە کە دەکرێ روون و شەفاف بن. زمانی زانستی دەبێ بە پێچەوانەی زمانی ئاخفتن دوور لە ئالۆزی و دەبێ شەفاف بن. لەبەر ئەوی کە هەر وشە و چەمکێك مانای زۆری هەیە، دەبێ مانای مەبەست بە تەواوی روون و دیاری کراو بێ، مەبەستی نیهایی زانستی سیاسەت دەست پێ راگەیشتن بە کۆمەڵێك مەرجی گشتی و گشتگرە کە بتوانی پێوەندی نەپساوە نێوان دیاردەکانی سیاسی روون بکاتەوە. رووداوەکان یان ئەو هەلس وکەوتانە کە لە ژیانی سیاسی دا پەیتا پەیتا دووپات دەبنەوە وەك دەنگدان، دەست نیشان کردنی حزبە جوراوجورەکان، رووداني شەڕەکان، هەڵبژاردنەکان، ریفورمی سیاسی، هاوپەیمانیەکان و...) دەبێ بە پێی مەرجی گشتی بۆ روونکردنەوە و تێ گەیاندن بن. دیارە ئەو زانستانە لەگەڵ دیاردەکانی پێکەوە لکاو و ئالۆزی سروشتی یان کۆمەڵایەتی رووبەروون، هیچ کاتێك ناتوانن هەموو فاکتەرەکانی گورانی کاریگەر بدۆزنەوە و بە روونی و بە دڵنیایی

بەیانیان بکەن. بەڵام بە بۆچوونی ئاکارخوازان ئەم قسە بەو مانا نیە کە نـاتوانرێ هـیچ جـورە رێك و پێکی یەك لە رەوتی کاروباری کۆمەڵایەتی و سیاسی دا بدۆزرێتەوە.

لە رووی ناوەڕکی لێکۆڵینەوەکان، روانگەی خەڵك سـەبارەت بـە سیاسـەت و حکومـەت و شێوەی دەربڕینی ئەو روانگەیانە دیراسەیان لەسەر دەکـرێ. هاتنـە کایـەی میتـودی راپرسـیە گشتیەکان یارمەتی ئەم بەشـەی لـە زانسـت داوە. شـی کردنـەوەی روانـین و هـەڵس وکەوتـە سیاسیەکانی خەڵکی ئاسایی لە شێوە جورەجورەکانی بەشداری سیاسی بابـەتی سـەرەکی ئـەم لقە لە زانستی سیاسی بوە. بابەتی لقی ئاکاری سیاسی بۆ خۆی لە چەند چڵ پێك دێ:

١ـ کۆمەڵ گرویی سیاسی [جامعە پـذیری سیاسی ]ـ کۆمەڵ گرویـی سیاسـی لـە رێگـای کانالی کۆمەڵ گرویـی سـەرەتاییەوە وەك بنەماڵـە و قوتابخانـە و کانـالی دوایـن وەك پیـشە، گرووپی هاورێ یان و حیزب دێتە ئارا. لە پروسەی کۆمەڵ گرویی یەکەدا روانینە سـەرەکیەکان و تا رادەیەك سەقامگیری تاکەکان سـەبارەت بـە دیـاردە گـەلێك وەك دەسـەلات، دەولـەت و سیاسەت دەردەکەون.

٢ـ فەرهەنگ و کولتووری سیاسـی ـ کولتـووری سیاسـی و کۆمـەڵ گرویـی سیاسـی دوو روخساری یەك راستین. بەڵام توێژینـەوەی جیـاواز دەخـوازن. بـاس لـە جورەکـانی کولتـووری سیاسی و پێوەندیی لەگەڵ دامەزراندنی دێموکراسی و سەقامگیری سیاسیش، یەکێك لە باسـە گرینگەکانی ئەم لقەیە. رەش بینی و بەد گومانی یان خوش بینی و باوەر بـە کەسانی دیکـە وەك توخمـە سـەرەکیەکانی کولتـووری سیاسـی لـە چارەنووسـی دێموکراسـیەکاندا نەخـشی کاریگەریان هەیە. هەرچۆنێك بێ کولتووری سیاسی هەر بەرهەمی مێژوو و کۆمـەڵ گرویـی و فێرکردن نیە، بەڵکوو سیستمە سیاسـیەکانیش لە پێکهاتنی کولتووری سیاسی دا کاریگـەریان هەیە.

٣ـ بەشداری و رکەبەری سیاسی بە تایبەت لە چوارچێوەی حزبەکان و هەڵبژاردندا لە بەشـە سەرەکیەکانی بابەتی هەڵس وکەوتی سیاسی یە.

هۆکار و پێوەرگەلی جۆراوجۆر وەك تـەمەن، رەگـەز، پێکهاتـەی چـینایەتی، رادەی داهـات، خوێندەواری، شارنشینی و ... لەسەر رادەی بەشداری لە سیاسەتدا بە گشتی و لەسـەر مـەیلی حیزبایەتی تاکەکان لە هەڵبژاردنەکاندا بە تایبـەتی کاریگەریان هەیە. بەم پێیـە لـەم روانینـەدا

لەسەر کۆکردنەوەی زانیاری و ئاگاداری بەربلاو سەبارەت بە هەڵس و کەوتە سیاسی و هەڵبژاردنیەکانی تاکەکان زۆر پێی لەسەردا دەگیرێ.

## لێکدانەوەی سیستەمەکان

شیواز و میتۆدی لێکدانەوی سیستەمەکان سەبارت بە سیستمە سیاسیەکان لە دەیەی ١٩٥٠و لە رۆژئاوادا بوو بە باو و مەبەستەکەی پێشکەشکردنی بۆچوونێکی گشتی بۆ لێکدانەوەی هەموو لایەنەکانی ژیانی سیاسی لە هەموو جورە سیستەمەکی سیاسی دا چ کۆن و چ نوێ و چ روو لە گەشە و چ پێشکەوتوو بووبێ. لێکدانەوەی سیستەمەکان وەك میتۆدێکی زانستی، واقیعی و سەلمێنەر کەوتە بەرباس و مەبەستەکەی بەس روونکردنەوە و بەیان کردنی میتودی کرداری سیستمە سیاسیەکان بوو. کێشەی سەرەکی لە لێکدانەوەی سیستمەگەلی سیاسی دا شێوەی پێکهاتن، پتەو بوون، درێژە کێشان، گووران و لە نێو چوونی رێژیمگەلی سیاسی یە و لەم روانگەوە سیاسەت لە گشت بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دا بوونی هەیە و لەم رووەوە بۆ لێ تێگەیشتنی وردتری سیستمی سیاسی دەبێ بە جورێك ئالۆزیەکانی شاراوە لە پێوەندیەکانی سیاسەتدا لەگەڵ باقی ژیانی کۆمەڵایەتی سانا بکرێنەوە.

کەوابوو دەبێ مەیدانی سیاسەت و حکومەت لە ماباقی مەیدانەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بە روونی جیا بکرێتەوە، تاکو دەرەتانی دیراسەی وردیان برەخسێ. سیستمی سیاسیە مانای بیاڤی سیاسەت و حکومەت، سیستمێکەکە لە دەوروبەری خۆی زانیاری وەردەگرێ، ئەوان بە هۆی پێکهاتە سیاسیەکان تەتەڵە و پاك و پوختی دەکا و پاشان وەك بەرهەم یان سیاسەت بۆ نێو کۆمەڵ دەی گوێزێتەوە، لە نیهایەتدا کاریگەری و دەرئەنجامی بەرهەمەکان یان سیاستەکان بە هۆی پروسەگەلی کۆمەڵایەتی ئالۆز دەدرێتەوە بە نێوخۆی سیستمی سیاسی و دەرخوارد دەدرێتەوە. داخوازیەکان و پشتیوانیەکان دەبنە گرینگترین زانیاری و ئامارەکان و بەرهەمەکانیش بە شێوەی بریارگەلی کە دەبێ بەرێوە بچن [ الزام آوار] خۆ دەردەخەن. ئەو داخوازیانە کە دێنە نێو سیستم لەوانەیە سەرچاوەگەلی جۆراوجۆریان بە پێی سیستمی سیاسی بێ، لەژێر کاریگەری تێروانینی لێکدانەوەی سیستمەکان، چەمکی سیستمی سیاسی برەوی زۆری پەیدا کرد و لە زۆر بارەوە جێی چەمکی دەوڵەت بەمانا گشتیەکەی گرتەوە. لایەنگرانی ئەم چەمکە پێ یان وایە کە مانای وشەی مێژووی دەوڵەت لە هەموو زمانەکاندا زۆر

ئاڵۆز،تارماویی و چەند لایەیە. لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی ڕا و بۆچوون سەبارەت بە بابەتی زانستی سیاسەت وەك دیراسەی دەوڵەت، دەسەلات، بڕیاردان،دەسەلاتداریەتی، بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگا و... بۆتە هۆی ناڕوونی بەربڵاو لە ناوەرۆکی زانستی سیاسەت دا. کەوابوو هەڵبژاردنی چەمکی نویێ سیستمی سیاسی کە پێشینەی تەماوی نەبێ تا رادەیەکی زۆر لە ناڕوونی کەم دەکاتەوە. لەگەڵ ئەمەش سەبارەت بەمە کە ئایا سیستمی سیاسی سیستێمیکی سروشتی، لەپێشدا دیاری کراو و واقیعی یە و یان دەرئەنجامی مانای جیهانی سیاسەت بۆ سەرو سامان دان بە دیراسەی خۆیەتی، جیاوازی بیروڕا زۆرە.

## تیوری بڕیاردان

هەندێك زانستی سیاسەت بە زانستی بڕیاردان دادەنێن و دەست دەکەن بە تیوری دانان سەبارەت بە بڕیاردان. بڕیاردان بە مانای دەست چین کردن لە نێوان چەند ئیمکاندایە. لە هەر بڕیاردانێکدا،بڕیاردەرێك هەیە کە بە شێوەی ئاوەزمەندانە دەرئەنجامەکانی بڕیارەکەی خۆی هەڵ دەسەنگێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاردان لە ئاستی دەوڵەتدا دەرئەنجامی گشتی بۆ گشت کۆمەڵگا بە دواوە دەبێ. هەر بڕیاردەرێك دەبێ لە پێشدا ئەو کێشە کە دەبێ بڕیاری لەسەر بدا، لێی ئاگادار بێ، زانیاریەکانی خۆی سەبارەت بەو کێشەشەن و کەووتاوتوو بکا. مەبەستەکانی خۆی لە بەرچاو بگرێ، ڕێگە جۆراوجۆرەکانی بڕیاردان دەست نیشان و هەڵیان سەنگێنێ و سەرئەنجام بە ئاکام بگا و بڕیار بدات. بڕیاردان لە ژێر کاریگەری هۆکار و زەمینەی جۆراوجۆردایە، ناوەرۆکی ئەو بابەتە کە دەبێ بڕیاری لەسەر بدرێ، فەزای دەرەکی (چ کۆمەڵگای نێوخۆی یان سیستمی نێونەتەوەیی) فەزایی ناوخۆیی (واتا چوارچێوەی دەوڵەت)، کەسایەتی بڕیاردەر، بڕیاراتی کەسانی دیکە و هۆکاری دیکە لەسەر بڕیاردانی سیاسی لە هەر حاڵەتێکدا کاریگەری دەبێ. هەروەها بڕیاردان لە هەلومەرجی ئاسایی یان قەیرانی دا وەك یەك نیە. هەبوونی کاتی پێویست بۆ بڕیاردان لەسەر رادەی هەڵسەنگاندن و تاوتوو کردنەکەیدا کاریگەری دەبێ.لەبەر ئەوەی کە گەوهەری سیاسەت لە روانگەی بڕیاردانەوەیە، جوری سیاسەتیش بە پێی جوری بڕیاردان (بە شێوەی دیکتاتوری یان راوێژ، بەتاك یان بە کۆ...) جۆراوجۆری دەبێ. ماکیاولی دەیگوت کە ئەو حاکمانە کە ناتوانن بڕیاری روون بدەن دەوڵەتەکەیان لەرزوك دەکەن، لە هەلومەرجی شورش دا رێبەران و دەسەلات بەدەستان تووشی

بێ بڕیاری یان بێ توانایی بۆ وەرگرتنی بڕیاری یەك لاكەرەوە دەبن. لە سیاسەتیش دا وەك ژیانی تایبەتی، هەموو شتێك بەستراوەتەوە بە بڕیاردان.

تیۆری بڕیاردان بۆ خۆی فرە چەشنی بەسەرداهاتوە. لە نموونەی كلاسیكی بڕیارداندا، بڕیاردەران پراكماتیسم گەلێكی خاوەن بیرن كە بە شێوەیەكی ژیرانە فەزای ناوە و دەرەوەی خۆیان و هۆكارە جیاوازەكان تاوتوو دەكەن، مەبەستی روون و دیاری كراویان هەیە، قازانج و زیانی بڕیاردانی خۆیان بە وردی لێك دەدەنەوە، لە ئاكامدا ژیرانەترین رێگە هەڵ دەبژێردرن.

بەلەبەرچاو گرتنی ئەو كێشە كە ئیمكانی وەدیهاتنی ئاوا نموونەیەكی بە تەواوی ئاوەزمەندانە و هەڵسەنگیندراو لە دونیای كردەودا مومكین نیە، لە نموونەكانی دیكەدا لەسەر كاریگەری هۆكارەكانی دوور لە ئاوەزیش پێ داگیراوە. بۆ نموونە نەخشی رێ و رەسم و نەریتە باوەكان لەهەر زەمینەیەكدا لە بڕیاردانەكاندا نابێ لەبەرچاو نەگیرێ. نەریتەكان و پێكهاتەگەلی باو لە هەر زەمینەیەكدا و وەدەست هێنانی زانیاری سەبارەت بە كێشەكان بەرتەسك دەكەن، ژمارەی هەڵبژاردەكانی [گزینە] مومكین دا دەبەزێنی و كەمی دەكاتەوە و هەروەها ئیمكانی بەرێوەبردنی بڕیارە دراوەكانیش تووشی تەنگەژە دەكەن. كەوابوو لە جیاتی پێداگرتن لەسەر تاكی بڕیاردەر، دەبێ لەسەر پێكهاتەی بڕیاردان پێی دا بگیردرێ. بە واتایەكی دیكە بڕیاردەر، بە تەواوەتی ئازاد نیە،بەڵكوو لە چوارچێوەی پێكهاتەیەكدا هەل دەسوورێ. لە روانگە گەلێكی دیكەدا بڕیاردانەكان لە نیهایەتدا بە ئاكامی خەبات و ململانیی هێزە سیاسیەكان دەژمیردرێن. كاتێك كە ژمارەیەك لە هێزە چالاكەكان لە ئارادابن، كێبەركێ و مشتومڕی نێوانیان لە سەر قازانج و بەرژەوەندی،دەبێتە هۆی بڕیارگەلێكی تەوافوقی كە لەوانەبوو كە لە سەرەتادا هیچكامیان پێ رازی نەبوایەتن. كەوابوو لە بڕیاردانە سیاسیەكاندا دەبێ نەخشی ژمارەی بەشداران، سەنگینی و گرینگی هەركام، نەخشی بیروڕای گشتی، راگەیەنەكان و گرووپەكانی گوشار و... لەبەرچاو بگیردرێ. لەهەر بارودۆخێكدا نابێ نەخشی كەسایەتی بڕیاردەر لەبەرچاو نەگیرێ. كەسایەتیەكانی بەهێزتر لە بڕیارداندا كەمتر دەكەونە ژێر كاریگەری دەوروبەر، پێكهاتەكان، یان هێزە سیاسیەكان، بەو رادە كەسایەتی بڕیاردەر لاوازتر بێ نەخشی ئەو هۆیانە دیارتر دەبێ، بەم جۆرە دەتوانین سیاسەتوانانی گەورە لە دەسەڵاتدارانی نێوەنجی جیا بكەینەوە.

هەندێك لە نووسەران بە تایبەت لە بواریَ سیاسەتی دەرەوەدا، وێنای بڕیاردەران لـە دەور و بەریان بە کاریگەرتر لە خودی راستی دەرەکی دەزانن. دیاردە لـەم بـوارەدا گـرفتی پێناسـەی عەینیەت و زیهنیەت دەمینێتەوە. هەر بڕیاردەرێك لانی کەم لەسەرەتادا هۆکارەکانی کاریگەر لەسەر کردەوەی خۆی دا واقیعی دەبینێ. هەندێك لـە نووسـەران لـە نێـوان بڕیـاراتی ژیرانـە، ناژیرانە، دژی ئاوەز و زۆرژیرانە جیاوازی دادەنێن. بڕیاردەران زۆرجار لـە بـارۆدوخی ئـالۆز و تەنگانەدا لە وردبینی ژیرانە دوور دەکەنەوە و دەکەنـە ژێـر کاریگـەری هۆکـاری نادیـار. بـە شێوەی گشتی تر هەر بڕیاردەرێك دەکەوێتە ژێر کاریگەری کۆمەلێك پێـوەر وەك تایبەتمەنـدی کەسایەتی ـ دەروونی خۆی چ خۆویست [ئاگاهانە] چ خۆنەویـست [نائاگاهانـە] (بـۆ نموونـە هەست بە بچووکی کردن [حقـارت] نازایـەتی، دەسـەڵاتخوازی، خۆشەویـستی خـوازی و... )، مەیگەلی ئایدولۆژی، و هۆکارەکانی کۆمەلایەتی (بۆ نموونە چینایەتی، رەگـەزی، تەمـەنی و فێرکاری). هەندێك گۆسپێش دەبنە هۆی ئەوە کە بڕیاردەران نەتوانن بە پەلە بڕیـار بـدەن. بـۆ نموونە کەوتنە نێو فشارگەلی دژبەیەك دەبنە کۆسپ لە رێگای بڕیاردانی بە پەلـە. کاتێـك لـە نێوان داخوازەکانی بـیروڕای گـشتی، گرووپـەکانی فـشار، حزبـەکان، کۆمـەلانی خـەڵك و... هەماهەنگی نەبیَ، بڕیاردەرەکان دەکەونە ژێر کاریگەری پالەپەسـتو دژ بەیەکـەکان. لەوانەیـە تاکی بڕیاردەر تووشی دژایەتی لە نێوان مەیلی دەروونی و ئاشکرای خۆیدا بیَ. بۆیە بڕیـاردان لە بارودۆخی تەنگانەدا دژوارترە، لەبەر ئەوەی بڕیاردەر لەگەڵ کۆمەلێك هۆکـار و ئاسـتەنگی دەست و پیَ گیر رووبەروو دەبیَ وەك: پێویستی بڕیـاردان لـە بـارودۆخی تـرس و دلـەراوکی، پێویستی بڕیاردان سەبارەت بە چـەند کێـشە هاوکـات، نـەبوونی ئاگـاداری پێویـست لەسـەر کێشەکان، فشارگەلی دژبەیەکی گرووپـەکان و بەرژەوەنـدی جۆراوجـۆر، نـاروونی لـە بـیروڕای گشتی دا و گورانی بەپەلە و ترس لە نەدانی بڕیار و لە دەست چوونی هەل.

## تیوری ئالۆویر [مبادلە]

ئەم تیوریە لە زانستی سیاسەتدا لەسەر بنـەمای تیوری ئالۆویر لە ئابووریدا بنیـات نـراوە. لەم رۆانگەوە بەشـێکی سـەرەکی لـە ئـالۆویری کۆمەلایـەتی و سیاسـی دەکـریَ وەك کـردەی ئالۆویری ئاشکرا و نهـێنی نێـوان تاکـەکان لێـك بدرێتـەوە. ئـالوویر یـان گۆرینـەوە کـردەی بازرگانییە دوو لایەنی هەیە و لەوێدا هیندێك شت لەگەڵ هیندێکی دیکە ئـالۆ ویـر دەکـرێن.

ئالووير، كردەوەيەكی ژيرانە و حيساب بۆ كراوە، و لەم رووەوە لەگەڵ كردەی ئەخلاقی (وەك بەخشين و يارمەتی بێ بەرانبەر) لە بنەرەتدا جياوازی هەيە. لە سياسەتدا وەك كردەوەی ئالوويری ئاوەزمەندانە هەر كردەوەيەك بۆ دژكردەوەيەك دێتە كايەوە. تاك لە ياساكان پێرەوی دەكا و چاوەڕوانە وەك هاوڵاتيەكی باش لەگەڵی بجووڵێنەوە. بەڵام بە لاواز كردنی پێوەندی ئالووير پێوەندی دەسەڵات، زاڵ بوون و ئامريەت بەهێز دەبێ. لەراستی دا پێوەندی كۆمەڵايەتی و سياسی نێوان تاكەكان هەر لە پێوەندی ئابووری ـ بازرگانی كڕين و فرۆشتن و ئالوويردا ناسڕێتەوە، بەڵكوو بجێگە لە ئالووير دوو پێوەندی ديكە واتا ئامريەت يان دەسەڵاتداريەتی و پێوەندی ئوگريش لە سياسەتدا كاريگەرن.

پێوەندی ئالووير هەڵگری ئيلمنتكی [عنصر] زۆر بەهێزتر لە ئازادی يە، لەبەر ئەوەی لە ئالوويردا هيچ تيبينی يەكی ئەخلاقی، ميهربانی، و ترس نابێ لە ئارادا بێ. هەر بۆيە بەو رادەيە كە ئالووير لە سياسەتدا زۆرتر پەرە بستينێ، ناوەرۆكی ژيانی سياسی دێموكراتيكتر دەبێ. بە پێچەوانە لە پێوەندی ئامريەت و ئوگری كە هيندێكيان بناخەی حكومەتە دەسەڵاتخواز و ئايدۆلۆژيكەكان پێك دێنن، توخمی [عنصر] ئالوو ير كەمترە.

## تيۆريكانی هەڵبژاردنی ژيرانە

روانين و شێوازگەلی دەست نيشان كردنی ژيرانە لەسەرەتادا ئابووری زانان هێنايانە نێو مەيدانی سياسەت. لەم ڕۆانگەوە هەڵسووڕانی سياسی بە شێوەگەلی ئاقلانە تێ دەكۆشن تا باشترين كەرەسە بۆ بە دەست هێنانی ئامانجەكانی خۆيان بەكار بێنن. لەم سونگەوە كردەوەی سياسی، لە بنەرەتدا كردەوەيەكی ئاوەزمەندانە و بەمەبەستە. شێوازگەلی دەست نيشان كردنی ئاوەزمەندانە لە سياسەتدا لە وردە ئابووری نئو كلاسيك وەرگيراوە. لەم روانگەوە مرۆڤەكان وەك هەڵسووراوانی ئابووری و سياسی بە شوين شتومەكی جێی پەسەندی خۆيانن و تێ دەكۆشن سوودمەندی و بەكەڵكيەكەی زۆرتر بكەن. ديارە قازانج و مەبەستەكە هەر خۆدی ياری كەرەكان بۆ خۆيان دياری دەكەن. گرينگترين رەخنەيەك كە لەسەر ئەم ڕۆانينە هەيە، ئەوەيە كە سياسەت هەر لە كردارگەلی ئاوەزمەندانەی مەبەستدار [هدفمند] كورت ناكرێتەوە، بەڵكوو هەروەك كۆمەڵناسی ئاڵمانی ماكس وبر روونی كردووتەوە ياريكەرانی سياسی، بجێگە لە كردەوەی عەقلانی مەبەست دار، كرداری بەهايی، كرداری خۆشەويستانە [عاطفی] و

کرداری نەریتیش بەرێوەدەبەن. زاڵ بوونی هەرکام لەم کردەوانە وەك کرداری گشتی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بیچمێکی تایبەت لە ژیان و سیستمی سیاسی (بەشوین یەکدا: سیاسەتی یاسایی، بووروکراتیك، سیاسەتی کاریزماتیك و سیاسەتی باوك سالارانە یان نەریتی). روانینەکان و شێوازگەلی دەست نیشان کردنی ئاوەزمەندانە چەند جورن بۆ نموونە: تیوری دەست نیشان کردنی گشتی،تیوری گەمەکان و نموونەگەلی فەزایی.

## تێڕوانینی دەست نیشانکردنی گشتی

تێڕوانینی دەست نیشانکردنی گشتی سەبارەت بە دابین کردنی هەموو ئەو شتانەیە کە هەموو خەڵك دەیانهەوێ. خێری داوا کراو بەم مانایە خێرکی بێ سنوورە، بەم مانا کە کەڵك وەرگرتنی ژمارەیەکی زۆری خەڵك لێی نابێتە هۆی رکەبەری و یان کەڵك وەرگرتنی زۆرتری بەشێك لەم کۆمەڵگا نابێتە هۆی کەم کردنی رادەی کەڵك وەرگرتنی بەشەکەی دیکە. لەگەڵ ئەوەش خێری داواکراو [مطلوب] بەم مانایە ناکرێ دوور بخرێتەوە یان لە نێو ببردرێ. بۆ نموونە ئەمن و ئاسایش نەبۆ وەلانان دەبن و نە کەڵك وەرگرتنی دەبێتە هۆی رکەبەری. ئیفلاتوونیش خێرەکان دەکا بە دوو گرووپ: خێرەکانی بەرتەسك و سنووردار وەك دارایی، دەسەڵات و گەورەیی و خێرەکانی بێ سنووریش وەك جوانی، زانایی و دینداری، لەم روانگەوە بە بێ بوونی دەوڵەت خێرە بێ سنوور و گشتیەکان دابین نابن. کەوابوو بوونی حکومەت خۆی بە قازانجی هەموانە. خێر و خزمەتگوزاریە گشتیەکان هەر حکومەت دابینی دەکا و دیارە بناخەی ئەم روانگەیە دەگەرێتەوە بۆ بۆچوونی ئەوانەی بروایان بە رەسەنایەتی قازانج [اصالت فایدە] (بەتایبەت جرمی بنتهام) هەبوو کە ئامانجی نیهایی حکومەتیان دابین کردنی قازانجەکان و و خزمەتگوزاری گشتی دەزانی. هەر بوونی حکومەت بۆ خۆی خێر و خزمەتێکی گشتی یە. ئەرکی سەرەکی حکومەت دابین کردنی ئەوپەڕی شادی گونجاو بۆ زۆرینەی خەلکە، لەم رووە بە بۆچوونی بنتهام باشترین دەوڵەت، دەوڵەتی پڕکار و کەم مەسرەفە.

## تیوری گەمەکان (یاریەکان)

تیوری گەمەکان لە بناخەدا بۆ روونکردنەوە و لێکدانەوەی بڕیارەکان خراوەتە مەیدان و بەشێك لە تێڕوانینی گشتی دەست نیشان کردنی ئاوەزمەندانە بە حیساب دێ. بەم پێیە

کردەکان و بڕیارات کەرەسەگەلێکن بۆ گەیشتن بە ئامانجە دیاری کراوەکان. تیوری گەمەکان لە کاتێکدا بەرێوە دەچێ کە دوویان چەند یارکەر دەست بکەن بە بڕیاردان و دەست نیشان کردنی [هەڵبژاردن] و بڕیارەکانیان لەگەڵ یەکتر لە پێوەندیدان. ئەم هەڵبژاردنە کە هەرکام لە یاریکەران لە بەر دەستیاندایە و دەرئەنجامی هەر کۆمەڵە لە هەڵبژاردنەکان لەم تیوریەدا دەکەوێتە بەر لێکۆڵینەوە.

هەر یاریکەرێك هەڵبژاردەیەك دەست نیشان دەکا کە قازانج یان سەرکەوتنی ئەو بگەیەنێتە لانی زۆری مومکین. تیوری یاریەکان لە بواری دیراسەی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی دا کەڵکی زۆری لێ وەردەگیرێ.

لە بواری دیراسەی سیاسی لە سەرەتا بە تایبەت لە زەمینەی شێوەی گەلی بڕیاردان کەڵکی لێ وەردەگیرا. تێڕوانینی یاریەکان لەسەر ئەم گۆمانە راوەستاوە کە لە نێوان یاریەکان و دەرفەتە سیاسیەکان لێکچوونێکی بنەڕتی بوونی هەیە. بەواتایەکی دیکە نێوان دەرفەتەکانی یاری و دەرفەتە جیدیەکان لە رووی پێکهاتەوە جیاوازییان نیە.

لە مێژە ژیانی سیاسی یان بە یاری شەترەنج شوبهاندوە. نێوان یاریەکان و هەل ومەرجی ژیانی راستەقینە لە چەند روانگەوە لێکچوون هەیە. لە هەردوو بوارەکەدا دەرەتانی خەڵەتاندن، سەر لێ شێواندن، خۆ هەڵکێشان، تانە و تەشەر و هەرەشە هەیە، لە هەردوولا قازانج و زیان و بردنەوە و دۆڕاندن لە ئارادایە و لەم رووە وە هەردوو پێویستیان بە تێ فکرین، حیساب کردن و بڕیاردان هەیە. بردنەوە و دوڕاندنی یاریگەران هەم بە کردار و جۆڵانەودکانی خۆیان و هەم بە جوڵەکانی بەرانبەرەکەیان پێوەندی هەیە، لە هەردوو جورەکەدا یاری کەران لەگەڵ کەم بوون یان هەر نەبوونی زانیاری پێویست و نەبوونی دڵنیایی تەواو دەست بە بڕیاردان دەکەن. لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی سیاسی لە دوورە دیمەنی یاریەکانەوە دەکرێ موتالا بکرێ: پێوەندی دەوڵەت لەگەڵ نەیارانی و لەگەڵ خەڵك، پێوەندی رێبەرانی سیاسی لەگەڵ یەکتر، رێکەوتن و هاوپەیمانی حزبە سیاسیەکان، پێوەندی دەوڵەتەکان لە بارۆدوخی شەڕ یان ئاشتی و زۆر هەل و مەرجی دیکەدا دەکرێ وەك یاری چاوی لێ بکرێ. لە هەمووی ئەم حاڵەتانەدا وەك یاریەکان، یاریکەری سیاسی لە دەرەتانەکان و جم و جوڵی یاریکەرانی دیکە زانیاری تەواویان لەبەر دەستدا نیە و بڕیاردانەکان بەستراوەتەوە بە هەل و مەرجی عەینی لە ئارادا و هەل ومەرجی بە هەڵکەوتی داهاتوو هەروەها مەیلی هزری یاریکەرانی دیکەو... و لە نیهایەتدا لەسەر بنەمای

لەبەرچاو گرتنی ئەگەرەکان دەچێتە پێش. لە هەر یاریەکدا سەرچاوەکان (دەسەلاتی سیاسی) لە نێوان دوو یان چەند یاریکەردا دابەش دەبێ، هەرکام لە یاریکەران سەرچاوەکەی بۆ گەیشتن بە ئامانجی جێی مەبەست بەکار دێنی و بۆ ئەم مەبەستە ستراتژی گەلێکی تایبەت هەل دەبژێرێ. وا دادەنرێ کە هەموو یاریکەران لە یەك ئاستدا دەجۆلێنەوە و یاسای یاریەکە لەسەر بنەمای نەخش و قورسایی هەر جولەیەك لە یاریدا لەبەرچاو دەگرن. لە سیاسەتدا لەبەرچاو گرتنی یاساکانی یاری لەراستی دا بە مانای لەبەرچاوگرتنی یاساکانی باوە. هەرچەند لە یاریەکاندا خۆهەلکێشان لە ئارادا هەیە، بەلام فێل و خەلەتاندن رێگەی پێ نەدراوە و بە پێچەوانەی یاسایی یاری یە. هەروەها یاری لەگەل بەکارهێنانی زۆر بۆ لە ژێر پێ نانی یاساکان لە بنەرەتدا دژایەتی هەیە. لە یاریەکاندا شارەزایی و لێزانی کە بۆ یاریەکە دەگەرێتەوە، جێی سەرنجە و ماباقی تایبەتمەندیەکانی ناکەسایەتی لەبەرچاو ناگیرێ، یاسای یاری تا دوایی نەگۆرە و دەستکاری ناکرێ. هەروەها رادەی کەلك وەرگرتنی یاریکەران لە سەرچاوەی یاری لە سەرەتا تا دوایی یاری دیاری کراوە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو تایبەتمەندیانە کە بۆ یاریەکان وتران، هێندێك رەخنە رووی کردوەتە نەخشی تیوری یاریەکان لە سیاسەتدا وەك:

١ـ لە سیاسەتدا هەموو یارکەران لە بارودۆخی یەکسان دا ناجوولێنەوە.

٢ـ لە سیاسەتدا هەم دەرەتانی درو [بلوف] کردن و هەم دەرتانی فێل و تەلەکە هەیە.

٣ـ لە سیاسەتدا بە پێچەوانەی یاریەکان کەلك وەرگرتن لە زۆر نەخشی سەرەکی هەیە.

٤ـ لەوانەیە خودی یاسای یاری لە سیاسەتدا پێشل بکرێ.

٥ـ تایبەتمەندیەکانی کەسایەتی کە پێوەندی بە یاریەوە نەبێ لە سیاسەتدا زۆرجار بایەخ و پێوەندی پەیدا دەکا.

٦ـ یاسای گەمە لەوانەیە لە سیاسەتدا لە کاتی یاری دا بگۆردرێ.

٧ـ سەرچاوەی یاریکەران لەوانەیە لە کاتی یاری [سیاسەت] دا بە پێچەوانەی چاوەروانی زیاد یان کەم بکات.

٨ـ یاریکەرانی سیاسی لەوانەیە لە یاسای یاری زانیاری تەواویان نەبێ.

## نموونەکانی فەزایی

تیروانینی نموونەکانی فەزایی بەشێك لە تێروانینی گشتی دەست نیشان کردنی ئەقلانی لە لێکدانەوەی هەڵس وکەوتە سیاسیەکاندایە. لەم تێروانینە گۆمان لەسەر کەش و هەوای سیاسی (فضا) یان ئایدولۆژیکی تایبەتە کە لەودا هەموو یاریکەران و بەشداران یەکتر دەناسنەوە و لەو کەش و هەوادا ئیش دەکەن. بۆ نموونە دەوترێ کە دەنگەکان بە شێوەیەکی زیهنی مەودای خۆیان لەگەڵ کاندیداکانی هەڵبژاردن هەڵ دەسەنگێنن‌و هەر دەنگدەرێك بە نزیکترین کاندید بە خۆی دەنگ دەدا و یان بە کاندیدایەك دەنگ دەدات کە لە مەودایەکی دوورتردایە، بەلاّم ئەگەری سەرکەوتنی زۆرترە. فەزای سیاسی یان ئایدولۆژیکی جیی سەرنج بە خۆی چەمکی ئایدولۆژیای باو وەك چەپ و راست، ئایینی و لائیك، لیبرال و رادیکاڵ و.... پێك دێ و هەرکەس خۆی لە فەزایەکدا دادەنێ. بە پێی بەڵگە هێنانەوەی تیوریسیینەکانی نموونەگەلی فەزایی هەروەك لە بازاردا، ئەو شوینانە [دوکان] کە لە سەنتەردا هەڵکەوتوون، زۆرترین مشتەریان هەیە، لە بازاری سیاسەتیش دا ژمارەیەکی زۆرتر لە یاریکەران و دەنگدەران لەگەڵ ئایدولۆژیای نیوبەند هەست بە مەودای نزیکتر دەکەن. لەو دیراسانەدا کە لەم دوایانەدا کراون تیوری فەزایی چەند روخسارە [چند بُعدی] بۆ شی کردنەوەی هەڵس وکەوتی سیاسی هاتووتە گۆر، لەگەڵ ئەوەش لە هەڵسەنگاندنی ئەم تێروانینەدا تەئکید دەکرێ کە تەنیا بۆ لێکدانەوەی هەڵس و کەوتی گرووپە بچووکەکان دەکرێ کەڵکی لێ وەربگیردرێ.

## تیوری یەکگرتن ئیئتیلاف

تیوری یەکگرتن وەك بەشێك لە تیوری یاریەکان سەبارەت بە پروسەی بڕیاردان لە لایەن دەستەیەك لە یاریکەران (زیاتر لە دوو یاریکەر)ە کە یەکگرتنیان بۆ دانی بڕیارێکی تایبەت پێویست و بەسە. پێکهێنانی ئیئتیلاف ئاکامی بڕیاردانی یاریکەرانێکە بە شێوەیەکی ئەقلانی بە لێکدانەوە و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان هەڵ دەستن و تێ دەکۆشن بیگەینە لانی زۆری. شیوەی یەکگرتنە سیاسیەکان بە کەڵك وەرگرتن لە نموونەگەلی ژمیریاری و بەتایبەت بە کەڵك وەرگرتن لە تیوری یاریەکانی چەند کەسە لێك دەدرێنەوە.

هەروەك بینیمان تیوری یاریەکان لەسەر بنەمای کرداری ئەقلانی یاریکەران، ئاکامی بردنەوە و دۆراندنی یاری روون دەکاتەوە. تیوری ئیئتیلاف لە بناخەدا پەیجۆری ناسینی یەکگرتنی سەرکەوتووی نێوان کومەڵێك پێوەندی نێوان یاریکەرانە. لەسەر بناخەی گومانی کردەی ئەقلانی یاریکەران، لە نێوان یەکگرتنی جوراجۆر، یەکگرتنێك شانسی پێکهاتنی زۆرتری هەیە کە بەش یان قازانجی هەموو ئەندامانی بگەیەنیتە لانی زۆر. (دیارە لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ بەشێك کەهەرکام لەوانە لە یەکگرتنەکانی دیکەدا بەدەستی بێنن). بۆ پێکهێنانی ئیئتیلاف چەند مەرجێك لە پێشدا پیویستە هەبێ: لانی کەم دەبێ سێ یاریکەر لە ئارادا بن، قورسایی دەنگی هەمووان وەك یەك بن و زۆرینە یاسای بڕیاردان بێ، بهای بردنەوە یان ئەو بەشەی کە هەموو براوەکان لە ئیئتیلافدا بەدەستی دێنن، دەبێ لەگەڵ بها یان نرخی دۆڕانی هەموو دوراوەکان لە حاڵەتی پێکنەهاتنی ئیئتیلافدا یەکسان بێ، نرخی بەشی هەر یاریکەرێك لە هەموو ئیئتیلافێك ئەگەر دامەزری یەکسان بێ و بەشێك لە هەر یاریکەر دەستی دەکەوێ هەر لە ئاکامی ئیئتیلاف بێ، بە لەبەرچاو گرتنی ئەم مەرجانە لە پێوەندی لەگەڵ پێکهاتنی ئیئتیلافە سەرکەوتوەکان تیوری گەلەلێکیان لێ دەردەکەوێ. باوترین تیوریك کە لەم بارەوە خراوەتە روو ئەوەیە کە لەوەها بارودۆخێکدا یەکگرتنی لانی کەم یان یەکگرتنی کامیل، واتا یەکگرتنێك پێك دێ کە زیاتر لەو رادە پێویستە ئەندامێ نەبێ. لەگەڵ ئەوەش ئەم تیورە بە هۆی زانیاریە ئەزموونیەکان سەبارەت بە زۆر لە یەکگرتنەکان بە تەواوی تەیید نەکراوە. لە ئاکامدا تیورگەلێکی دیکە وەك تیورگەلی جیی باوەڕ (معتبر) خراونەتە روو. بە پێی ئەم تیوریانە یاریکەران خوازیاری چوونە نێو جورە یەکگرتنێکن کە رادەی رێکنەکەوتنی لە نێوانیان دا بگاتە لانی کەمی خۆی. بە واتایەکی دیکە پێکهاتنی ئەو بیچمە لە ئیئتیلافە

براوەکان ئەگەری ئەوەی هەیە کە دژایەتی بەرژەوەندیەکان لە نێوان یاریکەران دا بگاتە لانی کەمی خۆی یان مەودای نێوان هەڵوێستەکانیان بگاتە لانی کەم.

## تیروانینی سیبرنتیك

سیبرنتیك یان زانستی پێوەندییەکان و کونترول وەك تیروانینیك لە زانستەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی بە بڵاوکردنەوەی کتێبی کلاسیکی نوربرت وانیر لە ژێر ناوی سیبرنتیك: یان کونترول و پێوەندییەکان لە ئاژەڵ و مەکاینین لە ساڵی ١٩٤٨ گەشەی سەند. بنەمای تێروانینی سیبرنتیکی مێشکی مرۆڤە کە وەك سیستمێکی دەروونگیر کومەڵێك کونترول و پێوەندی و زانیاری لە خۆ دەگرێت و کرداری بە مەبەست بەرێوە دەبات: نرخی سیبرنتیك لە لەشناسی دا physiologi بوو بە هۆی تەئکید لەسەر ئەوە کە سیستمی عەسەبی وەك ئامرازێکی ژمێریار بۆ پێکهێنانی پێوەندی و کۆ کردنەوەی زانیاری‌و کونترۆڵ‌و کردەی بە مەبەست ناسرا. لە نەخشی دەروونناسانەی سیبنتیك ئیمکانی ئالۆزی‌و نەخۆشی دەروونی بە هۆی تێکچوونی لە پرسەی گواستنەوەی زانیاری دا تەئکید کراوە.

هاتنەگۆر و پەرەسەندی کامپیۆترەکان بواری نەخشی سیبرنتیکی پەرە پێ دا. لە نیگای سیبرنتیکی یەوە نێوان کامپیوتری مێشکی مرۆڤ و حکومەت وێکچوونی بنەڕەتی هەیە، بەم مانا کە شێوازی کونترۆڵ و پێوەندی لە هەموو سیستمەکاندا لە لەشی مرۆڤەوە بگرە تا دەگاتە سیستمی سیاسی گشتی یە. لەوەها گۆشە نیگایەکەوە دەتوانرێ تەواوی پێوەندییەکان، زانیاریەکان و کونترۆڵ لە دەروونی سیستمی سیاسی دا بناسرێت. لەم روانگەوە کۆمەڵگا و حکومەتیش پێکهاتەیەکە کە کۆمەڵێك لە پێوەندیە نێوخۆیی ئاڵۆز لەخۆ دەگرێ، بەو جیاوازییە کە پێوەندییەکانی مرۆڤی زۆر ئاڵۆزتر لە پێوەندیە میکانیکیەکانە. لە روانگەیەکی گشتیەوە سیبرنتیك لە نێوان هەموو سیستمەکاندا (وەك لەشی مرۆڤ ،مەکینە و حکومەت) وەیکچوونی بنەڕەتی هەیە. هەر سیستمێك بە هۆی تۆرێکی پێوەندی نێوخۆیی هاوبەستەیی پەیدا دەکا و تۆری پێوەندی دەروون سیستمی هەڵگری پەیام و زانیاریەکانە. هەر سیستمێك لەسەر بنەمای ئەم زانیاریانە و پێوەندیانەی دەروون گێرە، بەم مانا کە هەم بە دەوروبەری خۆی و هەم بە دەرئەنجامەکانی کردەوەی خۆی وەلام دەداتەوە و دژ کردەوە دەنوینێ، زانیاری پێویست کۆ دەکاتەوە و خەزنی دەکا و بەکاری دێنی و خاوەنێ توانایی

فێربوون و نۆژەن کردنەوەی دەروونی یە، ئامرازەکانی سیبرنتیکی میکانیزم گەلێکی ئاڵۆزی بۆ گواستنەوەی راسپاردەکان و زانیاریەکان، خەزن دەکەن، دەیکەنە جەفرە، پلەبەندی دەکەن، تەسجیلی دەکەنو دەی گوزنەوە و لێکی دەدەنەوە. هەر بۆیە لە زانستی سیاسی دا بە شێوەیەکی سیبرنتیکی دەبێ لەسەر پێوەندییەکان کونترۆڵی دەروونی، گواستنەوەی راسپاردەکان، لێکدانەوەی ئامارەکان، خەزنی زانیاریەکان، پێش بینی، دژکردەوە بە داخوازە دەرەوەیەکان، ئەزموون، فێربوون لە هەڵە و ئەزموونەکان، هەڵبژارن لە نێو چەند بابەتی جیاواز، بڕیاردان و بەڕێوەبردنی بڕیارەکان، لێکدانەوە، کود دانان و پلەبەندی زانیاریەکان و... لە لایەن سیستمی سیاسیەوە تەئکید بکرێ.

## تیوری گرووپەکان

لەم روانگەوە یەکەی دیراسە لە سیاسەتدا گرووپەکانن و بۆیە دەبێ بۆ لێکدانەوەی سەرهەڵدان، ئەندامەتی، سەرچاوەکانی دەسەڵات، کردەوە ئامرازەکانی دەسەڵات هەڵکردنیان لەگەڵ یەکتر، هەوڵ بدرێ. یەکی لە پێشرەوانی ئەم تیۆرانینە ماتکورئولسون، کۆمەڵناسی ئەمریکایی بوو: بە بۆچوونی ئەو ئەندامانی گرووپەکان زۆرجار بۆ دابین کردنی ویستەکان و خوشگوزەرانی خۆیان، لە پلەی یەکەم دا بە شێوەی تاك هەنگاوی بۆ هەڵ دەگرن، بەڵام کە سەرکەوتوو نەبوون ئەو کات تێ دەکۆشن لە رێگای بردنە پێشی ئامانج و مەبەستەکانی گرووپەکەی خۆیان قازانجی شەخسی خۆیان دابین بکەن، کەوابوو هەر بەتەنێ بەشداری کردن لە بەرژەوندیەکان نابێتە هۆکارێکی بەکۆمەڵ بەڵکوو نەبوونی توانایی تاك لەکەوتنە شوین قازانجەکانی خۆی بە شێوەی تاك دەکەوێتە هەڵخراندنی کردەی بە کۆمەڵ. لێکدانەوەی نەخشی گرووپەکانی هاوقازانج لە سیاسەتدانانیش دا لە کانگای سەرنجی ئەم تیۆرانینە بوە. لەم روانگەوە سیاسەت و حکومەت شتێك جێگە لە پێکەوە هەڵکردن و پێوەندی گرووپەکانی هاوقازانجی رێکخراوە نیە و سیاسەتەکان لە نیهایەتدا بەرهەمی کردەی وەها گرووپەگەلێکن. کەوابوو گرووپ دەبێتە یەکەیەکی سەرەکی بۆ دیراسە کردن لە زانستی سیاسی دا. پرۆسەی سیاسی لەم روانگەوە بە مانای کۆمەڵێك پێوەندی و کردەی گرووپی یە. بە پێی بۆچوونی رەخنەگران، تیۆرانینی گرووپەکان زیاتر بۆ روونکردنەوەی پرۆسەی حکومەت و بڕیاردان لە

دێموکراسیەکاندا کاریگەری هەیە و ناتوانێ ناخی سیستمە سیاسیەکانی دیکە بە باشی دەربخا و روونی بکاتەوە.

✽ ✽ ✽

بەگشتی لە زانستی سیاسی نوێدا بە مەبەستی شی کردنەوەی دیاردەکانی سیاسی لە شێوازی لێکدانەوەی جۆراوجۆر کەڵك وەردەگرن و هەر ئەم لێکدانەوانە بۆ خۆی بۆەتە هۆی سەرهەڵدانی جورەها تێڕۆانینی نوێ لە زانستی سیاسەتدا. مەنتیقی بنەڕەتی تێروانینەکان و شێوەگەلێك کەلێکمان دایەوە، دەکرێ بە کورتی بە شێوەی خوارەوە باس بکرێ:

١ـ روونکردنەوەی هاوپێوەندی: دۆزینەوەی هاوپێوەندی نێوان دوویان چەند دیاردە یان رووداوی سیاسی لە زۆر لە تێڕۆانینەکانی نوێ لە زانستی سیاسەتدا جێی سەرنجە. بۆ نموونە لە تیوری نویژەنکردنەوەی سیاسی هەوڵ دەدرێ تا لە نێوان دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا (وەك پەرەسەندنی شارنشینی، پێوەندیەکان، فێرکردن و...) لەگەڵ دیاردەکانی پەرەسەندنی سیاسی ( وەك گەشەی بەشداری و کێبەرکێ سیاسی) شوێن پێی هاوپەیوەندی بدوزرێتەوە.

٢ـ روونکردنەوەی نەخش: لەو تێروانینەدا بایەخ بە نەخش دەدەن لەسەر پێوەندی نەخش نێوان بەگەشگەلی سیستمەکان یان هەر سیستمەکان بۆ خۆیان تەئکید دەکرێ. بۆ نموونە کاتێك سیستمی ئابووری ئەرکی تایبەتی خۆی (دابین کردنی سەرچاوەکانی دارایی و گەشەی ئابووری) بەرێوە دەبا، سیستمی سیاسیش دەتوانێ ئەرکی تایبەتی و ئاسایی خۆی (دابین کردنی ئاسایش و ئەمنیەت و خوشگوزەرانی) بەرێوە دەبات.

٣ـ روونکردنەوەی هاندان: ئەم جورە روونکردنەوە و شی کردنەوە لە تێڕۆانینەکانی بڕیاردان و تیوری یاریەکاندا باوە، بەم مانا کە لەواندا لەسەر مەیلە ئەقلانیەکانی کردەوەی سیاسی تەئکید کراوە، لە روانگەیەکی دیکەوە لە دەروونناسی سیاسی دا نەخشی مەیلی نائەقلانی هەڵس و کەوتی سیاسی لێك دەدرێتەوە.

٤ـ روونکردنەوەی مێژوویی: لەم تێڕۆانینەدا لەسەر ڕیستی گشتی بە گۆڕانی ئایدۆلۆژی یان پێگەیشتن [تکامل] لە بوارگەلی جۆراجۆری سیاسەتدا تەئکید دەکرێ. بۆ نموونە گەشەی بوروکراسی و ئەقلانی بوونی سیاسەت لە زۆر لە تیوریەکانی گەشەی سیاسیدا باس دەکرێ.

٥ـ روونکردنەوەی بیچمی ئامانجی: لەم تێروانینەدا بابەتەکانی واقیعی لەگەڵ جۆرێکی نموونەیی هەڵ دەسەنگێندرێ و لادان و کەم وکوڕیەکانی لێك دەدرێتەوە، بۆ نموونە لە تیوری

سیستمەکان، سیستمی سیاسی بە تەواوی کراوە، وەك بیچمی ئامانجی و نموونەیی لەبەرچاو دەگیرێ و سیستمە سیاسیەکانی باو لەگەڵ ئەو بیچمە هەڵ دەسەنگێندرێن.

- ٥ -

## گۆڕانی مێژووی لە چەمکی سیاسەتدا

بە درێژایی مێژوو بیر کردنەوە سەبارەت بە سیاسەت، بە شێوەی جۆراجۆر لێکدراوەتەوە، هەرچەند لەوانەیە بەکردەوە ئەرکی تایبەتیو سەرەکی سیاسەت و حکومەت زۆر گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێ. هەمووکات هەموو دەوڵەتەکان خۆیان لەبەرانبەر پاراستنی نەزم و ئەمنیەت و دابین کردنی شێوەیەك لە دادپەروەری و دیفاع لە وڵات لەبەرانبەر هێزی بێگانەدا بە بەرپرس زانیوە، بەڵام بیرکردنەوەی باو لەهەر چەرخێکدا سەبارەت بە ئامانجی سەرەکی سیاسەت و حکومەت جیاواز بۆە،لە چەرخی پێش لە مۆدیرنیتەدا زۆرجار لەهەموو شوێنێك بۆچوونێکی ئەخلاقی، فەلسەفی و ئایینی لە ئامانجی نیهایی سیاسەت بۆە، لەبەر ئەوە لە نێوان ئەم بوارانەدا جیاکردنەوەیەك نەکرابوو. لە چەرخی مۆدیرنیتەدا بۆچوونی دونیایی، ئابووری و خۆشگوزەرانی خوازی وەك ئامانجی سەرەکی سیاسەت و حکومەت باسی لێکراوە. لەم رووە دەتوانرێ لە تێگەیشتنە جۆراجۆرەکاندا وەك تێگەیشتنی ریئالیستی، ئەخلاقی، فەلسەفی، حقووقی، دینی و... لە سیاسەت دا قسە بکرێ.

## تێگەیشتنی ریالیستی یان سیاسەتی دەسەڵات پارێز

لە تێگەیشتنی ریالیستی دا سیاسەت ئامرازێکە بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش و بەرگری لە ئاژاوە و کێ بەکێی و بێ یاسایی. بەم پێ یەئەرکی زانست و زانایانی سیاسیش ئەوەیە کە ئامۆژگاری دەسەڵاتداران بکەن کە چۆن بناخەکانی دەسەڵاتەکەیان پتەوبکەن و لە رووخانی حکومەتەکەیان بەرگری بکەن بە پێی ئەو بەڵگانە کە سەبارەت بە نەریتی سیاسی ئێران پێش لە ئیسلام لەبەردەست دایە دەردەکەوێ،تێگەیشتنێکی ریالیستی بە مانای سەرەوە بۆە. بەگشتی لەم تێگەیشتنەدا گرینگترین کێشە لە سیاسەت دا پاراستنی دەسەڵاتە، چوونکوو بە بێ دەسەڵات هیچ مەبەستێکی دیکە وەك ئارامی و دادپەروەری دابین نابێ. بەرژەوەندی دەوڵەت لە سەرووی هەموو بەرژەوەندیەکانەو لە کاتێکدا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی دیکەدا

بکەوێتە دژایەتی دەبێ دیفاع و بەرگری لێ بکرێ. ئەگەر لەم ڕۆانگەدا لە پێویستی دابین کردنی عەدالەت و دادپەروەری لە لایەن دەسەلاتدارانەوە قسە دەکرێ و پێ لەسەر ئەوە دادەگیرێ کە دەسەلاتدار دەبێ دادپەروەر بێ و ئەخلاق و ئایین لەبەرچاو بگرێ، مەبەست ئەوە نیە کە بەڕێوەبردنی عەدالەت و مەسایلی ئایینی و ئەخلاقی، ئامانجی نیهایی سیاسەتە و دەبێ بە هەر نرخێك بەڕێوە ببرێن، بەڵکوو لە تێروانینی ڕیالیستی دا، تێگەیشتن لە ئەخلاق و عەدالەت ئامرازیە. دەسەلاتدار دەبێ بۆ پاراستنی خۆی لە حکومەتدا، بۆ پەرپێدانی عەدالەتیش تێ بکوشێ.

لە ڕوانگەی سیاسەت بە مانای پاراستنی دەسەلات هەموو شتێك ئامرازە "و ئامانج کەرەسەکە پاساو دەکا". ئاسایش و ئەمنیەت وەك مەبەستی سیاسەت دەکرێ بە بێ دادپەروەری، ئازادی، خۆشگوزەرانی، و ژیانی ئەخلاقی بوونی هەبێ، بەلام هیچ کام لەمانە بە بێ نەزم و ئەمنیەت نایەنە دی. تەنانەت لەوانەیە پێویستی پاراستنی حکومەت بوونی ڕادەیەك لە هەژاری و زوڵم و ترس و نیگەرانی لە نێو خەڵك دا بێ. بە واتایەکی دیکە ئەخلاقی سیاسی لەگەڵ ئەخلاقی گشتی جیاوازی هەیە. ئەوەی کە لە ڕۆانگەی ئەخلاقی گشتی یەوە شایستەیە، وەك بە جێ گەیاندنی بەڵێن لەوانەیە لە ڕوانگەی ئەخلاقی سیاسیەوە پێویست نەکا دەبێ شایستە بێ، بەڵکوو لەوانەیە ناشایستیش بێ. سیاسەتوان ناتوانێ خۆی بە هەندێك بنەما بالاتر لە بەرژەوەندی یەوە ببەستێتەوە، دەوڵەت لەم ڕوانگەوە دامەزراوێکی ئەخلاقی یان ئابووری یان ئایینی نیە. ئاسراوترین تێگەیشتنی ڕیالیستی لە سیاسەت لە ئەندیشەی نیکولۆ ماکیاولی (١٥٢٧ـ١٤٦٩) بیرمەندی ئیتالیایی دا دەبینرێ کە لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی دا(شەهریار) باس لە تیوری دەسەلاتی سیاسی وەك بنەمای درێژەکێشان و بەردەوامی دەوڵەتەکان دەکا. بە پێی بۆچوونی ئەو دەوڵەت بەرژەوەندی و قازانجی بۆ خۆی و جیا لە هەر بەرژەوەندیکی دیکەی هەیە و حاکم بۆ پاراستنی بەرژەوەندی دەوڵەتەکەی دەبێ تایبەتمەندی شێرانە و ڕێویانەی واتا سەرکوتکردن وفریوکاری لە خۆیدا کۆ بکاتەوە و بێ پسانەوە لەبەرانبەر "چارەنووسی ناسازگار" دا شەڕ بکا. ئەرکی شەهریار [حاکم، پادشا] ئەوەیە کە ئاژاوە و کێ بەکێی بگۆرێ بە نەزم و ئەمنیەت. بۆ ئەم مەبەستە حاکم بۆی هەیە کە لە زۆر و تۆندوتیژی و هەڵخەلەتاندن وفریو کەڵك وەربگرێ.

## تێگەیشتنی فەلسەفی و ئەخلاقی

لەبەرانبەر تێگەیشتنی سەرەوە [تێگەیشتنی ریالیستی] تێگەیشتنی یۆنانی لە سیاسەت تێگەیشتنی ئەخلاقی و فەلسەفی یان ئاوات خوازانە و ئایدئالیستی بوو. لەم روانگەوە سیاسەت و دەسەلات خۆی لە خۆیدا مەبەست نیە، بەلکوو ئامراز و کەرەسەیەکە بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی بەرزتر وەك خێر و بەختەوەری و زانایی گشتی. لە فەلسەفەی ئەفلاتووندا هەموو شتێك و یەك لەوان مرۆڤ و دەولەت، نموونەیەکی بۆە و مەبەستی سیاسەت ئەوە بۆە کە مرۆڤ بگەیەنێتەوە باروودۆخی نموونە یەکدی خۆی. هەروەك پێشتریش ئاماژەی پێکرا، بە بۆچوونی ئەفلاتوون مرۆڤەکان بە شوێن دوو دەستە لە خێری سنووردار و بێ سنوورەوەن. خێری سنووردار وەك دەسەلات دارایی دەبێتە هۆی شەڕ و ئاژاوە و حکومەتگەلێکی تاریك و گومرا سەرکوتکەرانە، ئۆلیگارشی و دێموکراسی لێ دەکەوێتەوە.

لەبەرانبەردا خێری بێ سنوور وەك زانایی، جوانی و گەورەیی شەڕ و کێشە دروست ناکەن و مەبەست دامەزراندنی مەدینەی فازیلە، ئامادەکردنی هەل و مەرجی لەبار بۆ بەدەست هێنانی زانایی و گەورەیی یە. لەم روانگەوە سیاسەت وەك حیکمەتی بەکردەوە لەگەلّ ئەخلاق تێکەلە. سیاسەتوانانی ئامانج خواز واتا فەیلسووف + شاه کە راستیەکان دەناسێ، کۆمەلگا بۆ لای یەکسانی، عەدالەت و گەورەیی دەباتە پێش. فێر کردن و پەروەردە لەگەلّ سیاسەت پێوەندییەکی نزیکی هەیە. هەر لە دەولەتو کۆمەلگایی نموونەیی، مرۆڤی نموونەیی دەردەکەوێ. لەراستی دا ئەفلاتوون پێی وابوو لە نێوان بەرژەوەندی خوازی و ئەقل گەرایی لە سیاسەتدا دژایەتی هەیە. لە روانگەی ئەوە هیچکام لەو سیستمە سیاسیانە کە لە سەردەمی ئەودابوون ئەقل گەرا نەبوون. بۆیە فەیلەسووفەکان لە روانگەی ئەوە ئەرکێکی سەرەکیان لە پێکهێنانی دەولەتە ئەقلانی و ئەخلاقیەکاندا هەبوو. ئەو پێی وابوو زانایی و ئەقل پێکەوە بەستراون و لە راستی دا یەکێك بوون.

لە روانگەی ئەرەستووشەوە ئامانجی سەرەکی سیاسەت، عەدالەت وانایی بوو و زیاترین رادەی عەدالەت وانایی کە ئێمکانی ببێ لە حکومەتی چینە نێوەنجیەکاندا پەیدا دەبوو. حکومەتی دەولەمەندەکان زۆرجار تەنبەلی و زیادە مەسرەفی لێ دەکەوتەوە و حکومەتی هەژارەکانیش واتا دێموکراسی عەدالەت وانایی تیدا نەبووە. بەلام حکومەتی چینی نێوەنجی کە خەلکێکی میانەرەون هەم ئیش و کار هەم ئەمنیەت و شادییان هەیە، لە ئارمانجی

سیاسەت نزیکترە، مەبەستی سەرەکی سیاسەتوانان دابین کردنی ژیانێکی باش و شادی و بەختەوەری بۆ هاولاتیانە. باشترین رژێمی سیاسی، رژێمێکە کە لەودا پیاوانی زانایان، "ئەشراف" حکومەت بکەن. حکومەتی دلخواز "ئەشرافیەتی ئارمانجی" یە، بەلام ئەم بیچمە بە کردەوە مومکین نیە. حکومەتی دلخوازی مومکین، حکومەتێکە تێکەل لە ئۆلیگارشی و دیمۆکراسی کەلەودا دەسەلات بەدەست پیاوانی چینی نێوەنجیەوە بێ.

## تێگەیشتنی حقووقی

سێهەمین تێگەیشتنی سەرەکی لە سیاسەت تێگەیشتنی حقووقی بوە کە بە هۆی پەیدا بوونی لە ئیمپراتۆری رۆم تێگەیشتنی رۆمیش پێ دەلێن.

ئەم تێگەیشتنە بەتایبەت لەسەردەمی پەرەسەندنی ئایینی کریستیان لە ئیمپراتووریەدا سەری هەلدا. لەگەل پەرەسەندن و زالبوونی کریستیان لە نێوان دوو سەرچاوەی دەسەلاتی ئایینی و سیاسی لەسەرەخۆ کەلێنی تێکەوت. دوای ئەوە کونستانتینی لە سالی ٣١٣ زایینی دا چووە سەر ئایینی کریستیان و پاشان ئایینی کریستیان بوو بە ئایینی فەرمی ئیمپراتووری، دەسەلاتدارانی سیاسی خۆیان بە رێبەری دامەزراوە ئایینەکان لەقەلەم دەدا و بەوجۆرە ئەو درۆشمە سەرەکییەی کریستیانەکان کە خوازیاری لێك جیابوونی دووبواری ئایین و سیاسەت بوون خەوشی تێکەوت و سەرەتا دەست تێ وەردانی سیاسەت لە ئایین و پاشان دەست تێ وەردانی ئایین لە سیاسەتدا دوورەدیمەنێکی نوێی لەباس لە سروشتی سیاسەدا خۆلقاند.

باسی سەرەکی لەو سەردەمەوە بە دواو لە سەرانسەرسەدەکانی ناوەراستدا باس لە سنووری دەسەلات و مافی دەسەلاتدارانی سیاسیو کەنیسە بوو هەر ئەم باسانە تایبەتمەندیەکی حقووقیدا بە زانستی سیاسی، گورانی کەنیسەی مەسیح لە کۆمەلێك گرووپی پرش و بلاو بە ئاینێکی سەقامگرتوو و فەرمیی ئیمپراتووری رۆم، بۆ بە هۆی قەوارە بەستنی مەیلگەلێکی هزری سەبارەت بە دامەزراوەکانی دەسەلاتی سیاسی، لە سەرەتادا دامەزراوە حکومەتیەکان وەك ئامرازگەلێك بۆ ئاسانکاری لە رێگای پەرەپێدانی ئایین لێك دەدرانەوە، بەلام دواتر و بەتایبەت لە سەردەمی سەدەکانی ناوەراست، ململانی، کێبەرکی، گێرە و کێشەگەلێکی زۆر لە نێوان کەنیسەو دەولەت لە سەر کاروباری جۆراوجۆر وەك مافی دانانی کاربەدەستانی کەنیسە، کونترۆل بەسەر دارایی و مۆلك و مالی کەنیسە، دیاری کردنی سنوورەکانی

دەسەڵاتی دەوڵەتو کەنیسەو.... سەریان هەڵدا. بەپێی بۆچوونی هەندێك لە پاپاکانن، دەسەڵاتداریەتی کەنیسە، مەیدانی کاروباری سیاسیو مەدەنیش دەگرتەوەو حاکمە سیاسیەکان هەر نوێنەرو کارگێرانی کەنیسە بوون. بەمجۆرە گرینگترین بابەتی باس لەو سەردەمەدا، سنووری دەسەڵاتو مافو ئەرەکەکانو رەوایی سیاسی دەسەڵاتدارانو کەنیسە بوو.

تێگەیشتنی ئازادیخوازانە (لیبرالی) لە سیاسەت لە سەدەکانی نوێشدا تێگەیشتنێکی یاسایی بوو. لەم روانگەدا سیاسەت گرینگترین ئامرازای دڵنیایی مافەکانی سروشتی تاکەکانی لە بەرانبەر دەسەڵاتی رەهای سیاسیو ئایینی لێك دەدایەوەو ئەوجا لە جیاتی باس لە سنووری دەسەڵاتی شاکانو پاپاکان، لە مافو ئەرەکەکانی هاووڵاتیانو خەڵك قسە دەکرا. یەکەمینن دەوڵەتی نەتەوەییو بە تەواوی مودێرن کە لە ئۆرووپاو لە چەرخی بزووتنەوەی چاکسازیو ریفورمی ئایینو شەرە ئایینەکاندا پەیدا بوو، لە بەرانبەر دامەزراوە کەنیسەیەکان داوای دەسەڵاتداریەتی تەواوو بەربڵاویان هەبوو. یەکێ: لە گرینگترین نیشانەکانی ئەم تێگەیشتنە لە سیاسەت لە چەرخی نویدا لە روانگەی جان لاك (١٧٠٤ـ١٦٣٢) فەیلەسووفی بریتانیایی پەیدا دەبێ کە لە کتێبی دوو ریسالە سەبارەت بە حکومەت تیوری مافی سروشتی تاکەکانی بۆ پێکهێنانی کومەڵگای سیاسی پشت بەستوو بە کۆدەنگیو رەزامەندی هێنایە بەرباس. مانای سەرەکی پەیمانی کومەڵایەتی لە تیوری لە تیوری ئەودا لە راستیدا سەبارەت بە بەرپرسایەتیو بەرتەسك بوونی دەسەڵاتی حکومەت بەرانبەر بە مافو ئازادیەکانی تاكو کومەڵایەتی بوو. بە بۆچوونی لاك حکومەت دیاردەیەکی سروشتی وەك بنەماڵە نیە بەڵکوو دامەزراوەیەکی دەستکردو لەم بارەوە پیرەوی بنەمای سروشتی دەسەڵاتی باوك لە بنەماڵەدا بە حیساب نایەت، بەڵکوو دەسەڵاتداریەتی لەو دا پەیمانێکی دیکەیەو پیرەوی لە پەیمانو رەزامەندیو بنەمای حکومەتی یاسا دەکا. مەبەستی سەرەکی حکومەت پارێزگاری لە گیانوماڵو ئازادی تاکەکانە. جیاکردنەوەی دوو دەسەڵاتی یاسادانانو بەرێوەبردن لە یەکتر، بە مەبەستی دانانی سنوورو مەرج لەسەر دەسەڵاتیش لە تێگەیشتنی حقووقی سیاسەت مانای هەیە.

## تێگەیشتنی مۆدێرن

لە سەردەمی مودیرنیتەدا سیاسەت بە ئامرازی دابینکردنی خۆشگوزرانیو شادی دەژمێردرێ، واتا بێجگە لە ئەرکە تایبەتیە سەرەتاییەکەی کە دابینکردنی ئارامیو ئاسایشو دادوەریو دیفاعی دەرەوە خاوەنی ئەرکی تایبەتیی نیهایی دابینکردنی ئەوپەری شادی بۆ زۆرینەی مومکینی خەڵکە. وەها خوێندنەوەیەك لە بناخەدا قازانج ویستانەیە. لە روانگەی قازانج ویستەکان ئەوەی کە لە لێکدانەوەکانی کومەڵایەتیو سیاسیدا گرینگە، ئەمەیە کە ئەوانە خاوەن ئەرکی تایبەتو قازانجگەلێکن. ریشەی ئەم تێگەیشتنە لە سیاسەتی مودیرندا دەگەرێتەوە بۆ بۆچوونەکانی جیرمی بنتهام کە بە چەمکگەلێکی وەك مافی سروشتی، پەیماننامەی کومەڵایەتیو رەزامەندی گشتیی لە بیروکەی فەیلەسووفانێك وەك لاك دا هێرشی کردو ئەو چەمکانەی بە بێ بناخەدانا. لە روانگەی ناوبراو پاساوی سەرەکی بۆ بوونی دامەزاوەکانی حکومەتی دەبێ لەو قازانجانەدا بێ کە تیاندا هەیە. کەوابوو دەوڵەت، سیستمێکی دەسەڵاتدارە بۆ دابینکردنی ئەم قازانجانە. ئەو پێی وایە قازانجی سەرەکی سیاسەتو حکومەت، دابینکردنی ئەمنییەتی گیانی و مالیی، فەراوانی نیعمەتو یکسانییە. چەمکی دەولەتی خۆشگوزرانی، مودیرن لە باری فەلسەفیەوە ریشەی تێگەیشتنی بنتهام لە سیاسەتدایە.

تێگەیشتنی سیاسەت لە سەردەمی مودیرنیتەدا وەك دابینکردنی خۆشگوزرانیو ژیان، لە دەلقەی ئەخلاقیو فەلسەفی کۆنەوە کەوتوەتە بە رەخنە. هاناتارنت، فەیلەسووفی ئاڵمانی سەدەی بیستەم لە هەڵسەنگاندنی سیاسەتی مودیرنو سیاسەت بە مانای ئەخلاقیو یونانیەکەی وتوویەتی کە ژیانی مرۆڤ دەکرێ بە سێ بەش: یەکەم کار بە مانای تیکوشانو هەڵسووڕان کە لەودا مرۆڤ لە سروشتدا دەژیو دەبێ وەك ئاژەڵەکان بەشێوەییەکی دووپاتە هەوڵ بۆ دابینکردنی بژیوی خۆی بدا. دووهەم کار بە مانای داهێنانو تێپەرین لە سرشتو داهێنانی بەرهەمگەلی هونەریو فیکری، سێهەم کارو کردەوە بە مانای بەشداری ئازادو یەکسان لە ژیانی گشتیو سیاسیدا. لە روانگەی ئاریتەوە، لە یونانی کۆن، بە پێی ناساندنی ئەرەستوو هەولی ژیانو بژیوی مەیدانی تیکوشانی بنەماڵەو کردەوەی ئازادو ئەخلاقی گۆرپانی تێکوشانی دەولەت بوو. بەڵام لە سەردەمی مودیرندا سیاسەتو دەولەت ئەرکی تایبەتی بنەماڵەی کەوتوەتە ئەستوو لە ئامانجی سەرەکی خوی واتا دابینکردنی کەشو هەوای

له بار بۆ کردەی سیاسی ئازاد که مەبەستێکی بێجگە خۆی نیە، دوورکەوتوەتەوە. دەرئەنجام "سیاسەت" که له ئەندیشەی یونانیەکاندا پیوەندی ئازادی تاکەکان لە کێشەی بڕیاردان سەبارەت بە کاروباری گشتی لە مەیدانی گشتیی‌دا بوو، بە "حکومەت" بە مانای ئامریەت‌و پیوەندی دەسەلات گۆڕاوە.

## پێشینەی مێژوویی‌و تیورگەلی گشتی دەوڵەت

### پێشینەی مێژوویی

بەپێی مەنتیق دەتوانین بلێین کە لە بەرئەوە دەولەت دیاردەیەکی گشتی‌یە، دەبوا لە بەرانبەر هەندێك داخوازی گشتی مرۆڤدا وەلامدەر بوایە. هەر بۆیە ئەرکە تایبەتەکانی دەولەت ئێمە رێنوێنی دەکا بۆ لای سەرچاوەو ریشەکەی. دیارە هەندێك ئەرکی تایبەتی دەولەت کۆن‌و هەندێکی نوێیە. ئەرکە تایبەت‌و سەرەکی‌و بنەرەتییەکان یان لانیکەم دابینکردنی ئەمنیەتی گیانی خەلك لە مەترسیەکانی نێوخۆیی‌و دەرەکی‌و سەقامگیرکردنی ئاسایشی کومەل بوە، لەگەل ئەمە سەلماندنی ئەم دەرئەنجامە مەنتیقی‌یە لە باری مێژووییی‌یەوە کردەیەکی زۆر سانە نیە. مێژووی کومەلگا سەرەتاییەکان زۆر ناسراو نین. لەگەل ئەوەش ئەو مێژووەش کە ناسراوە بەشێکی بچوك لە مێژووی سەرهەلدان‌و گووڕانی (تکامل) مرۆڤە، بەپێی هەندێك لە مەزەندەکان تەمەنی گۆی زەوی نزیك بە ۲۰۰۰ میلیون سال‌و تەمەنی ژیان لەسەر گۆی زەوی نزیك ۸۰۰ میلیون سال‌و تەمەنی مرۆڤ نزیك ٦۰۰ میلیون سالە.[٢] هەر چۆنێك بێ لەبەر ناروونی مێژووی شارستانیەت لە پیوەندی لەگەل ریشەی سەرهەلدانی دەولەت (منشأ) هەموو تیوریەکان سەبارەت بەو، شێوەیەك لە لێکدانەوەی ئەقلی‌و مەنتیقی بوون. لەگەل ئەوەش لەسەر بنەمای هەندێك بەلگە وادێتە بەرچاو کە نێوان دەولەت‌و ئەرکی تایبەتی رێکخستنی دیفاعی‌و شەڕانە لە زۆر کومەلگادا پیوەندیەکی نزیك هەبوە. رێکخستنی سەربازی بە مەبەستی بەرگری لە هێرشی قەوم‌و گرووپە دەرکیەکان یەکێك لە کونترین دامەزراوەکانی کومەلایەتییە کە تەنانەت لە چاخی راوو کوکردنەوەی خواردەمەنیشدا باو بوە. بە تێپەڕین ( لەو سەردەمانە)و گەیشتن بە کشتۆ کال‌و نیشتەجیی بوون، سیستمی دیفاعی گرنگێکی تایبەت پەیدا دەکرد. وادێتە بەرچاو کە لە سەردەمانی کشت‌و کال زۆر لە

---

[٢] ئەم مەزەندە لە کتێبی مێژووی شارستانیەتی ئارنولد توینبی وەرگیراوە.

قەومەکان ژیان لە دەشتە تەختو بەرینەکانیان پێ باشتر بووو سنوورگەلێکی لەبار بۆ دیفاعکردنیان لە کوێستانەکانی دەوروبەری خۆیان دادەمەزران.

هەندێك لە نووسەران بۆ ناسینەوەی ریشەو پێکهاتنی دەوڵەت کەڵکیان لە زمانناسی وەرگرتوە. زۆر لە وشەکانی سەرەتایی سیاسی لە کومەڵگا جوراوجورەکاندا بە مانای ناوچەی پارێزراو بە مەبەستی دابینکردنی ئاسایشو ئەمنیەتە. وشەی یونانی پولیس بە مانای ناوەندی کۆبوونەوە بۆ دابینکردنی ئەمنیەتی ژنانو منداڵان بوە. پێشینەی دامەزرانی شاری رۆم بۆ کۆبوونەوەی قەومەگوندیەکان لەسەر حەوت تەپولکە لە تەنیشت چۆمی تیبر، دەگەرێتەوە. هەروەها سەبارەت بە دامەزرانی دەوڵەتی ماد لە هەمەدان شی کردنەوەیەکی وەك [رۆم] هاتوە. سەبارەت بە هەر دوو نموونەکە تەپولکەی قەڵاو شوورەی لەسەر بوە. لە رۆم بە خانووەکانی سەرتەپولکەکان دەیانگوت urbs، بە مانای قایگە [استحکامات]. [بە مانای شارنشینیو ناوچەی شاریش هاتوە] پاشگری زۆر لە [ناوی] شارەکان لە ئینگلیزی بە ton (لە town)و لە فارسیدا بە تانو دان تەواو بوە کە بە مانای قەڵا وەك شوینی کۆبوونەوە بوە. (بۆ نموونە اکباتان، لندن) لە کومەڵگای سەرەتایی دەسەڵاتی دەوڵەتی بەدەست کەسانێکەوە بوو کە ئەرکی پارێزگاری شاریان پێ ئەسپێردرا بوو. بە واتایەکی دیکە پێکهاتەی سیاسی دەوڵەتە سەرەتاییەکان لە رووی شێوەی رێکخستنی کومەڵگا بۆ شەڕ وەرگیراوە. لە دەستووری ئاتن پێش لە چاکسازی سولون لە سەدەی حەوتمی پێش زایینش، خەڵك کرابوونە سێ چین: سەربازانی سوارە، سەربازانی پیادەو کرێکارەکان. بە رۆاڵەت دەوڵەت بە هۆی پێویستیی بە شەڕ پێکهاتووەو شەڕ کولەکەی سەرەکی دەوڵەت بوە. بەپێی ئەو توێژینەوانە کە کراون بڕیاردان لە نێو سیستمی رێکخراوەکانی عەشیرەیی لە زۆر لە کومەڵگاکانی سەرەتاییدا لە ئەستۆی سەروك عەشیرەکان بوە. لە عەشیرەکانی ئاڵمانی سەرەتاکاندا سەرۆك عەشیرەکان بە جل‌وبەرگی سەربازیەوە دەردەکەوتن‌و بە کوتانی رمیك بە سەر زەویدا بڕیارەکانی خۆیان رادەگەیاند. هەر ئێستاش لە سوئیس، لە کۆبوونەوە گشتییەکاندا هەندێك لە کانتونەکان، ئەندامان بە شمشێرەوە دەردەکەون.

یەکی لەو بەڵگە زۆر کەمانە کە سەبارەت بە ریشەی دەوڵەتەکان لە بەردەست دایە، راپۆرتێکە کە هیرودوت مێژوونوسی یونانی سەبارەت بە سەرهەڵدانی دەوڵەتی ماد لە رۆژئاوای ئێران داویەتیە دەست. عەشیرەکانی ماد ماوەیەکی زۆر لە گوندە پرش‌وبڵاوەکیان لە

بارو دۆخی شەڕو کێبەرکێی لە "بارودۆخی سروشتی"دا دەژیان. دیائوکو، لە سەرەتادا ناوبژیوانی شەڕو کێشەکان لە عەشیرەو گەندەکانی خۆی دا بوو، بەڵام لە گوندەکانی دیکەشەوەبۆ ناوبژیوانی دەهاتن بۆ ماڵەکەیان. بە پێی راپۆرتی هیرودوت، دیائوکو پیاوێکی هوشیار و زیرەك بووو ڕای گەیاند کە چیتر ئامادە نیە شەڕو کێشەکان یەکلا بکاتەوەو چارەسەریان بکات، لە بەر ئەوەی لەو بارەوە قازانجێکی دەست ناکەوێو کاتێکی زۆریشی دەگرێو بە خۆرایی دەڕوا، لە ئاکامدا شەڕوکێشەکان لە نێوان عەشیرەکانو گوندەکان پەرەیان سەندو کێبەرکێی زاڵ بوو. پیاوانی عەشیرە لە رووی ناچاریەوە ا، کۆبوونەوە تا کەسێك وەك پا دشا هەڵ بژێرنو بە هوی ئەوە ئاژاوەکان چارەسەر بکەن. بەم پێیە نیاز بە ناوبژیوان و حەکەم بە بۆچوونی هیرودوت بۆ یەکلا کردنەوەی شەڕەکانی نێوخۆو دەرەکی سەرچاوزی پێکهاتنی دەوڵەتی ماد بوو. سەبارەت بە ریشەی دەوڵەت لە کوچ نشینەکانی سەرەتایی ئامریکایش داستانێکی وەها دەگێرنەوە. کێبەرکی لەسەر سەرچاوەکان، شەڕ بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات، بارودۆخی نائارامو بی یاسایی، مەترسی هیندووسەکانو هوکارەکانی دیکە بوە هوی ئەوە که رێکەوتنێك بۆ دامەزراندنی پۆستی کەلانتر بکرێو هەر ئەم پۆستە بۆخۆی سەرەتای پێکهاتەی دەوڵەت لە ئەمریکادا بوو.

دیارە ئەرکی سەرەکیو سەرتایی یان لانی کەمی، دەوڵەت دواتر پەرەیگرتو لە سنووری دابینکردنی ئەمنیەتی گیانی خەڵك تێپەڕیو رێكوپێك کردنی پیوەندی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکترو یان ماڵو دارایشی گرتەوە. وەها سیستمێك لە هەناوی خویدا، هەڵگری تێگەیشتنێکە لە چەمکی دادوەری بووە بە خوێندنەوەیەکی دیکە هەر ئەم ئەرکە تایبەتە خوی جیا کەرەوەی دامەزراوەی دەوڵەت بە چەمکێکی گەشەسەندووتر بووە رستەیەکی بەناوبانگ لە ئگوستین قەدیسو فەیلەسووفی کریستییان لە کتێبی شاری خوا زۆر دەوتریتەوە کەوتوویە: "عەداڵەتو دادوەری لە بیر خۆببەنەوە دەبینن کە دەوڵەتەکان شتێك زیاتر لە گروپە چەتەکان نین، لەبەر ئەوەی گروپە چەتەکانیش بۆ خۆیان دەوڵەتێکی بچووکن کە لە نێویاندا رێكوپێکی هەیەو دەسکەوتەکان لەنێو خۆیان دا بەپێی یاساگەلێك دابەش دەکرێو ئەگەر بتوانن بۆ خۆیان قەڵا ساز بکەن شار بونیات بنێن، دەوڵەتەکەیان ئیتر پێی ناگوتری دەوڵەتی دزەکان "دیارە مانای دابینکردنی دادوەری وەك ئەرکی دەوڵەت جێی باسێکی بێبرانەوەیە لە فەلسەفەی سیاستو ئەخلاقدا. بۆ عەدالەتیش دەکرێ ماناگەلی لانیکەم زۆر لەبەر چاو بگیردرێ، ئەگەر

دەوڵەتیش نەتوانێ (بەوشێوە کە چاوەروان دەکرێ) لە دابینکردنی عودالەتدا بە مانای لانی زۆر سەرکەوتن بەدەست بێنێ، دەبێ لە دابینکردنی عەدالەت لە مانای لانی کەمی بۆ نموونە عەدالەتی قەزایی، پێکهێنانی هاوسەنگی لە نێوان بەرژەوەندی کومەلایەتیو ... هتددا هەنگاو هەلگرێ.

## تیوریە گشتییەکانی دەوڵەت

بەگشتی دوو دەستە تیور سەبارەت بە دەوڵەت ، سەرچاوە، ناوەرۆکو کردەوەی هاتوەتە گۆڕ. یەکەم تیوری دەوڵەت وەك دیاردەیەکی ئۆرگانیك [ئەنداموار]و دووهەم تیوری دەوڵەت وەك دیاردەیەکی ئەمرازیو سازکراو. تیوری دەوڵەت وەك دیارەیەکی ئورگانیك دەوڵەتی لە رووی کردەوەو پێکهاتنو گەشەکردن وەك ئورگانیزمێکی پێشکەوتوو دەشوبهێنێ. لەم روانگەوە بە وتەیەکی دروستتر، دەوڵەت وەك لەشێکی زیندو نیە، بەڵکوو خۆی بوونەوەرێکی زیندووی ئالۆزە. دەوڵەت وەك گژوگیاو درەختو ئاژەڵ ئورگانیسمێکی سروشتیەو لە سێ خەسڵەتی ئورگانیسیە پێشکەوتووەکانی وەك، پیوەندی نێوخۆیی نێوان بەشەکان، پەرەسەندنو گەشەکردن لەنێو خۆو نێوخۆبوونی مەبەستو ئامانجی هەیە. دەوڵەت ئامرازو کەرسەیەك نیە کە مرۆڤ بۆ دابینکردنی مەبەستێکی تایبەتی پێکی هێنا بێ، بەڵکوو وەك بنەماڵەو کومەڵگای مەدنی، ئورگانیسمیکە کە بۆ خۆی گورانی بەسەردا هاتووە پێگەیشتووە و هەڵگری ئامانجگەلێکی بەرزترو لە ئاواتی بچووکو تاکیەتی. بۆیە لەم روانگەوە دەوڵەت دوژمنی ئازادی تاك نیە، بەڵکوو گرینگترین ئامرازی دابینکردنی ئازادیو ئاسایش بۆ مرۆڤە. ریشەی تێگەیشتنی ئورگانیك لە دەوڵەت دەگرێتەوە بۆ فەلسەفەی یونانو ئەرەستوو کە پیوەندی تاكو دەوڵەت لەگەڵ پیوەندی ئەندام لەگەڵ لەش دەشوبهێنێو لەسەر ئەو باوەرە بوو کە دەوڵەت پێش لە تاك یان لە راستیدا پوتانسیلیکە کە لە تاکدا بوونی هەیەو درێژەی گەشەسەندنی بنەماڵەو کومەڵگایە.

لە سەدەکانی نویدا هیگل گرینگترین نوێنەری بۆچوونی ئورگانیك بوو. بە بۆچوونی ئەو دەوڵەت هاوبونیات یان سینتیز [synthesis] بنەماڵەیەو لەوێدا کەموکووری ئەو دووە وەك نیهاد (تیز) [thesis]و لە بەرانبەر نیهاد (ئانتی تیز) [antithesis] لادەچێ. دەوڵەت

وەك دیاردەیەكی ئاسادە بە بنەماڵەو كومەڵگای مەدەنی یەكپارچەیی دەبەخشێ‌و بۆخۆی قەوارەی گەشەسەندووتری بنەماڵەو كومەڵگای مەدەنی یە.

لە تیوری ئامرازیی، دەوڵەت بەرهەمی كردەكی بە ئەنقەستی مرۆڤە، ئامرازێكە كە مرۆڤەكان بۆ گەیشتنی بە مەبەستگەلێكی تایبەت پێكیان هێناوە دەوڵەت دەرئەنجامی پەیمانی كومەلایەتی بۆ دابینكردنی ئارامی‌و ئاسایش لە جیهاندایە، دەوڵەت شتێك دابین دەكا كە سروشت دابینی نەكردوەو ئەویش ئاشتی‌و ئاسایش‌و ئازادی مەدەنی‌یە. بۆیە دەوڵەت بۆ مرۆڤ بوونی هەیە. نە مرۆڤ بۆ دەوڵەت. گرینگترین نوێنەرانی ئەم بۆچوونە لە رۆژئاوادا جان لاك‌و توماس هابز دوو فویلەسووفی بریتانی بوون.

بە بۆچوونی هابز خەڵك لە بارودۆخی سروشتی واتا پێش لە دامەزرانی دەوڵەت لە بارودۆخی شەڕ هەموو بە دژی هەموو دەیان گوزوراندو ئەمنیەتی گیانیان نەبووە كە لەژێر تیشكی دووربینی‌و دوارۆژ بینی یان ئەقل بۆ خۆیان بوونە خوازیاری ئاشتی‌و ئاسایش‌و بۆ گەیشتن بەم ئامانجە لە مافی بەرگری كەسیی [دفاع شخصی] دەستیان هەڵگرت‌و ئەسپاردیان بەكەسایەتی سێهەم [شخص ثالث] واتا دەوڵەت وەك نوێنەری ویستی یەكەیەكەی خەڵك. بە بۆچوونی لاك هەرچەند بارودۆخی سروشتی شەڕانە نەبوو، بەلام ئاشتیش مسوگەر نەبوو، یاسای جیی باوەڕ، دادوەی بێ‌لایەن‌و دەسەلاتی بەڕێوەبردنی ئەو یاسایە لە بارودۆخی سروشتیدا دەست نەدەكەوت. كەوابوو مرۆڤەكان بۆ دەرباز بوون لەو بارودۆخە پەیمانگەلێكیان بەست‌و كومەڵگای مەدەنی‌یان پێكهێنا. حكومەت وەك بەرهەمی پەیمان‌و بەڵێنی خەڵك‌و نوێنەری هەمووی ئەوان دەبێ لە بازنەی یاساو مافی سروشتیدا بێ.

دوو بۆچوونی ئورگانیك‌و ئامرازیی، تیوریگەلێكی گرینگ‌و گشتی دەوڵەتن، بەلام لەنێو هەركامدا جورگەلێكی جیاواز پەیدا دەبن، بۆ نموونە تیوری دەوڵەت لە ماركسیزمدا روانگەیەكی وەك تیوری ئامرازیی‌یە، بەلام لەگەڵ بۆچوونی پەیماننامەی كومەلایەتی جیاوازی بنەرەتی هەیە، چوونكە بەو پێیە نە تەنیا بەرهەمی پەیماننامەی هەمووان نیە، بەڵكوو دەرئەنجامی بەكارهێنانی دەسەلات‌و ویستی بەشێك یان چینێك لە كومەڵگا بەسەر بەشەكان‌و چینەكانی دیكە دایەو بۆیە پارێزەری بەرژەوەندی گشتی نیە. ریشەی دەوڵەت دەبێ لە خاوەنداریەتی تایبەت بەسەر كەرەسەی بەرهەم هێناندا بدوزێتەوە كە بوتە هۆی پەیدا بوونی

چینەکانی کومەڵایەتیو لە هەر قەوارەبەندیەکی کومەڵایەتیدا، دەوڵەت ئامرازێکە کە چینی زاڵ بۆ پاراستنی دەسەڵاتو قازانجی کومەڵایەتی خۆی بەستیەوە گرتوە.

## -٧-

## بناخەو روخسارەکانی دەوڵەت

وەك باسمان کرد دەوڵەت دیاردەیەکی "هاوپێچەیی" [الضنمامی]، چەند روخساری و ئاڵوزە. مەرجی ناسینی دامەزراوەی دەوڵەت شۆناسی روخسارە جوراوجورەکانیەتی. هەندێك لە تیوریە سیاسیەکان هەر روویان لە روخسارێکی تایبەتی دەوڵەتە بۆ نمونە ئەویان وەك دامەزراوەی زۆرکردن، یان دامەزراوەی قازانجی گشتی یان تایبەتی، داناوە و لە ئاکامدا یەکێك لە روخسارەکانی دەوڵەتیان سەبارەت بە ئەوانی دیکە سەرەکی تر و کاریگەرتر دەزانن. بەڵام لە دورە دیمەنێکی هەمەگیرتردا، دەوڵەت خاوەنی چوار روخساری سەرەکی یە کە دەکرێ بە شێوەی خوارەوە نیشان بدرێ.

روخسارەکانی دەوڵەت



## روخساری زۆرداری

زۆرکردن یەکێك لە تایبەتمەندیەکان و روخسارە نەگۆرو سەرەکیەکانی دامەزراوەی دەوڵەتە. دەوڵەت لە پلەی یەکەم دا دیاردەیەکی زۆردارانە بۆە و بە بێ بوونی گەوهەری زۆر و هێزی توندوتیژی، پاراستنی ئارامی و ئاسایش و چارەسەرکردنی کێشەکان و یەکلاکردنەوەی ئاڵۆزیەکان و دابەش کردنی ئیمکانات و دیفاع لە بەرانبەر هێرشکەرانی دەرەکیدا مومکین نابێ. هەر بۆیە هەندێك بناخەدا دەوڵەت لە بە "دیاردەیەکی جەنگی" دادەنێن. لئون تولستوی وتوویە کەسێك کە لە زیندادا نەبووبێ، لە مانای دەوڵەت تێ ناگا.

هەرچەندە لە قوتابخانە جیاوازەکانی ئایدئالیستی، ئانارشیستی و مارکسیستیدا و روخساری زۆرداری دەوڵەت کەوتوەتە بەر رەخنە و هێرش، بەلام زانایانو تیوریسینیەکانی سیاسی هەموویان لەسەر بە ناچاری بوونی روخساری زۆردارانەی دەوڵەت کەم و زۆر تەئکید دەکەن. هەندێك کومەلگا وا وەسف دەکەن کە لە ئاخەوە بریتیە لە سەپاندنی ویستی بەشێك لە کومەلگا بەسەر بەشێکی دیکەدا. لەگەڵ ئەمەش زانا سیاسیە واقع بینەکان زیاتر لە وانیتر لەسەر روخساری زۆرداری و پیویستییەکەی تەئکیدیان کردوە. بە بۆچوونی ئەوان مرۆڤ لە نەبوونی دەسەلاتو زۆری دەوڵەتیو کومەلایەتی رووله سەرکێشیو تەجاوز دەکا. لەوانەیە دەسەلاتو زۆرداری دەوڵەت ناخۆشو شەر بێ، بەلام شەرێکی پیویستو ناچارییە، شەرێکە کە بەرگری لە شەری گەورەتر واتا ئاژاوەو کێبەکێی دەکا. لە نەبوونی دەسەلاتی دەوڵەتیدا، مرۆڤ دەگەرێتەوە بۆ بارودۆخی پێش شارستانیەت واتا دوخی سروشتیو یاسای جەنگەڵ. لەم رەانگەوە دەوڵەت، یاسا، ئەخلاقو دین هەموویان بۆ دەستەمۆکردنی زاتی سەرکێشی مرۆڤ هاتوونە ئاراوە.

توماس هابز فەیلەسووفی گەورەی بریتانی (١٥٨٨ـ١٦٧٩) بروای وابوو کە لە بارودۆخی سروشتیدا واتا پێش لە دامەزرانی دەوڵەت مروف گورکی مرۆڤ بوەو لەو دوخەدا شەری هەموو دژی هەموو درێژەی بوە. لە ئاکامدا مرۆڤ لە ترس زوومردنو بە گویرەی ئەقلو وردبینی لە مافی رەهای خۆی بۆ پارستنی خودی خۆی دەستی هەلگرتوەو ئەو مافەی بە کەسی سێهەم واتا دەوڵەت یان لویاتان ئەسپاردوە تا ئارامیو ئاسایش دابەزێنێ. بە بۆچوونی هابز هەر چەند بنەمای دەوڵەت لەسەر پەیمان دامەزراوە، بەلام پەیمانەکانو وادەکان بە بێ

پشتیوانی شمیشر بەرێوە ناچێ، بۆیە ئەو دەسەڵاتداریەتی دەوڵەتی وەك "دەسەڵاتی زۆری ڕەها" وەسف کرد.

ئەنارشیستەکانیش لە بناخەدا دەوڵەتیان وەك دامەزراوەیەکی زۆردارانە چاو لێ کردو لەو روانگەوە خوازیاری لە نێو بردنی بوون تا بە بۆچوونی ئەوان دەرەتانی نەزمێك لەسەر بنەمای هاریکاری‌و یارمەتیدان بە یەکتر ئامادە ببێ. لە روانگەی ئەوانەوە شتێکی زیادی‌و سەربارەکی نا پیویستە کە لەسەر شانی کومەڵانی خەڵك قورسایی دەکا. لە پشت دەوڵەتی یاسایی هەموو ڕژیمەکان پێکهاتەیەکی زۆردارانەی یەکسان لە هەموواندا شاردراوەتەوە. ئایدولوژیەکان تەنیا کەرسەیەکن بۆ پاساودانی دەسەڵات‌و زۆر.

زۆر ئامرزاێکە بە مانایدا سەپاندنی ویستیی حکومەت بەسەر موخالفەکانی لە رێگای بەکارهێنانی ئامرازی مادی‌و ئاشکرا حکومەتەکان زۆر جار پێیان باشە پەنا بۆ زۆر نەبەن، مەگەر ئەو کاتە رێگەیەکی دیکە لە بەردەمیاندا نەمابێ. سوپا، پولیس، بەندیخانەو هێزەکانی ئاسایش‌و دادگاکان کەرەسەی زۆردارانەی حکومەتن. لە کاتەکانی قەیرانی‌و پڕ مەترسیدا، دەوڵەت لە پیچمی سوپاو هێزە چەکدارەکاندا دەردەکەوێ. ئیمڕۆژە لە چەرخی دێموکراسی دەست تێوەردانی سوپا لە کاروباری حکومەتدا نایاسایی‌و بە پێچەوانەی نەریتی سیاسی لێك دەدرێتەوە. بەڵام لە رابردوودا جیایی سوپاو حکومەت بە پێچەوانەی نەریت بووە لە سیستمە سیاسیەکانی کۆندا، سوپا بە کولەکەی سەرەکی دەوڵەت دەژمێردرا.شاکانی کۆن فەرماندەری گشتیی سوپاو هێزە چەکدارەکان بوون.

زۆرداری پێکهاتەیی ئەو بیحمە زۆرداریەیە کە لە پێکهاتەی یاساکان‌و قەرارەکاندا رەنگی داوەتەوەو ئیتر دەوڵەت ناچار نیە دەبێ بۆ دابینکردنی مەبەست پەنا بۆ زۆر ببا یان لانیکەم لە ژمارەی کردە زۆرداریەکان کەم دەبێتەوە. بۆیە هەر نەبوونی دیاردەکانی موخالفەت لە سیستمێکی سیاسیدا بە مانای رەزامەندی هاوولاتیان نیە، بەڵکوو لەوانەیە زۆرداری پێکهاتەیی لە پێشدا دەرەتانی دژایەتی کردنی لەنێو بردبێ. بۆ نموونە رێگەنەدان بە مانگرتن لە یاسای کاردا زۆرداریی‌یەکی پێکهاتەیی یەکە زۆرجار پیویست بە زۆرداری ئامرازی‌و کەرەسەیی نامێنێ.

هەندیك لە خاوەن بیران باسیان لە زۆرداریی‌یەکی ئایدلوژیکیش کردوە، لە کاتێکدا لەزۆرداری کەرەسەیی‌و پێکهاتەیی دا ئاك دەزانێ کە دەبێ لە دەسەڵاتی لە سەر تری مەترسی

حکومەتو یان لە یاساکانی پیرەوی بکاتو ریگەیەکی دیکەی نیە، لە زۆرداری ئایدولوژیکدا ئەو لە بناخەدا سەبارەت بەوە کە زۆرداری بەسەریدا زاڵە بێئاگایە. لە بەر ئەوە کە مەنتیقی زۆرداری بەشێوەیەك پێی فامێندراوە کە ئەو زۆرداریییە بە سروشتیو ئاسایی دەزانێ، لەم روانگەوە زۆرداری کاتێك دەگاتە لووتکەی کە ببێ بە ئایدولوژی، واتا خۆی لەجلوبەرگی باوەری دەروونی دا بکاتەوەو ئیتر زۆردارانە، وەبەرچاو نەکەوێ. زۆر لە دەوڵەتەکان خاوەنی دەمو دەزگا گەلی راگەیاندنی باوەرو ئایدولوژینو بە بێ ئەوانە رەوایی دەوڵەت درێژە ناکێشی. هەندیك لە نووسەران وەرگرتنی ئایدولوژی لە بناخەدا دا بە چەمکێك لە زۆرداری نازاننو ئەوە بە بەشێك لە رەوتی کومەڵ گرۆیی سیاسی [جامعه پـذیری سیاسی] دادەنێن.

لە سێ جور پیوەندی دەسەلاتو زۆرداری ناوبراو لە سەرەوە، جۆری یەکەم زۆرداری کەرەسەیی تاك (بُعدی) [ Dimension ]، واتا لایەك راستەوخۆ زۆر بەسەر لایەکی دیکەدا دەکا. زۆرداری پێکهاتەیی دەسەلات دوو (بُعدی) [ Dimension ] ، لەبەر ئەوە زۆرداری یەکەم ویستی خۆی لە دووتویی یاساکاندا جێ دەکاتەوەو پاشان لایەنی زۆرلێکراو دەکەوێتە بەر ئوتوریتەی دەسەلات. زۆرداری ئایدولوژیکی دەسەلات سێ (بُعدی)یە [ Dimension ]، بەم مانا کە خاوەن زۆر دەسەلاتو ویستی خۆی لە نێو دەروونی دەزگاگەلی ئایدولوژیکدا جێ دەکاتەوەو پاشان پەیامو راسپاردەکانی ئایدولوژیکی، زەینی لایەنی زۆر بە سەرداکراو دەکاتە نیشانەو رازی دەکا، ئەوکات لایەنی زۆر بە سەرداکراو بە پێی باوەر "خۆی" بە کارەکە هەڵدەستی.

**گرینگترینی ئەو هۆکارانە کە دەبنە هۆی لاوازکردنی روخساری زۆرداریو سەرهەڵدانی قەیرانی دەسەلاتی سیاسی بریتین لە:**

١ـ نەبوونی دامەزراوە بەربڵاوەکانی دەسەلات هەروەك لە حکومەتە دیکتاتوریەکانی کۆندا دەبینران.

٢ـسەرهەڵدانی ناکۆکی نێوخۆیی لە دەستەی بەرێوەبەری دەسەلاتدار لەسەر چونیەتی بەکار هێنانی هێزەکانی زۆرداری.

٣ـ سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێو خودی هێزەکانی زۆرداریو سەرکوت.

٤ـ لاواز بوونی ئەم هێزانە لە ئاکامی هۆکارگەلێك وەك شەر.

٥ـ پێکهاتنی هێزگەلی سەربازی رکەبەر.

## روخساری ئایدولۆژیکی

هەموو دەوڵەتەکان خاوەن روخسارێکی ئایدولوژیکی ورەوایی هێنەرنو بۆ پاساودانی حکومەتەکەیانو پیرەویکردنی خەڵك کومەڵێك بەڵگەو پاساودێننەوە. دیارە هەموو خەڵکەکە لە رووی باوەر بە ئایدولوژی حکومەتی گویرایەکی حکومەت نین، لەوانەیە هۆی گویرایەلی ئەوان ئوگری، ترس، قازانج ویستی یان خوش ویستنی کەسی بۆ دەسەڵاتداران بێ، ئەو بەڵگانە کە دەسەڵاتداران بۆ پاساوی دەسەڵاتەکەیان دەیهێننەوە، لەوانەیە نێوخۆیی بێ، واتا خویان بە خاوەن ماف لە نێو حکومەتدا دەزانن، لەوانەیە ئەم بەڵگانە بۆ دەرەوە بێ، واتا بۆ هەڵسەنگاندنو دادوەری کردن بە هۆی گروپەکانی دەرەوەی دەسلاتیش بێ، رەوایی لە مانای یاسایی گشت پەسەندی [پذیرش همگانی] خوشەویستیو کارلێهاتوویی، تایبەتمەندی خاریج لە گرووپی هەیە، لە روانگەیەکی دیکەوە، دەکرێ ئەم دوو دەستە لە بەڵگەکان نەریتیو مودیرنیان پێ بوترێ.

رەوایی نەریتی کە پشتی بە خۆ هەڵواسینی بە خۆ داوەندو نوێنەرانی ئەویان خاوەن هێزی خوداینو ...، زۆر لە سەرەوە بوون، نەشیاو بۆ سەلماندنن، [اثبات ناپذیر] لە کاتێکدا کە رەوایی لە مانای مودیرندا کە لەسەر بنەمای یاسایی، رەزامەندی، کارلێهاتوویی و ... خۆی راگرتوە، بۆ هەڵسەنگاندن دەبێ. لە کومەڵگای نەریتیدا دەسەڵاتداران خۆیان بە خوداوەند یان سەرچاوەی خودایی یان ئەولادی خودا، یان نێردراو، راسپاردە هێنەری خوداوەندو یان نوێنەری خوداوەند، دەزانن و بەو پێی یە چاوەروانن خەڵك بکەونە شوێنیان. لە سەرچاوەکانی دیکەی رەوایی نەریتی، خاوەن بنەماڵەو فامیلی تایبەت بوون، پیرسالاریو باوك سالاری بوە. لە بۆچوونی پێش مودیرنیتە دەوڵەت درێژەو گەشەی بنەماڵەو ئیستنساخێکی گەورەتری ئەو بوەو دەسەڵاتداریەتی حاکم، بە چاولێکردن لە دەسەڵاتداریەتی باوك لە بنەماڵە پاساو دەدرا. لە کاتێکدا لە چەرخی مودیرنیتەدا، پەیانی کومەڵایەتی بنەمای دەوڵەت بە حیساب دەهاتو کەوابوو دەوڵەت لە درێژەی بنەماڵەدا حیسابی بۆ ناکرێ، بەڵکوو وەك دیاردەیەکی ساختەییو جیاواز چاوی لێدەکراو لێك دەدرایەوەو لەو روانگەیەوە دەسەڵاتداریەتی حاکم لەوێدا چی دی بە هۆی دەسەڵاتداریەتی باوك لە بنەماڵەدا پێناسە ناکرێ. کەوابو بناخەی گویرایەی ورەوایی لە دەوڵەتی مودیرندا نە پیوەندی تاكو بنەماڵەیی بەڵکوو پەیانو

رەزامەندی کومەڵایەتییە. دەوڵەت بە مەبەستی هەندێك ئەرکی تایبەتو دیاریکراو دادەمەزریّو پاساوی خۆی لە وەها دامەزرانێك وەچنگ دەخا. مەبەست لە دامەزراندنی دەوڵەت، پارێزگاری لە مافی سروشتیو مەدەنی تاکەکانە. گرنتی گیانو ماڵو ئازادی بەجۆرە ئامانجی دەوڵەتو بنەمای رەواییەکەیەتی. بەپێی تیوری پەیماننامەی کومەڵایەتی، یاسا دەرئەنجامی ویستی خەڵکە. لە راستیدا رەوایی مودێرن لە یەك قەوارە زیاتری نیەو ئەویش رەوایی دێموکراتیکە کە هەڵگری چەمکگەلێکی پێکەوە لکاوی پەیماننامەی کومەڵایەتی، یاسایی، ویستی گشتیی، دەسەڵاتداریەتی خەڵکو ... یە.

لە روانگەی مارکسیستیەوە ئایدولوژی، بیروکەکانی حاکمن لە هەر سەردەمێکداو بیروکەی چینی دەسەڵاتدارن. ئایدولوژی هەر چەند لە نێوخۆیدا پتەوە، بەڵام لە بناخەدا خەوشدارە، واتا بەو جۆرە کە زانست واقعیەتی کێشەکان دەسەلمێنێ ئەو نای سەلمێنێ بە بۆچوونی مارکس، ئایدلوژی خۆ دەرخستنی واقعیەتیەکان بەشێوەیەکی درۆزنانەیە. لە نیهایەتدا ئایدولوژی تەنیا بۆ پاساوی بەرژەوەندیەکانو دەسەڵاتی چینی حاکم بە حیساب دێ. ویلفوردوپارتو وشەی "لق وپۆپو خودەرخستنەکانی" [مشتقاتو نمایشها] لە جیاتی ئایدولوژی بۆ وەسفی رواڵەتی دەرەوەو مەیلو ویستەکانی بناخەیی تاکەکان بەکار دەهێنا. گائتانوموسکا نووسەری ئیتالیایی لە وشەی "فورموولی سیاسی" لەجیاتی ئایدولوژی کەلکی وەردەگرت. کارل مانهایم نووسەری ئاڵمانی ئەرکی تایبەتی ئایدولوژی بە بێ ئەوە بتوانێ خۆی لێ لا بدریّ بە خەوشدارکردنی ئەندیشە بە هۆوی چینی بە دەسەڵات بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکەیان پێناسە دەکرد. هەر چۆنێك بێ ئایدولوژیەکان کومەڵێك دەزگان کە دەوڵەتەکان بە هۆی ئەوانەوە رەوایی بە خۆیان دەدەن.

رەوایی سیستمە سیاسییەکان هەموو کاتێك پاكو بێگەرد نیە، بەڵکوو هەندێك جار تێکەڵێك لە چەند نیمچە رەوایی لە یەك دەوڵەتدا بەدی دەکرێ، هەر چەند لەوانەیە یەکیان بەسەر ئەوانی دیکەدا هەی بێ. لە بریتانیادا هێشتا دامەزراوەی سەڵتەنەت وەك دامەزراوەیەکی سەمبولیكو نموونەییو رەوایی دەر، لەگەڵ ئەنجومەنی ئەشرافی لوردەکانو ئەنجومەنی دێموکراتیکی عەوام، تانو پۆ جیاوازەکانی سیستمی سیاسی پێك دێنن، هەر چەند رەوایی یاساییو دێموکراتیك بناخەی ئەو سیستمەیە. لە دەستووری ئێراندا سێ توخمی [عنصر] کاریزماتیك (تئوکراتیك)، ئاریستوکراتیكو دموکراتیك لە چوارچێوەی

دامەزراوەگەلێك وەك ویلایەتی فەقیهە، دیـوانی دەسـتوور [شـورای نگهبـان]، و ئەنجومـەنی شوورای ئیسلامی تێکەڵ بەك بوون سیستمی سیاسی پەهلەویش لە رووی رەواییـیـەوە تێکـەڵ بوەو تیَدەکۆشا بە کەڵك وەرگرتنی لە سەرچاوەکانی جۆراوجـۆر وەك تیـوری شـاهی ئێرانـی، هێزی خودایی [فره ایزدی]، هەندێك سەمبولی ئایینی، دەستووری مەشـروتە، پارلمانتاریـسم، رێفوراندوم و راپرسی گشتیو ... رەوایی بە خۆی بدا.

دەوڵەتەکان خاوەن دوو روخساری دابینکردنی بەرژەوندی گشتیو تایبەتیشن واتا لە لایـەك خزمەتگوزاری بە قازانجی هەمووو ئەرکی تایبەتی گشتیی بەرێوەدەبەنو لە لایەکی دیکەشەوە سیاسەتو هەنگاوەکانیان زۆر جار بە قازانجی بەشێکی تایبەت لە کۆمەڵگا تەواو دەبێ.

## روخساری گشتیی

دەکرێ ئەرکە سەرەکیەگشتییەکانی دەوڵەت بە چوار بەش دابەش بکرێ: یەکـەم پاراسـتنی هاوپەیوەندی کومەلآیەتیو سیاسی، دووهەم چارەسەری کێشەو ناکۆکیەکان، سێهەم هـەوڵدان بۆ گەیشتن بە مەبەستە سـەرکیەکانی حکومـەتو چـوارەم هـەوڵدان بـۆ خۆگونجانـدن لەگـەڵ بارودۆخی نوێو لە حالّی گۆراندا.

- پێکهێنـانی هاوپەیوەنـدی: یەکـەمین ئـەرکی سـەرەکیو گـشتیی دەوڵـەت پێکهێنـانی هاوپەیوەندی بە بێ لەنێو بردنی فرەچەشنی کومەلآیەتی یە. لە هـەر کومەڵگایەکـدا بـەپێێ دابەشکردنی ئـەرك کومەلآیـەتی، چـینەکان، پلـەو پایـە، دەسـتەبەندیە کومەلآیەتیـەکانو فەرهەنگەکانو تێروانینە جوراوجورەکان بوونی هەیە. هـیچ کومەڵگایـەك سـاکارو یەکدەسـت نیـە، دیارە بەپێی ناکۆکیەکانو کەلێنـەکانی کومەلآیـەتی، ئـابووری، قـەومی، ئـایینیو ... کومەڵگاکان خاوەن ریزبەندی جوراوجورن. گرینگترین هۆکارێك کە لە کومەڵگاکاندا لـە رووی ئابووریـیەوە دەبنـە هـۆی رکەبـەریو ململانـی، کێشەی نـەبوونی سەرچـاوەکانی خـوازراوە [مطلوب] کە خۆی بـەپێی لێکدانـەوەی جوراوجـۆر دەرئـەنجامی کـەمبوونی سەرچاوەی سروشتی، دابەشکردنی نایەکسانی کومەلآیەتیو پێداویستییە روو لە زیاتر بوونە نوێکانە. بـە لەبەرچاوگرتنی ئەم پارادوکسانەو دابڕانە کومەلآیەتیەکانو هاوپیوەندیو بەردەوامی کومەڵگا پـیویستی بە داهێنانی بەها هاوبەشە گشتییەکانە.

دیارە بە روالّەت دامەزراوەکانی، کولتوری، ئایینیو فێرکاری بەرپرسایەتی سەرەکی یان لە خستنە بەردەستو پاراستنی وەها بەهاگەلێکیان لە ئەستودایە. بەلاّم دەولّەت لە مانا بەربلاّوەکەیدا بۆخۆی لە پێکهێنانو سەقامگیرکردنی وەها دامەزراوەگەلێکدا نەخشی سەرەکی هەیە. بە تایبەت دەولّەتە مودیرنەکان تێکوشاون لە رێگای ئایدولوژیەوە هەلّسن، بە پێناسەکردنی کومەلاّیەتی خۆیانو لەسەر فرەچەشنی [موزائیك] یان بەشە پرشوبلاّوەکانی کومەلّگا، ناسنامەیەکی نیشتمانیو کومەلاّیەتیو گشتیی بەرهەم بهێنن. لە بارودۆخی تێپەرین لە کومەلّگای بۆ کۆمەلّگای مودیرن دەرەتانی لێکپچراونی بەهایی زیاتر دەبێ. لە لایەك بەها نەریتییەکان خوراگری دەکەنو لە لایەك بەها نوێکان لە سیستمی کوندا جێی خۆدەکەنەوە. لە هەلومەرجی لاوازبوونی هاوپەیمانی نەریتی، سەرهەلّدانی کومەلّگای بەربلاّو گەشەی خوتەریك کردنەوەو دابرانی تاکیی، هەندێك لە ئایدولوژیەکانو دەولّەتە مودیرنەکان هەولّیان داوە تا بە پێشکەشکردنی چەمکگەلێکی دەرهێنراو [انتزاعی] وەك یەکیەتی رەگەزی، یەکیەتی نەتەوەیی، یەکیەتیی نیشتمانی، یەکیەتیی ئایینیو ... چەشنێك لە هاوپەیوەندی لە کومەلّگادا پێك بێنن.

چارەسەری کێشەو ناکۆکیەکان: لە کاتێکدا کە پێکهێنانی هاوپەیوەندی لەگەلّ بەهاکانی کومەلّگادا پیوەندی هەیە، چارەسەری کێشەکان دەگەرێتەوە بۆ یاساکان. لەسەر یەك بەهاکان، نادیار، نائاگاهانە [ خۆنەویست ]و پێکهاتەیین، بەلاّم رێگاو شێوازەکان رێگاگەلێکی ئاشکراو ئاگاهانەن کە لە چوارچێوەی یاساو ریسادا دەردەکەونو زۆر جار گەرەنتی بەرێوەبردنیان لە پشتە. رێکارەکان هەر ئەو سیستمە یاساییو رێو شوێنە یاسایانەن نییە. لە روانگەیەکەوە، حکومەت هەر ئەو کومەلّە یاسای زالّ لە کومەلّگایەکدایە کە بۆ بەرگری لە سەرهەلّدانی کێشەو چارەسەرکردنیان دانراون. هەر لەم روانگەوە حقووقو سیستمێکی حقووقی بەشێك لە دەولّەتو سیاسەتە. لە هەموو شوێنێك دەولّەتەکان ئەوەی کە بە تاوانو جینایەت دەژمێردرێ دەست نیشانیان دەکەنو سزایان بۆ دادەنێن. سیستمی حقووقی [ یاسا ] دەبێ پارێزگاری گیانو مالّو ئازادی خەلّك بێ. بە واتایەکی دیکە لە ئەرکەکانی سەرەکەی دەولّەت ناوبژیوانی کردن لە نێو تاکەکانی بە شەرِ هاتوون. بە بۆچوونی هەندێك لە مرۆڤناسان حکومەت لە بناخەو سەرچاوەی خۆیدا بۆ ناوبژیوانیو حەکەمیەت دامەزراوە. هەر وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، بۆ نموونە هیرودوت مێژوونووسی بەناوبانگی یونانی سەبارەت بە

سەرچاوەی دەوڵەتی ماد وتوویەکە لە نێو عەشیرەکانی رۆژئاوای ئێران هەموو کات شەڕو کێشە بوو تاوای لێهات ئەوانە کۆبینەوەو دیاکۆ کە سەرۆکی یەکێك لە عەشیرەتەکان بوو وەك ناوبژیوانو حەکەم بۆ ناکۆکیەکانی خۆیان دای بنێنو بەم شێوە بوو کە دەوڵەتی ماد دامەزرا.

## گەیشتن بە ئامانجە گشتییەکانی حکومەت

سێهەمین ئەرکی تایبەتیو گشتیی دەوڵەتەکان، هەوڵ دان بۆ گەیشتن بە ئامانجی گشتیی یان دیاری کراوێکە کە بۆخۆی لەبەر چاوی گرتوون. مەبەستە گشتییەکانی حکومەت زۆر جار لەگەڵ ئامانجە گشتییەکانی کومەڵگا یەکدەگرنەوەو ئەم ئامانجانە لەوانەیە لە سەردەمو دەورانی جیاجیادا، قەوارەو روخساری جیاوازیان هەبێ. بۆ نموونە مەبەستی سەرەکی کومەڵگا لە چەرخی ئیمان گەیشتن بە رەستگاری بوو، بەڵام مرۆڤی چەرخی مودیرن ئیتر بۆ رەستگاری لە قیامەتدا زۆر بە پەرۆش نیەو لەجیاتی ئەو بۆ خۆشگوزرانی لەو دونیادا تێدەفکرێ. دیارە لە سەردەمی ئیماندا دەوڵەت نەیدەتوانی لە ئامانجە سەرەکیەکانی تاكو کومەڵ زۆر دوور بکەوێتەوەو ناچار بوو هەر جۆرێك بوە بۆ وەدیهێنانیان یارمەتی بدا. لە کومەڵگای خۆشگوزرانی ئەورۆشدا کە پەرۆشی یان دڵخۆشی تاکەکان، خۆشگوزرانی دونیاییە دەوڵەتەکان ناتوانن بیر لە خۆشگوزرانی خەڵك نەکەنەوە. هەر بۆیە گرینگترین ئامانجەکانی حکومەت لە دەوڵەتەکانی ئیمڕۆدا ئامانجە ئابووریەکانی دەوڵەتەکان لە سەرەوەی ئامانجە پلەیەکەکاندایەو زیاترین موناقشەیان لە سەردەکرێ.

چوار ئامانجی سەرەکی لە سیاسەتەگەلی ئابووری دەوڵەتەکانی خۆشگوزرانی لەو سەرەدەمەدا بریتین لە: گەشەی ئابووری، سەقامگیری ئابووری، دابینکردنی کارو پیشە بۆ هەمووو پاراستنی هاوسەنگە دەرکەوتە دەرەکییەکان. مەبەست لە گەشەی ئابووری، زۆربوونە بەرهەمو داهاتی نەتەوەییە، مەبەست لە سەقامگیری ئابووری، کونترۆڵی نرخەکانو بەرگری لە ئاوسانی بێسەرەو بەرەیە. دابینکردنی پیشەو کار بۆ هەمووان لە سیستەمە سەرمایەداریەکانی پیشەسازیو نیوەپیشەسازی ئێستا بە چەکێك لە هەلومەرجی دابینکردنی عەدالەتی کومەلایەتی دەژمێردرێ. دابینکردنی ئەم ئامانجانە بەشێوەی هاوکات کارێکی سانا نیەو دژوارەو پیویستی بە سیاسەتدا نانێکی وردو هەڵسەنگیندراوە، لەبەر ئەوە زۆرجار

گەشەی ئابووری، هەندێك ئاوسان لەگەڵ خۆدێنێ‌و سەقامگیری ئابووری لەوانەیە لە گەشەی ئابووری بەرگری بکا. هەروەها دابینکردنی کارپیشەی تەواو هێزی کڕین‌و مەیل بۆ زۆربوونی ئاوسان پەرە پێ‌دەدا.

## خوگونجاندن لەگەڵ هەل‌ومەرجی نوێ:

دەوڵەتە مودیرنەکانی نەتەوەیی لە ناخی کومەڵێك توڕی بەربڵاو لە پیوەندی جوراوجورکاندا هەڵکەوتوون‌و لەگەڵ دەورروبەری خۆ بە ناچاری ئاڵ‌و ویری شت‌ومەك دەکەن. هەروەها ئەم دەرەتانە لە رووی سەربازی، تکنیکی‌و دارایی لەگەڵ یەکتر لە کێبەرکێ دان هەر بۆیە پێشکەوتنی تکنیکی‌و سەربازی دەوڵەتەکان پشتی رکەبەری‌و هەستی چاکسازی‌و نوێ‌کردنەوەی دارایی‌و تکنیکی لەواندا بەهێز دەکا.

بەگشتی دەکرێ بڵێین کە دەوڵەتە مودیرنەکان لە بنەمادا نوێخوازیشن‌و هەروەك بوونەوەرەی ئورگانیك‌و زیندوو، دەبوایە بۆ گەشەی مانەوەی خۆشیان، لەگەڵ بارودۆخ خۆ رێکبخەن. کاتێك پلەی گەشەکردن لە بەشێك لە جیهاندا دەچێتە سەر دەرئەنجام لە پانتای جیهاندا "نا رێك‌وپێکی لە گەشەکردندا" سەرهەڵ دەدا، بەشەکانی دیکە تێ‌دەکۆشن خۆیان بگەیننە پلەی پێشکەوتووتر. نوێژەن کردنەوەو پیشەسازی بوون‌و پەرەگرتنی تواناکانی تکنیکی‌و سەربازی‌و دارایی دەوڵەتەکانی ئورووپای رۆژئاوایی، لە شەپۆلی یەکەمی گەشەکردن مونافسەیەك لە نێو ولاتانی ئورووپای ناوەندی‌و رۆژهەلاتی‌و لە شەپولی دووهەمی گەشەکردن لەنێو ولاتانی ئاسیایی دا خستەرێ. هەستکردن بە دواکەوتوویی لەو ولاتانەدا بوو بە هۆی سەرهەڵدان‌و بەهێز بوونی مەیل‌و هەستی ناسیونالیستی کە خۆی یەکێك لە هەڵخرێنەرەکانی سەرەکی نوێ‌کردنەوەو پەرەسەندن لە کومەڵگاکاندا بوە. بەم هۆیەیە کە ناسیونالیزم زۆر جار لەگەڵ دۆخێکی لاواز لە رووی دەسەلاتی نیونەتەوەیی رووبەروو بوە. ئالوین تافلر لە کتێبی شەپولی سێهەم باسی لە سێ شورشی کشت‌وکاڵی، پیشەسازی‌و زانیاری کردووە. لە رابردوودا ولاتانی روو لە کەشە تێ‌دەکۆشان تا خۆیان لە قۆناخی یەکەم بگەیەننە قۆناخی دووهەم بەلام ئێستا خۆگونجاندن لەگەڵ هەل‌ومەرجی نوێ پیویستی بە وەرگرتنی گوڕان لە تکنولوژیای پیوەندی‌و زانیاریيە.

## روخساری تایبەتی

لە هەر کومەڵگایەکدا هەندێك گرووپ لە پیوەندی لەگەڵ دەوڵەتدا خاوەن شوێنێکی ئیستراتژیك‌و نایابن، خاوەن توانایی‌یەکی زۆری داراین، لەگەڵ گرووپەکانی دەسەڵاتدار پیوەندی نزیکیان هەیە توانای ئەوەیان هەبە کاریگەری لەسەر دەوڵەت دابنێن‌و دەوڵەتیش پیویستی زۆرتری پیانە. یەکێك لە موناقیشە سەرکیەکان لە فەلسەفەی سیاسی‌دا ئەوەیە کە ئایا بەراستی دەوڵەت نوێنەری قازانج‌و بەرژەوەندی گشتی‌یەو یان لە پشت ئەو دروشمە باوە روخساری راستەقینەی دەوڵەتەکان شاردرانەتەوەو ئەویش ئەوەیە کە دەوڵەت لە کومەڵگای چینایەتی‌دا ناتوانێ پارێزەری قازانجی گشتیی بێ، بەڵکوو نوێنەرایەتی قازانجی بەشێك لە کومەڵگا لە بەرانبەر بەشەکانی دیکەدا دەکا. ئەوانەی کە لە بناخەدا دەوڵەت وەك دامەزراوەگەلی گشتیی دەزانن، بڕوایان وایە کە شوێن‌و پێگەی دەوڵەت پۆستێکی تایبەتەو هەرکەس لەو پۆستەدا بێ، لە قازانج‌و بەرژەوەندی گشتیی باشتر تێدەگا، هەروەك گەمیەوانیك کە ماکیاولی وەك نموونە لە سیاسەتوانان دەیهێنێتەوە کە قازانجی گەمیەکە لە هەموو سەرنشینەکانی گەمیەکە باشتر دەزانێ‌و هەرکام لە گەمیە نشینەکان بچنە جێی ئەو بەرژەوەندی گشتیی‌و پیویستی لەبەرچاو گرتنی هەست پێدەکەن. لەم روانگەوە سیاسەت پیشەی کە ناسینی قازانجی گشتیی‌یە. لە بەرانبەردا رووناکبیرانی‌تر وەك مارکسیستەکان دەوڵەت وەك دامەزراوەیەکی تایبەتی چاوی لێدەکەن کە دەبێتە هۆی داسپانی ئیرادەو قازانجی بەشێك لە کومەڵگا بە سەر بەشەکەی دیکەدا. مارکس رەخنە لە تیوری دەوڵەتی هیگل لە سەر روخساری تایبەتی‌و کومەڵایەتی دەوڵەت دەگرت. هیگل پێی وابوو کە دەوڵەت مەیدانێکی سەربەخۆ لە هێزە ئابووریەکانی کومەڵگای مەدەنی‌و سەرچاوەی ئەقڵ‌و قازانجی گشتیی‌یە. بەڵام مارکس پێی وابوو کە دەوڵەتی مودێرن نەك ئەوەی کە لە باری کومەڵایەتیەوە بێ لایەن نیە، بەڵکوو شتێك بێجگە لە کۆمیتەی بەرێوەبەری چینە دەسەڵاتدارەکان نیە "دەوڵەت لە کۆمەڵگای سەرمایەداری دا بە بەرژەوەندی چینی دەسەڵاتداری دارا وەك بەرژەوەندی گشتی لە قەڵەم دەداو بەوانە لە چوارچێوەی ئیرادەی دەوڵەت‌و یاسادا روخسارێکی گشتیی پێدەبەخشێ. لینینیش دەوڵەتی مودێرنی وەك "مەکینەی دەسەڵاتی چینێك بە سەر چینێکی دیکەداو ئامرزای چەوسانەوەی هێزی کاری مووچەبگیر بە هۆی سەرمایە" وەسف دەکرد. کەوابوو بەپێی بۆچوونی ئەو دەوڵەتە

مودیرنەکان، دەوڵەتگەلی چینایەتین. بەشێوەیەکی گشتی تر لە روانگەی مارکسیستەکانەوە سەرهەڵدانی دەوڵەت بەرهەمی سەرهەڵدانی موڵك داریەتی تایبەتی بوو. خاوەنانی کەرەسەی بەرهەمهێنان دبۆایە ئاسایشی مۆڵکداریەتی خۆیان مسوگەر بکەنو دەوڵەت لەو پێویستییەوە لە دایك بوەو بووبە دەزگای زاڵی چینی بە دەسەلات بەسەر چینەکانی دیکەدا. کەوابوو ئەمنیەتو ئاسایشێك کە حکومەتەکان دابینی دەکەن لە بناخەدا بۆ پاراستنی موڵکداریەتی تایبەتیو خاوەنانی کەرەسەی بەرهەمهێنان بوو. هەر چەند هەموو دەوڵەتەکان هەندێك ئەرکی تایبەت وەك پاراستنی ئاسایشو بەرگری دەرەکیش بەرێوەدەبەن، بەڵام ئەمە بەو مانا نیە کە دەوڵەت بە یەك رادە لە خزمەتی قازانجی هەموو چینەکانی کومەڵایەتی دایە.

هەروەك پێشتریش باس کرا، دەوڵەتەکان لە لایەك هەندێك ئەرکی سەرەکی گشتیی بەرێوە دەبەنو دەمودەزگای دیوانی بەربلاویان بۆ ئەم مەبەستە پێك هێناوەو بەپێی قەوارەو ناوەرۆکی کومەڵایەتی خۆیان، کەمو زۆر بۆ دابینکردنی خزمەتگوزرای گشتیی هەنگاو هەڵدەگرن. بەڵام لە لایەکی دیکەوە گومانی تێدانیە کە دەوڵەتەکان خاوەن روخسارە تایبەتەکانیشنو لە هەموو شوێنێك: گرووپی هەڵکەوتوو، دەست رۆیشتوو بوونیان هەیە کە لەسەر چاوەگەلی جوارجوری دەسەلات کەڵك وەردەگرنو لەسەر سیاسەتەکانی دەوڵەت کاریگەرییان هەیەو تەنانەت دەوڵەتەکان دەکەنە داردەستی خۆیان. ئێستا پرسیاری سەرەکی ئەمەیە کە تا چ رادەیەك بە چ هۆگەلێك دەوڵەتەکان زۆرتر روخساری تایبەتیو چیننایەتی پەیدا دەکەنو یان لە چینی ناوەندی پەراوێز دەگرنو زیاتر روخسارێکی گشتیو خۆشگوزەرانی بەخۆوە دەگرێ.

پیوەندی دەوڵەتو چینە کۆمەڵایەتیەکان یەکێك لە باسە سەرەکییەکانی شوناسی قەوارەکانی دەوڵەتە. بە بەستراوەیی دەوڵەت بە هێندێك لە چینەکانو هێزە کۆمەڵایەتیەکان بەتایبەت چینی زاڵی ئابووری یان سەربەخۆیی رێژەی لەوەها چین گەلێك لە رێزبەندی کومەڵایەتی دەوڵەتو تێکوشانو کردەوەی کاریگەریەکی دیاری هەیە. رادەی بەستراوەیی (یان بوون بەکەرەسە یان داردەست) دەوڵەتو یان سەربەخۆی رێژەیی لە گرووپەکانو چینە زاڵەکانی ئابووری بە چەند هۆوە بەستراوەتەوە: یەکەم لە کاتێکدا کە چینی زاڵی ئابووری خاوەن یەکیەتیو رێکخستنو ناوەندیەتی هەبێ، دووهەم لە کاتێکدا چینە نێوەنجو خوارەکان خاوەن رێکخراوو یەکیەتییو ناوەندیەتیو ئەندیشەی ئایدولوژیکیو یەکگرتوویی پیویست نەبن.

سێهەم کاتێك چینو گرووپەکانی کومەلایەتی کۆن بەهۆی مێژوویی کەم بوویێتەوەو چوارەم کاتێك رادەی هاوپەیوەندیو تێکەڵی نێوان کاروباری کومەلایەتی تایبەتێك وەك سوپا، رووناکبیرانو روحانیەکان لەگەڵ چینەزاڵەکانی سەرەوە بێ، بەستراوەیی دەولەت بەم چینانە زیاتر دەبێ. بە پێچەوانە لە کاتێکدا ناکۆکی نێوخۆییو کەلێن لە نێوان چینی بە دەسەلاتی ئابووریدا ببێ، چینی کرێکار رێکخستنیو بەشداریان زیاتر ببێ، بەردەوامی دەسەلاتی چینە کومەلایەتیە کۆنو دژایەتی لە نێوان کاروباری کومەلایەتی ناوبراو لەگەڵ چینی زاڵی ئابووری، سەربەخۆیی رێژەیی دەولەت زۆرتر دەبێ.

لە پیوەندی لەگەڵ هۆکاری یەکەم، لە کومەڵگای مودیرندا لەگەڵ پەرەگرتنی ئالۆزی لە پێکهاتەی سامانو دارایی [سەرمایە]، کەلێنەکانی نێوخۆیی لە چینەکانی سەرمایەداردا زیاتر دەبێ. دەرئەنجام لەوانەیە سەرمایەی بازرگانی پیشەسازی، سەرمایەی گەورە لە بەرانبەر سەرمایەی بچووك، پێشەسازی کار خواز لە بەرانبەر پیشەسازی سەرمایەخواز، سەرمایەی کێبەرکێ لە بەرانبەر سەرمایە پاوانکراوو ... رادەوەستێ. بەو رادەیە ناکۆکیو دژ بە یەکیی نێوخۆیی سەرمایە توندتر ببێ، ئەگەری زاڵ بوونی سەرانسەر یەکەی کەم دەبێتەوە. لە پیوەندی لەگەڵ هۆکاری دووهەم، سەرهەلدانی چینی کرێکار وەك هێزێکی سیاسی رێکخراو لەسەر رادەی بەستراوەیی دەولەت بە چینی سەرمایەدار کاریگەری دەبێ. لە کومەڵگای رۆژئاوایی دا کاریگەری سیاسی بزوتنەوەی کرێکاری لە کوتاییەکانی سەدەی نوزدەهەمدا ئاشکرا بوو. دەرەتانی بەشداری ئاشتیخوازانەی رێکخراوە کرێکاریەکان لە حکومەتدا، دەرکەوتنی دەولەتگەلی خوشگوزرانی [رفاهی]، بەخشینی هەندێك ئاوانتاج بە چینی کرێکارو رێكوپێککردنی پیوەندی کارو سەرمایە لە نێوخۆی دامەزراوە دەولەتیەکان لە دەرئەنجامەکانی رێکخراوەیی سیاسی چینی کرێکار بووە.

لە پیوەندی لەگەڵ هۆکاری سێهەم، هەر چەند دەسەلاتی چینەکانی پێش سەرمایەداری [کاپیتالیزم] وەك ئولیگارشی گەلی ملکدار، ئەشرافیەتو فەلاحەکان لە بارودۆخی مودیرن بەردەوامیو پتەوی زیاتری هەبێو هەر ئەندازە کانالی دەست پێڕاگەیشتنیان بە سەرچاوەی دەسەلاتی دەولەتی زیاتر بێ (و لە کاتێکدا کە قازانجی کومەلایەتیەکەیان لەگەڵ قازانجی چینە نوێکانی سەرمایەداری هاوئاهەنگ نەبێ)، لە ئەگەری بەستراوەیی دەولەت بە چینی سەرمایەدار کەم دەبێتەوە. لە ئەسپانیا، پورتەقالو زۆر لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین دەسەلاتی

ئولیگارشیەکانی ملکدار تایبەتمەندی سەرەکی پێکهاتەی دەسەلآت بوە. لە پیوەندی لەگەلّ هۆکاری چوارەم، رادەی تێکەلّی قازانجو یەکیەتی فیکری نێوان کاروباری کومەلآیەتی وەك سوپا، روحانیەکانو گرووپە روناکبیریەکان لە لایەكو چینە نوێکان لە لایەکی دیکەوەو هەروەها رادەی ئەگەری دەست پێڕاگەیشتنی ئەو پێکهاتانە بە دەسەلآتی دەولەتیو دیوانی بەسەر ریزبەندی کومەلآیەتی دەولەت سەبارەت بە بوون بە داردەست یان سەربەخۆیی رێژەیی کاریکەریەکی بەچاوی دەبێ. هەرچەند هاوئاهەنگی نێوان قازانجی مادیو مەیلی فیکری ئەو پێکهاتانە لەگەلّ چینی بە دەسەلآت زۆرتر بی، دەست پێڕاگەیشتنیان بە دەسەلآت بە قازانجی چینی زالّی سەرمایەدار تەواو دەبێ. بەپێچەوانە بە بوونی ناکۆکی مادیو فیککری لە نێوانیاندا، ئەگەری دابەزینی دەسەلآتی سەرمایەدار زۆرتر دەبێ. بە واتایەکی دیکە رادەی هاوپەیوندەی چینی سەرمایەدار لەگەلّ باقی هێزە کومەلآیەتی ـ سیاسیەکان وەك ئولیگارشیەکانی خاوەن ملك، دامەزراوە ئایینیو سوپا لەسەر هێزیان لاوازی سیاسی ئەو چینە کاریگەری بوە.

لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە باسکرا پیوەندی نێوان دەولەتو کومەلّگا لەوانەیە قەوارەی جوراوجور بە خۆیەوە بگرێ. بەواتایەکی دیکە لەسەر چونیەتی شێوەی پیوەندی دەسەلآتی دەولەتی لەگەلّ چینەکانو کاروباری کومەلآیەتی جۆرگەلێك لە دەولەت بوونی هەیە.

لەم پیوەندیەدا دەولەت لەوانەیە بەستراوە بە یەك یا چەند چینو گرووپی کومەلآیەتی بێ. لەوانەیە ئیتیلافێك لە هێزە کومەلآیەتیەکان وەك پێگەی کومەلآیەتی دەولەت دەر بکەوێ، لەوانەیە دەولەت نوێنەری راگرتنی بالانسو هاوسەنگی چینەکانو هێزەکانی سەرەکی لە کومەلّگادا بێ، لەوانەیە خۆی بالانسێكو تەوازونێك [هاوسەنگی] لە نێوان ئەواندا پێك بێنێ، لەوانەیە دەولەت ژێردەستەی چینی زالّی ئابووری بێ، لەوانەیە دەولەت قازانج و بەرژەوەندی چینە کونەکان لە بەرانبەر چینە نوێەکاندا رێنك بخا و لەوانەیە لە سەرەوەی چینە بە دەسەلآتەکان چینە بێ دەسەلآتەکان هارووژێنێ. شێوازو قەوارەی پیوەندی دەولەتو هێزەکانی کومەلآیەتی لەژێر تاتێلو ناوی دیارتریشدا وەسف کراوە: دەولەتی چینایەتی، دەولەتێکە کە ئامرازی پێش بردنی بەرژەوەندی چینی بە دەسەلآت بێ (وەك دەولەتی لیبرالو چینی سەرمایەدار، یان دەولەتی پارێزگارو چینی مولکدار)، دەولەتی ریزپەر [استثنایی] یان بوناپارتیستی دەولەتێکە کە نوێنەری بالانسو تەوازونی چینەکان بێ، دەولەتی کورپوراتیستی

[ corporatisty ] یان کومپانیایی دەوڵەتێکە لە نێوان بەرژەوەندی چینە جیاوازەکانـدا بالانس‌و تەوازونێك لە رووی هێزی سیاسی پێك بێنێ.

## چالاکی سیستمە سیاسیەکان بە پێی پێگەکانی دەسەڵات

هەر وەك دیتمان چوار روخسار یان کومەڵـەی سـەرەکی حکومـەت واتـا زۆر، ئایـدولوژی، روخساری گشتیی‌و روخساری تایبەتی لە هەموو سیستمە سیاسیەکاندا دەست دەکـەوێ. بـە واتایەکی دیکە لانی کەمێك لە هەر کام لەم روخسارانە بۆ دەوڵەت پیویـستەو ناتوانـێ خـۆی لـێ لابدا. هەموو سیستمە سیاسیەکان کەم‌و زۆر خاوەن دەم‌و دەزگای زۆر کردنن، ئایدولوژی‌و بروایی بۆ پاساوانی دەسەڵاتی خۆی نیشان دەدەن، لانی کەمێ لە خزمـەتگوزاری بـۆ هـەموان وەك دابینکردنی هێمنی‌و ئاسایش بەجێ دەگەێنن‌و زیاتر بەشگەلێکی تایبـەتی لـە کومـەڵگا کە بەرژەوەندیان پارێزراوە پشتیوانی لـێ دەکـەن. بـەڵام ئـەوەی کـە دەبێتـە هـۆی ئـالوگۆڕو چالاکی ریژیمە سیاسـییەکان، کرانـەوەو وەخوهاتنـەوەی [انبـساط و انقبـاض] هـەرکام لـەم روخسارانەیە بەپێی ئەوەی کە کام یـەك لـە چـوار روخسارە ناوبراوەکـە روخساری سـەرەکی دەوڵەت پێك دێنێ، چوار گرووپی گەورە لـە سیـستمە سیاسـییەکاندا دەکـرێ دەسـت نیـشان بکرێ: یەکەم سیستمگەلی دەسەڵاتخواز کە زیاتر پشتیان بە دەسەڵات‌و زۆرو دەزگای سەرکوت بەستوە‌و بۆخۆی لەوانەیە قەوارەی جوراوجوریان هەبێ، دووهەم سیستمگەلی ئایدولوژیك کە لە بنەمادا پشت بە ئایولوژییەکی گشتیی‌و بەربلاو دەبەستن، سێهەم سیستمگەلی خۆشگوزەرانی [رفاهی] کە روخساری سەرەکی خۆی لە دابینکردنی خزمەتگوزرای گشتییدا ئاشکرا دەکات‌و چوارەم سیستمگەلی چینایەتی کە زیاتر پشت بە بەرژەوەندی بەشێکی تایبەت لە کومـەڵگادا دەبەستێ.

گۆڕانی سیاسی دەرئەنجامی لاوازبوونی یەکێك لە کوڵەکەکانی دەوڵـەت‌و پـشتبەستنی بـە کوڵەکەیەکی دیکەیە. بە واتایەکی دیکە قەیرانی دەسەڵاتی سیاسی (روخساری زۆر)، قـەیرانی رەوایـی (لـە روخـساری ئایـدولوژی)، قـەیرانی کارلێهـاتوویی (لـە روخـساری دابینکردنی خزمەتگوزاری گشتیی)‌و قـەیرانی دەرئـەنجامی کـزی پـشتیوانی کومەڵایـەتی دەوڵـەت (لـە روخـساری دابینکردنـی قازانجـەکانی تایبـەتی) دەوڵەتـەکان هـان دەدەن بـۆ سـەقامگیری‌و پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆیان روو لە سیاسەتگەلی دیکـە بکـەن‌و روخـسارێکی دیکـە لـە خـۆ

نیشان بدەن، بۆ نموونە کاتێك دەوڵەتەکان تووشی قەیران لە دابینکردنی خومەتگۆزاری گشتییدا دەبن (واتا قەیرانی کارلێهاتوویی) زۆر جار روو لە ئایدولوژی‌سازیو پەرەپێدانی دەزگای دەسەلاتو سەر کوت دەکەنو یان کاتێك لەگەڵ ئاریشەی رەوایی‌و لاوازی ئایدولوژی رووبەروو دەبن، تێدەکۆشن لە رێگای دابینکردنی خزمەتگوزاریو خۆشگوزرانی کەمیی رەوایی خۆیان قەرەبوو بکەنەوەو یان ئەگەر لەم بوارەدا توانایی نەبوو، دەست دەکەن بە تەیارکردنی کەرەسەکانی زۆرو دەسەلات. لە بارودۆخێکدا کە دەوڵەتەکان دەرەتانی دابینکردنی قازانجەکانی گشتییو یان تایبەتی بە رادەیەکی بەرچاویان نەبوو،دەست دەکەن بە وروژاندنی خەڵکو پەنا بۆ ئایدولوژی دەبن.

لەم ساڵانەی دوایی دا لاوازکردنی روخساری خۆشگوزەرانی دەوڵەتە رۆژئاوایەکان لە رێگەی دەست هەڵگرتن لە سیاسەتەکانی کینزیو دەست تێوەردانی ئابووری رووکردنە تایبەتی کردن، بوونە هۆی سەرهەڵدانی نارەزایەتیو پشێویو هەندێك لە دەوڵەتە رۆژئاواییەکان ناچار بوون، بۆ سەقامگیری دەسەلاتو بەرەوپێش بردنی سیاسەتەکانی خۆیان لە بەرانبەر نارەزایەتی دەربرینی کومەلایەتیدا راوەستنێ. کەوابوو لەگەڵ داکشانی رەوایی دەوڵەتەکان، دەرەتانی پەنابردن بۆ زۆر زیاتر دەبێ. بەشێوەی گشتیی‌تر ئەگەر دەوڵەت نەتوانێ ئەرکی سەرەکیو گشتیی خۆی بە باشی بەرێوەبەرێ، بۆ نموونە هاوپەیوەندی کومەلایەتیو پڕبەها بێنێتە کایەوە، یان لە رەوتی گورانکاریەکانی گشتیی دا دوابکەوێو یان بۆ چارەسەری ململانێو کێشە گرینگەکانی کومەلایەتی کەمتەرخەم بێ، ئامادەیی بۆ بە کارهێنانی زۆر زیاد دەکا. لە بارودۆخێکدا کە پیویستی مالیی دەوڵەت بەهۆی جوراوجور وەك شەڕ زیاتر دەکا، دەوڵەت ناچار دەبێ پشت بە سەرچاوە مالیەکانی چینە بالاکان ببەستێو ئەمە بۆخۆی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی دەوڵەتو ئەو چینانە، ریفورمی مالییو ئابووری بە مەبەستی هاوسەنگ کردنی سیستمی کومەلایەتیو یان لە راستای گەشە پێ‌کردنی ولاتیش، زۆرجار دەبێتە هۆی لاوازی روخساری تایبەتی دەوڵەتو یان سەرهەڵدانی ناکۆکی لەو روخسارەداو دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕ لە هەڵوێستەکانی دەوڵەتداو جاری واش هەیە کە پەنابردن بۆ دەسەلاتو زۆر زیاتر دەکا.

رەوایی دەوڵەتەکان لەوانەیە بەهۆی جوراوجور دابشکێو ببێتە هۆی ئاڵوگۆڕ لە روخساری دەوڵەتدا.

سـەرهەڵدانو پـەرەگرتنی ئایدولۆژییـەکانی نـوێ لـە دەرەوە، دەرکـەوتنی لێکدانـەوەو خوێندنەوەی نوێ لە ئایین، ئایدولوژی یان نەریت لەنێوخۆ، دەرکەوتنی رێبەرانی کاریزماتیـکو بزووتنەوەی کومەلایەتی لە دەوروبـەریانو ... دەبێتـە هـۆی دابـەزینی رەوایـی دەولەتـەکان. نارازی بوون زۆر دەرئەنجامی هەلـسەنگاندنی دوو بارودۆخەو ئاریشەی رەوایـیش شـێوەیەك لـە نارەزایەتی سیاسییە. ئاریشەی رەوایی لەوانەیە لە ئاستی جوراوجوردا بێتە پـێش: یەکـەم لـە ئاستی سەرەتایی کاتێك کە لێهاتوویی دەسەلاتداران وەك تاك لە حکومـەت کردنـدا گومـانی لەسەر بێ. دووهەم لە ئاستێکی قـوولتر کاتێـك کـە گومـان بکەوێتـە سـەر لێهـاتوویی ئـەو سیاسەتانە کە گیراونەتە بەرو سێهەم لە قوولترین ئاستدا کاتێك هەموو یاساکانی حـاکم واتـا دەستوورو سیستمی سیاسی لەلای بەشی سەرەکی خەلك رەوایی خۆی لەدەست دا بێ.

لە کۆتاییدا ئەگەر بمانەوێ نموونەیەك بێنینەوە، دەبێ بلێین کە دەولەت بوونەوەرێکی چـوار روخسارەیە یان چوار دەمو چاوی هەیە: روخسارێکی گرژو ترسناك (روخساری دەسەلاتی زۆر)، روخسارێکی خاوەن مافو پاساوگەر (روخـساری ئایـدولوژی)، روخـسارێکی خێرخـوازو پیـاو چاکانە (دابینکردنی خزمەتگوزاری گشتی)و روخسارێکی فیلمبازانەو تەماحکار. بەو حالەش خەلکی بەگشتیی لەگـەل هـەموو روخـسارەکان رووبـەروو نـابن، زۆر جـار جینایەتکارەکان، موخالفەکان، نارازیەکان، رووناکبیرانو کەسانی وەك ئەوان لەگەل روخـساری زۆرداری دەولـەت رووبەروو دەبن، خـەلك بەگـشتیی کـە خـەریکی ژیـانی رۆژانـەی خۆیـانن، زۆر جـار لەگـەل ئایدولوژیو پاساوگەردا رووبەروو دەبن یان لەگەل روخساری خێرخـوازو خێرومەنـدی دەولـەت زیاتر ئاشنایەتیان هەیە. بەپێچەوانە بازرگانەکانو خاوەنانی دارایـیو سـەرمایەگوزارەکان زۆر جار لەگەل روخساری تایبەتی دەولەت رووبەروو دەبن.

## ـ ٨ ـ

## قوتابخانەکان [مکاتب] و ئایدولوژیگەلی سیاسی

ئایدولوژیە سیاسییەکان لە راستیدا پێشنیارگەلێکن بۆ بیچمی رێکخـستن بـۆ دەولـەت لـە سەردەمی مـودێرن بـۆ بەردەسـت هێنـانی ئامانجگـەلێکی تایبـەتی وەك ئـازادی، دادوەری، خۆشگوزرانی، ئەمنیەتی فیکـریو ... پـاش لەنێوچـوونی دەولـەتو سیـستمگەلی نـەریتی، دەرەتانی رێکخستنی دەولەت بە شێوەی جوراوجور لە سـەردەمی نوێدا هاتـە کایـەوە. بۆیـە

سەردەمی مودێرن شایەتحالی سەرهەڵدانو پەرەگرتنی ئایدولۆژیە جوراوجورەکان بوە. هەر کـام لەو ئایدولۆژیانە دەربڕی ویستو بـەرژەوەنی گروپـەکانو چینەکانی کومەڵایـەتی جوراوجـور بوونو تێکۆشاون دەوڵەت لەسەر بنەمای ئامانجو بنەماکانی ئەو گرووپو چینانە رێك بخـەنو بێنە خشینن.

لەسەردەمی نوێدا، باسەکانی فەلسـەفەی سیاسـی کـۆن، لـە چوارچـێوەی ئایدولۆژیەکانـدا خراونەتە روو. ئایدولوژیە سیاسیەکان هەر چەند وەسـفی دیاردەکـانو راسـتیەکانی سیاسـیش دەکەن، بەڵام لە نیهایەتدا راسپاردە یینو بیچمکی تایـەت لە سیـستمی سیاسـی بـەپێی ئـەو بەهاگەلە کە بۆ خۆیان لایان پەسەندە پێشنیار دەکەن. سیستمە سیاسییەکان بە رادەیـەکی زۆر رەنگدانەوەی وەدیهاتنی ئایدولوژیە سیاسـییەکانن، هـەر چـەند لـە قـەوارە بەنـدی ئەوانـەدا هۆکاری زۆرتر وەك ، نەریت، کولتور، مێژووو سیستمی ئابووری کاریگەرییان بوە.

لێرەدا هەندێك لە گرینگترین ئایدولوژیەکانی سیاسی مودیرن شی دەکەینەوە.

## پارێزگاری [کۆنەپارێزی]

ئایدولوژی پارێزگاری لەسەر پیرۆزی [قداسـت] نەریتـەکان، موڵکـداری، بنەماڵـە، ئـایین، دەوڵەتو دامەزراوەکانی دیکەی جێکەوتووو کۆن پـێدادەگرنو لەگـەڵ هـەر چەشـنە پـلانو ئەندیشەی فیکریو شورشگێرانە بۆ پێکهێنانی ئاڵۆگۆڕی قووڵ تیایاندا دژایـەتی دەکـەن. بـۆ ریشەی مێژوویی ئایدولوژی پارێزگاری دەبێ لە دژکردەوە بەرە وتە ئەقلانیـەکانو بزووتنـەوەی رووناکبیریو لیبرالیزمی رۆژئاوادا بگەرێی. پارێزگارەکان هەر لە سـەرتاوە لەگـەڵ ئەندیـشەی سەرەکی نوێخوازی رۆژئاوایی وەك تاکگەرایی، ئازادی، یەکسانی، ئەقلگەراییو جیایی ئـایین لە سیاسەتو دەوڵـەت دژایـەتیان دەکـردو لەریزبەنـدیو ئاوانتاجـەکانی [ئیمتیـاز] نـەریتی دیفاعیان دەکرد. بنەماکانی ئایدولوژی پاریزگاران بەشێوەی خوارەوە کورت دەکرێتەوە:

١ـ **دژایەتی لەگەڵ ئەقلانیەت:** پاریزگارەکان لە بناخەدا لەسەر ئەوە کە بکرێ سروشـتی مرۆڤ بە یارمەتی ئەقل چاکسازی تێدا بکرێ رەشنیننو ئـەقلی مرۆڤ لـە بەرانبـەر ئـەقلی گشتی تردا کە لە نەریتو یان ئایین دا شاردراونەوە بەبێ بایەخ لە قەڵەت دەدەن. بە بۆچـوونی ئەوان ئەقل بۆخۆی پەیرەوی لە هەوەسی مرۆڤ دەکاو بۆ هاندەری سەرەکی کردەکـانی مرۆڤـ دەبێ لە هەوسەکانو مەیلە سروشتیەکاندا بگەرێی.

**٢ـ بەرگری لە ئایین:** بە بۆچوونی پاریزگارەکان مەبەستو ویستی ئیلاهی لە ژیانی مرۆڤدا هاتوەو مافو ئەرکەکانی مرۆڤەکان لەوەوەیە. ئەقلی سنووورداری مرۆڤ ناتوانێ لە پیویستییەکانی ئەو تێبگا. ئایینو پاریزگاری هەر دووکیان لەسەر ناتەواوی زانیاریو شوناسی مرۆڤ و پێویستیی پارێزگاری لە نەریتەکانو ریزبەندی دەسەلات تەئکید دەکەن.

**٣ـ نایەکسانی سروشتی مرۆڤەکان:** بەپێی بۆچوونی پاریزگارەکان نایەکسانیەکانی کومەلایەتیو ئابووری، دیاردەیەکی سروشتییەو هەر هەولدانێك بۆ لە نێو بردنی لە رێگای سیاسییەوە لەگەل تێکشان بەرەوروو دەبێ. تەنانەت درێژەکێشانی نایەکسانی کومەلایەتی پیویستی بەرەوپێشچوونی کومەلگایە، چوونکە نایەکسانی هاندەری سەرکیە بۆ کارۆ تێکوشانی مرۆڤەکان. هەولدان بۆ پێکهێنانی یەکسانی دەستکرد لە کومەلگادا دیکتاتوری لێ دەکەوێتەوە.

**٤ـ پیروزیی مولکداریەتی:** پارێزگارەکان مولکداریەتی وەك بنەمالەو ئایین بە دامەزراوەیەکی پیروز دەژمێرنو پێیان وانیە پێویستی بە پاساودان ببێ. پارێزگارە کۆنەکان مولکداری زەوی بە تایبەت بە پیرۆز دەزانو مولکداری تیجاریو پیشەسازی یان زۆرلا گرینگ نەبوو، بەلام پارێزگارە نوێیەکان هەنووکە بەرگری لە بازاری ئازادو هەموو چەشنە مولکداریەك دەکەن.

**٥ـ تێروانینی باوکسالارانە:** پارێزگارەکان دەولەت بە درێژەی بنەمالەو دەسەلاتەکەی وەك دەسەلاتی باوك لێکدەدەنەوە هەر بۆیە باوکسالاری سیاسی، وەك دیاردەیەکی سروشتی حیسابی بۆ دەکرێ. هەر لەم شێوە لە حکومەتدایە کە بەرژەوەندی تەواوەتی کومەلگاو دەولەت لەبەرچاو دوەگیرێ. لەبەر ئەوەی تاکەکانی مرۆڤ وەك یەك زاناو تێگەیشتوو نینو جیاوازیەکانیان سروشتییە، هەلکەوتوەکان دەبێ هەموو خەلکی رێنوێ‌ی بکەنو رێیان پێ نیشان بدەن.

بەشێوەی گشتیی پارێزگاری لە دژایەتی لەگەل لیبرالزم سەری هەلداوەو لە بەرانبەر ئەندیشەی ئازادیو دێموکراسی و یەکسانی کومەلایەتی، لە دابو نەریتەکانو پلە بەندی کومەلایەتی، بەکار هێنانی کونترول لەسەر کومەلگاو دەولەت، زانستو ئەخلاقی نەریتی، باوکسالاری کومەلایەتیو سیاسیو هەلکەوتووخوازی [نخبەگرایی] پشتیوانی دەکا.

## لیبرالیزم

مانای سەرەکی ئایدولوژیای لیبرالیزم، ئازادی هاوولاتیان لەژێر سێبەری حکومەتدا لە چوارچێوەی یاسا دایە. مەبەستی سەرەکی ئایدولوژی لیبرالیزم لە سەرەتای سەرهەلدانی، خەبات دژی دەسەلاتی رەهاو تاکرەوانەو دیکتاتوری بووەو لیبرالیزم لە سەرەتادا بە دژی حکومەتی رەهای کەنیسە لە رۆژئاواو پاشان لە بەرانبەر حکومەتی شاکانی رەهادا هەلسایەوەو لە جێی دەسەلاتی دیکتاتۆری‌و سەرەرۆ، دەسەلاتی یاسایی، ئامانجی سەرەکی لیبرالیزم بوە، هەر بۆیە یاساخوازی، جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان، لەبەرچاو گرتنی مافی مرۆڤ و حکومەتی دامەزراوە لەسەر نوێنەرایەتی لە بنەماکانی لیبرالیزم بەحیساب دەهاتن. هەندێ لە نووسەرەکان، لیبرالیزم وەك تیۆری حکومەتی سنووردارو لایەنگری ئازادی تاك لەگەڵ سیستمی بازاری ئازادو ئابووری سەرمایەداری بازاریی بەستراوەیەك دەزانن. ئەو هاوپەیوەندکی‌و هاورایی یە هەر چەند لە رووی مێژوویی‌یەوە بوونی هەبوە بەلام بەپێی مەنتیق زەروورەتی نیە.

لیبرالیزم خوازیاری دابین‌و لەبەر چاوگرتنی مافی یەکسانی بۆ هەموو شارومەندێك بە بێ لەبەر چاوگرتنی ئایین، قەومیەت، رەگەز، چین، نیرومێیی‌و ... بوە. هەمووان لە بەرانبەر یاسادا یەکسانن، مافە سەرەکیەکانی شارومەندان لە روانگەی لیبرالیزم بریتین لە: ئازادی بیروباوەر، ئازادی بەیان، ئازادی کۆبوونەوە، ئازادی یان مافی مولکداری، ئازادی بەشداری لە ژیانی سیاسی چ بە دەنگدان‌و چ بە وەرگرتنی پۆست‌و ...

تۆخمە سەرەکیەکانی ئایدولوژی لیبرالیزم بەشێوەی خوارەوە کورت دەکرێتەوە:

**١ـ حکومەتی سنووردارو مەرجدار لە رێگای جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان:** مونتسکیۆ (١٧٥٥ـ ١٦٨٩) فەیلەسووفی گەورەی فەرانسەویی یەکەم تیوریسینی جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان‌و دەستووری حکومەت بوو. لە روانگەی ئەوە دامەزراوە جوراوجورەکانی حکومەت لە دێموکراسی‌داو هەندێکی دیکە لە حکومەتەکان، واتا دامەزراوەکانی یاسادانان، بەرێوەبەریی‌و دادوەری، بە مەبەستی لێك جیاکردنەوەی دەسەلاتداریەتی سیاسی‌و رەخساندنی دەرەتانی کونترۆل‌و چاودێری بەسەریاندا، دانراون. لەم رووەوە راگرتنی هاوسەنگی نێوان هێزەکانی حکووومەتی ئامانج‌و مەبەستە. بەپێی بۆچوونی ناوبراو بۆ پاراستنی ئازادی ناتوانرێ بە تەنێ هەر بە تایبەتمەندی کەسایەتی دەسەلاتداران‌و

ئـازادیخوازی ئـەوان پـشت ببەسـترێ، بـەڵکوو دەبـێ بەشـێوەی واقیعـی واتـا بـەپێکهێنانی هاوسـەنگیو تەوازن نێوان بەرژەوەندو هێزەکان، دەتوانرێ ئەومەبەستە گرینگە وەدی بهێنرێ.

٢ـ زۆربوونی گروپەکانی کومـەڵگای مـەدەنی: حکومـەتی مەرجـدارو سـنووردارو ئازادی هاوولاتیان پێویستی بە بوونی کومەڵگای مەدەنی فرەچەشنە کە تێکەلێك لە جۆرەها ئەنجومەنو گرووپگەلی هزری، فەلسەفی، ئایینی، کولتووریوسیاسی بێ، هەیـە. هـەربوونیو هێزی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە هۆی پرشوبلاوی سەرچـاوەکانی دەسـەلات لـە کومـەڵگادا. ئەنجوومەنەکانی کومەڵگای مەدەنی بـواری خـوراگرتنی لـە بەرانبـەر دەسـەلاتی سـەرەڕۆودا دەرەخـسێنن. ئامـادە بـوونی گرووپـەکانی کومـەڵگای مـەدەنی لـە گۆرەپـانی سیاسـەتو دەسەلاتیـشدا بـە هـۆی ململانـێ نێوانیـان، کوسـپی سـەررێگەی پێکهـاتنی حکومـەتێکی یەکدەستو دیکتاتوری لـە لایـەن هـەرکام لەوانـە بـە دژی ئـەوانی دیکـە دەبـێ. زۆربـوونی گرووپەکانی کومەڵگای مەدەنی بەم شـێوە پێویـستی حکومـەتی سـنووردارو مەرجـدار وەك بنەمای سەرەکی لیبرالیزیە.

٣ــ رەشبینی سەبارەت بە حکومەت وەك شەڕی بە ناچاری [اجتنـاب ناپـۆیر]: یەکێك لە بنەماکانی ئایدولوژی لیبرالیزمە. جان لاك فەیلەسووفی گەورەی ئینگلیزی دەیگوت سیاسـەتوانەکان لە خۆیانـدا ئاژەڵگـەلێکی دڕنـدەن کـە لـە کـەڵك وەرگـرتن لـە دەسـەلاتی سەرڕویانە لە راستای بەرژەوەندی تایبـەتی خۆیاندا ناپرنگێنەوەو ترسیکیان نیە. کەوابوو هـەر لە رێی دانانی دامەزراوەو لەمپەری واقیعیو چاودێری بێپسانەوە دەتـوانرێ ئەوانـە کـونترۆڵ بکرێن. کەوابوو سیاسـەتوانەکان دەبێ هەمووکات لەژێر چاوەدێری توندو رەخنەگرانەی خەڵکدا بن دەنا گەندەڵ دەبن، چاوەدێری خەڵك بەسەر دەسەلاتـبەدەستانو کـردارو سیاسـەتەکانیان لـە بنەماکانی لیبرالزمە.

٤ـ لە پێشدا ئازادی پاشان یەکسانیو دادپەروەری-کومەڵایـەتی: بـە پێـچەوانەی بیرورای باو، لیبرالیـزم لـە دەوڵـەتی لائیکـەمو لاوازو ناچـالاك دیفـاعی نـەکردوە. ئامـانجی دەوڵەتی لائیکەم زۆرتر جێـی سـەرنجی "ئـازادیخوازانی تونـدرەو[١]" و ئانارشیـستە دەسـتە ڕاستیەکان بوە. لیبرالیزم لە روانگەی پاراستنو دابینکردنی ئـازادی تاکـەکان روویەکیـشی لـە دادپەروەری کومەڵایەتیو دەست تێوەردانی دەوڵـەت لـە ئـابووریداش بـوە. کـەڵك وەرگرتنی

---

[١] Libertarianism

هەموو هاوولاتیان لە ماف‌و ئازادیەکانی خۆیان بەشێوەی یەکسان وێدەچی پێویستی بە دابەشکردنی دادپەروەرانەی سەرچاوەکان‌و دابینکردنی دەرفەتی یەکسان [بۆ هەمووان] ببی. دیارە لیبرالە جوراوجورەکان سەبارەت بە رادەی یەکسانی پێویست بۆ پاراستنی ئازادی هاوولاتیان‌و رادەی دەست تێوەردانی دەوڵەت جیاوازی بیروڕایان هەیە. بەو حاڵەش بەشێوەی گشتیی لیبرالیزم لەسەرپێشخستنی ئازادی بەسەر یەکسانی‌و دادپەروەری کومەڵایەتی‌دا تەئکید دەکەن، واتا ئازادی یان وەك ئامانجی سەرەکی‌و یەکسانی‌و دادپەروەری وەك ئامرازی دەست پێڕاگەیشتن بەو ئامانجە دادەنێن. بە واتایەکی دیکە ناکرێ بە بیانووی یەکسانی‌و دادپەروەری ئازادیە سەرەکیەکان لەنێو ببرێ یان بەرتەسك بکرێن.

٥ـ **جیاوازی دانان لە نێوان بواری گشتیی‌و تایبەتدا:** لیبرالیزم هەمووکات سنوورێکی لە نێوان بوارەکانی گشتیی‌و تایبەتدا داناوەو بواری تایبەتی بە پیرۆزو موبارەك‌و پارێزراو لە دەست تێوەردانی دەسەڵاتی سیاسی‌دا زانیوە. جان ئیستوارت میل فەیلەسووفی بریتانی لەم پێوەندیەدا ، کردەی بۆخۆو کردەی بۆ خەڵکی دیکە لەیەك جیاکردوەتەوەو دەستەی یەکەمی بە بەشێك لە بواری تایبەت‌و دەستەی دووهەمی بە بەشێك لە بواری گشتیی‌و گونجاو بۆ دستێوردان بەهۆی کاربەدەستانی حکومەتی دەزانی. بەو حاڵەش سنووری نێوان بواری گشتیی‌و تایبەتی بۆ گۆڕان بوە. بۆ نموونە لە رابردوودا پێگەی یاسایی‌و کارو تێکوشانی ئابووری ژنان‌و هەڵس‌وکەوت لە گەڵیان لە بنەماڵەدا، بە بەشێك لە بواری تایبەتی بنەماڵە دادنرا، لە کاتێدا هەنووکە یاسادانەران بە عەداڵەتی پێوەندی لەنێو خۆی بنەماڵەداو مافی ئەندامەکانی سەبارەت بە یەکتری بێ لایەن نین.

٦ـ **چاوپۆشی (تساهل) سەبارەت بە بیروباوەری کەسانی دیکە:** رەوتی سەرهەڵدانی لیبرالیزم لە ماوەی پاش چەرخی ریفورمی ئایینی واتا لە سەدەی حەڤدەهم دەستی پێکرد. شەڕوشۆڕ و کوشتاری ئایینی لەو دەمانەدا یەکێك لە زەمینەکانی سەرەتایی سەرهەڵدانی چاوپۆشی دینی رەخساند پاشان چاوپۆشی سەبارەت بە باوەری ئایینی بۆخۆی بوو بە دەستپێکی چاوپۆشی سەبارەت بە باوەر سیاسیە جوراوجورەکانیش.

٧ـ **راوەستان لە بەرانبەر دەسەڵاتدا:** لیبرالیزم لە سەرەتادا ئایدولوژی بە رەنگاری‌و راوەستان لە بەرانبەر دەسەڵاتی رەهاو سەرەڕۆیانە بووە بە بۆچوونی جان لاك گەورەترین پارێزەری لیبرالیزم، کاتێك دەسەڵاتداران بە بێ ماف، دەسەڵات بە کار بێنن خریان دەخەنە

ئاستی شەڕ لەگەڵ خەڵکدا. کەوابوو خەڵك کاتێك لەگەڵ پێشێلکرانی مافو ئازادیەکانیان رووبەروو بن، مافی راوەستانو بەرنگاریو شورشیان لە بەرانبەر دەسەلاٚتداراندا هەیە. فەیلەسووفی ناوداری فەرانسەوی لە چەرخی شەفافیەت (روشنگری)، مارکی دوکندورسە (١٧٩٤ـ١٧٤٣) پێی وابوو کە لیبرالیزم هەرچەشنە دەسەلاٚتو دەسەلاٚتداریەتیەك جیا دەسەلاٚتی دەولەت بێ یان کەنیسە یان نەریت، لاواز دەکا.

٨ـ **مافی موڵکداریەتی تایبەتی:** موڵکداریەتی تایبەتی لە روانگەی لیبرالیزمەوە یەکێك لە ئامرازە سەرەکیەکانی پاراستنو درێژەکێشانی ئازادی سیاسیەیە. موڵکداریەتی تایبەتی یەکێك لە سەرچاوەکانی سەرەکی خودموختاری تاكو راوەستانی لە بەرانبەر دەسەلاٚتی حکومەت دایە. دیوید هیوم فەیلەسووفی بریتانی (١٧٦٦ـ١٧١١) موڵکداری تایبەتی وەك بنەمای دامەزراوەکانی دیموکراسی دادەنا. بەپێی بۆچوونی ئەو هەڵسوکەوتو کردەوەکانو دابو نەریتی پێوەندیدار بە موڵکداریەتی، بەستنی پەیماننامە، بازرگانیو حیسان بگەریو ... هۆکارێکی لە بارن بۆ لە بەر چاوگرتنی یاساکان. مونتسکیوش بەڵگەی دەهێنایەوە بۆ ئەوەی کە کڕینو فرۆشتن روحی چاو لێپۆشینو هەڵکردن بەهێزدەکا، لە بەر ئەوە لە پێوەیستییەکانی کڕینو فرۆشتن هەڵسوکەوتی ناشەخسیو کۆێنەدان بە تایبەتمەندی فیکریو فەرهەنگیو ئایینی لایەنی بەرانبەرە.

## مارکسیزم

کارل مارکس (١٨٨٣ـ١٨١٨) لە رووی فیکریەوە لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی ئایدئالیستە ئاڵمان، سوسیالیزمی فەرانسەویو زانستی ئابووری سیاسی ئینگلیزیدا بوو. بەو حاڵەش بە پێچەوانەی فەیلەسوفەکانی ئایدئالیستی ئاڵمان دوویەت [ثنویت] فەلسەفیو دژایەتی نێوان واقعیەتو راستی داری رەدەکردەوەو لەسەر پێویستی پێکهاتەی فەلسەفەی هەلینجراو بە ئامانجی ژیانی رۆژانەوە پێی دادەگرت. هۆی سەرەکی مەیلی مارکس بە هیگل رەدکردنی دوو فاقیی و پێك هێنانی یەکیەتیی نێوان "ذات" واتا خودی مرۆڤو رۆاڵەتدا بوو. کاریگەری بۆچوونی سین سیمون، زاناوسوسیالیستی فەلسەفەی لەسەر مارکسی لاو هەر بەو رادەی کاریگەری هێگل بوو. مارکس ئەندامی یانەی هێگلیە لاوەکان لە زانکۆی بیرلین بووە بە دەرچوونی کتێبی گەوهەری کریستییانی لە نووسینی فویرباخ لە ساڵی ١٨٤١دا هێگلیە

لاوەکانو بە تایبەت مارکس بە توندیکەوتنە ژێر کاریگەریەکەی. هەندێك لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی مارکسو رەخنە لە تیۆری دەولەتی هێگل (١٨٤٣)و دەستنووسە ئابووری ـ فەلسەفییەکان (١٨٤٤) بە توندی رەنگی بۆچوونی فورباخی پێوە دیاربوو. فورباخ خودای بە سەرچاوەی سەرەکی لە خونامۆیی مرۆڤ وەسف کردبوو. مارکس ئەم تیۆریەی لە بوارەکانی دیکە بەتایبەت ئابووریو سیاسەتدا پەرەیی دا.

ئەو لە کتێبی رەخنە لە تیۆری دەولەت"ی هێگل تیۆدەکۆشی فەلسەفەی ئایدئالیستی هێگل لەسەر پێی خۆیڕاگرێ، بەم مانایە کە لە روانگەی مارکسەوە، هێگل رەسەنایەتی [اصالت] لە بابەتی سەرەکی واتا مرۆڤدا دەبینیو بەرهەمی بیری ئەو واتا روحیی دەزانی. هەر بەو جۆرە لە بواری سیایی دا، دەولەت سەرچاوەی لە خۆ نامۆیی مرۆڤ بوو. هێگل دەولەتی بەمەیدانی سیستمی ئەقلانیو گشتییو سەربەخۆ لە کومەلگای مەدەنی لێك دەدایەوە. بەلام دەولەت لە روانگەی مارکسەوە بەم مانا شتێك بێجگە لە هاوکێشەی خودا لە تیۆری لە خۆ نامۆیی فویرباخدا نەبوو، لە کاتێدا لە جیهانی واقیعدا دەولەت رەنگدانەوەی بەرژەوەندی تایبەتە. دەولەت زیاتر لە بەرژەوەند تایبەتیەکانی کومەلگای مەدەنی نیە. بەلکوو دەرئەنجامو رەنگدانەوەی ئەوانن. مارکس بەو ئاکامە دەگا "دێموکراسی راستەقینە" بەرهەمی لە نێوچوونی لە خۆ نامۆیی مرۆڤو لێك گرێدانو خستنە سەریەکی [تلفیق] کومەلگای مەدەنیو دەولەتە. دێموکراسی ئایدئال لە نیهایەتدا لە ئارادا بوونی هەموو بەرژەوەندیەکانی کومەلگای مەدەنی لە پێکهاتەی دەولەتدایە.

مارکس لە سپتامبری ١٨٤٣دا لە ئالمانەوە چوو بۆ فەرانسەو لەوێ لەژێر کاریگەری سوسیالیزمی فەرانسەویدا سەرەتایەکی بۆ رەخنە لە فەلسەفەی "ماف"ی هێگل نووسی. لەم نووسراوەدا، مارکس لە سنووری رخنەی ئایینی فویرباخ تیۆدەپەڕیو رخنە لە کومەلگا دەگرێو ڕا دەگەیێنێ کە: "رەدکردنەوەی ئایین وەك شادییەکی خەیالی مرۆڤەکان پێویستی بە رەدکردنی بارودۆخێکە کە سەر لە وەهمو گومان (تموهم) دەردێنێ. "هەر لەم نووسراوەدا هۆکاری دواکەوتوویی ئالمان لێك دەداتەوە. بە بۆچوونی ئەو ئالمان لە رووی فیکریو فەلسەفیەوە پێشکەوتوە، بەلام لە رووی ئابووریەوە، بە دواکەوتوویی ماوەتەوە. کەوابوو رێگە چارەی گەشەی ئەو فەلسەفیو تیۆری نیە، بەلکوو دەبێ "کردەیی" بێ. مەرجی گەشەی ئالمان بە بۆچوونی ئەو" کردەی شۆرشگێرانە"و دەرکەوتنی گرووپی نوێخوازو شورشگێرە

ئەم گرووپە نوێیە بە ناوی "پرولیتاریا" دەیانناسێ کە "کەرەسە مادیەکانی فەلسەفە"ی دابین دەکرد.

ساڵێك پاش، کتێبی دەستنووسەکانی ئابووریو فەلسەفەی نووسی. لەم کتێبەدا مارکس بە ئاشکرا لە فەلسەفەی ئاگاهی هێگلیەکانی لاو دوورکەوتەوەو رووی لە ئابووری سیاسی دەکرد. بابەتە سەرەکیەکەی کە پاشتر لە کتێبی کاپیتاڵدا بەربلاوتر باسی لێکرا، رخنە لە سەرمایەداری مودیرنەو مارکس رخنەی سەرەکی لەسەر ئابووریزانان هەبوو: یەکەم ئەمەکە گومانی توانایی بەگشتییکردن [تعمیم] چەمکەکانو هەلومەرجی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری (وەك چەمکی ئابووری ئاڵوویر، مولکداریەتی تایبەتیو قازانج خوازی مرۆڤی مودیرن) بە هەموو بیچمەکانی ئابووری لە هەموو چاخەکانی مێژووی رابردوودا راست نەبوە، دووهەم ئەمەکە گومانی دەرەتانی لێکدانەوەی پێوەندی ئابووری بەشێوەی هەلینجان لە گشت پێوەندە کومەلایەتیەکان (وەك شتومەك، سیعر، بازار) بێ بنەمایە.

مارکس هەر لەم کتێبەدا دەس بە باسی نامۆیی مرۆڤ لە سەرمایەداری مودیرندا دەکا. بە بۆچوونی ئەو گەشەی رۆژ لە دوای رۆژی سەرمایەداری دەبێتە هۆی کەڵەکەبوونی زیادە بەها [ارزش اضافی] لە دەست سەرمایەدارەکانو بەرینتر بوونەوەی کەلێنی نێوان کرێکارەکانو بەرهەمی کارەکەیان دەبێو لە نیهایەتدا کاریکار، دەبێتە شتومەكو کاروشتمەك بە یەك پێوانە هەڵدەسەنگێندرین. لەگەڵ چوونەسەری بەرهەمهێنانی شتومەك بەهای کاری کرێکار دادەبەزێ وەك بابەتی راکێشانی شتومەك وەك سوژە [بابەت] دەبێ. بە بۆچوونی مارکس دژایەتی سەرەکی سەرمایەداری مودیرن ئاکامی نەگونجان نێوان هێزی داهێنەری کاری کرێکارانو نەبوونی کونترۆڵی چاوەدێری خۆیان بەسەر بەرهەمی رەنجی خۆیانە. مارکس چوار قەوارەی سەرەکی بۆ لە خۆ نامۆبوونی مرۆڤ دەست نیشان دەکا.

۱ـ **نەبوونی چاوەدێری بەرهەمهێنەر بەسەر بەرهەمی کارەکی خۆیدا:** کرێکار هر ئەندازە بەهای زۆرتر بەرهەم بێنێ، خۆی کەم بەهاتر دەبێ.

۲ـ **نامۆیی کرێکارەکان لە پرۆسەی کاردا:** کاری لە خۆنامۆ کارێکەکە لەژێر فشاری پێویستیی دا بەرێوەدەچێو رۆحو لەشی مرۆڤ دەشوێنێ. هەرکە فشاری جسمی [فیزیکی] هەڵبیگری، کرێکار وەك لە چاوە قووڵە [طاعون] هەڵدێ هەر واش لە کار هەڵدێ.

**٣ـ پەرەگرتنی پێوەندی بازار لـە گـشت ژیـانی کومەڵایەتیـدا:** دەرئـەنجامی کومەڵایەتی لە خۆ نامۆ بوون بە مانای پەرەگرتنی پێوەندیـەکانی بـازاریی لـە گـشت ژیـانی کومەلایەتیو دەسەڵاتی پوول وەك بەهای سەرەکی لە کومەڵگا "هەرکەس بتوانێ ئازادیـەتی بکرێ، ئازایە هەر چەند ترسنوکیش بێ".

**٤ـ لەخۆ نامۆبوونی مرۆڤ لە بوونی چەشنی خۆی:** بە پێچەوانەی گومانی بورژوازی، مرۆڤ بە تەنێ نیە، بەڵکوو بە هۆی تایبـەتمەندیە سەرەکیەکانی خۆی وەك بەرهەمهێنانو زمان خاوەن بوونێکی چەشنیو کومەڵێیە: "ژیانی بە تاكو ژیانی چەشنی مرۆڤ جیاواز نـین. تـاك هـەر ئـەو تەواوەتـیەیـە [کُـل] بـوونی زەینـی گـشت کومەڵگایـە". بـەلاّم لـە کومـەڵگای سەرمایەداریدا مرۆڤ لە پێوەندی چەشنییو بوونی کۆمەلیی خۆی نامۆدەبـێو تووشـی تـاك کەوتنو تەریك کەوتن دەبێ. دەرکـەوتنی تـاك وەك گەوهـەری مرۆڤـ بەرهـەمی سـەردەمی سەرمایەداری نوێیە.

بەرهەمی گرینگی دیکەی مارکس رێسالەگەلێك بـوو سـەبارەت بە فویربـاخ کـە لەوانـدا رەخنەی لە ماتیریالیستی فویرباخ گرتبـووو بنـەماکانی روانگـەی خـۆی روون کردبـوەوە. بـە بۆچوونی مارکس تێوری فویرباخ سەبارەت بـە ئـایین لەگـەڵ مێـژوو ناگونجـێ. واتـا مرۆڤـو گەوهەری مرۆڤی پێش لە کومەڵگای لە بەرچاو گرتبوو. لە کاتێکدا لـە روانگـەی مارکـسەوە هەستی ئایینی، هەستێکی کومەڵایەتیـیە نە پێش لـە کومەڵایـەتی. هـەروەها لـە روانگـەی مارکسەوە، فویرباخ پێوەندی دوو لایەن نێوان زەینو چاو [عین] لەبەر چاو ناگرێ، لە کاتێکـدا کە دەبێ بە بۆچوونی ئەو لەسەر نەخشی بابەت (سووژە) یان زەینی مرۆڤ تەئکیدی سـەرەکی بکرێ. بۆیە دیـالێکتیکی زەیـنو چـاو یـان مرۆڤـ و جیهـانی مـادی لەگـەل ماتریالیـسمی سەرسەریانەی فویرباخ جیاوازییەکی زۆری هەیە. لـە روانگـەی مارکـسەوە مێـژووی جیهـان بەرهەمی کار یان پراکتیسی بە کومەڵی مرۆڤەکانە.

ئەم روانگەیە کە لە کتێبی دوایی مارکسدا واتا ئایدولوژی ئاڵمـانی (١٨٤٦ـ١٨٤٥) کـە نیشانەی پچرانی بە تەواوی لە فەلسەفەو چوون بۆ لای ماتریالیزمی مێژوویی پێوە دیارە، بـە تەواوی پەل دەهاوێژێ. مارکس لەم کتێبەدا لە روون کردنەوەی ماتریالیزمی مێژوویـیـدا ئـاوا دەڵێ: "ناکرێ پێوەندی یاسایی و قەوارەکانی دەوڵەت هەروا خـۆی لـە خۆیـداو یـان لەسـەر بنەمای وەك دەڵێن یاسای گشتیی کەشەی زەینی مرۆڤ بناسـرێ، بـەڵکوو لـە بـارودۆخێکی

مادی ژیاندا ریشەیان هەیە." روانگەی مارکس پاش نووسینی ئایدولوژی ئاڵمانی لەسەر یەك نەگۆر مایەوەو سەقامگیر بوو. لە روانگەی مارکسەوە لە ماتریالیزمی مێژوویی [تاریخی]، بە پێچەوانەی ماتریالیزمی فەلسەفیو ئایدئالیزم، خاڵی دەست پێکردن نەمادەیە، نە زەینی، بەڵکوو کاری مرۆڤە. کاری مرۆڤ سەرچاوەی زەینو چاوە، تەنانەت لێ تێگەیشتنی مرۆڤ لە جیهانی مادی دەکەوێتە ژێر کاریگەری کومەڵگایەك کە تێیدا دەژی. هەروەها بە پێچەوانەی گومانی ماتریالیستە فەلسەفیەکان خۆیندنەوەی هەستی لە جیهانی مادی سەقامگیرو نەگۆڕ نیە، بەڵکوو خۆی بەشێك لە جیهانی کومەڵایەتیەیە: "تەنانەت مسوگەرترین خوێندنەوەکانی هەستی ئێمە لە رێگای ئەزموونی جیهانی کومەڵایەتی دەکەویتە دەست". دوای ئەوش پێویستیەکانی مرۆڤ بە پێچەوانەی گیانلەبەرانی دیکە گوڕانو گەشەی بە سەردا دێ. بە کورتی بە بۆچوونی مارکس، مێژوو نە جیهانی مردووی ماتریالیستەکانو نە تێکوشانی خەیاڵی ئایدئالیستەکان، بەڵکوو جیهانی کارو ژیانی مرۆڤەکانی راستین. کەوابوو دەبێ بە پرۆسەکانی راستەقینەی ژیان واتا پێوەندی نێوان مرۆڤو سروشتو پێوەندی نێوان مرۆڤەکانو گرووپو هێزە کۆمەڵایەتیەکان بچینەوە. "مێژوو شتێك بێجگە لە درێژەی یەك لە دوای یەکدا هاتنی نەوەکان نیە کە هەر لە میراتو سامانو هێزەکانی بەرهەم هێنانی جیلەکانی پێش لە خۆیان کەڵك وەردەگرنو بەم شێوە لە لایەك، کردەوەی نەوەی کۆن لە دۆخێکی بە تەواوی نوێدا درێژە دەداو لە لایەکی دیکە هەلومەرجی رابردوو لەگەل تێکوشانی بە تەواوی نوی گۆڕانی بە سەردا دێنێ".

بەم شێوە هەر چەشنە بزووتنەوەیەکی مەبەستدارو یان ئامانجی لە پێشدا دیاری کراو بۆ مێژوو رەد دەکرێتەوە. لەم رووەش کردنەوەی قۆناخە مێژووییەکانی ئۆرووپا پاش رووخانی ئیمپراتوری رۆم، بە مانای تەئکید لەسەر پێویستی دووپات بوونەوەی هەر ئەو قوناخانە لە ناوچەکانی جیهاندا نیە. مارکس چەند رێگەی جیاوازی بۆ گۆڕان لە کومەڵگای عەشیرەتی بۆ کومەڵگای پێشکەوتوی لە ئایدولوژی ئاڵمانیدا دەست نیشان کردوە کە بریتین لە : رێگەی کومەڵگای رۆژهەلاتی یان شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسیایی، رێگەی یۆنانیو رۆمیو رێگەی ژرمەنی [ئاڵمانی]. لە رۆژهەلات هۆکارەکانی پێوەندیدار بە ئاووهەواو جوغرافیاو خۆبژێوی [خودکفایی]و پرش‌وبلاوی کومەڵگای گوندی بوو بە هۆی سەرهەڵدانی سیستمی ئاودێری کۆچێی [متمرکز]و دیکتاتوری رۆژهەلاتی. لە ئاکامدا لە رێگەی رۆژهەلاتیدا، چینەکانی

کومەڵ، مەڵکداریەتی تایبەتی لەسەر ئەرزو ژیانی شاری بە گشتی لاواز بوون. بە پێچەوانە لە رێی یۆنانیو رۆمی، کومەڵگای عەشیرەتی لە ئاکامی تێکەڵ بوونی چەندین عەشیرە لەسەر بنەمای پەیماننامە یان داگیرکردن گۆڕانی بەسەردا هات. لەم مەسیرەدا شارەکان لە سەرەتادا تایبەتمەندی سەربازی یان بووو رۆحیەی جیهانگیری زاڵ بوو. لە رێی یان مەسیری رۆمی مولکداریەتی ئەرز، چینە خاوەن زەوینەکانو شارەکان خاوەن هێزێکی بەرچاو بوون. چوونە سەرێ رادەی حەشیمەتو لە ئاکامدا چوونە سەرێ زەخت بۆ سەر زەوینە بەرتەسکەکان بوە هۆی مەیل بۆلای جیهانگیریو داگیرکاری سەربازیو پەرەسەندنی کویلەتی. سەرئەنجام بناخەی ئیمپراتوری رۆم چەوسانەوەی گەلانی داگیر کرابوو. بەڵام رێگەی رۆمی لە نیهایەتدا بە بون بەست گەیشت، چوونکا لە لایەك پاراستنی سیستمی کویلەتی لە ئاستی نێونەتەوەییدا دژوار بووو لە لایەکی دیکە بە لەبەر چاوگرتنی روانگەی سووك چاو لێکردنی بازرگانی لە لایەن ئەشرافیەتی رۆم، دەرەتانێك بۆ پەرەسەندنی پێوەندی بەرهەم هێنانی نوێ نەمابوو. سەرئەنجام رێی سێهەم واتات مەسیری ژرمەنی کە بوو بە هۆی سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی [فئودالیزم] لە سەرەتادا تایبەتمەندی سەربازی بوو، بەڵام دەسەڵاتی سەربازەکان وردەوردە گوڕا بەسیستمی پاشایەتیو سۆپاو ئەشرافیەتی نوێ بەستراوەییان بە بنەماڵەی پاشایەتیەوە پەیدا کرد. تایبەتمەندیەکانی سەرەکی کومەڵگای ژرمەنی ـ فیودالی، سیرواژ، تیکنیکی، ئابووری بەرێچوون [معیشتی] کۆمەڵگای فەلاحی و گوندیی و لەخۆ نامۆیی سنووردار واتا نامۆیی رێژەیی نێوان بەرهە هێنەران و بەرهەمی بەدەست هاتووبوو. هەر ئەم رێ سێهەمەکە لە نیهایەتدا دەبێتە سەرمایەداری [ کاپیتالیزم] . تێپەڕین لە دەربەگایەتی بۆ سەرمایەداری بە هۆی کاریگەری چەند هۆکارێك بوو کە لەوانە: پەرسەندنو کامیل بوونی لە خۆ نامۆیی یان مەودای نێوان بەرهەم هێنەران و بەرهەمی بەدەست هاتووە، پەرەسەندنی شارە خودموختارە فئودالیەکان، پەرەسەندنی سەرمایەی سووخۆرانە و تیجاری و بڵاوبوونەوەی ئابووری و ئاڵوویری، پەرەسەندنی کشت و کاڵی تجاری، ئازادی رۆژ لە دوای رۆژی سرفەکان [کویلەکان] لە نێوچوونی پیشە داخراوەکان، پەرەسەندنی بازرگانی نێونەتەوەیی لە ئاکامی دۆزینەوە جوغرافیەکانی سەدەی چواردەهەم، گەیشتنی زێر و تەلاکانی ئەمریکا بۆ ئورووپا، سەرهەڵدانی دەوڵەتی رەهای نۆژەن کراو لە هەندێك لە وڵاتانی ئورووپاییو....

بابەتی سەرەکی کتێبی سی جەڵدی "کاپیتاڵ" یش لێکدانەوەی سەرهەڵدانی شێوەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری و یان " دوزینەوەی یاساکانی جوولآن و بۆ کۆمەڵگای مۆدیرن" و هەروەها ناتەباییەکانی سیستمی سەرمایەداری بوو. مارکس لەم لێکدوانەدا هەرچەند لەسەر هەندێك لە چەمکەکانی ئابووری سیاسی کلاسیك پێی داگرت، بەڵام ئاکامگیری یەکی بە تەواوی جیاوازی سەبارەت بە هەڵس‌وکەوتی سیستمی سەرمایەداری و مەیلەکانی داهاتووی دا بەدەستەوە. تەوەری سەرەکی لێکدانەوەکەی چەمکی چەوسانەوە بوو [استثمار]، بە بۆچوونی مارکس کار تەنیا هۆکاری بەرهەم هێنەر و سەرچاوەی بەهایە و سەرمایە لە راستی دا کاری، مردووە، هەروەها بەهای هێزی کار خۆی بە هۆی رادەی کار رادەکەی دیاری دەکریٚ، بە واتایەکی دیکە بەهای هێزی کار بە هۆی ئەو ماوە کارە کە پێویستە بۆ بەرهەم هێنان و سەرلەنۆی بەرهەم هێنانی ئەو هێزەی کارە دیاری دەکریٚ، کەوابوو ماوەی کاری پێویست بۆ دابین کردنی کەرەسەی ژیان هێزی کار دیاری کەری بەهای کارە. کریٚ کانیش لەسەر ئەم بنەما دیاری دەکرێن. مارکس لەسەر بناخەی ئەو بەڵگە هێنانەوە [استدلال] کە بەهای کارو بەهای شت‌ومەك بەستراوە بە یەك بنەمان، خوێندنەوەیەکی نویٚ لە پرۆسەی سەرمایەداری دەدا بەستەوە.

لە سیستمی سەرمایەداری‌دا کرێکارەکان ناچارن ماوەی کاری پێویستی خۆیان بە رادەی پێویست بۆ بەدەست هێنانی داهات بفرۆشن بەڵام لەم سیستمەدا رادەیەکی زۆرتر لە ماوەی کاری کرێکارەکان دەخوازری، کەوابوو ماوەی کار بە ماوەی کاری پێویست بۆ بەرهەمهێنانی داهاتی کرێکارانو ماوەی زیادی بۆ بەرهەمهێنانی زیادە لەو داهاتە دابەش دەبیٚو ئەم زیادییە دەبیٚ بەنسیبی سەرمایەدارەکان. بۆیە بە بۆچوونی مارکس دوو جۆرە سەرمایە لە بەرهەمهێناندا هەیە: یەکێك سەرمایەی لە گۆڕاندا [متغیر] (یان مووچەو کری‌کان)و ئەوەی دیکە سەرمایەی نەگۆڕ [ثابت] (یان ئامرازو کەرستەی کارنەکراو [ Raw materiales ] بەپێی بەڵگەهێنانەوەی مارکس هەر سەرمایەی لە گۆڕاندا خاوەن توانایی پێکهێنانی زیادەباییە. بە پێچەوانەی نەخشی سەرمایەی نەگۆر لە بەرهەمهێنانی زیادەبایی [ارزش اضافی] کاریگەری نیە، واتا ناتوانیٚ زیاتر لەو بەها کە خۆی هەیەتی، شتێك بە بەرهەمی نیهایی زیاد بکا. بەڵام سەرمایە لە گۆڕاندا یان هێزی کار خاوەن توانایی پێکهێنانی زیادەبایی لە بەهای خویەتی.

له روانگەی مارکسەوە بەدەست هێنانی زیادەبایی بناخەی سەرمایەدارییە. کەڵەکەبوونی سەرمایە بۆ خۆی بە هۆی خڕ بوونەوەی زیادەبەهایە،[لە لای سەرمایەدار]، لە سەرمایەداری پێشەسازیدا بە هۆی سوود وەرگرتن لە تەکنیك و مەکاین لە بەرهەم هێنان دا، هێزی کار کوجی یی [متمرکز] دەبێ. بە پێی لێکدانەوەی مارکس، لەگەڵ چوونە سەری رادەی کەڵك وەرگرتن لە تکنیك تێچووی [هەزینە] کار کە هەر یەکەیەك لە بەرهەم دا کەم دەبێتەوە، واتا تکنیك جیێ کار دەگرێتەوە و لە ئاکامدا نرخی شتوومەك دێتە خوارو لەم رووەوە زیادەبایی زۆرتر دەبێ، لەبەر ئەوە کە دابەزینی بەهای شتومەك دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی سەرمایەی گۆڕین یان کرێ و مووچە. دیارە لە زیادەبایی بۆ پەرەپێدان و نوژەن کردنەوەی تکنیك سەرف دەکرێ، بەڵام سەرمایەداران لە کاتێکدا لە کەرەسە و تەکنیك دا سەرمایە گوزاری نوێ دەکەن کە بتوانێ تیچووی شتومەك کەم بکاتەوە، واتا شتومەك هەرزانتر ببێ. ئاکامی گشتی ئەوە دەبێ کە داخوازیی بۆ کار لەم پروسەدا روو لە کزی دەدا، بەم مانا کە بە زۆر بوونی تکنیك و هاتنە خوارێ تێچوو [هزینە] ماوەی پێویست بۆ بەرهەم هێنان بە نیسبەتی کرێکارەکان کەم دەبێتەوە و لە ئاکامدا ماوەی کاری زیادی زۆر دەبێ‌و و لەم رووەوە زیادەبایی زۆرتر دەبێ.بەم شێوە لە لێکدانەوەی نیهایی دا بە بۆچوونی مارکس، تکنۆلوژیا دەبێتە هۆی لە دایك بوونی پرولتاریا.لەگەڵ پەرەسەندنی بیکاری مووچە و کرێکان لە ئاستی ژیانی رۆژانەدا دەمێنێتەوە و نایەکسانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی بەرچاو قووڵتر دەبێ. هێشتنەوەی مووچەکان لە ئاستی ژیانێکی ئاسایی دا بە بەردەوامی لە تایبەتمەندی یەکانی سیستمی سەرمایەداری یە. لەبەر ئەوە دەبێتە هۆی زۆربوونی زیادەبایی.

لە لایەکی دیکەوە بە بەرکارهێنانی زۆرتری تکنۆلوژیا، هێزی بێکاریش زیاد دەکا و لە ئاکامدا مووچە لە پلەی خۆیدا دەمینێتەوە. بە شێوەی گشتی میکانیزمی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارنە کە لە بوونی سەرمایە خۆ بەخۆ دەبێتە هۆی بێکاری. هەر ئەمە بۆ خۆی زەمینەی سەرەکی قەیران و ئاریشە لە سەرمایەداریدایە. دەرئەنجامی کاری سەرمایەداری بە بۆچوونی مارکس رووخانێکی بێ ئەم لا و ئەو لا و پڕ تند و تیژی دەبێ. قەیرانی سەرمایەداری زانیاری چینایەتی بە تایبەت لە لای پرولتاریا گەشە پێ دەدا. لە لایەکی دیکە ناتەبایی لە نێوان سیستمی بەرهەمهێنان [وجه تولید] سەرمایەداری ( کە لەسەر مۆڵکداریەتی تایبەت دامەزراوە) و پێوەندی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری (کە بۆ لای کۆمەڵایەتی بوون مەیلی

هەیە)، زانیاری چینایەتی پرولتاریا بۆ لای سوسیالیزم پاڵ پێوە دەنێ. بە بۆچوونی مارکس زنجیرە گورانکاری کە لە سەرمایەداری قەیران لێدارو دێتە پێش بەشێوەی خوارەوەیە:

پەرەسەندنی بەکارهێنانی تەکنولوژیا لەبەرهەم هێنان ← پەرەگرتنی بێکاری و هەژاری رۆژ لە دوای رۆژی چینی کرێکار ← دابەزینی ئاستی تواناسایی کرین بەگشتی راکێشانی بەرهەمە پیشەسازی یەکان بە تەواوی ← زیادە بەرهەم ← هەڵکشان و داکشان لە تێکوشانی بەرهەمهێنان و کەساتی ← چوونە سەری موناڤسە لە نێوان دامەزراوە ئابووریەکان ← چڕ بوونەوەی سەرمایەو سەرهەڵدانی مونوپۆلە [monopole] گەورەکان ← گەران بە شوێن بازارە دەرکیەکان زیاترو پەرەسەندنی ئیمپریالیزم سەرمایەی داران ← پڕبوونی بازارە جیهانەکان ← شەڕی ئیمپریالیزم ← شورشی سوسیالیستی و کرێکاری ← رووخانی دەوڵەتی سەرمایەداری و دامەزرانی دیکتاتۆری پرولتاریا.

بە بۆچوونی مارکس بە لەنێو چوونی دەوڵەتی سەرمایەداری لە سەردەمی دیکتاتوری پرولتاریا بارودۆخێکی بێوێنە دیتە کایەوە لە بارودۆخەدا هەر کەسێك بە رادەی پێویستیی خۆی کار دەکا. دیکتاتوری پرولتاریا قۆناخی گواستەوە لە سەرمایەداری بۆ کومونیزمی تەواوە. لەم قوناخەدا دەوڵەت هەر ئەو دیکتاتوریە شۆرشگێرانەی کرێکارییە. لەم سەردەمەدا کەرەستەکانی بەرهەم هێنان دەکەوێتە دەست دەوڵەت و چەوسانەوەی مرۆڤ بە دەست مرۆڤ کوتایی پیدێ، لە بەر ئەوەی کەرەسەی بەهەم هێنان لە دەست مولکداریەتی تایبەتدا نیە. بەو حاڵەش چەوسانەوەی تاکەکان لە لایەن دەوڵەتەوە درێژە دەکێشێ، بەڵام داهاتی زیاتری کومەڵگا هەر بۆ گەشەپێدان و پێشکەوتنی کومەڵگا سەرف دەکرێ. لە قۆناخی کومونیزمی تەواو چینەکان و کێشمەکێشی چینایەتی و دەوڵەت بە تەواوی لە نێو دەچن و لە جێیدا کومەڵگا بەشێوەی "ئەنجومەنگەلی ئازاد لە تاکەکانی ئازاد" دەگورێ. بە ئازادبوونی هێزەکانی بەرهەمهێنانی مەزنی کومەڵگا، سەردەمێك لە خۆشگەزەرانی و فەراوانی دێتەکایەوە کە هەرکەس بە رادەی پێویستی خۆی لە بەرهەمهێنانی مەزنی کومەڵگا سوود وەردەگرێ. لەو حاڵەدا مرۆڤەکان لە دەست نیگەرانیەکانی رابردوو خەلاسیان دەبێ و لە خۆشگوزرانی و ئاسایشدا دەژین.

## سوسیالیزمی ریفۆرمخواز

سیوسیالیزمی ریفۆرمخواز یان نا مارکسیستیش ئایدۆلۆژیەکی گەورە پێك دێـنن. ریـشەی ئەم جۆرە سوسیالیزمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەندیشەکانی فردیناد لاسال (٦٤ـ١٨٢٥)، لاسال لـە کاتی لاوەتیدا لە لایەنگرانی مارکس بوو، بەڵام دواتر کەوتە رکەبەری لەگەڵ ئەو بوو بە جێـی سەرنجی کرێکارەکانی ئاڵمان. ئەو دامەزرینەری ئەنجومەنی گشتیی کرێکارەکـانی ئاڵمـان بـوو کە دواتر گۆڕا بە حزبـی سوسیالیـستی دیمـوکراتیکی کرێکارەکـانو کەوتـە ژێـر کاریگـەری مارکسیستەکان. لاسال لایەنگری پلاندانان بۆ پێکهێنانی سوسیالیزمی دەوڵەتی بوو. ئـەو بـە پێچەوانەی مارکس نەی دەویست دەوڵەتی بورژوازی بڕووخێنێ، بەڵکوو پێی وابوو دەبـێ لـەو دەوڵەتانە بۆ دامەزرانی سوسیالیزم کەڵك وەربگیرێ. هەروەها لاسال بڕوایەکی بـە کومـەڵگای کومونیستیو بێ چین لە داهاتوودا نەبووو دامەزراوەی دەوڵەتی بە دامەزرانی هەرەوەرزیەکانو دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ژیانی ئابووریدا ئیمکانی هەیە.

سوسیالیزم نامارکسیستی لە کوتاییەکانی سەدەی نوزدەهەمو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بۆخۆی چەند جـۆری هـەبوو، لەوانـە دەتـوانین لـە سوسـیالیزمی کریـستییان، سوسـیالیزمی پیشەییو سوسیالیزمی فـابین لـە بریتانیـا نـاو بـەرین. سوسـیالیزمی کریـستیان خوازیـاری دامەزرانی عەداڵەتو دادپەروەریو سیـستمی دادپەروەرانەی کریـستییان لە ڕێگـای چاکـسازی سیستمی بەرهەمهێنانو دابەشکردنی کالاکان بوو. روبردو لامنـە (١٧٨٢ـ١٨٥٤) قەشـەی کارسولیکی فەرانسەوی دامەزرێنەری ئەم جۆرە سوسیالیزمە بـوو. لامنـە رای وابـوو بـە پـێ داگرتن لەسەر فێرکردنەکانی چاکخوازانەو عەداڵەتخوازانەی کریـستییان دەکـرێ ژیـانێکی نـوێ بێتەکایەوە. سوسیالیزمی کریستیان لە فەرانسەوە بۆ بریتانیا تەشەنەی کردو لەوی هەندێك لە رووناکبیرانی پروتستان ئایین بەتایبەت چارلز کینگزلی (١٨١٩ـ١٨٧٥) پەرەیان پێدا. ئـەوان کە لە بەرینتر بوونەوەی کەلینـە چینایەتییەکانو مەترسـی شۆرشـی چینـە پـایین دەسـتەکان نیگەران بوون، کەنیسە یان بەو تاوانبار دەکرد کە سەبارەت بە کاروباری کومەڵگای نـوێ بـێ تەفاوەت بوونو کەڵك وەرگرتن لە ئایین بۆ خەلەتانـدنی هـەژارانیان بـە پێـچەوانەی روحیـەی کریستیان دادەنا بەپێی بۆچوونی سوسیالیستە کریستییانەکان قوتابخانەی ئابووری کلاسیك کە هەژاری وەك دەرئەنجامێکی سروشتی سیـستمی ئابووری دەزانی، لەسەر راستییە بەرچـاوەکانی کۆمـەڵگای سـەرمایەداری سەرپۆشـیان دانـاوە. لـە راسـتیدا سوسیالیـستەکانی کریـستیان

خوازیاری دامەزرانی کومەڵگایەك لەسەر شێوەی ئەنجومەکانی برایەتی کریسیییان بوون کە لەواندا تاکەکان لەسەر بنەمای فێرکردنەکانی حەزرەتی مەسیح دوست و خەمخوری یەکتر بن.

لە کوتاییەکانی سەدەی نوزدەهەم سوسیالیسمی کریستیان شەفافیەتێکی زۆرتری بە خۆ وەبینی. پاپالئوی سیزدەهەم لە ساڵی ١٨٩١ نامەیەکی بڵاوکردەوە کە لەودا سەرنجی کریستانیەکانی بو لای بارودۆخی نا لەباری چینەکانی کرێکار راکێشا بوو. دیار پاپا لەو نامەدا [کە بۆ کەنیسەکانی ناوبراو] لە مافی مولکداریەتی تایبەت بەرگری‌دەکردو تیوریەکانی مارکسیستی،سەبارەت بە خەباتی چینایەتی‌و شۆرشی سوسیالیستی‌و دیکتاتوری پرولتاریا بە روونی‌و بە ئاشکرا رەد دەکردەوە. لە بەرانبەر ئەو دا داوای لە خاوەن کارەکان دەکرد کە بۆ مافی کرێکارەکانی رێز دابنێن‌و سەرنجی ئەوانی بۆ لای پێویستی دانانی کار، پێکهێنانی یەکیەتیەکانی کرێکاری‌و دیاری کردنی لائیکەمی رۆژانە، رادەکێشا. ئەم قەرارە [نامەکەی پاپا]و قەرارێکی دیکە کە لە ساڵی (١٩٣١) لە لایەن پاپاپیوسی یازدەهەم وەدەرکرا، یارمەتی بە گەشەی سوسیالیزمی کریستیان کرد، حزبەکانی دێموکرات کریستیان بە زۆری لە ئوروپا دا لایەنگری سوسیالیزمی کریستیان بوون.

سوسیالیزمی پیشەیی بزووتنەوەیەکی سوسیالیستی دیکە بوو کە لە دەیەی (١٩٢٠) لە بەریتانیا سەری هەڵدا. تیوریسینەکانی سەرەکی ئەم بیچمە لە سوسیالیزم، برتراند راسل، ئار. ئیچ تونی، جی. دی، ئیچ کول و اس .جی، هابس بوون. سوسیالیزمی پیشەیی تا رادەیەك بۆچوونەکانی ویلیام موریس شاعیر و هونەرمەندی سەدەی نوزدەهەمی بریتانیا کاریگەری لەسەر بوو، ئەو پێشە سازی نەوێی وەك دیاردەیەکی ناشیرین و تێکدەر وەسف کرد. سوسیالیستە پیشیەکان لە گواستنەوەی مەڵکداریەتی کەرەستەی بەرهەم هێنان بۆ دەوڵەت و سپاردن و بەرێوەبەری کارگاکان بە یەکیتەکان و پیشەکانی کاریگەری پشتوانیان دەکرد. هەر پیشەیەك دەبوا سەبارەت بە ویستی ئەندامانی خوێ وەك بەرهەم هێنەر ( بۆ نموونە سەعاتی کار و مەرجەکانی کار) دەسەڵاتی تەواوی بێ. بەڵام ویستەکانیان وەك خەڵکی ئاسایی کە بەرهەمی کار سەرف دەکەن [مصرف کننده] دەبوا لە ژێر چاودێری دەوڵەتدا بێ. سەبارەت بە ئەگەری تێکەڵ بوونی ئەرکەکان نێوان دەوڵەت و یەکیتیەکان لە نێو سوسیالیستەکانی پیشەیی جیاوازی بۆچوون هەبوو. هەندێك دەوڵەتیان لە کاتی کێشمەکێشەکاندا بە نێو بژێوانی نیهایی دادەنا، لە کاتێکدا کە هەندێکی دیکە دەوڵەتیان وەك دامەزراوەیەك لە راستای کونگرەی

یەکیتیەکان و پیشەکان بە حیساب دەهێنا و پێیان وابوو کە کیشمەکێشی جیگەی باس دەبوا لە ڕێی دیالۆگەوە چارەسەر بکرێ. هەر چوونێك بێ هەموو لەسەر ئەو بڕوایەدا بوون کە دەوڵەت لە سیستمی نوێدا نابێ ببێ بە دامەزراوەیەکی بووروکراتیکی مەزن. ئەوان سوور بوون لە ڕەخنە گرتن لەسەر هەڵوێستی مارکسیستەکان کە دامەزرانی دەوڵەتی پرولتاریایی هەر دیکتاتوری یەکی نوێی لە جێگەی دیکتاتوریە چینایەتیەکانی پێشوو پێك دەهێنا.

سوسیالیستە پیشەیی یەکان لەسەر ئەو بڕوایەدا بوون کە نامەرکەزی ئابووری و بەشکردنی سیستم گەلی بەرهەم هێنان نێوان پیشەکان و یەکیتیەکان بەرگری لە پێکهاتنی مونوپولەکان دەکا. بەلاّم بە کردەوە لە بارۆدوخی پاش شەڕی جیهانی یەکەم، مەیل بۆ لای مونوپولەکان لە سەرمایەداریدا بە هێز بوو و ئامانجەکانی سوسیالیزمی پیشەیی بە توندی لە بیر چووە، لەو هەل و مەرجەدا سوسیالیستە پیشەییەکان ئەرکی خۆیان هەر پاراستنی دێموکراسی لە بەرانبەر مەترسیەکانی فاشیزم دا دەزانی. سوسیالیزمی ریفورمخوازی "فابین" بە دامەزرانی "ئەنجومەنی فابین" لە ساڵی ١٨٨٤ سەری هەڵدا، وشەی "فابین" کە لە فابیوس، پالەوانی یونانی وەرگیراوە، بە مەیلی ڕیفورمخوازی لەسەرخۆ و سیاسەتی پشودرێژی و چاوەڕوانی ئەو ئەنجومەنە ئاماژەی دەکرد، لەبەر ئەوەی فابیوس لە شەڕ بە دژی هانی بال پێی وابوو کە دەبێ تا کاتێ لەبار چاوەڕوان بێ. زۆر کەس لەسەر ئەو شێوە کارە ڕەخنەیان بوو، بەلاّم فابیوس کاتێك هەلی لەبار ڕەخسی، گورزی خۆی وەشاند کە وابوو پشو درێژی و چاوەڕوانی بێ سنوور نەبوو. هەر چۆنێك بێ فابینەکان زیاتر ڕووناکبیرو پیاوی ئەندیشە بوون تا پیاوی شۆرش‌و کردەوە. لە کەسایەتیە ناودارەکانی سوسیالیزمی فابین دەبێ لە برنارد شاو، ئیچ. جی، ولز، گراهام والاس، دی، ئیچ کول، سیدنی ویبترس وب ناو ببرێت.

بەگشتی بەپێی بۆچوونی سوسیالیستەکانی فابین زۆربەی جورەکانی سامانی کار بۆ نەکراو [نامکتسب، باد آوردە] بەرهەمی کۆمەڵگایە، بۆ وێنە لەگەڵ زۆربوونی حەشیمەت لە ناوچەیەکدا یان سازکردنی شەقامێك لەو بەشەدا نرخی زەوینەکان دەچنەسەر. هەروەها گەشەی کارگەکان بەستراوەتەوە بە هۆکاری کومەلاّیەتی وەك زۆربوونی حەشیمەت، کەوابوو ئەو قسە کە سەرمایەدارەکان دەیکەن کە داهاتەکەیان ئاکامی تێکۆشانی خۆیان بو، تەنیا تا ڕادەیەك ڕاستە. ئەو سامانە مەزنەی جیهانی ئەورۆ بەرهەمی تێکۆشانێکی زۆرنیە، بەلکوو هۆکارگەلێکی زۆر ئالۆز لە پشت ڕەوتی جوونە سەری سامان شاردراوەتەوە. لە نیهایەتدا

سامان بەرهەمی کومەڵگایەو خاوەن سامانەکان کارێك جگە لە وەرگرتنی قازانجو کرێ بەرێوە نابەن.

سوسیالیستەکانی فابین تیۆری مارکسیستی بایی[ارزش] یان رەد دەکردەوە. بە بۆچوونی ئەوان بەها تەنیا ئاکامی کار لەسەر کەرەسەی خاوی سروشتی نیە، بەڵکوو لە بناخەدا بەرهەمی گەشەی کومەڵگاو کامل بوونی شارستانی بوە. بۆیە زیادە بەها نەبۆ کرێکاران نە بۆ خاوەن سامانەکان، بەڵکوو بۆ گشت کومەڵگایە. هەروەها سوسیالیستەکانی فابین بە تیۆری مارکسیستی شەڕی نێوان کارو سەرمایە قایل نەبوونو بە بۆچوونی ئەوان دژایەتی سەرەکی لە نێوان خاوەن سەرمایەکانو گشت کومەڵگا بوو. هەر بۆیە بەخشینی گشت بەرهەمی کاری کرێکارەکان بە وان بە ناعادیلانەیان دادەنا. بە بۆچوونی ئەوان سامان لە کومەڵگا دەبێ بەشێویەك دابەش بکرێ کە هەموو خەڵك لەو بەها یانەکە کومەڵگا خۆی بەرهەمی هێنانەوە، هاوبەش بن، لەم رووەوە سوسیالیستە فابینەکان لە گواستنەوەی لەسەر خۆی مولکداریەتنی ئەرزی، پیشەسازی،ماڵیو تیجاری بۆ کومەڵگا یان بۆ حکومەت وەك نوێنەری کومەڵگا لایەنگرییان دەکرد.

سوسیالیستە فابینەکان بە پێچەوانەی دروشمی سەرەکی خۆیان لە نیهایەت دا لە شۆرشی توندوتیژ پشتیوانیان نەدەکرد، بەڵکوو خوازیاری ئاڵوگۆڕی ئاشتیخوازانەو لەسەر خۆ بوون، سیدنی وب گۆڕانی لەسەر خۆی وەك یاساو بنەمایەکی مسوگەری دادەنا، بە بۆچوونی ئەو لە بناخەدا گۆڕانی شورشگێڕانەو لە ناکاوو بێپێشینە مومکیی نیە. هەروەها برنارد شاو دەیگوت: دەبێ لە ئیشی ساکاری شورشگێڕی دەست هەڵگریو رووبکەیتە ئیشی دژوار ریفۆرمی بەکردەوە بەشێوەی پارلمانی. بەگشتیی سوسیالیستە ئابینەکان دەوڵەتی دێموکراتیکی مودیرنییان وەك باشترین ئامراز بۆ دامەزراندنی سوسیالیزمو ئابووری کومەڵایەتی دەناساند.

## ئانارشیسم

ئەنارشیستەکان بە پێچەوانەی لاینگرانی هیگل کە دەوڵەتیان تا پلەی خودایی دەکێشایە سەرو ئازادی یان هەر لە پێرەویکردنی رەها لە دەسەلاتی دەوڵەتدا دوزیبوە، سەبارەت بە دامەزراوەی دەوڵەتو دەسەلاتی دەوڵەتی رەشبین بوونو هەر چەشنە دامەزراوەیەك لەسەر زۆرو

ناچارکردن دامەزرابێ بە هۆکاری گەندەلی ژیانی ئەخلاقیو کومەلایەتی مرۆڤ یان زانیوە. بەگشتیی ئانارشیستەکان لەگەڵ حکومەتی پشت بەستوو بە زۆر دژایەتیان کردوە، بەلام هیچکات خوازیاری پێچانەوەی دامەزراوەی حکومەت بەشێوەی گشتیی نەبوون. ئانارشیستەکان حکومەتەکان ئێستا وەك نموونەی زۆرو دەسەلاتداری مەحکوم دەکەن، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دامەزراوەی حکومەتی یان لەکومەلگای مرویی دا بە سوودمەند دەزانی، بەو حالەش حکومەتی دلخوازی ئەوان دەبێ بە تەواوی دلخوازانە بێو هیچ جۆرە دەسەلاتی زۆرەملانە نابێ بەسەر هاوولاتیاندا بسەپێ. لە روانگەی ئەنارشیستەکانەوە دەکرێ ئەو کەسانە کە سەرکێشن بخرێنە ژێر گوشاری بیروڕای گشتییو یان لە کومەلگا دەرکرێن. بەلام بە کارهێنانی زۆر لەوە زیاتر رەوا نیە. دیارە ئەنارشیستەکان بروایان وایە کە مرۆڤ لە ناخی خۆیدا پاكو کومەل گورۆیە، بەلام دەسەلاتو زاڵ بوونی دەولەتیی گەندەلی دەکاو سەرەرۆ باری دێنێ. ئەوان پێیان وایە کە لە نێو بردنی دەولەتی دامەزراوو لەسەر بناخەی زۆرداری جینایەت کەم دەکاتەوە. دەولەت بۆخۆی بە رێخستنی شەرو چەوساندنەوەی خەلك خراپترین جینایەتەکان سەبارەت بە خەلك تووش بێ.

ئەنارشیستەکان بەسەر دوو تاقمی سەرەکیدا دابەش دەبن: یەکەم ئەنارشیستەکانی تاکگەرا وەك ویلیام گادوین (١٨٣٦ــ١٧٥٦)، پرودون (١٨٦٥ــ١٨٠٩)و ماکس ئیشترنر (١٨٥٦ـ١٨٠٦) کە خوازیاری لەنێو بردن مولکداریە گەورەکانو پەرەپێدان بە مولکداری بچووكو بازرگانی ئازادو بچووكو لەگەل هەر چەشنە پلان دانان بە مەبەستی چاکسازی ئابووری دژایەتیان دەکرد.

دووهەم ئەنارشیستەکانی کۆگەرا کە هەموویان شورشگێڕیش بوون. دامەزرێنەری ئەنارشیسمی گۆگەرا میخایل باکونین (١٨٧٦ـ١٨١٤) بوو. ئەو لە بنەمالەیەکی دەولەمەند لە رووسیە لە دایك بووو سالەها بەهۆی تێکۆشانی شۆرشگێڕانەی خۆی کەوتبووە زیندان. لەنێونەتەوەیی یەکەمی سوسیالیستیدا لەگەڵ مارکس هاوکاری هەبوو، بەلام مارکس بۆچوونی ئەوی لەسەر ئەوە کە دەیگوت دەکرێ یەك شەوە [ بە ماوەیەکی کورت] دەولەت لەنێو ببرێ رەد دەکرد.

باکونین بەگشتیی دەولەتو دامەزراوەی مولکداریەتی تایبەتو ئایینیوەك دامەزراوەگەلێکی نائەخلاقی چاو لێدەکرد. لە روانگەی ئەوە دەولەت پشت ئەستوور بە زۆر،

مولکداری تایبەتو ئایین دامەزراوەگەلی سروشتی قوناخی یەکەمی گەشەی مرۆڤنو لەگەڵ گەشەکردنو کامل بوونی مرۆڤ کۆن دەبنو دەرزینو لەنێو دەچن. لەگەڵ ئەوەش ئەم دامەزراوانە نائەخلاقیشن. کردەی ئەخلاقی، کردەیەکە کە هان دەری بەرێوەبردنی خۆیەتی واتا بە بێ ترس لە سزا یان هیوا بە پاداشت بەرێوەبچێ. بەپێچەوانە کردەیەك کە لە رووی قازانج ویستی بەرێوەبچێ، کردەیەکی نائەخلاقییە. کردەوەکانی دەوڵەتیش نائەخلاقییە، لەبەر ئەوە لەسەر ترس لە سزا یان هیوا بە پاداشت پشتیان بەستوە. ئایینیش نائەخلاقییە لەبەر ئەوە کە لە بەرانبەر کردەی چاك یان خراپ پاداشتی باش یان خراپ وەردەگرێ. بەگشتیی دەوڵەتو ئایین لەگەڵ ئەخلاق نا تەبان.

باکونین بڕوای وابوو کە ئامانجەکانی ئەنارشیسم هەم لەرێی شۆرشو هەم لە رێی گۆڕانی لەسەرخۆ دێتەدی. شۆرشی ئەنارشیستیی دەبێ کەنیسەکانو ئامرازی زۆرداری دەوڵەتیو مولکداری تایبەت لەنێو با. لەم رێگادا دیارە روودانی توندوتیژی ناچارییەو باکونین ئەوەی پاساو دەدا، بەڵام کومەڵگای ئەنارشیستی دەبێ لەسەر بنەمای هاوکاری دڵخوازانە رابوستێ. هەموو کەرەستەکانی بەرهەمهێنان لەم کومەڵگادایەدا بۆ کومەڵگا بوو و کۆمەڵگای ئەم کەرەستانە بە دامەزراوەکان یان تاکەکان دەدا بەکرێ.

لەوانەی بڕوایان بە باکونین بوو دەبێ لە ئەنارشیستی ایتالیایی ئینریکومالاتستا (١٨٥٣ـ١٩٣٢) ناو ببرێ. ئەندامی بەشی ئیتالیای نێونەتەوەیی یەکەم بووو هەر لەم رێگاوە کەوتە ژێر کاریگەری فیکری باکونین. پاش مەرگی باکونین مالاتستا دەستی بە چالاکی ئەنارشیستیو شۆرشگێری کردو چەندین ساڵ بەو بۆنەوە زیندانی کرا. ئەو لایەنگری بەرەی یەکگرتووی ئەنارشیستەکان، سوسیالیستەکانو سەندیکالیستەکان بوو. بەڵام گرینگترین قوتابی باکونین، شازادە پیتر کروپوتکین (١٨٤٢ـ١٩١٩) بوو. ئەو لێکدانەوەی لەسەر تیۆری گوورانی [تکامل] داروین نووسیو پێی وابوو، کە ئەم تیۆریانە بە دروستی لێك نەدراونەتەوە. بەپێی لێکدانەوەی کروپوتکین مانەوەو درێژەدان بە ژیان وانیە هەر بۆ بە هێزەکان بێ، بەڵکوو لە بناخەدا توانایی بۆ هاوکاری لەگەل هاوچەشنەکان گرینگتر لە ململانییو شەڕ بۆ مانەوەی بێ بەزەییانەیە. ئەو پێی وابوو کە سەبارەت بە شەڕو ململانێ وەك هۆکاری "گووران"ی مرۆڤ زۆر گەورە کراوەتەوە [مبالغه]. ئەم هۆکارانەی لە جێی پاراستنی باشترین لە راستیدا باشترینەکان لەنێو دەبەن. کەوابوو گەشەی مرۆڤ پێوەندییەکی لەگەڵ شەڕ بۆ مانەوە نیە.

کروپوتکین بڕوای وابوو کە مرۆڤایەتی هەر لە ڕێگای ئازادبوون لە دەست زۆرو چەوساندنەوەی دەستی دەگا بە ئاسایش‌و پێشکەوتن‌و گەشە دەکا. کروپوتکین یاساکانی دەکردە بە سێ دەستە پارێزەری مولکداری، یاساکانی پارێزەری حکومەت‌و پارێزەری تاکەکان. لە ڕوانگەی ناوبراو یاساکانی دەستەی یەکەم دەبنە هۆی چەوساندنەوەی بەرهەمهێنەران‌و پاراستنی ئیمتیازەکانی کەمایەتییەك کە لە ڕێی "دزی"یەوە دژین. یاساکانی گرووپی دووهەم دەولەت کە پارێزەری بەرژەوەندیەکانی چینە دەسەلاتدارەکانە، لەسەر کورسی دەسەلات دەهێلێتەوەو یاساکانی دەستەی سێهەمیش لە ئاکامی کردارو دەسەلاتی دوو دەستەکەی یەکەم‌و دووهەم یاساکانی بێکەلك دەبن. بە بۆچوونی ئەو هەلوەشانی مولکداری تایبەت مەیل بۆلای جینایەت لەنێو دەبا.

کروپوتکین لەسەر ئەو بڕوا بوو کە دەبێ پاش لەنێو بردنی دەولەت کومەلگایەك پێکهاتوو لە کومون‌و ئەنجومەنگەلی ئازادو لەسەر بناخەی بەرژەوەندی ئابووری هاوبەش پێك بێ. ئەم جۆرە ڕێکخراوە دلخوازانە وردەوردە پەرە دەگرن‌و فیدراسیونگەلی ناوچەیی یان لێدەکەوێتەوە. بەم شێوە بناخەی کومەلگای دلخوازی کروپوتکین نە لە ڕووی زۆرو دەولەت، بەلکوو لەسەر تەوافوق دەبێ. وەهی کومەلگایەك لە ڕوانگەی ئابووری‌یەوە بەتەواوی کومونیستی دەبێ. لەم کومەلگادا پێویستی بە کاری تاقەت پروکێن‌و درێژ خایەن نیەو لە ئاکامدا تێکۆشانی فەرهەنگی زیاد دەکا. هەروەها بەرهەمهێنان ناوەندی دەبێ‌و کرێکارەکان نیوەی کاتی خۆیان لە کارگەکان‌و نیوەی کەی دیکەی لە کێلگەکاندا تێپەر دەکەن. ئەوکات کارە فکریەکان لە پاوانی کەمایەتیەکان مومتاز دا نامێنێ‌و مووچەکان بەپێی پێویستی دەبێ‌و ئەمە تەنیا سیستمێکی دادپەروەرانەی دانی مووچەکانە. لەبەر ئەوەی هیچ پێوانەیەك بۆ لە سەرەو دانانی کاریەك لەسەر کارێکی دیکە لە گۆڕێدا نیە.

لەسەر یەك ئەنارشیستەکان بە پێچەوانەی لایەنگرانی هیگل‌و هابز کە دەولەتیان بە پارێزەری ئازادی دەزانی، دەسەلاتی دەولەتیان وەك دوژمنی ئازادی حیسیب دەکرد. لە سەدەی بیستەم ئەنارشیسم بەهۆی جوراوجور پێگەی خۆی لە دەستدا. تەنانەت لە سیستمی قەیرانی گەورەی دەیەی ١٩٣٠ پێویستی بوونی دەولەت بە مەبەستی پێکهێنانی نەزم‌و ئەمنییەت‌و ئاسایش زۆرتر دەرکەوت، تەنانەت لە سیستمی بەروالەت سوسیالیستی ڕوسیە دەولەت زۆر گەورەترو بەهێزتر بوو.

## فاشیزم

زۆر لە بیرمەندانی سیاسی بە بەرپرسی پێکهاتنی بیروکەی فاشیستی ناسراون. ئەفلاتوون، ماکیاولی، هابز، فیختە، روسو، هیگل، کونت دوبنیگو، نیچە، سورل، پارتوو کەسانی دیکە لەوانە بوون کە بونیاتنانی ئەندیشەی فاشیسم لە لایەن ئەوانەوە دەزانن. دیارە ئەندیشەیەك بە گرینگیو بەربلاوی فاشیسم ناتوانێ بێریشەی فیکری بێ، بەلاّم فاشیسم لە سەرەتادا مانایەکی سنووورداری هەبووو بیچمیك لە سەندیکالیستی دەولەتی بەحیساب دەهات کە موسولینی هێنایە بەرباس. ئەم چەشنە سەندیکالیستە بە مانای رێکخستنی ئابووری کومەلگا لە سەرەوە بە هۆی دەولەت بوەو لەودا تاپوگەری تایبەت بە پشتیوانی دەولەت بوەو هێزی کار بە توندی لە رووی سیاسیەوە کونترول کراوە. کەوابوو دەتوانرێ لە دوو روانگەوە فاشیسم لێك بدرێتەوە: یەکەم، بە مانا سنووردارەکەی واتا چەشنێك لە سەندیکالیستی حکوومی یە کە زۆرجار لەو دەولەتانەدا کە لە کومەلگای روو لە گەشەو پەرەگرتنن [در حال توسعە] بۆ گەشەی ئابووری هەلدەستن بە ریفورمو شۆرش لە سەرەوە، مانا بەربلاوەکەی ئەوەیە کە پێکهاتوە لە بونیاتگەلی فەلسەفیو مێژوویی بزووتنەوەی فاشیسمو سەرهەلدانی کومەلگاو دەولەتی توتالیتری کە باشترین نموونەکەی ئالمانی هیتلیری (٤٥-١٩٣٣)و ئیتالیای فاشیستی (٤٥-١٩٢٢) بوون.

لە مانای سنووورداری یەکەم دەکرێ سەرهەلدانی فاشیسم هەم لە روانگەی بیروئەندیشەی سیاسیو هەم لە روانگەی کومەلناسی سیاسی لێك بدرێتەوە لە باری ئەندیشەی سیاسی، هەروەك وتمان، فاشیسم چەشنێك لە قوتابخانەی سەندیکالیستی دەولەتییە کە بەتایبەت بەهۆی ژورژ سورل هاتوەتە ئاراوە. لە رووی کومەلناسی، فاشیسن دژکردەوەیەکە لە بەرانبەر قەیرانە قوولە کومەلایەتیەکاندا سەرهەلێ دەداو بەتایبەت بەهۆی هەست بە لادانو تێکشکانی چینەکانی پێش قوناخی سەرمایەداریە. فاشیسیان زۆرجار وەك شۆرشی چینی وردەبورژوازی لێك داوەتەوە. برینگتون مور لە کتێبی ریشەگەلەی کومەلایەتی دێموکراسیو دیکتاتوری پێی وایە کە فاشیزم لە سێ توخمی سەرەکی پێك هاتوە: یەکەم دژکردەوەی بەشگەلێك لە کومەلگا بە تایبەتی بەشی پێش سەرمایەداری واتا جووتیارانو وردەبورژوایو تا رادەیەك خاوەن ئەرزە دەولەمەندەکان سەبارەت بە فشاری پیشەسازیو نوێگەرایی، دووهەم چەشنێك لە بە پەرۆشیو خوزگە بۆ ژیانی ساکاری گوندیو فەلاحیو ئاواتی گەرانەوەی بۆ ئەو بارودۆخە، سێهەم

دژکردەوە سەبارەت بە هەوڵو کۆشش بۆ پێکهێنانی دێموکراسی پارلمانی. بەشێوەی گشتیی فاشیسم زۆر جار پاش خولێکی کورتخایەن لاوازو هەوڵ بۆ نوێژەن کردنەوەو پیشەسازی سەرهەڵ دەدا. بەم مانایە فاسیسشم بزووتنەوەی راستی توندرەوی چالاكو چەشنێك لە رادیکالیزمی راست رەوانەیە.

لە رووی پێگەی کۆمەڵایەتی فاشیسم زیاتر بزووتنەوەیەکی چینی نێوەنجی یە کە زۆر جار بە پێشتیوانی بەشێك لە ئەشرافیەتی کۆن و جوتیاران بە دژی مودێرنیتە و پیشەسازی سەر هەڵ دەدا. چینە نێوەنجیەکانو وردە شاریو جوتیاران کە دەکەونە بەر تەوژمی پەرەسەندنی سەرمایەداری گەورە سەبارەت بەم گۆرانە دژ کردەوە نیشان دەدەن. لەبەرانبەردا رێبەرانی فاشیسمیش زۆرجار دەستەو داوینی هەستی دژی سەرمایەداری لە نێو چینە نێوەنجیەکان دا دەبن. بەڵام لەم روانگەوە سەرنجام فاشیسم خەباتی چینایەتی چینی سەرمایەدار بە دژی چینەکانی خوارەوەیەو لەسەریەك بەرژەوەندی گرینگ و جێکەوتوو لە کۆمەڵگادا دەپارێزێ. بەواتایەکی دیکە فاشیسم گورانێك لە کۆمەڵگادا پێك ناهێنی.

بە شێوەیەکی گشتی پاش شەری یەکەمی جیهانی، سێ ئایدۆلوژی گرینگ لە ئورووپا لە ململانی دا بوون. یەکەم لیبرالیزم و بزووتنەوەکانی سوسیال دێموکراتی نامارکسیستی، دووهەم مارکسیسمو کۆمونیسمی نێونەتەوەیی و سێهەم چەشنەکانی فاشیسم.

لە وڵاتگەلی تا رادەیەك سەقامگرتووی ئورووپا وەك بریتانیا هێشتا لیبرالیزم دەسەڵاتدار بوو، هەرچەند لەویشدا بزووتنەوەی کومونیستی و فاشیستی گەشەیان کرد. بزووتنەوەی فاشیستی لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٣دا دامەزاو و لە ساڵی ١٩٢٦ نیو میلیون لایەنگری هەبوو. لە ساڵی ١٩٣٣ یەکیتی فاشیستەکانی بەریتانیا بە رێبەری سێرئازوڵدمازڵی دامەزاو بووبە یەکێك لە هێزە سیاسیە گرینگەکان. فاشیسمی بەریتانیا لەت بوونێك بوو لە بزرتنەوەی چەپ و مازڵی بۆ خۆی پێشتر ئەندامی دەوڵەتی حزبی کرێکار بوو.

لە فەرانسە دەسەڵاتی لیبرالیزم لاوازتو بوو و لە ئاکامدا بزووتنەوەی مارکسیستی و فاشیستی پەرەی زۆرتریان سەند. حزبی کاری [عمل] فەرانسە بە رێبەری شارڵ موراس لقو پوپێکی فاشیستی بەهێزی بوو. لە ئیتالیا ناسەقامگیری سیاسی زیاتر و پێگەی لیبرالیزم لاوازتر بوو، تەنیا هەڵبژاردنی واقیعی هەڵبژاردنێك لە نێوان دوو بزووتنەوەدا بوو. یەکێك بزووتنەوەی سوسیالیزم لە باکووری ئیتالیا لە نێو کرێکارەکان و جووتکارانێك کە بە دژی

خاوەن ئەرزەکان یەکیتیەکیان پێك هێنابوو و دووهەم سەندیکالیزمی نیشتمانی موسولینی. سوسیالیستەکان و فاشیستەکان ئیتالیا هەردوو ئامادە بوون بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی سیاسی خۆ لە کردەوەی توندوتیژنە بویرن. لە ئاڵمان پاش شەڕی یەکەم هەرکەس بەهەرکەس و پشیوی و نەبوونی کۆنترۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی، بارۆدوخەکەی لەشەڕی نێوخۆیی نزیك کردەوە. کۆماری وایمار(١٩٣٣ـ١٩١٨) دەوڵەتێکی لیبراڵو لاواز بووو لەوسەردەمانەدا کومۆنیستەکان، سەندیکاکان، ئەنارشیستەکان، ئیسپارتاکیستەکان، ناشنال سوسیالیستەکان(نازیەکان) و باقی گرووپەکان هەموو خوازیاری دەسەڵات بوون. تەنیا هۆکاری پارستنی یەکیەتی کۆماری وایمار کە هەموو دەسەڵاتێکی ئەخلاقی و نیزامیشی لەدەست دا بوو کەسایەتی باوك سالارانەی فیلد مارشاڵ فۆن هیندنبرگ بوو، سەرئەنجام هیتلیر، رێبەری حزبی ناشناڵ سوسیالیست کە بە دژی بولشویکەکانی رووس‌و پیلانی جولەکان پرۆپاگەندەی دەکرد، لە وروژاندنی کۆمەڵایەتی بەربلاو بەتایبەت لە نێو چینەنێوەنج و خوارەکان سەرکەوتوو بوو و لە هەڵبژاردنی ١٩٣٣ دا گەیشت بە راوێژکاریی دەوڵەتێکی لاواز.

هەروەك وتمان فاشیسم لە پلەی یەکەم دا لقێك لە سەندیکالیسم بۆ خۆی بەشێك لە دەوڵەتی داخراوە. سورل لە سەرەتای سەدەی بیستەم نمایەکی تەواوی لە سەندیکالیسم خستە بەرچاو. سەندیکالیسمی سورل تیورێکی شۆرشگێرانە بووو پێی لەسەر بایەخی ئابووری‌و سیاسی چینی کرێکار دادەگرت. بەڵام سورل دژی چەمکی دیکتاتوری پرولتاریا و خوازیاری پێکهاتنی سیستمێکی نیشتیمانی بوو کە لەسەر بناخەی کۆمەڵێك لە یەکیەتیە کرێکاریەکان دامەزرابێ. سورل هەروەها خوازیاری بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی بوو. لانی کەم لەرووی شیوەگەلی پەنابردن بۆ کردەی راستەخۆی سیاسی، فاشیسم بە توندی لەژێر کاریگەری بیری سورل بوو. هەروەها فاشیسم لە حکومەتی تاکە حیزبی پێشتیوانی دەکرد. سیستمی تاك حیزبی بە دوو هۆی گرینگ پاساو دەدرا: یەکەم حزب سەرچاوەی ویست و ئیرادەی نیشتمانی یە، لەبەر ئەوەکە کاتێك دەوڵەت بەدەستەوە دەگرێ ئیرادەی فرە چەشنی گرووپەکان لە خۆی دا کۆ دەکاتەوە، دووهەم حزب سەرچاوەی چارەنووسی مێژوویی دەوڵەتە کە خۆی دەربری روحی نەتەوەیی یە.

هەروەك پێشتر ئاماژە کرا، لە مانای دووهەمی دا فاشیسم لە سنووری سەندیکالیسم تێ پەڕی و سەرچاوەی بزووتنەی ناسیونالیستی و دژی ئەقلانیەت بوو. فاشیسمی ئیتالیا

پێکهاتەیەك لە ناسیونالیزمی توندرەوانەو چەشنێك لە ئایدیالیزم بوو کە بەهۆی پروفیسوری فاشیستی ئیتالیایی جیوانی جینتیله (١٩٤٤ـ ١٨٧٥) هاتە ئاراوە. جینتیله ماموستای فەلسەفە لە زانکۆی رۆم بوو و لە لایەن موسولینی یەوە بەرپرسایەتی نوێژەن کردنەوەی سیستمی فێرکردنی ئیتالیای لە ئەستۆ بوو. ئەو کە خۆی بە شوێن کەوتووی هێگڵ دەزانی، مەبەست لە هەوڵە فیکریەکانی خۆی لە" کوکردنەوەی جوراوجوریە بێ سنوورەکانی مرۆڤایەتی و سروشت لە یەك ئەندیشەو رەها"دا راگەیاندبوو. ناوبرا بەتایبەت دژی روناکبیری بوو، روناکبیرەکانی بەهۆکاری پێکهێنانی دووبەرکی و دژی یەکیتی نیشتمانی دەزانی.

جینتیله لەسەر ئەندیشەی یەکگرتنی تاكو دەوڵەتو نەبوونی جودایی ئەندیشەو کردە کە لە بنەماکانی فیکری فاشیسمە، پێی دادەگرت. دەوڵەت لە روانگەی ناوبراوە بوونەوەرێکە خاوەن چارەنوس، مەبەستو ئیرادەی تایبەت بەخۆی سەرچاوەی ئەخلاقی رەهاو ئیرادەی گشتی یە. هەربۆیە هەموو کاروبارەکان و تێکۆشانی مرۆڤی بە شیوەی رەوا [مشروع] لە بازنەی دەسەڵاتی دەوڵەتدا جێی دەگرت. دەوڵەت بەم مانایە داواکاری چاودیری بەسەر تەواوی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی یە. فاشیسم هەروەها دوژمنی ئەندیشەی سەربەخۆو بەجیا لە کردەی سیاسی یە. ئەرکی تاك نە ئەندیشە بەڵکوو ئەمەکداری گشتیی و بەکردەوە بەرانبەر دەوڵەتە. هەروەها فاشیسم باوەڕی بە بەردەوامی روحی نەتەوایەتی یە. نەتەوە یان قەوم بوونەوەرێکی مێژوویی یە کە ریشەی لە بەر بەریەتیکی پالەوان ئاسادا هەیە،ئەرکی تاك بە جێی هێنانی بەشی خۆی سەبارەت بە رۆحی قەومی یە. رۆحی قەومی دەست نیشان کەری چارەنوسی گەلەو زانیاری سەبارت بەم روحە تەنیا بۆ کەمینەیەکی تایبەت مومکینە. رێبەری فاشیستی لە نێو ئەو کەمینە سەر هەڵ دەدا و نوێنەرایەتی روحی نەتەوەیی دەکا. دیارە وەها وێنایەك لە رێبەری فاشیستی زۆرجار لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا باو بوە، لە نێو دەروپشتو خەڵکانی نیزیك بەرێبەر زۆرجار کێشەی دەسەڵاتونەبوونی باوەر بەرێبەریی بە فرەیی بینراوە، هەروەها رێبەرانی فاشیستی دیارە لەگەڵ یەکتر جیاوازی زۆریان لە کەسایەتیدا بوە.هەندێك وەك هیتلیرتووشی [ئیحساساتی] ناناسایی و هەندێکی دیکە وەك موسولینی و ژنراڵ فرانکو، عاقلتر بوون. ئیریك فروم لە کتێبی راکردن لە ئازادی فاشیسمی، بە جورێك لە نەخوشی کۆمەڵایەتی دەزانێ کە لەودا خۆئازاری (مازوخیسم) و خەڵك ئازاری (سادیسم) لەگەڵ یەك تێکەڵ دەبن و لە رێبەران و شوێن کەوتوانی دا هەردووکیان خۆ دەنوێنێ.

- ٩ -

# سیستمە سیاسیەکان

## ڕێزبەندی سیستمە سیاسیەکان

سیستمە سیاسیەکان بە پێی پێوەرگەلێکی جوراوجور دابەش دەکرێن. ئەرەستوو ئوگریەکی تایبەتی بەرێزبەندی جوراوجورەکانی حکومەت بوو. بۆ ئەم مەبەستە ئەو لەسەر دوو تەوەرە پێی دادەگرت: یەکەم پێوانەی ژمارەی دەسەلاتبەدەستان و گرووپی دەسەلاتدار و دووهەم تایبەتەندیە ئەخلاقیەکانی سیستمەکان کە داخوا خزمەت بە بەرژەوەندی تایبەتی دەسەلاتداران دەکەن یان بەرژەوەندی گشتی. لە پێکهاتەی ئەم دوو تەوەرە سێ جۆر ڕێژیم پێك دێ: حکومەتگەلی تاکەکەسی باش یان خراپ، واتا مورناشیو ستەمکاری، حکومەتگەلی چەند کەسی باش یان خراپ واتا ئاریستوکراسی و ئولیگارشی و حکومەتگەلی باش یان خراپ کە بەدەست ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکەوە بێ، واتا پولیتئی و دێموکراسی.

هەروەها بە بۆچوونی ئەرەستو سیستمە سیاسیەکان یان دەستوورەکان بە پێی شێوازی ڕێکخستن بەسێ توخمی حکومەت بۆ ڕێزبەندی دەبوون. سێ توخمی [عنصر] حکومەت بریتین لە: توخمی بڕیاردان لە سیاسەتی نێوخۆودەرەوە، توخمی ئیداری، واتا هەموو پوستە بەڕێوەبەریەکانی حکومەت و توخمی دادوەری. توخمی یەکەم و سێهەم زۆرجار لەدەست دەسەلاتدارانی سەرەکی وەك پادشا یان گرووپی دەسەلاتدار لە ئولیگارشیەکاندا. بەڵام توخمی دووهەم لەوانەیە لەسەر بنەمای میراتگری و گواستنەوەی پوستەکانی بێ، بە هەڵبژاردن بێ‌و یان تیروپشك بێ. هەڵبژاردن بەتایبەت لە ئاریستوکراسیەکاندا باو بوە کە زیاتر لە ڕێژیمەکانی دیکە پابەندی ئەخلاقیاتی مەدەنیو سیاسی بوون شێوازی تیروپشك لە دێموکراسیەکاندا بوە.

لە سەدەکانی نوێدا سەرەڕای پێوانەکانی ئەژماری، پێوانەی جیاکردنەوەو پێوەندی دەسەلاتەکانی حکومەتی لەگەڵ یەکتر لە دابەش کردنی ڕژیمەکاندا لەبەرچاو گیراون. شارل لوویی مونتیسکیو (١٦٨٩-١٧٥٥) تیوریسینی فەرانسەوی لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی روح القوانین بەڵگەی دەهێنایەوە بۆ ئەوەکە دابەشکردنی کونی ڕێژیمەکان بەسەر مونارشی، ئاریستوکراسی و دێموکراسیدا روون نیە، بەڵکوو دەبێ ڕێژیمەکان بەسەر مونارشی، دیکتاتوریو کۆماری ( چ دێموکراسی، چ ئاریستوکراسی) دابەش بکرێن. بناخەی ئەم ڕێزبەندیە دەگەرێتەوە بۆ بنەماکانی هەرکام لەم سیستمانە کە بریتین لە: شانازی

خوازی(بنەمای مونارشی) توس( بناخەی دیکتاتوری) زانایی‌و گەورەیی مەدەنی [فضیلت] (بنەمای کۆماری). هەروەها بەبۆچوونی مونتیسکیو حکومەتگەلی مەعقوول و نەرم رەو ئەوانەن کە لە نێوان سێ دەسەڵاتەکەی بەرێوەبەریی، یاسادانان و دادوەری،دابەشکردنی هاوسەنگیەك پێك بێن.هەرکام لەم هێزانە دەبێ بەهۆی دامەزراوەگەلی جیاواز بەرێوە ببرێ و نوێنەری پێگەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەتی بێ. ئەشراف دەبێ بەسەر دەسەڵات و کردەوەکانی خەڵك دا چاودێری بکەن و خەڵکیش لەبەرانبەردا بەسەر ئەشرافدا چاودێری هەبێ. بە پێی بۆچوونی مونتیسکو حکومەتی جێی پەسەند، حکومەتێکە پێك هاتبێ لە تۆخمەکانی پادشایی،ئەشرافی و جمهوری. لەبەر ئەوە کە تایبەتمەندی وەها حکومەتێك، جیا کردنەوەی هێزەکان و چاودێری ئەوان لەسەر یەکترە.

لە بابەتەکانی پێشوودا لە دووپێوەر بۆ دابەشکردنی جورە گشتیەکانی سیستمە سیاسیەکان قسەمان کرد: یەکەم رێزبەندییان بە پێی زاڵ بوونی یەکێك لە روخسارە سەرەکیەکانی دەوڵەت و دووهەم بە پێی چەشنی پێوەندی دەوڵەت لەگەڵ چینە کۆمەڵایەتیەکان. بە کەڵك وەرگرتن لەم پێوانانە تایبەتمەندی گەلێکی زۆرتر سەبارەت بە جورەکانی سیستمە سیاسیەکان دەناسرێ. پێوەری ژمارەیی ئێستا دەربڕی جۆر و سرۆشتی سیستمە سیاسیەکان نیە.

لەهەموو دەوڵەتە مودێرەنەکاندا گرووپەگەلێکی بە ژمارە کەم لە کاروباری حکومەتکردن دا دەستیان هەیە، بەڵام شێوەی گەیشتن بە دەسەڵات، شێوازی بەکارهێنانی دەسەڵاتەکەیان، پێگەو سەرچاوەی دەسەڵاتداریەتیان و جۆری پێوەندیەك کە لەگەڵ کۆمەڵگا هەیانە، زۆر جیاوازن. هەروەها پێوەری ئەرەستووی لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیو قازانجی گشتیو تایبەتی ئێستا ئیتر لی روانگەیەکی ئەخلاقی پەتی مانای نیە، بەڵکوو دەبێ ئەوانە بە سەرنجدان بە پێوەرەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی کامڵ بکرێن.دوو پێوەر لە روخساری چوارینەی دەوڵەت و پێوەندی ئەو لەگەڵ چینەکانی کۆمەڵایەتی، جۆرەکانی رێژیمە سیاسیەکان بە شێوەیەکی کامڵترو بەربلاوتر دەردەخا. هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا بە پێی پێوەری یەکەم، چوار جوری گشتی سیستمە سیاسیەکان لەوانەیە بێتە ئاراوە: دەسەڵاتخواز، ئایدولۆژیك،خوشگوزەرانی و چینایەتی. جۆرگەلی روونتر لە رێژیمە سیاسیەکان لەوانەیە لە ناخی هەرکام لەم جورە گشتیانەدا پەیدا ببێ. بە پێی پێوەری دووهەم،هەروەك پێشتر دیتمان، دەوڵەت لەوانەیە ئامرازی چینی دەسەڵاتدار، نوێنەری بارۆدوخی بالانس و تەوازونی چینایەتیو یان خاوەن

سەربەخۆیی ڕێژەیی لە چینەکانی کۆمەڵایەتی بێ. بەو حاڵەش دوو پێوەری دواییش تاردەیەکی زۆر دەرهەستن [انتزاعی]. وەسف کردنی خۆشگوزەرانی بوون [رفاهی] یان چینایەتی بوونی دەوڵەت لایەنەکانی و تایبەتمەندیەکانی دیکەی ئاشکرا ناکات. هەروەها باس لە پێوەندی نێوان دەوڵەت و چینە واقعیەکانی کۆمەڵایەتی وێنایەکی تەواو ناداتە دەست. ئێستا بە تێکەڵ کردنی کۆمەڵێك لە پێوەرەکانی سەرەوە لە دوو پێوەری گشتی تردا دەتوانرێ وێنایەکی کاملتر لە جۆرەکانی ڕێژیمە سیاسیەکان بدرێتە دەست. یەکەم شێوەی بەکارهێنانی دەسەڵاتی حکومەتی بەسەر کۆمەڵگادا کە پێکهاتەی دەسەڵات پێك دێنێ‌و دووهەم ڕادەی بەکارهێنانی دەسەڵاتی حکومەتی بەسەر کۆمەڵگادا بۆ پێك هێنانی گۆڕانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی.بە پێی پێوەری یەکەم سیستمە سیاسیەکان بە دوو دەستەی گەورە واتا دێموکراتیك‌و دەسەڵاتخواز دابەش دەبن‌و بە پێوەری دووهەم ڕێژیمەکانی چەپ گەراو ڕاست گەرا لێك جیا دەکرێنەوە. جوراوجوری ڕێژیمە سیاسیەکان لە کردەوەدا لە ڕادەی ڕێژەی دێموکرات بوون یان دەسەڵاتخواز بوون‌و چەپ گەرا یان ڕاست گەرا بوون دا بەرهەم دێ.

بە پێی پێوەری یەکەم پێکهاتەی دەسەڵات دوو جورە: یەکەم پێکهاتەی دەسەڵاتی یەك لایەنە وئەوەی دیکە پێکهاتەی دەسەڵاتی دوولایەنە، لە جوری یەکەم دا دەسەڵاتی سیاسی ڕەوایی خۆی لەسەرچاوەکانی سەرەوەی کۆمەڵایەتی [ماوراء اجتماعی] وەردەگرێ و فەرهەنگ و نەریتی بەشداری‌و کێ بەرکی لەواندا لاوازە. قەوارەی جوراوجور لە ڕێژیمەکانی دیکتاتوری کۆن‌و نوێ، توتالیتر و دیکتاتوری سەربازی‌و ناسەربازی خاوەن پێکهاتەی یەك لایەنەن. لە پێکهاتەی دەسەڵاتی دوو لایەنەدا سەرچاوەی ڕەوایی کەیان لە نێوخۆی کۆمەڵایەتی دایە. و لەئاکامدا دەرەتانی بەشداری‌و کێ بەرکێ‌و موناقسەی سیاسی لەواندا بە پلەی جوراوجور بوونی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ باس لە پێکهاتەی دەسەڵاتێك بکرێ کە دەسەڵات لەودا بە ڕواڵەت خاوەن پێکهاتەی دوولایەنەو دامەزراوەکانی بەشداری یە، بەڵام لە ڕاستی دا پێکهاتەی دەسەڵات یەك لایەنەیە. دێموکراسیە ڕواڵەتیەکان‌و لەو بیچمانە خاوەن وەها پێکهاتەیەکی دەسەڵاتن.

پێوەری دووهەمی ڕیزبەندی سیستمە سیاسیەکان، ڕادەی دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری‌و کۆمەڵگایان بە لێکدانەوە بەناوبانگەکە لە چەپ‌و ڕاست بۆ بوونیان دایە. ووشەکانی چەپ‌و ڕاست جیاکردنەوەی تیۆرانینەکان و ئایدولۆژیە سیاسیەکان لە ئاستی تاکەکان،

حزبەکانو دەوڵەتەکان بەکارهێنراون. لەگەڵ ئەمەش ئەم دوو وشە وردبینی تەواویان پێوە دیار نیە و ناتوانن جۆرگەلی هەلۆێستە ئایدولۆژیکە سیاسیەکان بخەنە ژێر چەتری خۆیان. ریشەی مێژوویی ئەم وشانە دەگەرێتەوە بۆ شۆرشی فەرانسە (١٧٨٩). لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانی شۆرش لە پاریس ئەندامانی توندرەوتر لە لای چەپو ئەندامانی نەرم رەوتر لە لای راستی شوێنی سەروکی ئەنجومەن دادەنیشتن، پاش ئەوەی مانای چەپ وردە وردە بۆ ناساندنی لایەنگرایی لە شۆرش، دەسەلاتداریەتی خەڵك حکومەتی کۆماریی‌و دژایەتی لەگەڵ کەنیسەو مانای راست بۆ ناساندنی پێشتیوانی لە تاجو تەختی شا و کەنیسەو حکومەتی ئەشرافو خاندانەکان بەکار دەهێنرا. لە سەردەمی شۆرشی پیشەسازیدا چەپ گەرایی بە مانای پێشتیوانی لە بەرژەوەندی چینی کرێکارو راستگەرایش بەمانای پێشتیوانی لە چینی سەرمایەدار بوو. بۆیە چەپو راست دوو مانای لێك جیاو لەهەمان کات دا پێکەوە بەستراوەی سیاسی‌و ئابووریان بوە. چەپ لە مانای سیاسی دا لەسەر بەها فەرهەنگی‌و کۆمەلایەتیەکانی شارستانی نوێی رۆژئاوایی واتا ئازدای، یەکسانی، خودموختاری تاك، کەسایەتی مرۆڤ، ئەقلگەرایی، زانست گەرایی، پێشکەوتن‌و گەشەی کۆمەلایەتی، دێموکراسی، حاکمیەتی خەڵكو رەسەنایەتی [اصالت]ی مرۆڤ، تەئکیدی دەکرد. لەبەرانبەردا راست لەمانا سیاسیەکەیدا لەسەر نەریت و نەریتگەرایی، بەها ئایینیەکان گووران گروویی [ کمال پذیری] مرۆڤ ، پاراستنی دابو نەریتەکان، رەدکرنەوەی دەسەلاتداریەتی خەڵك یان لێهاتووی خولك بۆ جکومەت، لە چارەنەهاتووی نایەکسانی کۆمەلایەتی‌و ئابووری، دژایەتی لەگەڵ ئەقلگەرایی‌و زانست گەرایی رادیکالو بایەخ دان بە بنەماڵە بە جێ کەسایەتی تاك، پێان داگرتوە.

لە روانگەی ئابووری چەپ رەوەکان لەسەر پێویستی دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری بۆ دابین کردنی دادپەروەری کۆمەلایەتی‌و راست رەواەکانیش لەسەر نامومکین بوونی دابین کردنی دادپەروەری کۆمەلایەتی لە رێگەی سیاسی یەوە، پێویستی پاراستنی بازاری ئازاد، بەرگری لە سەرمایەداری‌و پێشگرتن لە دەست تێوەردانی بەربلاوی دەوڵەت لە کاروباری ئابووری دا تەئکیدیان دەکرد. ئەگەر چەمکی چەپی سیاسی‌وراستی سیاسی بە شوێن یەکدا لەگەڵ پێوەری یەکەم واتا مەیلی دێموکراتیكو مەیلی دەسەلاتخوازانە لەسەر یەك دابنێین،

ئەوکات لە پێکهاتەی دوو پێوەری سەرەوە چوار تاقم لە ڕێژیمە سیاسیەکان دەکەوێتە دەست کە بریتین لە:

١) سیستمگەلی دێموکراتیکی ڕاست ٢) سیستمگەلی دەسەڵاتخوازی ڕاست ٣) سیستمگەلی دێموکراتیکی چەپو ٤) سیستمگەلی دەسەلاتخوازی چەپ. لە ژێر تیشکی ئەم ڕێزبەندیەدا، ئێستا دەست دەکەین بە لێکدانەوەی هەندێك لە جۆرە گرینگەکانی سیستمە سیاسیەکان. سەرەتا ڕێزبەندیە گشتیەکان وەك دێموکراسی، دێموکراسی کۆمەڵایەتی، دەسەڵاتخوازی، تۆتالیتالیسمو کور بوراتیسم شی دەکەینەوەو پاشان لەسەر جۆرە واقیعیو عەینیەکانی دەوڵەتو نموونەگەلێك لە سیستمە سیاسیەکانی پارێزگار، لیبراڵ، لیبراڵ دێموکراسی، دەوڵەتی خۆشگوزەرانی، لیبراڵی نوێ، فاشیستو کومونیست باس دەکەین.

## قەوارە گشتیەکان

### دێموکراسی

دێموکراسی سەدەی بیستەم بەرهەمی لیبرالیزمی سەدەی نوزدەهەمە، دیارە لیبرالیسمی سەدەی نوزدەهەمیش بۆ خۆی ڕیشەی لە ئەندشەی هیوم، میلو ڕۆسودایە. هەندێك دێموکراسی بەئایدۆلوژی سیاسی چینە نێوەنجیەکان دەزانن. هەر جورێك بێ جیاوازی سەرەکی لە نێوان دێموکراسی لە سەدەی نوزدەهەمو بیستەم دا لەوەدایە کە لەوروژدا بنەماکانو ئایدۆلوژی سیاسی چینە نێوەنجیەکان بۆ نێو توێژگەلێکی زۆرتر لە کۆمەڵگادا تەشنەی کردوە. مانای سەرەکی ئەم ئایدۆلوژیە یەکسانی هەمووان لە بیاڤی سیاسیو یاسایی دایە. لە سەدەی نوزدەهەم دا مەبەست لە دێموکراسی دابین بوونی ویستەکانی یاساییو سیاسی توێژە نێوەنجیەکان بوو بۆیە سەرمایەداری، سیستێمکی گونجاو لەگەڵ جۆری سەرمایەداری ئازدی سەدەی نوزدەهەم گونجاویەکی ئەوتۆی نیە، لەبەرانبەردا مانای دەوڵەتی خۆشگوزەرانی [رفاهی] پالپشتو گەرەنتی ڕاستەقینەی دێموکراسی سیاسی لە سەدەی بیستەم دا بوە. لە لایەکی دیکەوە لە ڕووی ئەخلاقی یەوە، دێموکراسی لەسەر بنەمای ڕێژەیی

[نسبيت] بەهاکان دامەزراوە، واتا هیچ چەشنە پێوەرێکی ڕەها بۆ دیاری کردنی پلەبەندی[سلسله مراتب] بەهاکان لە گۆڕێ دا نیە. ئاکامی ئەم تێروانینە ڕەدکردنەوەی هەرچەشنە ڕاستی یەکی ئەخلاقی یە، لەبەر ئەوە بڕوا بە چەمکگەلی ئەخلاقی ڕەها،

دەسەڵاتی سیاسی نەریتی هەروا لە جێی خۆی دا دەمینیتەوەو بنەمای راستودروست بوونی دەنگی زۆرینەی خەڵك [اکثریت مردم] ( کە لەوانەیە بە پێچەوانەی بنەما ئەخلاقی یەکانی کۆن بێ) وەرناگیرێ. بە پێچەوانە رێژیمگەلی دەسەڵاتخوازو نادێموکراتیك هەمووکات لەسەر بناخەی بەها رەهاکانی ئەخلاقی دەسەلاتداریەتیان کردوە.

چاوگەی فەلسەفەی دێموکراسی قوتابخانەی پراگماتیسم (کردار گرا)یە کە پاش شەڕی دووهەمو بەتایبەت لە ئەندیشەی چارلز پیوس لە ئامریکادا خۆی نواند. ویلیام جیمز دەروونناسی ئەمریکاییو ( جان دیوی)یش لە لایەنگری ئەم قوتابخانە[مکتب] بوون. بۆچوونی سەرەکی ئەم قوتابخانەیە ئەوەیە کە توخمی سەرەکی پێکهێنەری راستی [حقیقت]، قازانجە. بۆ نموونە ئایینو نەریت تا ئەو رادەیە کە بۆ پاراستنی کۆمەڵگا قازانجیان هەیە، راستیشن. راستی بڕواکان لە ئاکامی کردەوەی ئەواندا روون دەبێتەوە. بەم جۆرە لە روانگەی ئەم قوتابخانەوە چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵایەتی جێی دەست پێ راگەیشتن بە راستی رەها دەگرێتەوە، هەروەها قوتابخانەی پراگماتیسم بڕوای بە رێژەیی بوونی ئەخلاقەو هێرش دەکاتە سەر هەرچەشنە دەسەلاتداریەتی ئەخلاقی واقیعیو رەها.

لە روونکردنەوەی تایبەتمەندیەکانی گشتی دێموکراسی دا زۆرجار لەسەر چەند خاڵی سەرەکی تەئکید دەکرێ:

١)دێموکراسی حکومەتێکە پشت بەستوو بە دەنگو ئەندیشەی گشتیو دەبێ بە بەردەوامی [مستمر] سەبارەت بەوە هەست بە بەرپرسایەتی بکا، بەواتایەکی دیکە تەنیا دێموکاتیك بوون سەرچاوەی دەسەڵاتداریەتی بۆ دێموکراسی بەس نیە، بەڵکوو بەرپرسایەتی لەبەرانبەر خەڵك دا دەبێ هەمیشەیی بێو حکومەت هەمووکات سەرچاوەی دێموکراتیکی خۆی نوێ بکاتەوە.

٢) بیروڕای گشتی بە شێوەیەکی ئازادو ئاشکرا دربڕێو شێوازگەلێکی لەبار بۆ دەربڕینیان وەك رۆژنامەکانی ئازاد، هەڵبژاردن، حزبایەتی، رێفراندومو ...هتد، بوونیان هەبێ.

٣) سەبارەت بە مەسایلی جێی ناکۆکی لە پێش بیروڕای گشتی زۆرینە ئەژماری لەبەرچاو بگیردرێو بۆ دابین کردنی دەنگی زۆرینە، دەبێ مافی دەنگدانو بەشداری سیاسی بۆ هەموو گرووپەکانو کەمینەکان بێ.

٤) حکومەتی دێموکراسی لە کەش و هەوایەکدا هەڵس و کەوت دەکا کە لیواولێو لە دامەزراوەو ئەنجومەنە سەربەخۆ و خورسەکان بێ کە لە بەرانبەر ئەگەری سەرەڕۆیی دەسەلاتداران لە ماف و ئازادی تاکەکان و ئەنجومەنەکان پێشتیوانی بکەن.

٥) حکومەتی دێموکراسی دەخوازێ کە زۆرینە خوازی کۆمەلایەتی لەگەڵ بێ، واتا ئەم راستی یە کە هەر کۆمەڵگایەك بریتی یە لە کۆمەڵێك بەرژەوەند، ئارمانج و داخواز، دەبێ لەبەرچاو بگیردرێ. حکومەتی دێموکراسی ناتوانێ هەر بە قازانجی یەکێك لەمانە هەنگاو هەڵ گرێ.

٦) دێموکراسی دەخوازێ کە رێژەگەرایی ئەخلاقی و بەهاکانی تێدا بێ و کەوابوو هیچ گرووپێك مافی ئەوەی نیە لە کاتی دەسەلاتداریەتی دا، هیچ فەلسەفە یان ئایدۆلۆژیەکی تایبەت بەسەر گرووپەکانی دیکەدا بسەپێنێ. لەگەڵ گۆڕانی بیروڕای گشتی، راستیەکان و ئەخلاقەکانیش گرانیان بەسەردا دێ. کەوابوو دێموکراسی حکومەتێکە کە لەودا دەرەتانی ئەوە کە کەمینەی هزری ببێ بە زۆرینە هەمووکات بوونی هەبێ.

٧) کاتێك هەڵس وکەوتی دامەزراوە دێموکراتیەکان جێی رەزامەندی یە کە ئازادی یە بنەڕتیەکان لەوانە ئازدای بەیان، ئەنجومەن و قەڵەم لەبەرچاو گیرابێ، ئازدای وەك خوێنی ئورگانیسمی حکومەتی دێموکراسی یە.

بە گشتی سێ دەستە تیوری سەبارەت بە حکومەتی دێموکراسی بوونی هەیە. یەکەم دێموکراسی بەمانای حکومەتی زۆرینەی خەڵك، دووهەم دێموکراسی بەمانای حکومەتی یاسا و سێهەم دیۆکراسی بە مانای حکۆمەتی یەك لەدوای یەکی چەندین گرووپی هەڵبژێردراو.

## دێموکراسی زۆرینەیی یان ژاکوبنی

ئەم روانگە هەر ئەو روانگە کلاسیکەیە سەبارەت بە دێموکراسی کە دەگەڕێتەوە بۆ بیروڕای ژان ژاك رۆسو. بە پێی ئەم روانگە زۆرینە هیچ کاتێك هەڵە ناکات. دێموکراسی بەم مانایە چاوگەی ویستی زۆرینەی خەڵکە، بەلام بۆ ئەوەی ئەم ویستە ئاشکرا ببێ چەند مەرجێك دەبێ بینە دی. بەتایبەت حکومەتی ویستی زۆرینە بەستراوەتەوە بە پەرەسەندنی فێرکردن و پەروەردە لە نێو خەڵك دا، پەرەسەندنی زانیاریە گشتیی کان سەبارەت بەکێشەکانی نێو کۆمەڵگا، زۆربوونی حزبە سیاسیەکان و پەرەگرتنی پێوەندیە سیاسیەکان.

لەوەها روانگەیەکەوە دەبێ باوەڕی تەواو بە ئەقڵو هەستی گشتی هەبێ. باوەڕە راستەکان لە زیهنی زۆرینەی خەڵکدا خۆ نیشان دەدا، لە کاتێکدا باوەرە ناراستەکان دەکەونە پەراویزو زیهنی کەمینەکان داگیر دەکەن.

دێموکراسی یاسایی: هەندێکی دیکە گەوهەری دێموکراسی نە لە حکومەت یان "دیکتاتوری" زۆرینە،بەڵکوو لە حکومەتی یاسادا دەبینن. لەم روانگەوە دەسەڵات لە بنەڕەتدا پڕمەترسی یەو دەبێ بە هۆی یاسا سنووردار بکرێ، حکومەتی باش حکومەتی سنوورداره، بەڵام ویستی زۆرینەی وەك سنوورداری بۆ دەسەڵات بە حیساب نایە، بەڵکوو لەوانەیە کار بکیشرێتە سەرەرۆیی زۆرینە، دیکتاتوری زۆرینە لەوانەیە لە دیکتاتوری کەمینە پڕمەترسیترو قورستر بێ. کێشەی بنەڕتی لەم روانگەوە، پاراستنی مافو ئازادیەکانی کەسیەتی لەبەرانبەر هەرچەشنە دەسەڵاتی رەهاو ویستی سەرەرۆیانەیە.زۆرینەش دەبێ بە هۆی دامەزراوەگەلی یاسایی کونترۆڵ بکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا یاسا لە دێموکراسیداو لە هەناوی خۆیدا، رەدکەرەوەیە، نە ئامرو زۆردارانە. یاسا دیاری ناکا کە خەڵك چلون دەبێ بژین، بەڵکوو ئەوان لە بەرێوەبەردنی هەندێك کردەوەی تایبەتو دەست نیشان کراودا دوور دەخاتەوە. لانی زۆر ئەمەیە کە دێموکراسی نە حکومەتی راستەخۆی کۆمەڵانی خەڵك یان زۆرینەی خەڵك، بەڵکوو ئامرازێکە بۆ راوێژ لەگەڵ زۆرینە لە راستای پاراستنی بەرژەوەندی تاکەکانو کەمینەکانە. پێشتیوانی کۆمەڵانی خەڵك لە دەسەڵاتدارن لە واجباتی دێموکراسی نیە. زۆربوون، سەرەرویانێك کە پێشتیوانی بەرینی کۆمەڵانی خەڵکیان لەگەڵ بوە.

## دێموکراسی بەمانای زۆربوونی گرووپە هەلبژێردراوەکان

هەندێك لە تیوریسیەنەکانی هاوچەرخ گەوهەری دێموکراسی لە ململانی نێوان چەندین گرووپی بەدەسەڵاتدا دەزانن. بە بۆچوونی ئەوان چەمکی حکومەت ئیرادەو ویستی زۆرینەیان حکومەتی یاسا ناوەرۆکی دێموکراسیە مودێرنەکان روون ناکاتەوە، بە واتایەکی دیکە ئەم تیوریسنانە خوێندنەوەیەکی "واقع بینانە"یان لە سروشتی دێموکراسی مودێرن هەیە. لەسەرەتادا بەڵگە هێنانەوەی [استدلال] ئەم تاقمە تیوریسینە لەبەرانبەر "نوخبەگەراکانی" کلاسیك دا هاتە گۆر کە ئەندیشەی دێموکراسیان بە تەواوی پێ پووچو بەتاڵ بووو هەموو حکومەتەکانیان بە جورێك لە ئۆلیگارشی دادەنا.

## دێموکراسی کۆمەڵایەتی

دێموکراسی کۆمەڵایەتی، ئەو جۆرە لە دێموکراسی یە کە بۆ دابین کردنی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی‌و پێکهێنانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی‌و دابەش کردنی سامان‌و سەرمایە لە کۆمەڵگادا بە هۆی دەوڵەت تەئکید دەکا. لایەنگرانی دێموکراسی کۆمەڵایەتی هەوڵیان بۆ ئەوە دەدا کە تا بتوانن بنەماکانی لیبرالیسم‌و حکومەتی دامەزراوە لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی‌و دەسەلاتداریەتی خەڵك لەگەڵ بنەماکانی ریفورمی کۆمەڵایەتی‌و دادپەروەری لە دابەش کردندا یەك بخەن. بەواتایەکی دیکە دێموکراسی کۆمەڵایەتی ئەو دێموکراسیەیە کە تا رادەیەك رۆحی سوسیالیزم لەودا بەدی دەکرێ‌و لەم بارەوە لە رووی سیاسەتگەلی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری لە سنووری نێوەنج لە نێوان لیبرالیزم‌و سوسیالیزم دا جێ دەگرێ. کەوابوو دێموکراسی کۆمەڵایەتی لەسەر بەرپرسایەتی کۆمەڵایەتی دەوڵەت پێ دادەگرێ،و لە هەمان کاتدا پارێزگاری سیستمی سەرمایەداری بە شێوەیەکی هاوسەنگ کراوە. زۆر لە نووسەران ریشەی سەرەتای دێموکراسی کۆمەڵایەتی لە بیروڕای ئێدوارد برنشتاین، مارکسیتی ریفورمخوازی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دا دەدۆزنەوە کە خوازیاری هەوڵدان بۆ وەدیهێنانی ئامانجە سوسیالیستیەکان، نە لە رێگەی شۆرش‌و راپەڕین، بەڵکوو بە شێوەی پارلمانی‌و ریفورمخوازانە بوو. یەکێکی دیکە لە ریشە سەرەکیەکانی دێموکراسی کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەندیشەکانی بزتنەوەی سوسیالیستی فابین ( لە بەریتانیا) بەتایبەت ئەندیشەی کەسانێك وەك ئیچ، جی، ولز، برنارشاوو سیدنی وب. دەوڵەتگەلی رفاهی [خۆشگوزەرانی] سەدەی بیستەم لە رۆژئاوا لە راستی دا لەسەر وەها ئامانج‌و بنەماگەلێك دامەزران. لە نوێنەرانی [فیکری] دواتری دێموکراسی کۆمەڵایەتی لە ئامریکا بەتایبەت دەبێ لە جان رالزو رونالد دورکین ناو ببرێ کە لایەنگری دادپەروری کۆمەڵایەتی‌و دابەشکردنی دادپەروەرانەی داراییین.

ئەم خوێندنەوە نویێ یە لە دێموکراسی کۆمەڵایەتی لە کوتاییەکانی سەدەی بیستەم دا لەبەرانبەر خوێندنەوەی نێو لیبراڵ دێموکراسی لە لای کەسانێك وەك فریدریش فۆن هایك فەیلەسووفی نەمسایی خراوەتە روو کە دەست تێ وەردانی دەوڵەت لە ئابووری‌و دادپەروەری دابەشکردنیی بە پێچەوانەی بنەماکانی لیبراڵیسم‌و بە بێ ئاکامی دەزانی. دیارە هەروەك ئاماژەی پێکرا، سوسیاڵ دێموکراسی لە بنەڕەتدا نەریتێکی ئورووپایی بووو خوێندنەوەی ئەمریکاییەکەی زیاتر لە ژێر کاریگەری تاك گەری‌و لیبرالیزمی ئامریکایی یە تا سوسیالیسم.

لایەنگرانی دێموکراسی کۆمەڵایەتی هەرچۆنێك بێ لە مافە کۆمەڵایەتیەکان، بەرگری دەکەن‌و پێیان وایە کە ئەم مافانە لە سەدەی بیستەم دا جێی سەرنج بوون، لە سەدەی نوزدەهەم لەسەر "مافە سیاسیەکان" لە سەدەی هەژدەهەم لەسەر " مافە مەدەنیەکان"و لە سەدەی حەفدەهەم لەسەر "مافە سروشتیەکان" تەئکید کرابوو. ئەمە لە خوێندا خوێندنەوەیەکی لیبراڵ لە دێموکراسی کۆمەڵایەتی یە، لەبەر ئەوە لە جیاتی پێداگرتن لەسەر چەمکی سوسیالیستی بەرپرسایەتی کۆمەڵایەتی دەوڵەت لەسەر چەمکی مافەکانی تاك تەئکید کراوە. هەندێك لە نووسەران لەم سنوورەش تێ پەریون‌و کەڵك وەرگرتن لە مافە کۆمەڵایەتیەکان وەك مەرجی هاوولاتی بە مانای تەواوی وشەکە لە دێموکراسیەکانی ئێمرۆدا دەزانن.

لە نیهایەتدا ئەوەی کە لەو سەردەمەدا لە دێموکراسی کۆمەڵایەتی تێ دەگەن، شتێك زیاتر لە بەرگری لە دەوڵەتی ریفاهی [خۆشگوزەرانی] نیە. دابین کردنی کارو پیشەو خزمەتگوزاری، کەم کردنەوەی کەلینە چینایەتیەکان لە رێ سیاسەتگەلی مالیی، بەرزکردنەوەی میزانیەی گشتیو... گرینگترین هەنگاوەکانی دەوڵەتی ریفاهی بوە. دێموکراسی کۆمەڵایەتی شتێك زیاتر لە دێموکراسی لیبراڵ‌و بەو پێیە کەمتر لە سوسیالیستە.

## نیمچە دێموکراسیەکان [شبە دمکراسی]

نیمچە دێموکراسیەکان لە ولاتانی روو لە گەشەدا سەریان هەڵداوە. لەم جۆرە سیستمانەدا، ژیانی سیاسی نەبە تەواوی دێموکراتیك‌و نە بە تەواوی توتالیترە. وەها ولاتگەلێك لە راستیدا سەرقاڵی پرۆسەی چاکسازی‌و پەرەپێدانۆ گواستنەوە لە نەریت بۆ مودێرنیتەن‌و کێشمەکێشەکانی هەڵقولاو لەم بارۆدوخە لە سەقامگیر بوونی هەم دێموکراسی‌و هەم توتالیتر بەرگیری دەکا. هەروەها پێکهاتەی کۆمەڵایەتی نەریتی‌و کولتووری نەریتی لێکترازاو و پرش‌و بلاو دەرەتانی سەقامگیری بەتەواوی سیستمی سیاسی مودێرن (چ دێموکراتیك‌و چ توتالیتر) لە نێو دەبا.

لەم جورە ولاتانەدا سێ شۆرش‌و راپەرینی مێژوویی نموونەی رێکخستن بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی بوون: یەکەم راپەرینی فەرانسە، دووهەم راپەرینی پیشەسازی‌و سێهەم راپەرینی رووسیە یان نموونەی سۆڤیەتی پێشوو. لە نموونەی سیاسی شۆرشی فەرانسە ئەندیشەگەلێك وەك مەرجداریەتی [مشروطیت]، دەستوور، دەسەلاتداریەتی نەتەوەیی،

نەتەوەو دێموکراسی وەرگیرا. هەموو ئەم چەمکانە لەگەڵ سیستمە سیاسیەکانی خۆجێی [بومی] واتا دیکتاتۆری‌و باوك سالاری نەریتی، تئوکراسی، شێخ سالاری‌و ... لە دژایەتی‌دا بوون، هەر چەند هەرکام لەم سیستمانە بە ناچاری هەندێك لەم ئەندیشانەیان وەرگرتووەو پێکهاتەیەکی سەیرو سەمەرە لە باری فیکری‌و سیاسی یان پێك هێناوە.

شۆرشی پیشەسازی نموونەی ئابووری بۆ زۆر لەم ولآتانە بۆ پیشەسازی کردن، گەشەی ئابووری‌و نوێژنکردنەوە بوو. دیارە پێکهاتەی داخوازەکانی نموونەی ئابووری شۆرشی پیشەسازی‌و نموونەی سیاسی شۆرشی فەرانسە لە بارودۆخی ولآتانی روو لە گەشە زۆر دژوار بوە. نموونەی سێهەم واتای نموونەی دەوڵەتی راپەریوی رووسیە بە پێداگرتن لەسەر دەوڵەتی بەدەسەلآت‌و بەهێز، پلان دانەرو گەورە لەگەڵ میراتی نموونەی سیاسی شۆرشی فەرانسە ناتەبا بوو. کێشەی سەرەکی زۆر لە ولآتانی روو لە گەشە بونیاتنانی پێکهاتەی دەوڵەتی مودێرن (رەها، بووروکراتیك‌و نوێگەر) بوە. لەم رووەوە نموونەی شۆرشی رووسیەی نەیدەتوانی بەشێوەیەکی گونجاو کەڵکی لێ‌وەربگیرێ.

بەگشتیی دامەزران‌وسەقامگیری دێموکراسی لە ولآتانی روو لە گەشە لەگەڵ زۆر کۆسپی سەرەکی لەوانە: زاڵ بوونی گرووپە ئەشرافی [ خاندان] و کۆن کە دێموکراسی ناتەبا لەگەڵ بەرژەوەندی خۆیان دەزانی، زاڵ بوونی بەها رەهاکانی کۆن‌و پتەوبوونی نەریتەکان، درێژەی دەسەلآتی دامەزراوە کۆنەکان ناتەبا لەگەڵ دێموکراسی وەك دیوانی شاکان [دربار] ، دامەزراوە ئایینە بەهێزە کۆنەکان‌و سوپاکان، سەرهەڵدانی چینە نێوەنجیەکانی تیجاری‌و پیشەسازی کە زۆرجار خوازیاری ئاشتی‌و لێبووردەیی‌و دێموکراسین، بەرین‌و قووڵ بوونی کەمینەکانی قەومی، ئایینی‌و کولتووری کە زۆرجار لە کۆدەنگی‌و لێك تێگەیشتنی کومەلآیەتی بەرگیری دەکەن،و داخوازی‌و فشارەکان بەهۆی رەوتی چاکسازی‌و نوێسازی‌و پێشەسازی. لە لایەکی دیکە زەمینەگەلێکی لە بار بۆ رووکردن لە شێوەکانی حکومەتی دەسەلآتخوازیش بە توندی لە ئارادایە. لە ئاکامی کۆی ئەم هۆکارانە نیمچە دێموکراسی‌گەلێکی ناسەقامگرتوو لە ولآتانی روو لە گەشە هاتوەتە کایەوە کە لە نێوان ئوتوکراسی، ئولیگارشی، پوپولیسم، نیمچە دێموکراسی یان دێموکراسی رواڵەتی لە هەڵکشان‌و داکشان دایە.

## دەسەڵاتخوازی [اقتدارطلبی]

لە دەسەڵاتخوازیدا وەك سیستمی سیاسی دەسەڵاتداران ویستەکانی خۆیان لە چوارچێوەی بڕیاراتی سیاسی لە سەرەوە بە سەر خەڵکدا دەسەپێنن. لە ڕاستیدا دەسەڵاتخوازی تایبەتمەندی قەوارەی جۆراوجۆر لە سیستمە سیاسیەکانە لەوانە سیستمەکانی کۆنەپارێز، فاشیست، دیکتاتۆری نەریتیو مودێرن، توتالیتاریسمو ... لە سیستمە دەسەڵاتخوازەکاندا بڕیاردانی سیاسی دەکرێ بڵێین بە تەواوی یەك لایەنە بەهۆی هەئیەتی حاکمەو بە بێ پرسوڕا بە بیروڕای گشتییو ویستو داخوازیەکانی خەڵك، دەردێ، بەسەردەسەڵاتی کاربەدەستانی سیاسیدا هیچ یاسا یان سنووردانانێکی بەراستی، چاودێری ناکاو سەرچاوەی ڕەوایی یان زۆر نادێموکراتیکە. دەسەڵاتخوازەکان، ڕەوایی خۆیان لەسەر چاوەگەلی سەرووی کومەڵایەتی [ماروأ اجتماعی]، یاسای خودایی، یاساگەلی گشتیی مێژووو سروشتو یان تایبەتمەندیەکانی کاریزماتیکی ڕێبەران وەردەگرن. دەسەڵاتدارانی ئەم جۆرە سیستمانە لەسەر بناخەی وەها سەرچاوەگەلێك، چاوەڕوانی گوێڕایەڵی تەواویان لە خەڵکی وڵاتەکەیان هەیەو ئەوان بە لێهاتوو بۆ دادوەری کردن سەبارەت بە ڕەوایی سیستمەکەیان، نازانن.

هەندێك لە نووسەران لە نێوان ڕژێمەکانی دەسەڵاتخوازو پاوانخواز [تمامیت خواه] جیاوازی دادەنێن. ڕژێمی توتالیتر لە هەموو بیاڤەکان [حوزەها] گشتییو تایبەتی ژیانی هاووڵاتیان خۆیان دەست تێوەردەدەنو تێدەکۆشن تا ژیانی سیاسیو کومەڵایەتیو فەرهەنگی خەڵك بەپێی نموونەی ئایدولوژیك ڕێکبخەن، لە کاتێکدا کە ڕژێمی دەسەڵاتخواز هەر نەیارانی سیاسی خۆی سەرکوت دەکاو لە حکومەتی یاسا پێشگیری دەکا، بە بێ ئەوەی لە ژیانی تایبەتی خەڵکدا دەست تێوەربداو تووشی کێشەی ئایدولوژی خۆیان بکا. ساکارترین قەوارەی دەسەڵاتخوازی لە حکومەتی دیکتاتۆری تاکەکەسی (ئوتوکراسی) دەردەکەوێ کە لەوێدا هیچ سنوورێکی یاسایی بەسەر دەسەڵاتی زاڵدا دانەنراوەو دەسەڵاتدار بۆ خۆی سەرچاوەی یاساو چاوەگەی حاکمیەتو دەسەلاتداریەتی یە. دیکتاتۆری لە هەلومەرجێکی کومەڵایەتیو ئابووری تایبەتدا دەتوانێ درێژەبکێشێ، هەر ئەندازە کومەڵگای مەدەنی لێکترازاوترو هێزە سیاسیو کومڵایەتیەکان پرشو بڵاوترو لاوازترو پێوەندیەکانو هوشیاری گشتیی ناکارا بێ، دەرەتانی درێەکێشانی سەرەرۆیی سیاسی زیاترە. لەم ڕووەوە دەسەڵاتداری دیکتاتۆر بە

درێـژایی مێـژوو بەرژەوەنـدی خـۆی لـە بـەرگیری لـە پـەرەگرتنی پێوەندیـەکان، هۆشـیاری، ڕێکخستنی کومەڵایەتی‌و بەهێزکردنی هێزە سیاسییەکان دوزیوەتەوە.

یەکێك لە قەوارەکانی سیـستمەدەسەڵاتخوازەکان، دەوڵـەتی ڕەهایـە کـە بـە هەڵـسەنگاندن لەگەڵ سیستمەکانی دیکتاتۆری کۆن‌و نوێ‌و دەوڵەتگەلی دەسـەڵاتخوازی مـودێرن، ئالۆزیـەکی زۆرتری پێوە دیارە. دەوڵەتە ڕەهاکان نە تەنیا لە ڕووی بەکارهێنانی دەسەڵات تا ڕادەیەکی زۆر دوور لە بازنەی سنوورە یاسایەکان بوون، بەڵکو بـە پـشت بەسـتن بـە دەسـەڵاتی بەرفـەراوانی خۆیان بۆ پێکهێنانی گۆڕانی کومەڵایەتی‌و نوێـژەن کردنـەوەی ئـابووری‌و فەرهـەنگی هـەوڵ دەدەن. هەندێك لە نووسـەران لەم ڕوانگەوە دەوڵەتی ڕەها بۆ دەورەیەکی تایبـەتی لـە مێـژووی کومەڵگادا دادەنێن، کـە شایەتحاڵی گواسـتنەوەی پێکهاتەیـەکی تایبـەتی کومەڵایـەتی بـۆ پێکهاتەیەکی دیکە (واتا لە فئودالیسم بۆ سەرمایەداری) بـوون. لـە ئۆرووپـا پـاش سـەردەی شانزدەهەم مەیل بـۆلای پەرەپێـدانی دەسـەڵاتداریەتی کاربەدەسـتانی ناوەنـدی‌و پتـەوکردنی دەسـەڵاتداریەتی‌و کەڵەکە کردنی سەرچاوەی دەسەڵات کە یان بە ئاشکرا ڕوو لـە زیـاد بوونـدا بوو. لە قۆناخی یەکەم دەوڵەتی ڕەها بەسەر کەنیسەو دامەزراوە ئایینەکان زاڵ بوو پاشان لـە ڕاستای ئامادەکردنی بارودۆخ بۆ نوێکردنەوە لە بەرانبەر دەسەڵاتی چینە ئەشرافی [خانـدان]و موڵکدارەکان‌و هێزە ناوچەیەکان ڕاوەستا. لە سەردەمی هەژدەهەم دەوڵەتە ڕەهاکان گەیـشتنە لوتکەی دەسـەڵاتی خۆیان‌و سوپاگەلێکی گەورەو مەزن‌و دەم‌ودەزگای دیوانی بـەربڵاویان پێـك هێنا‌و بە پشت بەستن بە ئەوانە دەستیان دایـە چاکـسازی ئـابووری، کومەڵایـەتی‌و یاسـایی. دەوڵەتگەلی ڕەهای زۆر بەهێز لەو سەردەمەدا لە ئەمسا، ڕووسیـە، پـروس‌و فەرانـسە سـەریان هەڵدا. بەڵام لە فەرانسە دەوڵەتی ڕەها بە هۆی بێتوانایی لە بەڕێوەبردنی ئـەرکی چاکـسازی‌و نوێسازی خوی‌دا، سەرئەنجام ڕاپەرینی لـێکەوتەوە.

دەوڵەتی ڕەها ئەرك گەلێکی مێژوویی بەرچاوی لە ڕووی پێکهێنانی هەل‌ومەرجی پێویـست بۆ پەرەپێدانی سەرمایەداری، پەرەپێدانی ئابووری، نوێکردنەوە، چاکسازی یاسـایی، ئـەقلانی کردنی سیستمی ئیداری‌و بەهێزکردنی چینە نێوەنجەکان بـەڕێوەبردوە. دەوڵەتـە ڕەهاکـان لـە ڕەوتی مێژووی وڵاتانی جوراوجۆر لە قوناخگـەلێکی جیـاوازدا سـەریان هەڵـدا. هەنـدێك لـە نووسـەران، دەوڵەتی ڕەزاشای پەهلەوی‌یان وەك نموونەی دەوڵەتی ڕەها لێك داوەتەوە.

## توتالیتریسم

سیستەکانی توتالیتر ئەو رژیمانەن کە بەپێی ئایدولوژیایەکی گشتگیر لە هەموو بیاڤەکانی [حوزه] ژیانی تاکو کومەلگا دەست تێوەردەدەنو تێدەکۆشن کە ئەو ئایدولوژیە بەسەر راستیەکاندا بسەپێنن. بەم خوێندنەوە توتالیتریسم بە سیاسیکردنی کومەلگا بیاڤەکانی تایبەتو ناسیاسی ژیان لەنێو دەبا. دیارە سیاسیکردن هەر لە روانگەییەك ئایدولوژیایەکەوە جێبەجێ دەبێو لە ئاکامدا بنەمای جوراوجوی بیروبۆچوونەکانو شێوەکانی ژیان دەکەوێتە ژێر پرسیار. توتالیتریسم پێویستی بە کونترولی دەولەت بەسەر هەموو ئامرازەکانی پێوەندی گشتیو دامەزراوە فێرکاریو فەرهەنگی کانە. دەولەتی توتالیتر بە لەنێوبردنی دامەزراوە خورسکەکانی کومەلگای مەدەنی، تێدەکۆشێ بۆ پتەوکردنی پێگەی دەسەلاتەکەی، دامەزراوەگەلێك لە سەرەوە بە سەر کومەلگادا بسەپێنێ. هەندێك لە نوسەران توتالیتریسمیان کردوە بە دوو بەشی چەپو راستو نمونە سەرەکیەکان بە شوێن یەکدا ئالمانو ئیتالیا لە سەردەمی دەسەلاتی نازیسمو فاشیسمو یەکیەتی سوڤیەتی پێشوو یان ناوبردوە.

لە توتالیتریسمی چەپدا دەولەت هەول دەدا تا ئەوەی کە لەگەل تەواوەتی ئایدولوژی دەسەلاتدار ناتەبایە، لەنێو ببا. دەولەت نەخشی نێوبژیوانی بەرژەوەندە دژ بە یەکەکان ناگێرێ، بەلکوو بەرژەوەندی دژ بە خۆی لەبەر پێ لادەبا. دەولەتی توتالیتر بە ناوی ئامانجو مەبەستێکی جیهانگیر هەنگاو هەلدەگرێ کە هەموان لەسەریانە پێرەوی لێبکەن. بنەماکانی ئەخلاق لە توتالیتریسمدا رەهاوواقیعی لێك دەدرێتەوە ویستگەلی تاکەکان ناکرێ لەگەل راستی رەها یەکسان حیسابی بۆ بکرێ. چەشنێك لە روحیەی ئایینی لە توتالیتریسمدا بەشێوەی گشتیی زالە. ئەوانەی کە لە بنەما ئەخلاقیەکانی ئایدولوژیایدەسەلاتدار پێرەوینەکەن وەك تاوانبار دەناسرێنو بۆ سزادان دەبن. تەفتیشی بیروڕا لە شێوە باوەکانی دەولەتگەلی توتالیترە "ئەوانە کەوا لە ململانی سیاسی دا تێك دەشکێن، چارەرەش، بێدینو لادەرن. لەم رووەوە بژارکردنی حیزب، دەولەتو دامەزراوە سیاسیکان لە کەسانی لە دین هەلگراوە [مرتد]و لادەر یەکێکی دیکە کە میتودە باوەکان لە دەولەتە توتالیترەکاندا بوە. لە روانگەی توتالیتریسم خەلك هەمووکات لە قازانجی راستەقینەی خۆی تێناگا، بەلکوو حزب

یان تاقمی دەسەلاتدار لە زیان خەڵکەوە، قسە دەکەنو خۆیـان بـە نوێنـەری بەرژەوەندیـەکانی ڕاستەقینەو ویستی واقیعی زۆرینەی خەڵك دەزانن.

لە توتالیتریسمی ڕاستدا کومەڵگا بەگشتیی وەك ئورگانیسمیك چاوی لـێدەکرێ کە هەموو ئەندامەکانی پیکەوە پێوەندییان هەیەو کرداری بەرانبەریەکیان هەیە. بەواتایەکی دیکـە ئـەم جۆرە توتالیتریسم بوونی هەر چەشنە دژایـەتیو ناتـەبایی بەتایبـەت دژایـەتی چینایەتی لـە کومەڵگادا ڕەد دەکاتەوە. دەوڵەت بۆخۆی ئامانجو مەبەستی نیهایی خۆی هەیەو بە چـاوگەی یەکیتی ئەخلاقیو سیاسی کومەڵگا دەژمێردرێو لە سەرەوەی ئەندامەکانی پێکهێنەری خـۆی جێ دەگرێ. ئەندامەکانی خزمەتکاری تەواوەتی دەوڵەتنو هەر بەم شێوەش مانـا دەبەخـشن. دەوڵەت وەك چاوگەی زانیـاریو ئـیرادەی گـشتی مـرۆڤ لـە مێـژوودا لێـك دەدرێتـەوە. بـە شێوەیەکی گشتی نەتـەوە، ڕەگـەز یـان دەوڵـەت ڕەسـانەیەتی هەیـە، نـە تـاكو ئـازدی یـان مافەکانی. لە تۆتالیتریسمی چـەپ دا لانـی کـەم لـەڕووی تیوریـشەوە بـوە بـاس لـە لایەنـە باشەکانی دێموکراسی دەکرێو دیکتاتوریش دەکەوێتە بەررەخنە، بەڵام لە توتالیتریسمی ڕاست دا هیچ چەشنە خۆرانانێك بە دیفاع لە دێموکراسـی نـاکرێ. بەپێـچەوانە لەسـەر ڕەسانەیەتی ڕێبەرو ڕێبەریو ئەخـشی وی بـۆ ڕێنـوینی کۆمـەڵانی خـەڵك بـە ئاشـکرا تەئکیـد دەکـرێ. ئەندامانی حزبی فاشیست لە ئیتالیا سوێندی ئەمەکداریان بۆ ڕێـبەر دەخواردو دەیـان گـوت:" سـوێند دەخـۆم کـە ئـەمرەکانی ڕێبـەر بەڕێوەبـەرم" یـەکێك لـە" دە ئـەمری" بـەناوبانگی مووسولینی بەم جۆرە بوو:" بڕوابکەن، پیڕەوەی بکەن، شەڕ بکەن."

ڕێبەری توتالیتر" ویستی خەڵك" بە بێ لەبەرچاوگرتنی داخوازی خەڵك دیـاری دەکـاو لـە ئالمان دەوترا کە" بڕوای خەڵك بە نازیسم ناتوانرێ پووچەڵ بکرێتەوە، لەبەر ئەوە خەڵکەکە بە خوێنی خۆیان بیر دەکەنەوە. " لە توتالیتریسم بەگشتی دامـەزراوەکانی کۆمـەڵگای مـەدەنی یەکجار لاواز دەکرێنو ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیەکان جێی خۆیان دەدەن بە کۆمەڵگای کۆمەڵانی خەڵك. توتالیتریسم لە ڕاستیدا لەسەر دەسەڵاتی ڕەهاو سـەرەرۆی دەسـەڵاتدارن دانەمـەزراوە، بەڵکوو حکومەت یاسا گشتیەکانی مێژووو سروشتە بەسەر خەڵکەکەدا. بەڕێوەبردنی یاسـای گشتی پێویستی بە کەشو هەوایەکی پڕ لە ترسو خۆفـە کـە وێرانـی پێوەندیـەکانی مرۆڤـی لێدەکەوێتەوە. بەڵام گرینگترین کەرەسـەی حکومـەتی توتالیتر هەر ئەو ئایدۆلوژیە گـشتگیرەیە کە جۆراوجۆری کۆمـەڵایەتی لە نێو دەباو پێوەندی مرۆڤ لەگـەڵ ڕاسـتیەکانو لەگـەڵ خویـشی

خەوشدار دەکا. بەیەك قسە دەوڵەتی توتالیتر، تایبەتمەندیەکانی بەندیخانە، سەربازخانەو گورستانی لەخۆدا کۆ کردوەتەوە.

## دەوڵەتی ئورگانیك [ئەندامواڕ] (کوربوراتیسم)

ئایدولوژیای دەوڵەتی ئورگانیك لەسەرەتادا بە مانای شێوەی ڕێکخستنی نێوان دەوڵەتو گرووپە کۆمەڵایەتیەکان لە سیستمە فاشیستیو دەسەڵاتخوازدا دەچووبەڕێوە. بەڵام ئایدۆلوژیا دوو جۆری سەرەکی بوە: یەکەم چەشنی دەوڵەتی یان دەسەڵاتخوازانەو ئەوەی دیکە چەشنی کۆمەڵایەتی یان لیبراڵ. جۆری دەوڵەتیەکەی لە دەوڵەتەکانی فاشیستیو دەسەڵاتخوازی پورتەقاڵو ئەسپانیاییش لە سەردەمی دێموکراسی لە وڵاتانەدا بەڕێوەچوو. چەشنی کۆمەڵایەتی کوربوراتیسم کە لەهەندێك لە دێموکراسیەکانی ئەورۆیی دا وەك سوئیدو نەمسا لە ئارادایە، لەراستی دا جورێك لە نوێنەرایەتی پیشەو گرووپە ڕێکخراوەکانی لە پلەی دەوڵەتدایە کە لە تەنیشت دامەزراوەکانی نوێنەرایەتی باو واتا پارلمانو حزبەکان لە گۆڕیدایە. لەم چەشنە لە دەوڵەت ڕێکخراوەکانی نوێنەری بەرژەوەندی ئابووریو کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگادا لە پێگەیەکی شاز لە وتووێژەکان لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی لەسەر بڕیاردان سەبارەت بە گرینگترین کاروباری کۆمەڵایەتیو ئابووری، کەڵك وەردەگرن لەبەرانبەردا، ڕیکخراوەکانی جێی سەرنج ئەمەگناسی ئەندامانی خۆیان سەبارەت بە سیاسەت گەلی ئامادە بۆ بەڕێوەبردن [جاری] مسوگەر دەکەن. لە کوربوراتیسمی دەوڵەتی وەك ڕژێمەکانی موسولینیو سالازار لە ئیتالیاو پورتەقاڵ، پێکهاتەکانی پێویست بۆ دێموکراسیو بەشداری سیاسی یان نەبوو و لەبەرانبەردا تاقمێکی ئەقەلیەت (کەمینە) دەسەڵاتی سیاسی لەدەست دابوو. دەوڵەت بە کونترۆڵ کردن لەسەرەوە ڕێكوپێکیودیسپیلین دەبەخشێتە ڕێکخراو و دامەزراوە کرێکاریو پیشەییەکانو بەتایبەت لە ڕێکخراوە پیشەییو خاوەن کارگەکان لەبەرانبەر ڕکەبەریی نێونەتەوەی دا پێشتیوانی دەکرد. لەسەریەك ڕێکخراوەو دامەزراوە ئابووریو کۆمەڵایەتیەکانی هەڵکەوتوو لە نێوان دەوڵەتو کۆمەڵگا لە ژێر چاودێریو دیسپیلینی دەوڵەتیدا بوون.

لەبەرانبەردا، لە کوربوراتیسمی دێموکراتیك ڕێکخراوە خورسەکان نوێنەری بەرژەوەندی چینەکانو گرووپگەلی جوراوجۆری ئابووری بە تایبەت چینی کرێکارو چینی سەرمایەدارنو

ڕێکخراوەکانی وەك دیوی بازرگانیو پیشەسازیو یەکێتییە کرێکاریەکانو مولکداریەتیو کشتوکاڵی لە بڕیاردانی گرینگ نەخشی سەرەکییان هەیە. نەمساو وڵاتانی سکاندیناوی خاوەن دەوڵەتی ئۆرگانیك بەشێوەی دێموکراتیکن. لەم وڵاتانەدا ئەندامەتی لە یەکتیەکانو پیشەکان بۆ هاووڵاتانی دەست بەکار ناچارییەو هەر پیشەو یەکیەتییەك زۆر باش ڕێکخراونو خاوەن ڕێبەری لە ئاستی نیشتمان دان. هەر ڕێکخراوێکی پیشەیی لە ئاستی سەرانسەری وڵاتدا پاوان [انحصاری] نوێنەرایەتی بەرژەوەندی ئەندامەکانی پێکهێنەری لە دەست دایە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر ڕێکخراوێکی پیشەیی خاوەن مافی یەکسان بۆ بەشداری لە وتووێژەکانو بڕیاردانەکانی پەیوەندیدار بە پلان دانانی ئابووریو کومەلایەتی یە کە بەشێوەی نافەرمی بەرێوەدەچن. کوربوراتیسمی دێموکراتیك لە وڵاتانی دیکە وەك هولەندو ئالمانیش لە هەندێك قوناخدا بەرێوەیان بردوە. لەگەڵ پەرەگرتنی ئایدولوژیای نیولیبرالیسمو هاوسەنگ کردنی پێکهاتەییو بەتایبەتی کردن لە دەیەی ١٩٨٠ دا کوربوراتیسمی کومەلایەتی تا رادەیەك روو لە نەمان بوە.

## قەوارە تایبەتەکان

## دەوڵەتی پارێزگار [محافظه کار]

سیاسەتو حکومەتی پارێزگارانە بەپێی هەلومەرجی مێژوویی قەوارەو مانای جیاوازیان بوە. مانا کلاسیکەکەی دەبێ لە پێکهاتەی دەوڵەتێکدا بوی بگەرێی کە پاش لەنێوچوونی دەوڵەتە رەهاکان لە ئورووپا لەسەر بناخەی دەسەلاتی چینەکانی سەرەوە، مولکدارو توجار پیشەسەری هەڵدا. سیاسەتو حکومەتی پارێزگارانە [کۆنەپارێز] لەسەر پیرۆزی مولکداریەتی تایبەت، بنەماڵەو نەریتو ئایین تەئکیدی کردوە. لە پارێزگاریی سەرەتاکاندا مولکداریەتی ئەرزی بناخەی سیاسەتو حکومەتی پێك هێنا، بەلام لە سەردەمی سەرمایەداریدا، پارێزگارەکان لەسەر مولکداریەتی لەسەر پیشتوانیی مولکداریەتی پیشەسازی و مالیی پێیدادەگرن. نموونەی کلاسیکی دەولەتی پارێزگاری لە رۆژئاوادا، دەولەتی حزبی تۆری (پارێزگار) لە بریتانیا لە سەدەکانی هەژدەو نوزدەهەمدا بوو. لە فەرانسەش پاش شۆرشی مەزن مەیل بۆ لای پارێزگاری لە سیاسەتدا بەهۆی دژکردەوە نواندن سەبارەت بە ئەندیشەی شورشگێرانەو پێشکەوتووو ئەقلانی، وەدەرکەوت. لە ئورووپا ئەو پادشاهانە کە لە ژێر

کاریگەری مەیلی کۆنەپارێزی لـە سیاسـەتی وڵاتـانی خۆیانـدا بـوون، بەپێـچەوانەی شـاکانی سەردەمی دەوڵەتی ڕەهاو نوێساز، لە هەر چەشنە چاکسازیو داهێنانی کومەڵایـەتی خۆیـان دەپاراست. بۆ نموونە جورجی سێهەم پادشای "دەوڵەتی کونەپارێز" دەیگوت: "لـە سـەردەمی مندا هیچ چەشـنە داهێنانێـك نایەتـە کایـەوە" لـە فەرانـسوای یەکـەم ئیمپراتـوری نەمـسا دەگێرنەوە: "حکومەت بکەن بەڵام هیچ شتیك مەگۆڕن." حکومەتی مترنـیخ لـە نموونەگـەلی حکومەتی کلاسیکی کۆنەپارێزی بوو کە لەگەڵ هـەر چەشـنە گـۆڕانو نوێکردنـەوە دژایـەتی دامەزرا بوو. سیستمە سیاسیەکانی کۆنەپارێز (وەك وتمان) لە سەدەی نوزدەهـەم لـە ڕاسـتیدا لەسەر دەسەڵاتی چینە ئەشرافە خاوەن موڵکەکان دامەزرابوو. بەڵام لەگەڵ گەشەی تیجـارەتو پیشەسازیو دابەزینی مولکداری، بناخەکانی ئابووریو کومەڵایەتی ڕێژیمگەلی کۆنەپارێز لـەق بوو. لەگەڵ ئەوەشدا لبرالیسمی فیکری لـەنێو ڕووناکبیرانـدا هۆکـارێکی سەرەکی دیکـە لـە لاوازکردنی حکومەتە کۆنەپارێزەکان لە هەموو شوێنێك بوە.

## دەوڵەتی لیبراڵ

لیبرالیسم بەو مانایە کە سەبارەت بە حـزبو ڕێژیمەسیاسـیەکان بـەکار دەبرێ بـە مانـای سپاردنی کاروباری ئابووریو کومەڵایەتی تا ئـەو جێگـە دەگونجـێ بـەلانی زۆرەوە بـە بەشـی تایبەتی. دەوڵەتە لیبرالـەکان زۆرجـار لـە ئاکـامی قـەیرانی دەوڵەتـە کۆنـەپارێزکان سـەریان هەڵداوەو لەسـەر تیجارەت [بازرگانی]و پیشەسازی (لە جیاتی مولکداری زەوی)و لیبرالیسمی فیکری ڕووناکبیران (لە جیاتی نەریتگەرایی) ڕاوەستاون. مانـاو قـەوارەی دەولـەتی لیـبرالیش بـەپێی هەلومـەرجی مێـژوویی‌و ناوچـەیی جیـاوازبوە. گـۆڕان لـە پێکهاتـەی ئـابووریو کومەڵایەتی، ئاوابوونی [افول] خانەدانەکانی خاوەن مولـك، پـەرەگرتنی چـینە نیوەنجیـەکانی بازەرگـانیو پیـشەسازیو نوێگـەرایی فیکـریو کولتـووری، زەمینـەی سـەرهەڵدانی ڕێژیمـە لیبرالەکانی لە ئوروپادا پێك هێنا. لـە بریتـانیا ڕێفـۆرمی سـاڵی ١٨٣٢و بەخـشینی مـافی هەڵبژاردن بەچینی پێـشەساز [صـنعتگر]، سـەرەتای دەرکـەوتنی دەولـەتی لیـبرال بـە مانـا تایبەتەکەی بوو. ڕێژیمە لیبراڵەکان لە سەرەتاکانی سەدەی نوزدەهـەم لەسەر بنەمای دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ڕەوتەکانی بەرهەمهێنانو ئابووریو بەخشینیی مافی دەنگدان (زۆرجار

ناچار بە نووسینی موڵکداریەتی) بوون. بە واتایەکی دیکە دەوڵەتی لیبرال هەر ئەو دەوڵەتە سەرمایەداریە ئازادە بوە.

مارکس بۆ ناساندنی ئەم دەوڵەتە وتبووی کە دەوڵەتی مودێرن "کومیتەی بەڕێوەبەری بورژوازییە". دەوڵەتی لیبرال لە سەردەی نوزدەهەم لە چاو دەوڵەتە دەرەبەگایەتیەکان [فودالی]، ڕەهاو ئەشرافی ڕابردوو، بە دەوڵەتێکی پێشکەوتو دەژمێردرێ. لە سەردەمی دەوڵەتی لیبرال، موڵکداریەتی زەوی سروشتی سەرمایەدارانەی پەیدا کردو سنووردار کردنە سیاسیەکان لەسەر بازەرگانی نێوخۆو دەرەوە هەڵوەشایەوە. تایبەتمەندی سەرەکی دەوڵەتی لیبرال، دەست تێوەرنەدان لە ئابووری سیستمی سەرمایەداری مونافسەییو ئازاد، زاڵ بوونی چینەکانی بازەرگانی [تیجاری]و پیشەسازی بەسەر دەزگای حکومەت، دانانی سنوور بۆ بەشداری سیاسیو بەتایبەت تەرخان کردنی دەنگدان هەر بۆپیاوانو دەوڵەمەندەکان بوو. لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکان لەم بوارانەدا واتا بە گۆڕانی سەرمایەداری بۆلای پاوان کردن [انحصار] چ لە بەشی تایبەتو چ لە بەشی دەوڵەتیو پەرەگرتنی دەست تێوەردانی دەوڵەتو سەرهەڵدانی بزوتنەوەی چینەکانی کومەڵایەتی لای خوار [پایین] بۆ بەدەست هێنانی مافی دەنگدانو بەشداریی، دەوڵەتی لیبرال بە مانا کلاسیکەکەی ڕوو لە ئاوابوون رویشتو بوار بۆ دەرکەوتنی ڕژێمەکانی دێموکراسی ڕەخسا.

## دەوڵەتی دێموکراتیکی سەرتایی

لە ئورووپادا پاش لە شورشەکانی ١٨٤٨و سەرهەڵدانی قەیرانی بەشداریی سیاسی دەرکەوت کە ڕژێمە لیبراڵەکانی سەرمایەدارانە ناتوانن وەك ڕابردوو درێژە بکێشن. هۆکاری جوراوجور وەك پەرەسەندنی داخواز بۆ بەشداریی [ سیاسی] پێویستی دەست تێوەردانی هەرچی زۆرتری دەوڵەت بە مەبەستی دابینکردنی دادپەروەری کومەڵایەتیو پێشگیری لە بەرینتربوونەوەی کەمینە چینایەتیەکانو .. لە نیهایەتدا بوو بە هۆی تێپەڕبوون لە دەوڵەتی لیبرال بۆ دەوڵەتی دێموکراتیکی مودێرن. لەم دەوڵەتەدا بەپێچەوانەی دەوڵەتی لیبرال لەسەر ئەندیشەی بەرپرسایەتی کومەڵایەتی دەوڵەت لە سیستمی سەرمایەداریدا تەئکیدکراوە، دەوڵەتی دێموکراتیك لە پەرەسەندنی مافی دەنگدان بۆ هەموانو بەشداری پلان ڕێژیکراوی هەموو هاووڵاتیان لە ژیانی سیاسیدا پشتیوانی کرد. چینی دەسەڵات بەدەست لە دەوڵەتی

لیبراڵدا دیاربوو نەیدەتوانی لە بەرانبەر پەرەگرتنی بزووتنەوەی کومەڵایەتیدا زۆر خۆرابگرێ. لە دەوڵەتی دێموکراتیکدا بەپێچەوانەی دەوڵەتی لیبراڵ، دەرەتانی زیاتر بۆ تێکۆشانی سیاسی چینەکانی دیکەو نوێنەرایەتی بەرژەوەندەکانیان لە مەیدانی سیاسەتدا رەخسا. دەست تێوەردانی دەوڵەت لە کێشەی دابینکردنی لانی کەمی رفاه [خۆشگوزرانی] بۆ چینەکانی خواری بە پێویستیی دابینکردنی مافی سیاسیو مەدەنی دادەنرا.

بەو حاڵەش سنووری دەست تێوەردانی دەوڵەت لە دێموکراسیی سەرەتاکاندا بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ دەوڵەتەکانی رفاهی [خۆشگوزەرانی]و سوسیال دێموکراسیەکانی دوایی بەرتەسکتربوو. دەوڵەتی دێموکراتیك بەپێچەوانەی دەوڵەتی لیبراڵ بە بەرپرسی دابینکردنی هەلومەرجی پێویست بۆ گرتنی کەڵك وەرگرتنی راستەقینەی هەمووان لە مافی مەدەنیو سیاسی دادەنرا.

دێموکراسی بە ناسینی دەسەڵاتی یەکیەتیەکریکاریەکانو پەرەپێدانی مافی دەنگدان بۆ هەرمو خەڵكو هەڵگرتنی چەندین هەنگاو لە بواری دابینکردنی یەکسانی رێژەیی لە رێی سیاسەتی تەئمینات[ بیمە] کومەڵایەتیو ... بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ دەوڵەتی لیبراڵی سەرەتاکان وەك، هەنگاوێك بۆ پێش لە قەڵەم دەدرا. لەگەڵ هەمووی ئەمانە دێموکراسی بە مانای لیبرالیەکەیشی قەوارەو مانایەکی تاكو نەگۆڕی نەبوەو لەژێر کاریگەری هەلومەرجی مێژووییدا شێوازی جۆراوجۆری پەیداکردوە. ئەو دێمکراسیانە کە لە سەدەی بیستەمدا سەریان هەڵدا، لە قەوارەی لانیکەم بۆلانی زۆر چەرخانو ئەو تایبەتمەندیانە کە لە بارەی دێموکراسی لیبرالی سەرەتاکان وتمان گەیاندیانە لووتکەی خۆی.

## دەوڵەتی خۆشگوزرانی [رفاهی]و دێموکراسی کومەڵایەتی

دەوڵەتی ریفاهی باوترین قەوارەی دەوڵەتی مودیرنە کە لە دژکردەوە بە قەیرانەکانی سەرمایەداری پێکهاتوە. شەپولی قەیران لە سەرمایەداریدا لە دەیەی ١٩٣٠ کە بەرزبوونەوەی رێژەی بێکاری، کە ساتییو کەمبوونەوەی سەرمایەگوزرای لێکەوتەوە، پێویستی دەست تێوەردانی حکومەت لە ئابووری بەشێوەیەکی تەواوی نوێی، گەڕەك بوو یەکەمین دەوڵەتگەلی ریفاهی لە سەردەمی نێوان دوو شەڕی جیهانی لە رۆژئاوادا سەریان هەڵدا، هەنگاوگەلێکی بەربلاویان بۆ چاکسازی سیستمی داراییو بانکیی، بەرزکردنەوەی

تێچوەکانی گشتییو باجەکان، پەسەندکردنی یاسای کار، خۆماڵی کردنی پیشەسازی، دابەش کردنی دادپەروەرانەی داهاتەکانو دابینکردنی خزمەتگوزاری کومەڵایەتیو خۆشگوزرانیهەڵهێنا. **جان میناردکینز**، ئابووری زانی بەناوبانگی بریتانیی، بنەماکانی تیوری دەوڵەتی ریفاهی [خۆشگوزەرانی] لە کتێبی تیوری گشتیی دراو، قازانجو بەکارەوە گلان [اشتغال] (١٩٣٦) نووسیو پاش ئەوە ئابووری دەوڵەتی ریفاهی بە ناوی ئابووری کینزی ناوبانگی دەرکرد. رێگە چارەی کینز بۆ قەیرانی سەرمایەداری ئەوە بوو کە دەوڵەت دەبێ دەسەڵاتی خۆی لە بواری دانانی باج [مالیات، تاکس]و بەردەنە سەری مەسرووفاتی گشتیی بە مەبەستی پێکهێنانی داخوازیی [تقاضا] کاریگەرو دەست بەکار بوونی تەواوی ئەوانەی کە دەبێ [اشتغال کامل] بەکار بێنێ. بەگشتیی دەوڵەتی ریفاهی پاش شەڕی جیهانی دووهەم وەك رێکخەری سەرمایەداری تا رادەیەك جێی سیستمی بازاری ئازادی گرتەوە. دەوڵەتە ریفاهییەکان بە پلەی جوراوجور لە بواری دابەشکردنی داهاتەکان، سەرمایەدانانو پەیداکردنی کار بەرپرسایەتی خستوەتە سەر شانی خۆی. دەوڵەتی ریفاهی لە راستیدا هەوڵێك بۆ بە "کومەلایەتیکردن"ی دێموکراسی بوە. سەرهەڵدانی پێکهاتەی دەوڵەتی ریفاهی بەرهەمی تێکۆشانو سەرکەوتنەکانی حزبە سوسیال دێموکراتەکان بوە. حزبی سوسیال دێموکراتی ئاڵمان، حزبی کاری بریتانیا، حزبی سوسیالیستی فەرانسەو تا رادەیەك حزبی دێموکراتی ئەمریکا لە سیاسەتەکانی خۆشگوزەرانی تەئمینی کومەڵایەتی [تأمین اجتماعی]و نەهێشتنی بێکاری یان پەیداکردنی کار بۆ هەمووان [اشتغال کامل] پشتیوانی یان کردوە.

## دەوڵەتی لیبرالی نوێ یان نیۆلیبرال

نیۆلیبرالیسم، تێڕوانینی کۆنەپارێزانەیەکی نوێیە کە بەرووکردنە سیستمی بازاری ئازاد کەوتوەتە دژایەتی لەگەڵ پێکهاتەی دەوڵەتی ریفاهی، لیبرالە نوێکان تیوری کینزو نەخشی دەوڵەت تەئکید دەکەنەوە. لە کوتاییەکانی دەیەی ١٩٧٠ دالە ولاتانێك وەك بریتانیا، ئەمریکا، ئاڵمان، فەرانسەو ئۆسترالیا دەوڵەتەکان روویان کردوەتە بەتایبەت کردنی ئابووریو سیاسەتەکانی دەوڵەتی ریفاهیسان وردە وردە ناوەتەلاوە. ئەم گۆڕانە دژکردەوەیەك بوو بە قەیرانی کەساتێك[رکورد] کە لە ناوەراستەکانی دەیەی ١٩٧٠ لەسەرخۆ ئابووری رۆژئاوایی داگرتبوو. دابەزینی تێچوەکانی گشتیی، رێگەچارەی نیۆلیبرالیستەکان بۆ قەیرانی ئابووری

سەرمایەداری بوە. بەمجۆرە نیۆلیبرالیسم هەوڵێکە بۆ گەڕانەوە بۆ باروودۆخی پێش لە سرهەڵدانی ریفاهی،و لەم رووەوە بوە هۆی پەرەسەندنی بەشی تایبەت. فریدریش هایك، فەیلەسووفی بەرەگەز نەمسایی هاوچەرخ وەك تیۆریسینی نیۆلیبرالیستەکان ناسراوە.

## دەوڵەتی فاشیسم

فاشیسم وەك شێوازی رادیکاڵ کراوی کۆنەپارێزییەو لە هەلومەرجێکی مێژوویی تایبەت سەرهەڵدەداو پێگەکانی کومەڵایەتی‌و ئابووری تایبەت بەخۆی هەیە. بەگشتیی فاشیسم ـ هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا ـ وەك ئایدولوژی‌و بزووتنەوەی کومەڵایەتی، دژ کردەوەی چینەکان‌و شێوەی ژیانی نەریتی زیان وێکەوتوو لە پرۆسەی نوێ کردنەوەو مودێرنیسمدا بوە بە دژی کومەڵگای مودێرن‌و دەرکەوتە هزریەکەی لەوانە لیبرالیسم، دێموکراسی‌و سوسیالیسم راپەریوە. بەڵام دەوڵەتی فاشیستی لەگەڵ بزووتنەوەی فاشیستی یەك نیەو یەکیش نەبوە. رێژیمەگەلی فاشیستی هەمووکاتێك لەگەڵ کێشەی بەرێوەبردنی کۆمەڵگای نیوە مودێرن‌و نیوە نەریتی بەرەورووبون. هەڵکشان‌و داکشانی [نوسان] رژێیە فاشیستەکان نێوان ئەم دوو بەشە لە هۆکارە گرینگەکانی ئالۆزی دیاردەی فاشیسم‌و دژواری تێنەگەیشتنی بوە. لە رووی پێکهاتەی ئابووری، دەوڵەتەکانی فاشیست هیچ کات بە کردەوە دەسەڵاتی تەواو و سەرانسەریان پەیدا نەکردوەو دامەزراوە سیاسی یەکانیشیان هەمووکات تووشی ململانی‌و کێشمەکێشەکانی تاك‌و گرووپی بوە. درێژە کێشانی مۆلکداریەتی تایبەت بەسەر کەرەسەی بەرهەم هێنان‌و پشت بەستنی دەوڵەتە فاشیستەکان لەسەر سەرمایەی بازرگانی‌و مالّیی بۆتە هۆی ئەوە کە هەندێك لە لێکۆلەرەکان فاشیسم وەك چەشنێك لە دەوڵەتی سەرمایەداری وەسف بکەن. هەندێك لە مارکسیستەکان، فاشیسم وەك "دیکتاتوری بورژوازی" دەناسێنن، بەڵام لە راستیدا فاشیسم لە وڵاتانی نیوەپیشەسازی‌و نیوە سەرمایەداریدا دەرکەوت، فاشیسم لە راستیدا ئایدولوژیای یەك چینی کومەڵایەتی نەبوو، بەڵکوو بزووتنەوەیەك بوو پڕ لە ناتەبایی‌و دژ بەیەکی نێوخۆیی. بۆ توخمە سەرەکیەکانی دەوڵەتی فاشیستی دەبێ لە بنەمای پیشەسازی، بزووتنەوەی خەڵکی، دەسەڵاتی سەرانسەری حزبی تاقانە، سەرکوتی دامەزراوەکانی یاسایی‌و کومەڵگای مەدەنی، شەڕخوازی، کونترۆلی ئایدولوژیکی کومەڵگا، سیاسەتی تەرساندن‌و خۆف، راگەیاندنی بەربڵاوی خەڵکیی، کەڵك وەرگرتن لە گرووپگەلی نیمچە سەربازی، کونترۆلی

راگەیانەگشتیەکان، سوود وەرگرتنی بەربلاّو لە هێزی ئەمنیـەتی‌و پولیـسی و نەتەوەپەرستی یان رەگەزپەرستی بگەریی. جورج ئوورول نووسەری ئینگلیـزی زمـان لـە وەسـفی دەولـەتی فاشیستیدا وتبووی: "زۆرجار فاشیسم وەك" دەوڵەتی کواری میش هەنگوێن" وەسف کـردوە، بەلاّم ئەو وی چواندنە بێئینسافیە سەبارەت بە مـیش هەنگوێنـەکان، بـە واتایـەکی شـیاوتر فاشیسم کومەلّگایەك لە کەروێشکەکان وەبیر دێنێتەوە کە لەژێر چەپوکی سمورەکاندا بن.

## دەوڵەتی کومونیستی

کومونیستی دەوڵەتی وەك پێکهاتەی سیاسی بـۆ یەکـەم جـار پـاش راپـەرینی ١٩١٧ لـە رووسیە دامەزراو خۆی وەك دیکتاتۆری پرولیتاریا یان دەوڵەتی چـینی کرێکـار وەسـف کـرد. حزبی کومونیست خۆی بە نوێنەری چینی کرێکار دادەناو بـەم هۆیـەوە تێکۆشـا تـا لـەریی هەلّوشاندنی خاوەنداریەتی تایبەتی لەسـەر کەرەسـەی بەرهـەم هێنـان، گـۆڕان لـە سیـستمی ئابووری‌و کومەلاّیەتی‌دا پێك بێنێ بەم حالّەش پاش شۆرش سەبارەت بە ناوەرۆکی کومەلاّیەتی دەولّەتێك کە لە ناخی ئەو شۆرشەدا سەری هەلّدا بوو، نـاکوکی رووی‌ـدا. بـە پێـی روانگـەی حزبی کومونیست، کومەلّگای نوێ کومەلّگایەکی سوسیالیستی‌و ناچەوسێنەر بـوو کـە لـەودا حزب وەك نوێنەری چینی دەسەلاّت بەدەستی پرولیتاریا حکومەتی لـە بەردەسـت دابـوو. لـە بەرانەردا لایەنگرانی لیئون تروتـسکی لـە رێبـەرانی شـۆرش، لەسـەر ئـەو بـاوەرە بـوون کـە کومەلّگای نوێ کومەلّگایـەکی ناچەوسـێنەر، بـەلاّم ناسوسیالیـستی‌یەو لـەودا بووروکراسی دەولّەتیدا لە جیی پرولیتاریا دانیشتووەو حزب بە سـەر ئەنجومەنـە کرێکاریەکانـدا دەسـەلاّتی سەپاندوە. هەندێکی دیکە لەو برِوایەدا بوون کە لە سیستمی کومەلاّیـەتی نـوێ‌دا، چـینێکی دەسەلاّت بەدەستی نوێ خەریکە پێك بێ کە نەسەرمایەدارو نـەکرێکار، بـەلّکوو کونترولّچی کەرەسەی بەرهەم هێنـەرە. هەنـدێکی دیکـە ئـەو سیـستەمەیان وەك سەرمایەداری دەولّـەتی ژێردەسەلاّتی "بورژوازی دەولّەتی" وەسف دەکرد. لـە کـردەوەدا، لـە سەرەتاکانی شۆرشـدا، ئەنجومە کرێکاریەکان دەسەلاّتێکی رێـژەیی یـان هـەبوو، بـەلاّم لـە ١٩١٩ بـەدوا بـە جـودا بوونەوەی حزب لە ئەنجومەنەکان، حزی کومونیست لـە سـەرانسـەردا زالّ بـوو. لـە سـەردەمی ئیستالین دا ئەنجوومەنەکان، یەکیەتیە کرێکاریەکان تەنانەت حزبی کومونیـستیش گوێرایـەلّو مەلکەچی ئیرادەی رێبەر بوون. بەکشتیی حزبی کومونیست لەسەر کاروبـارە جوراوجورەکـانی

ژیانی ئابووری، کومەڵایـەتیو فەرهەنگیـدا زاڵ بـووو بـە هەڵـسەنگاندن لەگـەڵ پێکهاتـەی ڕواڵەتی دەوڵەت، دەسەڵاتی ڕاستەقینەی بەدەستەوە بوو. مەیل بۆلای پارێزگاری یان چاکسازی لە یەکیتی سووڤیەتدا لە ڕووی پشتیوانی لە کونترۆڵی تەواوی حزب یـان کزبـوونی دەسـەڵاتی دەزگای حزبی دیاری دەکرا.

مەبەستی سـەرەکی چاکسازی سەردەمی گورباچوف پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لە پێکهاتەی حزب، دەوڵەتو بووروکراسی بوو. بەڵام لـە نیهایـەت وا چاکـسازی لـە کـونترۆڵی ئـەو دەرچـوو بـە ڕووخانی حکومەتی حزبی کومونیست تـەواو بـوو. لـە ڕووی پێکهاتـەی حزبـی کومونیـست پێڕەوی بنەمای "ناوەندگەرایی دێموکراتیك" بوو بەم مانا کە کەمینە فیکری دەبێ پێڕەوی لە زۆرینە بکەنو لە دووبەرکی دووری بکەن. کونگرەی حـزب وەك ئورگـانی سـەرەکی کومیتـەی ناوەندی حزبی هەڵ دەبژارد کە ئەویش لەلای خۆیەوە هەئیـەتی سـەروکایەتی هەڵدەبـژارد. لـە کونگرەی ١٩١٩ کومیتەی ناوەندی سـێ ڕێکخـراوی نـوێی دامەزرانـد. مەکتـەبی سیاسـی، مەکتەبی ڕێکخراوەییو سکرتاریەت. پاش ئەوە سکرتێری گشتی حزب دەسەڵاتێکی بەرچـاوی پێدرا. ئیستالین، خروشچوف، برژنیفو گورباچوف سکرتێری گشتیی حزب بوون. دامـەزراوەی پولیسی نهێنیش دەسەڵاتێکی بەربڵاوی هەبوو.

* * *

– ١٠ –

## گۆڕانی سیاسی

لەوانەیە بتوانرێ بگوترێ کـە ئەگـەر نیـوەی زانـستی سیاسـی سـەبارەت بـە ئەمنیـەتو سەقامگیریو درێژەکێشانی دەوڵەت بێ، نیوەکـەی دیکـە سـەبارەت بـە نائـارامی سیاسـیو داکـشانو ڕووخـانی دەوڵەتەکانـە. بابـەتی گـشتیتری باسـی، ناسـەقامگیریو لەنێوچـوونو ڕووخانی دەوڵەتەکان "گۆڕانی سیاسی"یە. جۆرەکانی گـۆڕانی سیاسـی بـە پێـی سـێ پێـوەر ڕیزبەندی دەکرێن: یەکەم شێوەی جێبەجێ بوون یـان ڕوودانـی گۆڕانـە کـە بـەپێی ئـەوە کـە ئاشتیانە یا بە توندوتیژی بێ، دووهەم سەرچاوەی گۆڕان بـەپێی ئەمـە بـێ کـە لەوانەیـە لـە سەرەوە واتا لەنێو خۆی حکومەت ڕوو بدا یان لە خوارەوە واتا لەلایـەن گرووپـەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی سیاسی بێتە کایەوە، و سێهەم بە پێـی قـووڵیو بـەربڵاوی گۆڕانەکە لەوانەیـە لـە

ڕواڵەتی ئاڵوگۆرەکان تا قووڵترین گۆڕان لە دەستوور، ئایدولۆژی چینی بە دەسەڵاتو سیستمی ئابووری بگرێتە خۆ.

دیارە وەها پێوەرگەلێك گشتینو دەبێ لە لێکدانەوەی گۆڕانی سیستمە سیاسیەکاندا هۆکارەکانی دیکەش لەبەر چاو بگیرێ، لەوانەیە سەرچاوەی گۆڕان تەنیا بە هۆکارەکانی نێوخۆوە بەرتەسك نەکرێتەوە، بەڵکوو جاری واش هەیە هۆکارەکانی دەرەوەش کاریگەرییان لەسەر گورانە سیاسیەکان دا دەبێ. هەروەها لەوانەیە گۆڕان لە سیستمی سیاسی لە ماوەیەکی تا ڕادەیەك درێژخایەندا جێبەجێ ببێو یان کوتوپڕ ڕوویدا. لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە ڕەوتی گورانە کە ڕووی لە گەشەی دێموکراسیو تێپەڕین لە سیستمی نادێموکراتیك بۆ سیستمی دێموکراتیك بێو یان بەپێچەوانە دەوڵەتی دەسەڵاتخواز لەجێی دێموکراسی یەکی لاوازو ناسەقامگرتوو سەرهەڵ بدا. بەم حاڵەش دەکرێ بۆ ساناکردنی باسی گۆڕانی سیاسی لەسەر بناخەی سێ پێوەری سەروە بەشێوەی خوارەوە ریزبەندی بکرێ:

## چاکسازی

چاکسازی یان ریفۆرمی سیاسی بۆخۆی یەکێك لە هۆکارەکانی گرینگی گۆڕانی سیاسی بوونو چاکسازی لەوانەیە لە سەرەتادا لە هەندێك مەیداندا وەك ئیسلاحی زراعی بەرتەسك بکرێتەوە، بەڵام پاشان پەرەدەستێنێ. لە هەندێك وڵات کە دەرەتانی ڕوودانی ڕاپەڕین لە خواری نەرخسا، بەرێوەچوونی ڕێفۆرمی لەسەرەوە جێی ڕاپەڕینی گرتوە. چاکسازی میجی لە یابان [ژاپون] لە ساڵی ١٨٦٨، چاکسازی بەناوبانگی بیسمارك لە ئاڵمانو لەم دوایانەدا چاکسازی گورباچوف لە یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو، دەرئەنجامی گەورە شۆرشگێرانەی لێکەوتەوە. کەوابوو هەندێك چاکسازی لەوانەیە لە هەندێك ڕاپەڕین کاریگەرتر بن. سەبارەت بە هەلومەرجی چاکسازی دەبێ بگوترێ کە بەرێوەچوونەکەی بەستراوەتەوە بە سەرهەڵدانی جۆرێك کەلێن لەنێو چینی دەسەڵات بەدەستو نەبەستراوەیی ریفۆرمخوازان بەو تاقمانەوە کە لەوانەیە لە ئاکامی چاکسازیدا زیانیان وێ بکەوێ. پادشاهان، عەسکەرەیکان، بەشگەلێك لە چینی ئەشراف [خاندان]و ڕووناکبیران لە بەرێوەبردنی چاکسازی سیاسی لە وڵاتانی جوراوجوردا نەخشیان بوە. سەرکەوتنی ریفۆرمو چاکسازی پێویستی بەوە هەیە کە بارودۆخێکی تایبەتدا بەرێوەچووبێ. زۆر جار کاتێك رێژیمە سیاسیەکان تووشی قەیرانێکی

ئاشكراو روو لە گەشە دەبن، لە باروودۆخێكی لاوازو بە دژكردەوە بە قەیرانەكە ریفۆرم دەكەن‌و هەر بەم هۆیە لەوانەیە بۆ خۆی ببێتە قوولتر بوونەوەی قەیرانەكەو ئاكامی دڵخوازی لێنەكەوێتەوە. بەپێچەوانە ئەگەر چاكسازی لە هەلومەرجی بە دەسەڵاتی‌و پێش سەرهەڵدانی قەیران بەرێوەبچێ، كاریگەرتردەبێ. بەپێی چەشنی سیستمێك كە لەودا چاكسازی دەكرێ، رێژیگەلی داخراوو دەسەڵاتخواز دەبێ لە رێژیمە دێموكراتیكەكان جودا بكرێنەوە. رێژیمە دەسەڵاتخوازەكان لەم بارەوە زیاتر دەكەونە بەر زیان‌و لەوانەیە برێك چاكسازی، ئوتوریتەی رێژیمەكە وردە وردە لاواز بكاو ببێتە هۆی هاندان‌و بەهێزكردنی نەیارانی رێژیم‌و ئەگەری ئەوە كە سەرەنجام رێژیمەكە برووخێ یان لێك هەڵوەشێتەوە لە ئارادایە. بەپێچەوانە رێژیمە دێموكراتیكەكان توانایی زۆریان بۆ ریفۆرم كردن هەیە. لە رووی جورەوە، مەبەستی چاكسازی سیاسی لەوانەیە وەلامدانەوە بە قەیرانی رەوایی رێژیم‌و نویژەنكردنەوەی بنەماكانی دەسەلاتداریەتیەكەی‌و یان وەلامدانەوە بە قەیرانی بەشداری‌و پەرەپێدان‌و بەهێزكردنی كانالی بەشداریكردن گشتیی لە سیاسەتدا بێ. هەروەها لەوانەیە چاكسازی بۆ بەهێزكردنی توانایە جوراوجورەكانی دەولەت لە كێشەی كوكردنەوەو دابەشكردنی سەرچاوە جوراوجورەكان بێ. چاكسازی ئابووری لە بواری دابەشكردنی دادپەروانەتری سامان‌و كەمكردنەوەی ناتەبابییەكانی كومەلایەتی زۆرجار لایەنی سیاسی بەخۆیەوە دەكرێ‌و پێویستی ئالوگۆری سەرچاوەكانی دەسەلات‌و ئیمتیازەكانە. زۆرجار سەركەوتنی ریفۆرمخوازەكان بە هاوكاری هەندێك بەشی گرینگ لە هێزە جواروجورەكان‌و رێفۆرمخواز لە دەرەوەی بازنەی دەسەلاتداریەتی سیاسی پێویستی هەیە.

هەندێك لە نووسەران، ریفۆرم لە بەرانبەر شۆرشدا بە كار دێنن، لە كاتێكدا كە قوولكردنەوەی شۆرشەكان زۆرجار پێویستی بە چاكسازی لە سەرەوەیە. سەبارەت بە پێوەندی ریفۆرم‌و شۆرش، چاكسازی لەوانەیە (هەروەك ئاماژەمان پێ‌كرد) دنە دەرو توندكەرەوەی شۆرش یان هۆی رووخانی رێژیمە سیاسیەكان بێ. جۆرێك لە چاكسازی سیاسی‌و بەرتەسك لە سەردەمانێك راست پێش دەست پێكردنی شۆرش بەرچاو كەوتوە. لە هەلومەرجی جوراوجور، چاكسازی لەوانەیە لە روودانی شۆرش پێشگیری بكا، هەر وەكوو لە زۆر لە ولاتانی ئورووپا كە راپەرینییان لە خوارەوە بۆ نەكراوە، دەسكەوتی وەك شۆرشیان لە رێی چاكسازییەوە پێ‌گەیشتووە.

لە کۆتاییدا دەبێ چاکسازی بەپێی ئەوەکە لەنێوخۆی سیستمە نەریتییەکان، یان ڕێژیمە دێموکراتیکەکانو یان ڕێژیمە ئایدۆلۆژیك ڕوو دەدەن پلەبەندی بکەین. چاکسازی لە سیستمگەلی دێموکراتیك بەشێك لە پرۆسەی ئاسایی سیاسینو لەسەر کارا بوونو سەقامگیری ڕێژیم کاریگەرییان هەیە. بەڵام چاکسازی چ لە ڕێژیی نەریتیو چ لە سیستمی ئایدۆلۆژیك بە مانای دەرچوون لە پرۆسەی ئاسایی سیاسیەو هەر بۆیە هەڵگری مەترسیو هۆکاری ناسەقامگیری سیاسین.

## کوودیتاکان

کوودیتاکان بە زۆری بەهۆی گرووپە بچووکەکان لەنێو هێزە چەکدارەکاندا بە مەبەستی ئاڵوگوری خێرایی گروپی بە دەسەڵاتو گۆران هەندێك لە سیاسەتەکانی نێوخۆ یان دەرەوە، بەشێوەیەکی کەمو زۆر نهێنیو بە بێهەرووژاندنی هێزە کومەڵایەتیەکان ڕوو دەدەنو پاش زاڵ بوونو گواستنەوەی دەسەڵات، لە ماوەیەکی کورتدا سیستمی سیاسی نوێ دادەمەزرێنن. هەلومەرجی ڕوودانی کودیتاکان بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ ڕاپەرینەکان زۆر ساکارترە. بۆ ڕوودانی کودیتا دەبێ گروپ یان گروپگەلێك بڕیاریان دابێ لە ڕێگای توندوتیژی ئاسایی یەوە حکومەت سەرولێژ بکەنو ئامرزای پێویست بۆ ئەم مەبەستەیان لە بەردەستدا بێو بە پێی گەڵاڵەو پلانی ورد هەنگاو هەڵگرن. ئەگەر لە کاتێکدا هێزە چەکدارەکان توکمەو یەکپارچە بن. ئەگەری ڕوودانی کودیتا کەم دەبێتەوەو لەوانەیە کوودتا بەدنەی دەسەڵاتە دەرکیەکانیش ڕووبدا.

لە لێکدانەوەیەکی قووڵتردا ڕوودانی کودیتا لەلایەك بە ویستو ئیرادەیەکی ئاگاهانەی هەندێك لە هێزە چەکدارەکانو لە لایەکی دیکەوە بەستراوەتەوە بە هەلومەرجی کومەڵایەتی، بەو ڕادەیەکە کومەڵگای مەدەنیو پێکهاتەی حزبیو فەرهەنگی سیاسی توکمە ترو ئالۆزتر بێ، ئەگەری ڕوودانی کودیتا کەم دەبێتەوە. بە واتایەکی دیکە کاتێك ڕەوایی سیاسی سیستم، کارایی دامەزراوە سیاسییەکانو بەشداری خەڵك لە سیاسەتدا لە سەرەوە بێ، ئەگەری ڕوودانی کودیتا کەم دەبێتەوە. لەوەها هەلومەرجێکدا ڕادەی خوراگری لە بەرانبەر کردەوەی جەیشدا زۆرتر دەبێ. بە پێی ئەزموونی مێژوویش ئەو وڵاتانەی کودیتایان تێدا کراوە

کە بێبەش بوون لە کوملگای مەدەنی بەهێزو پێکهاتەی حزبـی جێگرتـووو بـیروڕای گـشتیی ڕێکخراو.

سەبارەت بە دەرئەنجامەکان، کودیتاکان لەوانەیە کاریگەری قوولی کومەلایـەتیو ئـابووری یـان هـەبێ. بڕکردنـی کاریگـەری کودیتاکـان بەسـتراوەتەوە بـە هۆکارگـەلێك وەك پێگـەی کومەلایەتی کودیتاچیەکان، پێویستەکانی نوێکردنەوەو پەرەسـەندنی کومەلگـە، ئایـدولوژی کودیتاو ڕادەی هاوبەیانی کودیتاچـیەکان لەگـەلّ هێزەکـانی دەرەوەی دەولـەت. هەنـدێك لـە نووسەران شەپۆلەکانی جوراوجور لـە کودیتـا سـەبارەت بـە ولاتـانی ڕوو لـە گەشـە یـان بـۆ دەرکەوتوە. لەم ولاتانەدا کودیتاگەلی سەربازی لە قوناخـەکانی سـەرەتادا پارێزگارانـە بـوون، بەلام لەگەلّ گەشەی چینە نیوەنجیەکان، کودیتاگەلێك بە نوێنـەرایەتی لـە قـازانجو بەرژەوەنـدو ویستەکانی ئەو چینانە ڕوویان داوە. لە شەپۆی سـێهەمیش کودیتاگـەلێك بـۆ پـشتیوانی لـە قازانجو بەرژەوەندی چینەکانی خواری بەهۆی [افسران] ی سادە ڕوویان داوە.

## هەلّبژاردن

هەلّبژاردن لە دێموکراسیـەکاندا ئاسایی گۆڕان لە هەتیتی دەسـەلاتدار دایـەو گواسـتنەوەی دەسەلات نێوان حزبە سیاسیـەکانە. دیارە لەگەلّ گـۆڕانی حزبـی حـاکم، سیاسـەتە باوەکـانیش گۆڕانیان بەسەردا دێ. بەلام ڕادەی ئەم ئالوگۆرە لە هەلومەرجی جیاوازدا وەك یـەك نیـە. لـە سەردەمی پاش شـەڕی دووهـەمی جیهـانی تـا کوتاییـەکانی دەیـەی ١٩٧٠، هـەولی حزبـە سیاسیەکان بۆ ڕاکێشانی ژمارەیەکی هەرچی زۆرتر لە گروپەکانو چـینە کومەلایەتیـەکان بـۆ لای خۆیان، بوە هۆی سەرهەلدانی "حزبە گشتگیرەکان". زانای سیاسـی بـەناوبانگی بەرەگـەز ئالمانی ئۆتۆکرچهایمر ئەم وشەیە بۆ وەسفی مەیلی ڕوو لە گەشـەی حزبـەکان بـۆ ڕاکێـشانی دەنگداندەران زیاترو زیاتر لە هەر چینو توێژیو لە ئاکامدا، دابەزینی خەسلەتی ئایدولوژیکیو لەنێوچوونی پێگەی چینایەتی ئەوان بە کار دەبرد. هەندێکیش مانـای حزبـی گـشتگریان وەك سیمایەك لە مەیل بۆ "کۆتایی ئایدولوژی" لە جیهانی مودێرندا* کـەلك لـێ وەردەگـرت. لـە ئاکامدا لە هەلومەرجێکی ڕوو لە ئاوابوونی ئایدولوژی نێوان سەردەمی شەڕ تـا کوتایـەکانی دەیەی ١٩٧٠ کە لە هەمان کاتدا هەلومەرجی سـەقامگیریو بـەردەوامیی دەولـەتی ڕیفـاهی [خۆشگوزەرانی] بوو، هەلّبژاردن خەسـلەتی ئایـدولوژیو یـان سـتراتیژیکی نـەبوو گۆڕانـە

بنەرەتییەکانی لەگەڵ خۆ نەدەهێنا. بەلام لەگەڵ سەرهەڵدانی ئایدولوژی نیولیبرالیسم لە بەرانبەر دەوڵەتی ریفاهی‌دا و مەیلی حزبە پارێزگارەکان و راستەکان بۆ ئەو ئایدولوژییە، هەڵبژاردنەکان لە دەیەی ١٩٨٠دا خەسلەتی ئایدولوژیك و ستراتژیکی وەخۆگرت، چوونکە بە سەرکەوتنی حزب ئینتماکانی نیولیبرال لەگەڵ راستی نوێ و بەرێوەبردنی سیاسەتەکانی بەتایبەت کردن و داشکانی تێچووی گشتی، پێکهاتەی کومەڵایەتی دەوڵەتە ریفاهیەکان تووشی گۆڕانی گەورە و بنەرەتی بوو.

نموونەیەکی دیکە لە هەڵبژاردنەکانی "شۆرشگێرانە" یان ستراتژیك و بنەرەتی، دەتوانرێ لە هەڵبژاردنەکانی پارلمانی ساڵەکانی ١٩٨٩ و ١٩٩٠ و یان هەڵبژاردنی سەرکۆماریی ١٩٩١ی رووسیەدا بدۆزینەوە. لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا رەوتی تێپەڕبوون لە سیستەمی کومونیستی بۆ سیستەمی دێموکراسی لە ساڵ'کانی رێبەری میخائیل گورباچوف (١٩٩١ــ١٩٨٥) دەستی پێکرد. لەو ماوەدا هەنگاوگەلێکی بنەرەتی بۆ لابردنی سانسور، ئازادی بەیان و بلاوکردنەوە و پێکهێنانی کەش و هەوایی سیاسی کراوە هەڵگیرا. بەتایبەت هەڵوەشانی مادەی ٦ی دەستوور ١٩٧٧ سەبارەت بە پاوانکردنی دەسەلات لە دەست حزبی کومونیست، زۆر بەرچاو بوو. بە شوێن ئەم گۆڕانانەدا هەڵبژاردنەکانی پارلمانی ١٩٨٩ و ١٩٩٠ و هەڵبژاردنی سەرکۆماری لە ژوئنی ١٩٩١ کە بووریس یلتسن دەسەلاتی کەوتەدەست، نەخشێکی کاریگەری لە گۆڕانی نیهایی رێژیمدا گێرا.

## راپەرینەکان

گورانی سیستەمی سیاسی هەر ناگەرێتەوە بۆ کودیتاکان، چاکسازی بەربلاویان داگیرکارییە دەرەکیەکان، بەڵکوو لەوانەیە بەرهەمی رەوتی لاوازی و لەنێوچوون و تێك رووخانی لەسەرەخۆی رێژیمەکان بێ. هەروەك لە بەشی روخسار و بناخەکانی دەسەلاتی دەوڵەتدا وتمان، بەردەوامی رێژیمە سیاسیەکان بەستراوەتەوە بە پتەوی بناخە چوارینەکانی دەسەلاتەکەیان واتا رەوایی (ئایدولوژی)، کارلێهاتوویی (دابینکردنی بەرژەوەندی گشتیی)، پێوەندی لەگەڵ چینی بە دەسەلات (دابینکردنی بەرژەوندی تایبەتی) و دەزگای سەرکوت و زۆر. قەیران لە یەکێك یان لە هەمووی ئەم بناخانەدا لەوانەیە بێتە گۆڕانی نێوخۆیی یا تێك رووخانی تەواوی سیستەمە سیاسیەکە. زۆرجار کەمیی رەوایی، کارلێنەهاتوویی، لەدەست چوونی پێگەکانی پشتیوانی

کومەلایەتی‌و لاوازی لە سەرکوت‌و بەکارهێنانی دەسەلات لە رواڵەتدا کاتێک دەست دەدەنە دەستی یەکتر، ئەگەری رووخان بە تەواوی زیاتر دەبێ. ئەم ئەگەرە کاتێک بەراست دەگەڕێ کە وەها دەوڵەتێك لەگەڵ هێزەکانی ئوپوزیسیونی رێکخراو کە توانای خورۆژانـدنی سیاسی، رێبەری‌و ئایدولوژی یان هەبێ روو بە روو ببێ، بەو پێی دەتوانرێ بوترێ:

**کەمی رەوایی + کارلێنەهاتویی + کەمی پشتیوانی کومەلایەتی+ گەندەلی لە دەسەلات‌و زۆر+ دژایەتی رێکخراوەیی‌و خاوەن رێبەری‌و ئایدولوژیای شۆرشگێرانە= رووخان‌و شۆرشی سیاسی**

قەیرانی رەاویی لەوانەیە بەهۆی سەرهەلدانی ئایدولوژیای رەوایی هێنەری لایەنی بەرانبەر [رقیبب]، رێبەرانی کاریزمایی، کەلێنی روو لە زیاد بوون لە نێوان بەلێنەکان‌و کردەوەی سیستمی سیاسی، کارلێنەهاتوویی دەولەت لە دابینکردنی خزمەتگوزاریە گشتییەکان‌و هۆکاری دیکە بێ.

قەیرانی کارایی سیستمە سیاسییەکان لە رووی توانایی دابینکردنی ئاسایش‌و پێویستیە سەرەکیەکان‌و خزمەتگوزاری گشتیی لەوانەیە بەرهەمی هۆکاری عەینی‌و زەینی بێ. قەیرانی مالیی‌و ئابووری، شەڕو دابەزینی کوتوپڕ لە داهاتەکانی دەولەت لە هۆکارە عەینییەکانن، لە کاتێکدا کە چوونەسەری داخوازیەکانی خەلك بەهۆی بەلێنی حکومەت‌و یان هەلسەنگاندن لەگەل کومەلگاکانی دیکە هۆکاری زەینی یە. ئەو رژێمانە کە تووشی قەیرانی قوولی رەوایی نەبن. باشتر دەتوانن خۆ لەبەرانبەر قەیرانی کارایی دا راگرن‌و یان لەسەرخۆ تێپەری کەن. لەلایەکی دیکەوە وانیە کە کارایی حکومەت هەموو کاتێک ببێتە هۆی چوونەسەرو دابینکردنی رەوایی بۆی. ئەم خالە بەتایبەت لەسەر دەولەتە دەسەلاتخوازەکان کە لەرەوایی یاسایی بێبەشن، باشتر بەراست دەگەرێ. هەر چۆنێك بێ کاتێک قەیرانی رەوایی‌و کارایی دەست دەدەنە دەست یەك، پاراستنی دەسەلات بۆ حکومەت بە بێ پەنابردن بۆ دەزگای زۆر و سەرکوت بە رادەیەکی زۆر، دژوار دەبێ. بەلام لەم هەلومەرجەدا زالیەتی [سلطە]یش لەوانەیە خۆێنیشان بدات. دەولەتەکان بەهۆی جوراوجور بۆ نموونە تێکشکان لە شەری دەرەوە، دوو دەستەیی لەنێو هێزە چەکدارەکان، هەلگەرانەوەی بەشێك لە هێزەکان، نەبوونی توانایی کاربەدەستانی سویل لە کونترول کردنی هێزە چەکدارەکان، پێکهاتنی سوپای رکەبەرو ... توانایی کونترول‌و بەکارهێنانی دەسەلاتی سیاسی خۆیان لە دەست دەدەن.

لە خەباتە شۆڕشگێڕانەکاندا بەشێکی زۆر لە حەشیمەت بەهۆی نەیارانی حکومەت لەدەور ئایدولوژیایەکی تایبەت خڕدەبنەوە. خەباتی شۆڕگێڕانە پێویستی بەرێکخستن، رێبەری‌و ئایدولوژیا بۆ کۆکردنەوەو هوروژاندنی خەڵك هەیە.راپەرین خەباتێکی توندوتیژ بۆ بەدەستەوەگرتنی لەنێوخۆی یەکیەتی سیاسی سەربەخۆداو لەودا گرووپەکانی دەرەوەی دەوڵەت دەست بەکۆکردنەوەو هوروژاندنی خەڵك دەکەن. راپەرینە مەزنەکان جگە لە ئاکامە سیاسیەکەی سەرەتاکان واتا گۆڕینی حکومەت، ئاکامی کەم‌و زۆر قووڵی کومەلایەتی، ئابووری‌و کولتووریشی لێ دەکەوێتەوە. لەسەر ئاستی قووڵکردنەوەی شۆڕشەکان هۆکارگەلێکی جوراوجور وەك چەشنی ئایدولوژیا، سەرچاوەی کومەڵایەتی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە، ئاستی هاوپەیمانی‌و تێکەڵی گرووپە شۆڕشگێڕەکان لەگەڵ گرووپەکانی بەستراوە بە چینی دەسەڵاتداری کۆن، ململانێ دەسەڵات پاش سەرکەوتنی سەرەتاکانی شۆڕش‌و جۆرو ئاستی چاکسازی پاش شۆرش کاریگەری یان هەیە. لە چەمك‌و مانای راپەرین (شۆرش) خوێندنەوەی جوراوجور هەیە.

## ماناکانی راپەرین (شۆڕش)

**١. راپەرین بە مانای ئاڵوگۆڕ لە سیستمی ئابووریدا:** مارکس مەبەستی سەرەکی لە شۆرش بە گۆران لە سیستمی ئابووریدا دەزانێ. هەروەك پێشتریش وتوومانە چینی دەسەلاتدار لە هەر سیستمێکی کومەڵایەتی خاوەنداریەتی [مالکیت] ئامرازو کەرەسەی بەرهەمهێنانی لە دەست دایە. راپەرین بە رووخانی چینی دەسەڵاتداری کۆن، چینێکی چالاکی نوێ کە پێکهێنەری سیستەمی نوێ دەبێ، دەگەیەنێتە دەسەڵات. دیارە شۆرش بۆخۆی توندوتیژە. بە وتەی ئینگلس "شۆرش کردارێکە کە بەهۆی ئەو بەشێك لە کومەڵگا ئیرادەی خۆی بەهۆی بەکارهێنانی توپ‌و تفەنگ بەسەر بەشەکەی دیکەدا دەسەپێنێ "ئەخشی سەرەکی شۆرش گۆرینی چینی دەسەلاتداری ئابوورییە. شۆرشگەلێك کە لە بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایین تا ١٨٤٨ روویان دا، بوونە هۆی تێپەرین لە دەرەبەگایەتی بۆ سەرمایەداری. سەرکەوتنی بۆرژوازی لەوانەیە سەرکەوتنی خاوەنداریەتی بورژوای بە سەر مولکداریەتی دەرەبەگایەتیدا [فئودالی] بوو.

٢. **ڕاپەڕین بە مانای هەڵگەڕانەوەی هەڵکەوتووەکان:** لە ڕوانگەی ڕیالیستگەلێك وەك ویلفوردوپارتو ئەرکی سەرەکی شۆڕش گۆڕینی تاقمی دەسەڵاتدار یان هەڵکەوتوە سیاسیەکانە. هەموو گومەڵگاکان بەسەر کومەڵانی خەڵكو هەڵکەوتوەکاندا دابەش دەکرێن، بەڵام لەوانەیە هەڵکەوتوەکان لە شوێنی شروشتیی خۆیان جێ نەگرنو نەتوانن بڕۆنە نێو پێکهاتەی دەسەڵاتەوە. ئەگەر وابوو لەوانەیە ڕاپەڕین ڕوو بدا. لە کومەڵگەی کراوەدا دەرەتانی هەڵگەڕانەوەی هەڵکەوتوەکان [نوخبەکان] هەیە، بەڵام سیستمە داخراوەکاندا دەرەتانی هەڵگەڕانەوەی لەسەرەخۆ بوونی نیە، کاتێك چینی دەسەڵاتدار بریتی لە کەسانی ناشایست بێو هەڵکەوتوەکان لە دەرەوەی بازنەی دەسەلات بن، ئەگەری ڕوودانی شۆڕش زیاتر دەبێ. ئەرکی سەرەکی شۆڕش کردنەوەی کاناڵی چالاکیو بزووتنی کومەڵایەتیو سیاسیو هەڵگەڕانەوەی هەڵکەوتوەکانە. شۆڕش بۆ کومەڵانی خەڵك بەگران دەوەستێو هەر ئەوەندیەکە دەسەلات دەگوازێتەوە بۆ چینی دەسەڵاتداری نوێ.

٣. **ڕاپەڕین بە مانای چوونەسەری دەسەڵاتی دەوڵەت:** هەندێك لە نووسەران وەك ماکس ویرو ئالکسی دوتوکویل، ئەرکی سەرەکی شۆڕشو ڕاپەڕین بە پێکهێنانی هەلومەرجی پێویست بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتێکی ناوەندگەرای مودێرن دەزانن. لە ڕوانگەی "توکویل"ەوە شۆڕشی فەرانسە پاشماوەکانی کومەڵگای دەرەبەگایەتی [فئودالی] سەدەکانی ناوەڕاستی لەنێوبردو پێکهاتەی دەوڵەتی بە دەسەڵاتو ناوندگەرایی مودێرنی لێکەوتەوە. پێشتر دەسەڵات بەدەستەکانی بنەماڵەی بووربون لە هەوڵەکانی خۆیاندا بۆ پێکهێنانی وەها دەوڵەتێك لەرێی نوێکردنەوەوە سەرکەوتوو نەبوو، ڕاپەڕین ئەو کارەی گەیاندە ئەنجام کە دەسەڵاتدارە رەهاکانی پێشین دەستیان پێکردبوو. دەسەڵاتی دەوڵەتی شۆڕشگێڕانە ڕەهاتر لە دەسەڵاتی هەموو شاکانی ڕەهای پێش لە ڕاپەڕین بوو. زۆرجار ڕێژیمە ڕاپەڕیوەکان زیاتر لە ڕێژیمەکانی پێش ڕاپەڕین لە بیاڤە [حوزە] جۆراوجۆرەکانی ژیانی خەڵکدا دەست تێوەردەدەن.

٤. **ڕاپەڕین بە مانای چارەسەری قەیرانی بەشداری سیاسی:** ئەم خوێندنەوە لە لایەکەوە هاوشێوەی خوێندنەوەی هەڵگەڕانەوەی هەڵکەوتوەکانە، بەڵام لەودا دەسەڵات هەر لە نێوان هەڵکەوتوەکاندا دەستاو دەست نابێ، بەڵکوو ڕاپەڕین دەرەتانی بەشداریی ڕاستەقینەو چوونەپێش بەرەو دێموکراسی زیاتر دەکا. پێش لە ڕاپەڕین گرووپگەلی کومەڵایەتیو سیاسی نوێ پەیدا دەبنو خوازیاری بەشداریی لە ژیانی سیاسیدا دەبن. ئەرکی سەرەکی شۆڕش ئەوە

دەبێ کە دەست بکا بە پێکهێنانی دامەزراوە سیاسیەکانو بە ویستی گرووپەکانی بەشداری خواز وەڵام بداتەوە. شۆرش کاتێك روو دەدا کە پێکهاتەی سیاسی بۆ راکێشانی بەشداری کومەڵایەتی وەڵامدەر نەبێ. لەو کومەڵگایانە کە هێشتا ویستو ئیرادە بۆ بەشداری بەربڵاو نەهاتوەتە ئاراوەو هێشتا لەو کومەڵگایانەدا دامەزراوە سیاسیەکانی پێویست بۆ وەڵامدانەوە بەو ویستانە پێك نەهاتوون، روودانی شۆرش مومکین نیە. شۆرش بەهۆی نەبوونی هاوسەنگی نێوان سیستمی کومەڵایەتیو سیستمی سیاسی بە مانای سەرەڕۆیە. ڕاپەرینی سەرکەوتوو، ئەو راپەرینەیە کە ئەم ناهاوسەنگیە نەهێڵێ. سەرئەنجام ئەرکی سەرەکی شۆرش لەم خوێندنەوەدا پەرەپێدانی ئازادیە سیاسیەکان، پێکهێنانی حکومەتی یاساییو مسۆگەرکردنی زۆرینەخوازی لە ژیانی کومەڵایەتیو سیاسی دایە.

٥. **راپەرین بە مانای خوش خەیاڵی بۆ داهاتوویەکی نادیار [موهوم]**: هەندێك لە نووسەرە کۆنەپارێزەکان روودانی شۆرش لە ئاکامی دەنگوی شتگەلێکی بێبناخە لەنێو خەڵکدا سەبارەت بە دەرەتانی پێکهێنانی کومەڵگای خەیاڵی دەزانن. لە سەردەمەکانی پێش لە راپەرین ئایدولوژیگەلێکی خوش خویالانە لەنێو چینە جوراوجورەکانی خەڵکدا بلاوە دەبێتەوە کە رێگەیەکی ساناو روون بۆ چارەسەری ئاڵوزترین کێشە کومەلایەتیو ئابووریەکان دەخەنە رووو تا گەیشتنی بە بەهەشتی ئازادیو دادپەروەری لەسەر زەویدا، رێگەیەك درێژ لە بەردەم خۆیاندا نابینن. لەم روانگەوە بارودۆخی شۆرشگێرانە دۆخێکی وەهم ئامێزو داغە کە لەودا خەڵك بە روودانی موعجیزە ئیمان دێنن.

## هۆکارەکانی شۆرش

کێشەی روونکردنەوەی هۆکارەکانی راپەرین یەکێك لە دژوارترین کێشەی زانستی سیاسیە. بێگومان لەبەر ئەوە دیاردەی شۆرش وەك تەواوەتی کومەڵگە دیاردەیەکی ئاڵوزو خاوەن لایەنی جوراوجورە، شیکردنەوەی هۆکارەکانیشی ئاڵۆز دەبێ. لە راستیشدا دیراسەو موتالا سەبارەت بە هۆکارەکانی شۆرش تیۆرانینی چەند هۆیی هەبوە. سەبارەت بە شۆرشی فەرانسە لێکولینەوەی ئەم دواییە گەیشتوە بەو ئاکامە کە ئەم ئۆرشە لە راستیدا تەنانەت دیاردەو رووداوێکی تاك نەبوە، بەڵکوو تێکەڵێك لە ململانێی دەربار [دیوانی شایەتی] و خانەدانەکان

[ئەشراف]، راپەرینی بورژواژی، شۆرشگەلی فەلاحیو شۆرش کومەلانی شاریی. دیارە گرووپە جیاوازەکان کە لە شۆرشدا بەشداری دەکەن، ویستو داخوازیی جوراوجوریان هەیە.

بەگشتیی بۆ تێگەیشتن لە سەبەبو هۆکاری شۆرشەکان، دەبێ لە پێشدا هۆکارەکانی رێکوپێکیو هاوسەنگی کومەلایەتی کە پێش لە روودانی شۆرش بوونی هەبوە، لێک بدرێتەوەو روون بکرێتەوە هۆکارەکانی ئەمنیەتو درێژەکێشانی سیستمی سیاسی چییەو پاشان هۆکارەکانی تێکچوونی هاوسەنگی لە نێوان بەشەکانی کومەلگای روو لە گەشە، سیستمی تیکنولوژیك لەوانەیە بەهۆی کاریگەری دەرەکی گۆرانی خێرایی بە سەردابێ، بێئەوەی کە گۆرانێکی هاوشێوە لە سیستمی فەرهەنگی دا بێتە ئاراوە. یان ئەوەی کە لە ئاکامی دزەکردنو تەشەنەی کولتووری ئالۆگور لە سیستمی فەرهەنگیو یان کومەلایەتی بە بێ گۆرانی هاوشێوە لە سیستمی تکنولوژیکدا بێتە کایەوە لە مارکسیسمیشدا نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان ژێرخانو سەرخانی کومەلایەتیدا وەك چوونەسەری دژکاریی [تضاد]و سەرهەلدانی راپەرین لێك دەدرێتەوە. بەلام مارکسیزم خالی دەست پێکردنی گۆران چارەنووس سازەکان لە سیستمی تکنولوژیكو ئابووریدا دەدوزێتەوە، لە کاتێکدا لە تیۆری هاوسەنگی کومەلایەتیدا گۆرانی چارەنووس ساز لەوانەیە لە هەرکام لە بیاڤە [حوزە]کانی کومەلگادا دەست پێ بکا.

لە روانگەیەکەوە گۆرانی کاریگەر لەسەر بالانسی کومەلایەتیدا دوو جورە: گۆرانی خولییو گۆرانی هێلی [خطی]. گۆرانی خولیی هەر چەند ماوەجارێك روودەداتەوە، بۆ نموونە کەساتێ ئابووریو شەر لەم چەشنەیە. بەلام گۆرانی هێلی لە بناخەدا دووپات نابێتەوە، بۆ نموونە گەشەی زانستو پیشەسازی لەسەدەکانی رابردوودا پرۆسەیەکی تا قانەو بێ گەرانەوە بوە. هەر چۆنێك بێ هەم گۆرانە خولیە کەو هەم گۆرانە هێلیەکان لە رووداني راپەریندا دەوردەگێرن. گۆرانی خولیی لەوانەیە لە رێی کردەی سیاسی راوەستێ، بەلام گۆرانی هێلی هەر دەبێو لە چارەنەهاتوە. لە پێکهاتەی گۆرانی خولییو هێلی لە سیستمی کومەلایەتی، فەرهەنگیو تکنولوژیکدا دەتوانرێ هۆکارە درێژخایەنو کورت خایەنەکانی راپەرین دەست نیشان بکرێن.

## هۆکارە درێژخایەنەکانی شۆرش

زۆر جار دیراسەکان سەبارەت بە ڕاپەرینەکان بەشوێن هۆکارە درێژخایەنەکاندا لە یەك سەدە پێش لە ڕوودانی شۆڕشەکەدا دەگەڕێن. هۆکارەکانی درێژماوەی شۆڕش گۆڕانێکن لە چەشنی هێلی ئێستا بە هەندێك لە هۆکارەکانی هێڵیو درێژخایەن شۆڕش لە تیوریە جیاجیاکاندا ئاماژە دەکەین.

**سەرهەڵدانی چینی کۆمەڵایەتی نوێ:** لە ڕوانگەی مارکسیستەکانەوە ڕوودانی شۆڕش پێویستی بە سەرهەڵدانی چینێکی نوێیە کە لە پێوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی سەقامگرتوودا خاوەن بەرژەوەندی نەبێو قازانجی بەهۆی گۆڕان لە پێوەندیو شێوەی بەرهەم هێناندا بێ. بورژوازی وەك وەها چینێك، بەرهەمی پەرسەندنی بازەرکانو پێوەندیەکانی سەرمایەداری لە دەرەوەی بازنەی پێوەندیەکانی بەرهەم هێنانو شێوازی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی جێگیرتوو بوو. هەر ئەم چینە لە ڕوانگەی مارکسیستەکانەوە هێزی سەرەکی ڕاپەرینی سەدەکانی نوێ بوو.

**نوێژەنکردنەوەی کۆمەڵایەتیو ئابووری:** لە تیۆریەکانی نوێژەنکردنەوە، هۆی سەرەکی شۆڕش لە درێژخایەندا ڕوودانی گۆڕانی ئابووریو کۆمەڵایەتی بەهۆی چاکسازیو نوێژەنکردنەوە، لە سەرەوە کە پاڵەپەستوو لەنێوخۆی سیستمدا پێك دێنێ. ئەگەر سیستمی سیاسی بتوانێ بەم پاڵەپەستوانە وەڵامی لە بار بداتەوە، شێوازی چاکسازی سەردەکەوێ، دەنا پاڵەپەستووی دەرئەنجامی نوێکردنەوە لە ئاکامدا دێریان زوو سیستمە سیاسیەکە تێکەوە دەپێچێ. یەکێك لە نووسەرانی هاوچەرخی ئەمریکا، تداسکا چپول لە کتێبی دەوڵەتەکانو ڕاپەرینە کۆمەڵایەتیەکان (١٩٧٩) بەڵگە دێنێتەوە [استدلال] کە شۆڕشە مەزنەکان لە سەردەمانی نوێکردنەوەی سەرەتاکانو ڕکەبەری ئابووری، سەربازی ڕوویان داوە. لەگەڵ پەرەسەندنی ڕکەبەریو تێکهەڵچوونەکانی شەڕو چوونەسەری مەسرووفاتی [تێچوو] سەربازی، دەوڵەتە لاوازەکان بە مەبەستی قەرەبووکردنەوەی دواکەوتوویی خۆیان ڕوویان لە ریفۆرم کردوە، بەڵام کۆسپگەلێك لەسەر ڕێی چاکسازیو نوێکردنەوەدا قوت بوونەوە، بەتایبەت چینی خانەدان کۆسپی نوێکردنەوەی ئیدارەیو دارایی بوو. لەو کاتانەدا دەوڵەت لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ خانەدانەکاندا سەرکەوتوون (بۆ نموونە لە ژاپۆنو ئاڵمان) شۆڕش لە سەرەوە ڕووی داوە، بەڵام لەو کاتانەدا کە دەوڵەت لەو ڕووبەڕوو بوونەوەدا تێك شکا (بۆ نموونە لە فەرانسەو چینو ڕووسیە) شۆڕشگەلی کۆمەڵایەتی ڕوویان دا.

**سەرهەڵدانی دەوڵەتی ڕەها:** لە ڕوانگەی زۆر لە بیرمەندان، ڕاپەرینە کلاسیکەکان لە ڕاستیدا لەنێوخۆی دەوڵەتە ڕەهاکانداو نوێکردنەوە ڕوویان دا کە دەیانویست کە بە کۆکردنەوەی سەرچاوەکانی دەسەڵات گۆڕانی کومەڵایەتیو ئابووری پێك بێنن. بە واتایەکی دیکە شۆڕش دژکردەوەیەك بوو بە کۆکردنەوەی دەسەڵات لەدەست دەوڵەتدا کە دەیویست بە کەڵك وەرگرتن لەو دەسەڵاتە پێکهاتەی بەرژەوەندی کومەڵایەتیو ئابووری تێك بدا. دەوڵەتە ڕەهاکان لە ڕۆژئاوادا لە مەودای نێوان لەنێوچوونی دەرەبەگایەتی [فئودالی]و سەرهەڵدانی سەرمایەداریو لیبرالیسم سەقامگیر بوون. دیارە ڕوودانی شۆڕش لەنێوخۆی سیستمی دەرەبەگایەتی نا ئاوەندی بیری لێنەدەکرایەوە. بنەماڵەی شاکانی بریتانیا، فەرانسەو ڕووسیە لە سەردەمی شۆڕشەکان لەو وڵاتانەدا ڕەهاخوازبوونو لە ئاکامی کردوەوکانی خۆیاندا، دژکردەوەگەلێکیان هەڵخراند کە دەرئەنجام ڕوودانی ڕاپەرینی مسوگەرکرد.

**سەرهەڵدانی ئایدولۆژیای شۆڕشگێڕانە:** هەندێك لە نووسەران سەرهەڵدانی ئایدولۆژیای شۆڕشگێڕانە یان وەك لێکدانەوەی نوێ لە ژیان بە زەمینەیەکی سەرەکی لە ڕوودانی ڕاپەرینیدا دەژمێرن. **ژۆرژ سورل**، نووسەری فەرانسەوی بڕوای وابوو کە ئایدولۆژیەکان، ئەفسانەگەلێکی نوێ بۆ ژیان بەرهەم دێننو مرۆڤەکان هان دەدەن تا بەپێی چونیەتی ئەو ئەفسانانە ژیان بکەن. ئەفسانەکان هێزە داهێنەرەکانی چەرخێکی مێژوویی دەبزوێنن. ئەندیشەی ڕوشنگەری لە فەرانسە پێش لە ڕاپەرین، زەمینەی فیکری پێویستی بۆ ڕاپەرین ئامادە کرد.

## هۆکارەکارە کورتخایەنەکانی ڕاپەڕین

هۆکارە کورتخایەنەکانی ڕاپەرین لە یەك دوو دەیەی پێش لە شۆڕش سەرهەڵ دەدەنو زۆرجار لە چەشنی گۆڕانی دەورانین. [خولیی]

**قەیرانی ئابووری:** قەیرانی ئابووری بە مانای گرانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بێکاریو کەساتی ئابووری هەموو جارێك لە ساڵەکانی پێش لە ڕوودانی شۆڕشەکان ڕوویان داوە. **جیمز دیویس** لە تیۆری بەناوبانگی "کەوانەی جەی" گەشەی درێژخایەنی ئابووری لەگەڵ قەیرانی کورتخایەن بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاپەرین تێکەڵ کردوە. بەپێی ڕوانگەی ناوبراو "شۆڕشەکان کاتێك ڕوو دەدەن کە پاش دەوریەکی درێژماوە لە گەشەی ئابووری دەورەیەکی کورتی قەیرانیش بێتە پێش" وەها پشت سەریەك کەوتنی [توالیی] ئابووری سەرەتا دەبێتە هۆی پێکهاتنی داخوازی بۆ

تێرکردنی بەردەوامی پێویستییەیەك لە دوای یەکەکانو پاشان لە ئاکامی نەبوونی دەرەتانی دابینکردنی ئەم پێویستییانە دەبێـە هۆی نارەزایەتی گشتیی. دەرئەنجامی تێکەڵیی گەشەی ئابووری درێژماوەو قەیرانی کورتخایەنە، کە بارودۆخی راپەرین سازدەکا.

## نارەزایەتی رووناکبیران

کاتێك ئەمەگناسی رووناکبیران روو لە سیستمی سیاسی وەرگێرێو ئایدولوژیەکی نوێ لەنێویاندا بڵاوبێتەوە رەوایی سیستمیی لەسەر کار دەکەوێتە ژێر پرسیار. لە روانگەی کارل مانهایم نووسەری ئاڵمانی سەرهەڵدنی رووناکبیرانی نوێ، یەکێك لە دیاردە گرینگەکانی سەردەمی مودێرنە. تاقمە رووناکبیریەکانی نەریتیو ئایینی لەنێوخۆی پێکهاتەی کومەڵایەتی کۆن خاوەن پێگەیەکی نەگۆرو دیار بوون، بەڵام چینی رووناکبیرانی نوێ پێگەیەکی نەگۆرپیان نیەو چینێك پێك ناهێنن، بەڵکوو ریشەکانی دەچێتە نێو چینە جیاوازەکانو پێگەی کومەڵایەتی رووناکبیران دەخوازی کە لەسەرەوەی بەرژەوەندی تایبەتی چینەکانی خۆیان جێبگرن. دیارە رووناکبیران لە ساتە وەختێك گەلێکی [دربرهەهای] تایبەت لە مێژوودا دەتوانن خۆیان لەگەڵ چینە دژبەیەکەکان یەك بخەن. بەم شێوە رووناکبیران دەکەونە هەوڵی بەرگری لە بەرژوەندی چینە دەسەڵاتدارەکانو یان چینەکانی روو لە نێوچوون (دەست دەکەن بە داهێنانی ئایدولوژی)و یان لە چینەکانی روو لە گەشە پشتیوانی دەکەن (دەست بە پێکهێنانی یوتوپی [ئارمانج شار] دەکەن). زۆرجار نەخشی رووناکبیران پاسەوانی دەسەڵاتی چینی دەسەڵاتدارە، بەڵام ئەگەر ئەوانە رخنە لە بارودۆخەکە بگرنو بە پێی ئایدولوژیەکی نوێ کومەڵێکی دڵخواز بنەخشێنن، دەرەتانی روودانی شۆرش دەچێتە سەر.

**کەلێن لەنێو چینی دەسەڵاتدار:** ئەفلاتون لە جمهوریدا وتوویە: "ئایا ئەمە راستیەکی ساکار نیە کە لە هەر چەشنێك لە حکومەتدا شۆرش هەمو کات لەگەڵ روودانی ململانێ نێوخۆیی لەنێو چینی دەسەڵاتداردا دەست پێدەکا؟ تا ئەو کاتە ئەو چینە یەکپارچە بێ، حکومەت نارۆخێ. هەرچەندیش ئەو چینە، چینێکی بچووك بێ". لەو لێکوڵینەوە جوراوجورانەدا کە سەبارەت بە شۆرشەکان کراوە، ئاماژە بە کەلێنی نێوخۆیی لە گرووپی دەسەڵاتداردا کراوە.

لەسەریەك ئەگەری سەرکەوتنی شۆرش بە بوونی یەکیەتیو یەکپارچەیی چینی دەسەڵاتدار کەمە، لە کاتێکدا کە بزووتنەوە شۆرشگێرانەکانی لاوازیش لەوانەیە چینە دەسەڵاتدارەکانی لێك دابراو هەڵتەکێنێ. گرووپی دەسەڵاتداری یەکپارچەو یەکگرتوو مەیلێکی زۆرتری بۆ لای کردەوەی زۆردارانە بەدژی شۆرشگێرەکان هەیە، لە کاتێکدا کە ناکۆکی لەنێو گرووپی دەسەڵاتداردا لەوانەیە جیاوازی بیروای سەبارەت بە بەکارهێنانی هێزە چەکدارەکان بەدژی شۆرشگێرەکانی لێبکەوێتەوە.

## شەڕ

لە نێوان شەڕو شۆرشدا پێوەندیەك هەیە. وتوویانە شەڕ مامانی [ ئەو ژنەی کە وەك دوکتور یارمەتی بەژنی دوو گیان دەدا کە منداڵەکەی بێنێتە دونیاوە] شۆرشە. سەبارەت بە شۆرشەکانی چینو رووسیەو رووخانی ئیمپراتوری فەرانسە پاش شەڕی ١٨٧٠ ئەم بابەتە بەتەواوی بەراست دەرچوە. تێکهەڵچوونی فەرانسە لە شەڕی سەربەخۆیی ئەمریکا، لە روودانی شۆرش لەو وڵاتەدا کاریگەری هەبوو. دەرئەنجامی ئەو تێکهەڵچوونە پێك هێنانی قەیرانی دارایی بۆ دەوڵەتی فەرانسە بوو. شەڕەکان لەوانەیە ببنە هۆی ماندوویی خەڵكو بێزاری ئەوان لە حکومەت. هەروەها شەڕەکان دامەزراوەکانی حکومەتی لە کار دەخەنو بەشێك لە هێزو تواناکانیان دەگرن. هەروەها لە سەردەمی شەڕدا، خەڵك ئاواتی ئاشتی دەخوازیو دڵی پێ خۆش دەکا. بەڵام ئەگەر لە سەردەمی ئاشتیشدا بارودۆخەکە پێشکەوتن بەخۆیەوە نەبینی، دەرەتانی مەیل بۆ گۆرانی شۆرشگێرانە زیاد دەبێ، شەڕەکان خەڵکە دەهروژێنێو شۆرشیش کە بە پێویستی بە هروژاندنی خەڵك هەیە لەوانەیە لەوەها هەلومەرجێك کەڵك وەربگرێ.

## فشارو پاڵەپەستوی ماڵیی [دارایی] لەسەر خەڵك

کاتێك مەسرووفاتی حکومەت بەهۆی جوراوجور دەچێتە سەر یان داهاتەکەی دادەبەزێ، فشار بۆ وەرگرتنی باج [ماڵیات / تاکس TAX ] لەسەر خەڵك زیاتر دەکاو ئەمە بۆخۆی نارەزایەتیەکان دەباتە سەر. لە فەرانسە مەسرووفاتی دەوڵەت لە شەڕی سەربەخۆیی ئەمریکا بوو بەهۆی بەکارهێنانی زەخت خستنە سەر خەڵك بۆ وەرگرتنی باج. کەم بوونی داهاتی TAX یان ماڵیات دەوڵەتی ناچار کرد قەرز بێنێتە سەرخۆ.

## هەندێك لە جۆرەكانی شۆڕش

بەرچاوترین پێوەر بۆ ریزبەندی پێوەری ئایدولوژییە، بۆ نموونە دەتوانرێ لە شۆڕشەكانی لیبرال، كومونیستی، ناسیونالیستی، فاشیستی‌و دیموكراتیك ناوببرێ. ئاتەواوی ئەم دابەشكردنە ئەوەیە، یەكەم جیاوازی بیرورا هەیە لەسەر مانای روونی ئەم ئایدولوژیانەو دووهەم هەندێك شۆڕش لانیكەم لەسەرەتادا هەڵگری چەند ئایدولوژین، زۆر جار شۆڕشەكان خاوەن دوو قوناخی لیبرال‌و توندرەو بوون.

لە دابەشكردنێكی ئالۆزتردا لە روانگەی چالمرز جانسون، نووسەری ئەمریكایی لەسەر بنەمای چوار پێوەر بە سەر شەش جوردا دابەش دەبن. ئەم پێوەرانە بریتین لە: ١) مەبەستەكانی تێكۆشانی شۆڕشگێرانە (لابردنی دەسەڵاتبەدەستان [حكام]، حكومەت‌و یان دەوڵەت) ٢) ناسنامەی شۆڕشگێران (كومەڵانی خەڵك یان گرووپە هەڵبژاردەكان) ٣) ئایدولوژی شۆڕش ٤) خۆرسكی یان پێش بینی بۆكراو لە رووداوی شۆڕشدا. شەش جۆر شۆڕش كە لەسەر بنەمای ئەم پێوەرانە لێك جیادەكەینەوە بریتین لە:

١ـ شۆڕشی فەللاحی [دهقانی]

٢ـ شۆڕش بۆ پێك هێنانی ئارمان شار [مدینه فاضله]

٣ـ شۆڕشی ئانارشیستی

٤ـ شۆڕشی نەتەوە خولقێن

٥ـ كودیتا

٦ـ شۆڕشی چەكدارانە

## كومەڵانی خەڵك

وەك دیارە ئەم دابەشكردنە رووداوەكانی ناشۆڕشگێرانە وەك كودیتاو راپەرین فەللاحی لەژێر ناوی شۆڕش دادەنێ‌و دیاردە جیاوازەكان لەگەڵ یەك تێكەڵ دەكا.

دابەشكردنێكی دیكە لە شۆڕش لە كتێبی مێژووی سروشتیی شۆڕشەكان لە نووسینی لایفورد ئیدواردزدا خراوەتە بەرچاو ناوبراو شۆڕش بەسەر سێ تاقمدا دابەش دەكا:

١ــ شۆڕشەكانی بێئاكام كە لەودا هێزە پارێزگارو كونسێرواتیوڤەكان‌و یان سەڵتەنەتخوازەكان شۆڕشگێرەكان تێك دەشكێنن، وەك شۆڕشی بێئاكامی ١٨٤٨ لە ئاڵماندا.

٢ـ شۆڕشەکانی میانەرەو [معتدل] کە لەودا هێزەکانی نەرم ڕەو بەسەر پارێزگارەکانو توندرەوکاندا سەردەکەون، وەك شۆڕشی بریتانیا، شۆڕشی ١٨٤٨ لە فەرانسەو شۆڕشی ١٩١١ی چین.

٣ـ شۆڕشە توندرەوانەکان یان رادیکال کە لەواندا توندرەوەکان یان رادیکالەکان بەسەر نەرم رەوەکانو پارێزگارەکاندا سەردەکەون، وەك شۆڕشی مەزنی فەرانسە، شۆڕشی رووسیەو شۆڕشی کووبا.

ساموئیل هانتینگتون، نووسەری ئەمریکایی دابەشکردنێکی دووانەی لەژێر ناوی "رۆژهەلاتیو رۆژئاوایی" لە شۆڕشەکان دەداتە دەست کە دیارە لایەنی جوغرافیایی نیە. بەپێی ئەم روانگە شۆڕشە رۆژئاواییەکان لە کومەلگای نەریتی کە لەژێر چاوەدێریو کونترولی شاکانی رەهاو نەجیب زادەکانی خاوەن زەوی بوون روویان دا. لەگەل ئەوە کە ئەم شۆڕشانە لە ناوەندی ولاتەوە (پێتەختەکان) دەستیان پێکردو ئەمە بۆخۆی ئەوە دەگەیەنێ کە دەمودەزگای دەولەت تووشی قەیرانی نێوخۆیی بوە. شۆڕشەکانی رۆژهەلاتی لە کومەلگاگەلێك روودەدەن کە تا رادەیەك نوژەن کراونەتەوە، لەم شۆڕشانەدا خودی دەولەت لێك بلاو نابێو ناوەندی دەرکەوتنی شۆڕشو راپەرین نە لە پێتەخت بەلکوو لە دەوروبەر دایە شۆڕشەکانی رۆژئاوایی لە پێشدا بەرنامەرێژی بۆ نەکراوە، بەلکوو خۆرسکن بۆیە بە قوناخگەلێکی تایبەتدا تێدەپەڕن. رووخانی لە نەکاوی رێژیم لەم شۆڕشانەدا بۆ شایی دەسەلات پێك دێنێو لەم بۆشاییەدا نەرم رەوەکانو توندرەوەکان بۆ گەیشتن بە دەسەلات دەکەونە ململانێ. لە ئاکامدا شۆڕش خاوەن قۆناخی لیبرالو رادیکالە [توندرەوانە]. لە شۆڕشەکانی بیچمی رۆژهەلاتی کاتێك شۆڕش دەست پێدەکا، دەولەت هێشتا بە دەسەلاتە. لەم شۆڕشانەدا لە پێشدا گەلالەو پلانێك بۆ بەدەست هێنانی دەسەلات بیری لێکراوەتەوە: شۆڕشگێرەکان لە ناوچەکانی دەوروبەر، رێکخراگەلێك پێك دێننو دەست دەکەن بە تێکۆشانی پارتیزانی. لە شۆڕشی بریتانیا، فەرانسەو رووسیە لە چەشنی رۆژئاواییو شۆڕشی چینو کووبا لە چەشنی رۆژهەلاتی بوون. لە شۆڕشی رۆژئاوایی قوناخەکانی دوایی واتا کاتێك رادیکالەکان بەسەر نەرم رەوەکاندا سەردەکەون، دێتەپێش. بە پێچەوانە لە شۆڕش چەشنی رۆژهەلاتی قوناخی تیرۆر لە سەرەتاکانی شۆڕشدا روو دەدەن.

دابەشکردنێکی دیکە لە شۆڕشەکان لە بەرهەمەکانی مارکسدا بەرچاو دەکەوێ. ناوبراو لە شۆڕشی سیاسیو شۆڕشی کومەڵایەتی لە بەرانبەر یەکتردا باس دەکا. شۆڕشی سیاسی دەسەڵاتی سیاسی لە گرووپێکەوە بۆ گرووپێکی دیکە دەگوازێتەوەو دەبێتە هۆی گۆڕان لە قەوارەی حکومەتدا (سەڵتەنەتی بۆ کوماریی)، بەڵام کاریگەرییەکی لە سیستمی ئابووریو کومەڵایەتیدا نابێو چینی دەسەڵاتدار ئابووریی پێشوو درێژە بە دەسەڵاتداریەتی خۆی دەدا. بەپێچەوانە لە شۆڕش کومەڵایەتیدا کاریگەری شۆڕش لە سنووری کومەڵگای سیاسی تێدەپەڕیو سیستمی کومەڵایەتیو ئابووریش سەروژێر دەکا. بە بۆچوونی مارکس هەر شۆڕش کومەڵایەتی خاوەن بایەخی مێژوویی یە.

بۆ دابەشکردنێکی دیکە لە شۆڕشەکان دەکرێ بەپێی ماناکانی ناوەندو دەوروبەر، تیۆریگەلێگ لە سیستمی سەرمایەداری جیهانی بدوزیتەوە. ئەو شۆڕشانە کە لە ولاتانی ناوەندی سەرمایەداری جیهانی دا روو دەدەن، زیاتر لایەنی خەباتی چینایەتی یان هەیە. لە کاتێکدا کە شۆڕشەکانی ولاتانی دەوروبەرییو بەستراوە، توخمێکی بەهێز لە ناسیونالیستیان تێدا هەیە.

## کێشەی خورسکیو پیلانگێڕی لە شۆڕشدا

یەکێك لە بابەتە گرینگەکان سەبارەت بە شۆڕش، کێشەی رێکخستنە، لێرەدا ناکوکی بیرورا لەسەر خۆرسکی شۆڕش یان بوونی گەلاڵەو پیلانی لەپێشدا دارژاو یان بیر لێ کراوەیە. زۆرجار مێژوونووسانی چەپگەرا شۆڕش وەك بزووتنەوەیەکی خۆرسکی جەماوەری خەڵك لێك دەدەنەوەو نەخشی رێبەری لە روودانیدا بە گرینگ نازانن‌و پێیان وایە کە زۆر کەمە. لە لایەکی دیکە مێژوونووسانی راستگەراو کونسیرواتیڤەکان [محافظە کار] شۆڕش بە دەرئەنجامی پیلانو دەسیسەی تاقمێکی بچووك دەزانن. لە روانگەی ئەوانەوە جەماوەری خەڵك دەکەونە ژێر کاریگەری خەڵك خلەتێنگەلێك کە جگە لە مەبەستە تایبەتەکانی خۆیان نەبێ ئامانجێکی دیکە یان نیە.

بەم شێوەیە دەکرێ لە دوو "گریمانەی تەقینەوە "و "گریمانەی پیلانگێری" باس بکرێ.

## گریمانەی تەقینەوە

بەپێی ئەم بۆچوونە شۆڕش بەرهەمی هەڵچوونی کتوپڕی ئەو ململانێیانەیە کە ساڵەهای ساڵ لە هەناوی کومەڵگادا خۆیان حەشار داوە. هەر بۆیە سەرکەوتنی شۆڕش دەبێتە هۆی سەرسوورمانی دەسەڵاتداران و شۆڕشگێڕانیش. بەپێی ئەم گریمانەیە شۆڕش پێیك نایە بەڵکوو روو دەدا. لە رۆژەکانی پڕهەستی [حساس] رووداونی شۆڕشدا، رێبەران و رێکخراوەکان بە شوێن ئەو رووداوانەدا دەکێشرێن کە جەماوەر دەیانخولقێنن. ناروونی و سەرلێشێواوی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەراستی هیچ کەسێك ئاگاداری تەواوی لە بارودۆخەکە نیە. کەوابوو ناکرێ لە پلانی شۆڕش باس بکرێ، لە راستیدا شۆڕش یەکێك لە دەگمەنترین هەلومەرجەکانی مێژوویییە کە جەماوەری خەڵك لەسەر شانوی مێژوو دەردەکەون. یەکێك لە دیاردەکانی ئەم راستییە سەرهەڵدانی ئەنجومەکان و رێکخراوگەلی خەڵکی لە هەموو شۆڕشەکاندا بووە. ئەم ئەنجومەنو رێکخراوانە بەستراوە بە پلانی لە پێشدا دارژاونەبوەو لە هەموو شۆڕشەکاندا بەشێوەی خورسك سەرهەڵ دەدەن. لە روانگەی لایەنگرانی ئەم گریمانە دەوڵەتی شۆڕشگێر خاڵی بەرانبەری هەڵچوونی شۆڕشگێڕانەیەو پێش بە پێشکەوتنی دەگرێ.

## گریمانەی پیلانگێڕی

بەپێی ئەم گریانە شۆڕش دەرئەنجامی کردەی تاقمێکی پیلانگێرە کە رەوایی حکومەتی لەسەرکاری لەرێی پروپاگەندەو، تیرۆریسمو کرداری نایاسایی دەباتە ژێر پرسیار. هەرچەند لەوانەیە لە کاتێ راپەرینەکە دا رووداوی چاوەروان نەکراو بێتە پێش، بەڵام تەواوی راپەرین ئاکامی پیلانێکە کە تا کاتی سەقامگیری دەسەڵاتی نوێ درێژەی هەیە. لایەنگرانی ئەم بۆچوونە بڕوایان وایە کە چۆن زۆر لە ژاکوبنەکان پێش لە رووداوی شۆڕشی فەرانسە ئەندامی فراماسونرێ بوون و یان چۆن زۆر لە بلشویکەکان جوولەکە بوون، دەرئەنجام شۆڕشی فەرانسە پیلانی فراماسونرەکان و شۆڕشی رووسیە پیلانی جوولەکەکان بوو. دیارە بەرپەرچ دانەوەی تیوری سادەبینانەی پیلان بە مانای نکوولی لە بوونی جۆرێك لە رێبەری و رێکخستن لە رووداونی شۆڕشەکاندا نیە.

## گریمانەی [فرضیە] ڕێبەریی شۆڕش

گریمانەکانی خۆرسکی‌و پیلانگێر بەشێك لە ڕاستییەکان دەردەخەن، بەلاّم ڕوونکردنەوەی تەواو نین بۆ ڕوودانی شۆڕش، ئەم کێشە ڕوونەکە خورسکی جەماوەری بە بێ‌ڕێبەری نابێتە هۆی سەرکەوتنی هیچ شۆڕشێك. بەرەو پێشبردنی ئامانجەکانی شۆڕش بە ناچاری پێویستی بە ڕێبەری هەیە. لە لایەکەی دیکە سەرهەلّدانی هۆکارەکانی درێژخایەنی شۆڕش وەك دەرکەوتنی چینو یان ئایدولوژی نوێ ناتوانێ دەرئەنجامی پیلان بێ. هەر چۆنێك بێ بە بێ‌ڕێبەری دەرەتانەکانو بارودۆخە شۆڕشگێڕانەکان لە دەرئەنجامی تێکەلّبوونی هۆکارەکانی درێژخایەنو کورت خایەن پەیدا دەبن، لەوانەیە بە زوویی لە دەست دەربچن. تروتسکی وتوویەتی: کە نارەزایەتی جەماوەری وەك هەلّم وایەو ڕێبەری‌و ڕێکخستنی وەك مەکینە هەر چەند بەبێ هەلّم مەکینەی هەلّم نابزوێ بەلاّم بە بوونی مەکینەو مەنجەلّیش هەلّم دەچێتە هەوا.

### قوناخەکانی شۆڕش

بەپێی لێکدانەوەی کرین برینتین لە کتێبی شیکاریی شۆڕشەکان، ڕاپەرین خاوەن سێ قۆناخی سەرەکی‌یە: حکومەتی نەرم ڕەوەکان، حکومەتی ڕادیکالّو تیرۆر، وترمیدور

## حکومەتی میانەڕەوەکان [نەرم ڕێ]

نەرم ڕەوەکان خوازیاری ئالّوگۆڕی سیاسی، ڕووکاریی، کەمو لەسەر خۆنو دەستبەجێ دوای ڕووخانی ڕێژیی کۆن شۆڕشەکە بە تەواو بوو رادەگەیەننو بایەخێك بە گۆڕانی قوولّو بنەڕەتی‌و ئابووری نادەن، بۆ نموونە نەرم ڕەوەکانی شۆڕشی بریتانیاو فەرانسە دەیانویست بەشداری سیاسی لە ئاستی خاوەن مولّكو مالّەکاندا ڕاگرن. نەرم ڕەوەکان لە ڕاستیدا لە ئاستی سەرەوەی کومەلاّیەتین [ماوراء اجتماعی] و لەبەر ئەوەی لە ئاکامی شەپۆلی شۆڕش بە دەسەلاّت گەیشتوون، خاوەن ئایدولوژیەکی لەپێشدا بیر لێکراوەنین.

حکومەتی میانەڕەوەکان بەهۆی پشت بەستنی بە ئازادی دامالّراوەکان [انتزاعی]و سەرنج نەدان بە کاروباری کومەلاّیەتی بە زوویی خوشەویستی خۆیان لەدەست دەدا. لە بواری سیاسەتی سەربازی، میانەڕەوەکان لەگەلّ ئەوەکە بە پاشماوەی هێزە سەبازیەکانی بەجێ ماو لە ڕێژیی پێشوو باوەڕێکیان نیە، لەوەش دەترسن کە هێزێکی شۆڕشگێڕی سەربازی نوێ پێك

بێنن. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی حکومەتی میانەڕەوەکان بوونی دەسەڵاتی دووانە لەنێویاندایە، بەو هۆیە دەوڵەتی میانەڕەوەکان دەسەڵاتێکی راستەقینەی نیە. لەم بارودۆخەدا دەسەڵاتی دووانەی میانەڕەوەکان تا رادەیەك کونترۆڵی ئەو رێکخراوانە کە لە رژێمی پێشوو ماوەتەوە دەگرنەدەست، بەڵام رێکخراوە نوێکانی شۆڕشگێڕ لە کونترۆڵی هێزەکانی رادیکال دایە. لەسەر یەك حکومەتی میانەڕەوەکان دەرئەنجام ناکام دەبێ‌و بەشێوەیەکی خێرا لە شەپۆلی داهێنەری شۆڕش بەجێ دەمێنێ. میانەڕەوەکان ناتوانن بە داخوازەکان‌و نارەزایەتی دەبرینەکان چینو توێژە جوراوجورەکان وەڵام بدەنەوە، ئەوە لە کاتێکدایەکە رادیکاڵەکان بە دانی بەڵێنی بۆ چارەسەری کێشەکانی ئابووری‌و کومەڵایەتی دەست بە کۆکردنەوەو هرووژاندنی خەڵك دەکەن.

## حکومەتی رادیکاڵەکان یان توندڕەوەکان

بەدەست هێنانی دەسەڵات بەهۆی توندڕەوەکان سەرەتای دیکتاتۆری شۆڕشگێرانەیەو تایبەتمەندیەکەی "حکومەتی تیرۆرو دانایی [فضیلت]"ە. مەبەست لە "تیرۆر" ماوەیەکی تایبەت لە حکومەتی رادیکاڵەکاندایە کە لەودا توندوتیژی بۆ پاراستنی شۆڕش دەگاتە لوتکە. رادیکاڵەکان زیاتر لە میانەڕەوەکان خوازیاری ئالوگۆڕی خێراو بنچینەی لە پێکهاتەی کومەڵگاو دەوڵەتن‌و لەو بارەوە لەگەڵ میانەڕەوەکان دەکەونە ململانێ، لەسەر یەك رادیکاڵەکان لەچاو میانەڕەوەکان لە چینە خوارترەکانن.

"حکومەتی تیرۆرو دانایی" سەرەتای زاڵ بوونی بە تەواوی رادیکاڵەکانە. سەبارەت بەهۆی سەرهەڵدانی سەردەمی تیرۆر لە شۆڕشدا دوو بیرۆکە لە ئارادایە:

١ـ **بیرۆکەی کردەی ناعەقلانی:** بەپێی ئەم تیرۆریە لەبەر ئەوەی شۆڕشەکان دەبنە هۆی لێك هەڵوەشانی نەریتەکانی ئەخلاقی کومەڵگا، دەرئەنجام هێزی تووڕەیی‌و شەرئەنگیزی لە مرۆڤدا ئازاد دەکەن . مرۆڤ بجورێك دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی سروشتیی کە لەودا نیازەکانی سروشتی ئاژەڵیی زاڵ دەبن. توندوتیژی‌و تیرۆر گشتگیر دەبێ‌و تەنانەت خودی رادیکاڵەکانیش لێی دەرباز نابن بەم شێوەیە وتراوە کە شۆڕش وەك کرونووس یەکێك لە خواکانی یونانی، مناڵەکانی خۆی دەخوا. ئیدموند برگ "باوکی پارێزگاری مودێرن دەڵێ: "کاتێك مرۆڤەکان ئەو خانوەی کە ساڵەهاو بە بەردەوامی خزمەتی پێ‌کردوون دەی‌ڕووخێنن‌و پاشان تێ‌دەکۆشن

به بێ ئەوەی نموونەیەکیان لەبەر دەست دابێ کومەڵگایەکی نوی دامەزرێنن، دیارە تیرۆریش بە شوێنیدا دێ". هێگیلش سەبارەت بە تیرۆر لە شۆرشی فەرانسەدا وتوویە: "ویستی دامەزرێنەرانی ئەوە بوو کە بنەمایەکی عەقلانی پێبدەن، بەڵام ئەوان هەر زەینیاتیان بەکار دەبرد ... ئەزموونەکەیان ترس و تیرۆری لێکەوتەوە".

٢ـ بیرۆکەی پێویستی سیاسی تیرۆر پێی وایە کە پێکهێنانی ترس‌وخۆف بە مەبەستی پاراستنی شۆرش‌و لەنێوبردنی هەرەشەکان سەبارەت بە ئەو [شۆرش] پێویست دەکا [مەبەست ئەوەیە تیرۆر پێویست دەکا]، بە بۆچوونی یەکێك لە نووسەران "تیرۆر" گەڵاڵەیەکە بۆ ترساندنی خەڵك"و دوژمنانی شۆرش. لە ڕاستیدا مەبەستی سەرەکی تیرۆر پتەوکردنی کونترۆڵی سیاسی ڕێژیمی رایدکاڵەکانە.

## ترمیدور

بە مانای دامرکانی هەل‌ومەرجی شۆرشگێڕانەو گەرانەوە بۆ باروودۆخی ئاساییە. لە رۆژژمێری شۆرشگێرانەی فەرانسە رۆژی نوهەمی ترمیدور لە ساڵی سێهەم ڕێکەوت لەگەڵ ٢٧ی تەمووزی ١٧٩٤ رۆژێك بوو کە روبسپیر رێبەری توندرەوی شۆرش‌و هەڤاڵەکانی رووخان‌و سیاسەتی تیرۆری سوور کۆتایی پێهات. لە لێکدانەوەی جوراوجۆردا ترمیدور بە مانای سەرتای راستگەرایی لە شۆرش، بێهیوایی بە وادەو بەڵێنەکانی شۆرشگێران، ناسیاسی بوونی ژیانی رۆژانە، گەرانەوەی بەشێك لە چینی دەسەڵاتداری پێشوو بۆ سەرکورسی دەسەڵات‌و ... هتد بەکار هاتوە.

ـ ۱۱ ـ

## سیاسەتو پێوەندیە نێونەتەوەییەکان

هەنـدێك لـە نووسـەران بابـەتی پێوەندیـە نێونەتەویـەکانیان بـۆ لێکدانـەوەی پێوەندیـە سیاسـیەکانی نێوان دەوڵەتەکان لە ئاستی نێونەتەوەییدا بـەکارهێناوەو لـە راسـتیدا ئـەوەیان لەگەڵ "سیاسەتی نێونەتەوەیی" بەیەکسان داناوە، لەبەر ئـەوەی کـە لـە سـەردەمی ئێـستادا نەتەوەکان یەکەگەلێکی سیاسین. هەندێکی دیکە وا دەزانن کە پێوەندیە نێونەتەوییەکان بریتین لـە سیاسـەتی نێونەتـەوەیی، ئـابووری نێونەتـەوەیی، راگەیەنەگـشتیە نێونەتوەیـەکان [ Communication ] مافە نێونەتەوەیەکانو رێکخراوە نێونەتەوەیەکان. بەشی پێوەندیـە نێونەتەوەییەکان وەك بەشێکی زانستی لە سەدەی بیستەم دا هاتـە ئـاراوە. بەتایبـەت شـەڕی یەکەمی جیهانی لە پەرەپێدانی لێکوڵینەوە لە بواری پێوەندیو سیاسـەتی نێونەتەوەییـدا زۆر کاریگەر بوو. لەگەڵ ئەمەش دا سەرتاپی یەکان زۆرتر یاساییو راسـپاردەیی بوون. بـەڵام لـە ساڵی ۱۹۹۳دا فریدریك شۆمان لـە کتێبێـك دا لـە ژێـر سـەردێڕی سیاسـەتی نێونەتـەوەیی شێوازێکی زاقعبینانەی لە دیراسەی پێوەندیە نێونەتەوەییەکاندا خستە بەردەست. دواتـر لـە ساڵی ۱۹٤۸دا هانزمورگانتا بە نووسینی کتێبی سیاسەت لە نێوان گەلانـدا بەشـوێن ئـەو تێڕوانینەی دا چووو بەهێزی کـرد. نـاوبراو سیاسـەتی نێونەتـەوەیی لـە روانگـەی کێـشە بـۆ دەسەڵان خستە بەر لێکوڵینەوەو دیراسەکردنو تێڕوانینەکانی ئارماغخوازی بردە ژێـر پرسـیار. مورگانتا توخمەکانی پێکهێنەری دەسەڵاتی نەتەوەیی بە جوغرافیـا، سەرچـاوە شروشـتیەکان، توانـای پێـشەسازی، ئامـادەیی سـەربازی، رادەی حەشـیمەت، ورەی نەتـەوەیی شـێوەی دیپلۆماسیو قەوارەی حکومـەتی نەتـەوەیی دەزانـی، بـەڵام بەرتەسـك کردنـەوەی دیراسـەی پێوەندیە نێونەتەوەیەکان لە شەڕی دەسەڵاتدا بەم جۆرە نارەزایەتیو رخنەگەلێکی هەلایسان کە بۆخۆی بوە هۆی پەرەسـەندنی تێڕوانینـەکانو رێوشـوێنی نوێ لـە لێکدانـەوەی سیاسـەتو پێوەندی نێونەتوەیی. هەروەك پێشتر بینیمان گرینگترین تێـڕوانینو شـێوازەکان لـەم بـوارەدا، تێوری بریاردان، تێوریگەمەکان، لێکدانەوەی سیـستمەکان، سیـستمەکانی پێوەنـدی تێـۆری هەڵبژاردنو دەست نیشان کردنی [گزینش] عەقلانیو .. هتد بوون.

بابەتی لێکدانەوەی سیاسەتو پێوەندی نێونەتەوەیی بەگشتی کێشەگەلێك وەك شەڕو ئاشتی، دیپلۆماسیو سیاسەتو پێوەندی دەرەوەی دەوڵەتەکانە. سیستمی دەوڵەتەکانی ئەو سەردەمە لە بنەمادا سیستمێکی ڕۆژئاواییە لە نزیکەیی پێش لە سێسەد ساڵ لە ئاستی جیهاندا وردە وردە پەرەی سەندوە. بەڵام بۆ تێگەیشتن لە هەڵسوکەوتی دەوڵەتەکان بە تاك لەم سیستمەدا بەگشتیی پێویستی بە پشتبەستن بە زانستەکانی پشتیوانی وەك مێژوو، ئابووری، کومەڵناسی، دەروونناسی، جوغرافیاو یاسایە. بەڵام تێگەیشتنی لە کرداری بەکومەڵی دەوڵەتەکلن پێوستی بە بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر زانستی سیاسەت، سیاسەتی بەراوەردی [تطبیقی]و حقوقی نێونەتەوەیی هەیە. هاتنە مەیدانی پەیمانەکان، یەکیەتیەکانو ڕێکخراوە ناوچەییو نێونەتەوەیەکان تۆڕێکی ئاڵۆزو نوێی لە کرداری دەوڵەتەکان بۆ دیراسەکردن بەرهەم هێناوە. جگە لەوانە سەرهەڵدانی ئایدولوژیە گشتگیرەکان لە سەدەی بیستەمدا یارمەتی بە ئاڵوزی زۆرتری پێوەندی نێودەوڵەتەکان کرد.

چەمکی دیپلوماسی لەگەڵ چەمکی سیاسەتی دەرەوەو پێوەندی نێونەتەوەی پێوەندیەکی زۆر نزیکیان هەیە. دیپلوماسی بە دوو مانا بە کارهاتوە: لە مانای بەرتەسکیدا بەشێوەکانی فەرمی پێوەندیی نێوان دەوڵەتەکان لە هەلومەرجی دەسەلاتداریەتیان هەیە ئاماژە دەکا، بەڵام لە مانا بەربلاوەکەیدا بەشێوەکانو ئامرازەکانی بەڕێوەبردنی سیاسەتی دەرەوە و لە ئاستی نێونەتەوەییدا پەیوەند پەیدا دکا. لە رابردوودا دیپلوماسی بۆ دەربرینی پێوەندیە فەرمیەکانی دەوڵەتەکان لە بارودۆخی ئاشتیدا بەکار دەهێنرا، بەڵام ئێستا کە بە مانای بەربلاوتر برێتی لە هەڵوێستو تێکۆشانێك دەبێ کە لەوانەیە خەسڵەتی ئاشتیخوازانەی نەبێ. لەگەڵ ئەوەش هەڵوێستی دەوڵەتەکان لە سیاسەتی دەرەوەدا هەر ئەوە نیە کە هەر لە کاناڵی فەرمیو دیپلۆماتیکدا رابگەیەندرێ.

## سیاسەتی دەرەوە

سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتەکان کومەڵە هەڵوێست، تێکۆشانو بڕیاراتێکە کە دەوڵەتە نیشتمانیەکان سەبارەت بە یەکترو یان سەبارەت بە ڕێکخراوەکانی نێونەتەوەیی وەردەگرنو مەبەستی سەرەکییان دابینکرنی بەرژەوەندی دەوڵەتی نیشتمانی وەك یەکەیەکی یەکپارچەیە، سیاسەتی دەرەوە برێتی لە کردەوەی هەر دوولایە، واتا دەوڵەتێکی تایبەت داهێنەری کردەیەك

بێو یان لە وەڵامی کردەوەی ئەوانیتر دژکردەوە لە خۆپیشان بدا. سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکان لە هەمان کاتدا کە خاوەن بنەماگەلێکی نگۆڕن، پێویستە ئالوگۆڕەکان لە ئاستی نێونەتەوەییشدا لەبەر چاو بگرن. هونەری سیاسەت دانانی دەرەوە لە کۆی ئەم دوو هۆکارەدا شاردراوەتەوە.

لەپرۆسەی بڕیاردان بە سیاسەتی دەرەوە بڕیاردەران یان دەبێ تێگەیشتنەکانی خۆیان لە بەرژەوەندی نیشتمانی لە چوارچێوەی مەبەستو کردەوەی دیاری کراودا بێننە بەرباس،کەرەسەو ئامرازەکانو توانایی یەکانی خۆیان لە بەرێوەبردنی ئەو مەبەستاندا تاوتوێ بکەن شێوە بەکارهێنانی ئەو ئامرازانە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانێی مەبەست دیاری بکەنو بکردەوە لە راستای دەست پێراگەیشتن بە ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوە هەنگاو هەڵ بگرن. بەو رادەیە کە پێوەندییەکانی دەرەوەی دەوڵەتەکان بەبلاوتر بێ، بایەخی سیاسەتی دەرەوە زۆرتر دەبێ. لەم بارەوە دەسەڵاتە گەورەکان کە پێوەندییەکی دەرەوەی بەربلاویان هەیە، بەشێکی زۆری لە ئامرازو کەرەسەکانی خۆیان بۆ سیاسەتی دەرەوە تەرخان دەکەن.هەروەك ئاماژەی پێکرا، دابینکردنی بەرژەوەندی نەتەوەیی مەبەستو ئامانجی سەرەکی بڕیارەکان لە سیاسەتی دەرەوەدایە. ناساندنو دیاریکردنی بەرژەوەندی نیشتمانی کێشەیەکی دژوارو ئالۆزەو لەوانەیە لە لایەنی یجۆراوجورەوە هەنگاوی بۆ هەڵبگیردرێ. لەگەڵ ئەوەش هەندێك توخمی [عناصر] سەرەکی وەك پاراستنی سەربەخۆییو یەکپارچەیی وڵات، پاراستنی لایەنی نەتەوەییو ئەمنیەتی سنوورەکانو بەردەوامی ئاشتیو خۆبواردن لەشەڕ بۆ تەئکید دەبێ. بەرژەوەندی نەتەوەیی بە خوێندنەوەیەکی فەلسەفی تر وەك بەرژەوەندی دەوڵەت لێك دراوەتەوەو دەگوترێ کە سیاسەتی دەرەوەی واقیعی ئەو سیاسەتەیە کە بەرژەوەندی [مصلحت] دەوڵەتی نەتەوەیی وەك یەکەیەکی یەکپارچە لە سەرەوەی هەر چەشنە بەرژەوەندیەکی دیکەدا دادەنێ. بۆ نموونە لە مێژوویی یەکیەتیی سۆڤیەتدا زۆرجار پاراستنی قازانجو بەرژەوەندی نەتەوەیی لەگەڵ "بەرژەوەندی" کومونیستی نێونەتەوەیی دەکەوتە دژایەتیو ناتەبا دەبوو، لە کاتێکدا قازانجی نەتەوەیی دوو یان چەند وڵات هاوئاهەنگ بن، ئاکامەکەی ئاشتیو ئاسایشی نێونەتەوەییە، بەپێچەوانە ناتەبایی قازانجی وڵاتەکان هۆکاری شەڕو ململانێیە. دیارە یەکێك لە ئەرکەکانی سیاسەتی دەرەوەی هەروڵاتێك ئەوەیەکە تێبکۆشێ لە رێگەگەلی جۆراوجورەوە ناتەبایی قازانجەکان لەگەڵ وڵاتانی دیکە کەم بکاتەوە،

بە بێ ئەوەی قانجی نەتەوەیی بکا بە قوربانی. هەر بۆیە لە تێڕوانینی واقعبیانەدا دەگوترێ کە لە سیاسەتی دەرەوەدا مەبەست ئامرازە کە پاساو دەدا، واتـا لـە نیهایەتـدا ئامرازێـك دەبـێ هەڵبژێردرێ کە زیـاترین رادە لـە قـازانجی نەتـەوەیی [ملـی] دابـین دەکـا. کـاتی واش بـوە دەوڵەتەکان ناچارن بەپێی دەرەتانێك کە هەیانە، تا ئەو جێگە کە دەگونجێ قـازانجی وڵاتەکـەی خۆیان دابین بکەن.

چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی [امنیت ملی] لە تێگەیـشتنی بـەربڵاودا بریتـی لـە لایـەنی جوراوجورە: وەك بەشوێنداچوون [پیگری]و دابینکردنی قازانجی ئـابووری، پاراسـتنی ئـابووری نەتەوەیی، پەرەپێدانی دەسەڵاتی نەتـەوەیی‌و گـەرەنتی یەکپارچـەیی وڵات. بـە سـەرنجدان بـە پەرەسـەندنی بێوێنـەی بـازاری جیهـانی‌و پیوەندیـە نێونەتەوەییـەکان لـە بیاڤـە[حـوزە] جوراوجورەکاندا لەدرێژەی پرۆسەیەك کە "بەجیهانی بوون" ناوی براوە چـاوەدێری دەوڵەتـەکان بۆ دیفـاع لـە قـازانجی ئـابووری خۆیـان گرینگییـەکی نـوێی تایبـەت بـەخۆی پەیداکردوە. مسوگەرکردنی گەشەو خۆشگوزرانی [رفاه] ئـابووری پێویـستی بـە بەشـداری‌کردنی هەرچـی زۆرتر لە بازرگانیی جیهانی‌و سیاسەتدانان‌و بڕیاردانەرکانی پێویست لەم بوارەدایـە. پاراسـتنی پرستیژو ئابروی نەتەوەییش بەشێك لە ئامانجە گرینگەکانی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکانە. لـە چاخی پێوەندیە بەربڵاوەکانی [Communication] لەو رۆژگارەدا "سیما سـازی" زۆر گرینگـە. کـەوابوو هەوڵـدان بـۆ پێکهێنـان‌و پاراسـتنی "سـیما"ی‌پیرۆزکـراو لـە وڵات لـە سیاسەتدانانی دەرەوەی وڵاتەکاندا هەموو کـات لەبـەر چـاو بـوە. سـەبارەت بـە پەرەپێـدانی دەسەڵاتی نەتەوەیش لە سەردەمی ئێستادا سەرچاوەکانی دەسـەڵات لەچاو رابردوو جوراوجـورتر بوون. کولتور، زمان‌و پێوەندیەکان وەك سەرچاوەی دەسەڵات حیسابیان بـۆ دەکـرێ. هـەروەها گرەنتی ئاسـایشی نەتەوەیی‌و راویستان لە بەرانبەر ئەگەری مەترسیەکان لـە پلـەی یەکـەمی ئەولەویەتەکانی دەوڵەتەکانی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتـەکان جێی‌گرتـوە. بەڵـە بـەر چـاوگرتنی لاوازی دامـەزراوە نیونەتوەییـەکان بۆ گرتنیی ئاسایشی وڵاتەکان، ئـەوان بـۆ خۆیـان لەرێگـەی پەیمان‌و گرێبەستەکان، گرتنی هەڵوێستی بێلایەنانە، پەرەپێدانی توانایی سەربازی‌و ئامـادەیی بۆ شەڕ بە مەبەستی گرتنی ئاشتی، بۆ دابینکردنی ئەمن‌و ئاسـایشی خۆیان تێدەکۆشن.

دیارە بۆ بەرێوەبردنی سیاسەتی دەرەوە، دەسـت پێڕاگەیـشتن بـە سەرچـاوەکانی دەسـەڵات پێویستە، هۆکارگەلێکی جوراوجور لە بەهێزی‌و دەسەڵاتی دەوڵەتەکان لـەم بـارەوە کاریگـەرن

وەك: سامانی نەتەوەیی، رادەی حەشیمەت، هەلکەوت و بەرینی جۆغرافیایی سەرچاوە سروشتیەکان، سەرچاوەکانی سووتەمەنی، [ئینەرژی] رادەو چەشنی پیشەسازی نەتەوەیی، بەربلاوی سیستمی گواستنەوەو گەیاندن و پێوەندیەکان، جۆرەکانی، چەك وچۆل و رادەکەی، ژمارەو چلونایەتی هێزە چەکدارەکان، رادەی پشتیوانی کومەلایەتی لەنێوخۆ لە سیاسەتەکانی دەرەوەو ... هتد. سەرچاوەی دەسەلاتی دەولەتەکان دیارە بەپێی تێپەربوونی زەمان گۆرانی بەسەر دادێ. هەروەها دەبێ لەبیر نەچی کە لە زانستی سیاسی دا دەسەلات لە بناخەدا چەندایەتی نیە، بەلکوو پێوەندیەکە لە نێوان یاریکەراندا. کەوابوو دەسەلاتی هەریاریکەرێك لە ئاستی نیونەتەوەیی‌دا تەنیا بەسەرنجدان بە چەندی‌و چۆنی سەرچاوەی دەسەلاتەکەی نیە بەلکوو بە هەلسەنگاندن لەگەل سەرچاوەی دەسەلاتی یاریکەرانی دیکەشدا مەزندە دەکرێ. لەگەل ئەوەش دیارە پسپۆری‌و لێهاتوویی کاربەدەستان لە کەلك وەرگرتنی لە بارتر لەسەرچاوەکانی ئامادە بۆ دەست پێراگەیشتن بە ئامانجەکان دەبێ لەبەر چاو بگیردرێ.

بڕیاردەران لە بیاڤی سیاسەتی دەرەوەدا، هەروەك لە تیئوری بڕیارداندا وتمان، لە بڕیاراتی خۆیاندا دەکەونە ژێرکاریگەری هۆکارە جوراوجورەکانی نێوخۆیی‌و نێونەتەوەیی، لەنێوخۆ گرووپەدەست رۆیشتوەکان، حیزبەکان، کاربەدەستە پایەبەرزەکان لەنێو دەسەلاتەکاندا [بەرێوەبەری، یاسادانان، دادوەری]و هەروەها بیروڕای گشتیش لەوانەیە سنووری بڕیاردانەکە دیاری بکەن.

لە رێژیمە نادێموکراتیکەکاندا، ئوتوکراسیەکان‌و توتالیتاریەکان سەرچاوەی سەرەکی بڕیاردان دەگەرێتەوە بۆ کەسایەتی بە دەسەلات یانی گرووپی بەدەسەلات. هەروەها رۆل‌و نەخشی سپاو وەزارەتی دیفاع لە زۆر بواردا بەرچاوە. لە لایەکی دیکەوە بڕیاردەران دیارە دەکەونە ژێر کاریگەری کەش‌و هەوای نێونەتەوەیی‌و هەلس‌وکەوت‌و سیاسەتی دەولەتەکانی دیکە. بەشێکی بەرچاو لە هەلوێستە سیاسیەکانی دەرەوە، نەکردەوە، بەلکوو دژکردەوەیە بە کێشەکان‌و هەلس‌وکەوتە نێونەتەوەییەکان، بە ڕوودانی شەڕەکان، دەولەتەکان ناچارن هەلوێستی دەرەوەی خۆیان سەبارەت بەوانە روون بکەنەوە.

رادەی زانیاری پێویست بۆ بڕیاردان لە سیاسەتی دەرەوەدا دیارە زۆر گرینگە. بەو رادەیەکە زانیاری لە هەلوێست‌و کرداری چاوەروانکراوی دەولەتەکانی دیکە زۆرتر بێ، بڕیاردان ساناتر دەبێ. بەو حالەش لەو زەمینەشدا وەك لە زەمینەکانی دیکەدا بڕیاردەران هیچکات هەموو

ئەو زانیارانە کە پێویستییان پێی دەبێ بە دەستی ناهێنن‌و جاری وا هەیە بڕیاردان پێویستی بە ریسك كردن هەیەو لەسەر هەڵسەنگاندی کەسایەتی بڕیارەر لەسەر زانیاریە بەردەستەکاندایە. دیارە لەم نێوەدا نەخشی دەزگا زانیاریەکانی دەوڵەتەکان لە کۆکردنەوەی ئاگاداریی‌یەکان لەسەر سەرچاوەکانی دەسەڵات‌و ئامرازی دەوڵەتەکانی دیکە گرینگی‌یەکی تایبەتی هەیە.

دیارە بڕیاربەدەستەکان دەبێ لە پێشدا هەڵسەنگاندنێك لە ئیمکاناتی نێوخۆیی بۆ بردنە پێشی سیاسەتەکانی دەرەوە تاووتوو بکەن‌و بەتایبەت ئیمکاناتەکان لە ئاستی نیونەتەوەیی دا دامەزندە بکەن. بەپێی جۆری سیاسەتی دەرەوەی پەسەندکراو، ئیمکانات‌و تواناکانی نەتەوەیی قورسایی‌و بایەخی جوراوجور پەیدا دەکەن. دەست نیشانکردنی سیاسەتی دەرەوە لە بوارەکانی فەرهەنگی، ئابووری، سیاسی‌و ... هتد پێویستی بە مەزندەکردنی سەرچاوەکانی پێوەندی دار لە هەر بیاڤێك دا [حوزە] بەوردی‌و روونی هەیە.

بەڕێوەبردنی سیاسەتی دەرەوە نیازی بە بەکارهێنانی ئامرازی جوراوجورە. ئامرازی سیاسی بریتین لە وتووێژی فەرمی، بەستنی پەیماننامە، دامەزراندنی پێوەندی یان پچرانی پێوەندی، راگەیاندنی پشتیوانی سیاسی لە ولاتەکان، راگەیاندنی بێ‌لایەنی‌و شتی لەو بابەتانەیە.

ئامرازەکانی ئابووری‌و دارایی بریتین لە دانی یارمەتی مالیی، سەرمایەگوزاری، دامەرزاندنی پێوەندی بازەرگانی لەسەر بنەمای دەوڵەتی "کاملة الوداد"، گەماروی ئابووری، بەستنی پەیماننامەی بازرگانی‌و ... هتد دەبێ، ئامرازەکانی سەربازی بریتین لە بەستنی پەیماننامەی سەربازی، پەنابردن بۆ شەڕ، دەست تێوەردانی سەربازی لە کاروباری ولاتەکانی دیکە، ناردنی چەك‌وچۆڵ‌و ... هتد.

## هەندێك تێروانین لە سیاسەتی دەرەوەدا

بڕیاربەدەستان لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا لەوانەیە وەشوێن ئامانجی جوراوجور بکەون. هەروەك لە باسی تێگەیشتنەکانی جیاواز لە سیاسەت بەگشتی دیتمان، لەوانەیە مەبەستی سیاسەتوانانو کاربەدەستان هەر پاراستنی دەسەلاتو قازانجە جێگیر بوەکان بە هەر نرخێك بێو یان لەوانەیە سیاسەت وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە مەبەستی گەورەتر چاولێبکەن، لە سیاسەتی دەرەوەشدا بیر لە بۆچوونی جوراوجور دەکرێتەوە. بۆچوونی واقیعگەرایانە یان قازانج خوازانەو بۆچوونی ئارمانج خوازانە دوو بۆچوونی زاڵ لەم بوارەکان دان.

لە بۆچوونی واقیعگەرایانە یان نەتەوەیی دا لەسەر دابینکردنی بەرژەوەندیی نەتەوەییدا بە هەر نرخێك پێ دادەگیردرێو ئەمەش بۆخۆی پێویستی بەدەست پێڕاگەیشتن بە لانی زۆری سەرچاوەکانی دەسەلاتە. هەر بۆیە لە بۆچوونی واقیعگەرایانەدا دەسەلات کێشەی سەرەکی یە. بە بێ دەسەلات ناتوانرێ قازانجی نەتەوەیی دابین بکرێ، لە بەرانبەردا ئارمانج خوازی لە جیاتی دەسەلات، لەسەر یاسای نێونەتەوەییو فورمو بەها ئەخلاقییەکان پێ دادەگرێو پێی وایە لەوەها روانگەیەکەوە دەکرێ هاوکاریو ئاشتی لە ئاستی نێونەتەوەییدا بچێتەپێشو ئەمەبۆخۆی لە نیهایەتدا بە قازانجی هەموو دەوڵەتەکانە. بە بۆچوونی ئارمانج خوازان تێروانینی دەسەلاتخوازانە، تەنیا لە کورتخایەندا قازانجی نەتەوەیی دابین دەکا، لە کاتێکدا کە پشت بەستن بە مافو یاساو بەهاکان، پشتیوانی نێونەتەوەیی بەردەوام بۆ دەوڵەتی مەبەست پێك دەهێنێ.

لە روانگەی پاراستنی کاریگەری بارودۆخی نێونەتەوەیی لە رێگای سیاسەتی دەرەوەیش دوو روانگە هاتوەتە گۆڕ: یەکێك روانگەی پارێزگارانە Conservatively کە مەبەستی ڕاگرتنو پاراستنی بارودۆخی لە ئارای [ موجود] نێونەتەوەیی لە هەر بارێکەوەیە. دیارە ئەو دەوڵەتانە کە خاوەن دەسەلاتێکی بەهێز لە ئاستی نێونەتەوەیی دان، وەها روانگەیەکیان زیاتر لەلا پەسەندە. لەم بۆچوونەدا لەسەر پیشگیری لە شەڕو ناکۆکییەکانو پەرەسەندیان، درێژەدان بە پێوەندی دیپلوماتیکی ئاسایی،و لەبەر چاوگرتنی یاساو نەریتی نێونەتەوەی پێدا دەگیردری.

روانینی دووهەم روانینێکی شۆڕشگێرانە یان رادیکاڵە کە لەودا سیاسەتی دەرەوە وەك ئامرازێك بۆ پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لە سیستمی نێونەتەوەییداو لە لایەنی جوراوجور لێك

دەدرێتەوە. ئەم روانینە زۆرجار بەهۆی ئەو دەوڵەتانەوە دێتە ئاراوە کە خۆیان لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا بەلاواز یان زوڵم لێکراوو چەوساوەو بێ بەشکراو دەزانن‌و دەیانەوێ بارودۆخەکە بە قازانجی خۆیان بگۆڕن. لەم بۆچوونەدا لەسەر بەهێزکردنی رێکخراوو بزووتنەوەکانی دژی سیستمی نێونەتەوەیی بە مەبەستی تێکدانی سەقامگیر یەکەی پێدادەگیرێ‌و یاساو نورمەکانی نێونەتەوەیی ئامرازی دەسەڵاتی دەوڵەتە بەهێزەکان بە حیساب دێن. وەها روانینێك زۆرجار پۆتانسیلی کێشە نێونەتەوەییەکان‌و ئەگەری روودانی شەڕەکان بەهێز دەکا.

یەکێك لە دەرئەنجامەکانی سیاسەتی دەرەوەی رادیکال‌و دژی بارودۆخی حازر، ئەگەری سەرهەڵدانی سیستمی هاوسەنگی [موزانە] هێزەکانە کە لەودا کومەڵێك لە دەوڵەتەکان بەدژی دەوڵەتەکانی دیکە یەك دەگرن‌و دەست دەدەنە دەستی یەکتر. مەبەستی ئەم سیستمە پێکهێنانی هاوسەنگی‌و موازنەی دەسەڵات بە مەبەستی دابینکردنی قازانجی نەتەوەیی خۆی بەلانی زۆری گونجاوە. بەم هۆیەش وەها سیستمێك بەپێی بیرکردنەوەی دەوڵەتەکان لە قازانجی نەتەوەیی خۆیدا، تووشی گۆڕان‌و هەڵکشان‌و داکشان [نوسان] دەبێ. سیستمی هاوسەنگی دەسەڵات لەوانەیە بۆخۆی قەوارەو شێوەی گرفتی جوراوجوری ببێ. لە هاوسەنگی دەسەڵاتی چەند لایەنەدا بەشێوەیەك تا پێش لە شەڕی جیهانی دووهەم لە ئورووپا جیگرتوو بوو، تێکەڵیەکی جوراوجور لە پێنج دەسەڵاتی گەورەی ئورووپایی بناخەی هاوسەنگی هێزەکان‌و هۆکاری بالانس‌و نەرمکێشی لە پێوەندیەکانیاندا بوون. لە بەرانبەردا هاوسەنگی دەسەڵات بەشێوەی سادەو بەسیت یان دوولایەنە بەو جۆرەی لە ماوەی شەڕی سارد لە نێوان ئەمریکاو یەکیەتی سۆڤیەت سەریهەڵدا، نەرمکێشی کەم دەبێتەوە. سیستمی هاوسەنگی دووجەمسەری دەبێتە هۆی ئەوە کە ئارمی دەوڵەتەکان ببەسرێتەوە بە کێبەرکێی سەربازی‌و سیاسی نێوان دوو جەمسەرە سەرەکیەکەو دەوڵەتە بێلایەنەکان بەشێوەیەکی روو لە گەشە خۆیان لە بارودۆخێکدا دەبینن کە دەبێ لە یەکێك لە دوو جەمسەرەکە نزیك ببنەوە. بە تەواوبوونی شەڕی سارد پاش رووخانی یەکیەتیی شوڤیەت ئوگرییەکی زۆر بۆ هاوسەنگی دەسەڵاتی چەند لایەنەو نەرمکێشی دەرکەوتوە.

## ریزبەندی دەسەڵاتی دەوڵەتەکان لە ئاستی نێونەتەوەیی دا

دەوڵەتەکان بەشێوەی جوراوجور لە پێوەندی لەگەڵ یەکتردا، بۆ دابینکردنی قازانجی نەتەوەیی خۆیان سەرچاوەی دەسەڵاتەکانیان رێك دەخەن. لە ئاکامدا ریزبەندیو پێوەندی دەسەڵاتی جوراوجور لە نێوانیاندا سەرهەڵ دەداو شێوەگەلی جیاواز لە کێبەرکێی یان هاوکاری پەیدا دەبێ. بەو بۆنەوە کە دەوڵەتەکان لە ئاستی نێونەتەوەیی دا هەموویان خاوەن دەسەڵاتداریەتین [حاکمیت]، هەرکام لەوانەیە بۆ ئەوەی دیکە بە هەڕەشەیەك بژمێردرێ. لە ئاکامدا دەوڵەتەکان دەبێ بە یەکخستنی ریزبەندیو بە نموونە وەرگرتنی دەسەڵاتێکی تایبەت لە ئاستی نێونەتەوەیی‌دا خۆی لە بەرانبەر هەڕەشەکان بپارێزێ. هەڵبژاردنی هەرکام لەم نموونەو ئولگویانە بەستراوەتەوە بە روانگەی دەوڵەتەکان سەبارەت بە قازانجی نەتەوەیی خۆیان، هەڵسەنگاندنی ئەوانە لەسەر چاوەکانی دەسەڵاتی خۆیانو سەرچاوەکانی دەسەڵاتو ئەگەری مەترسی دەوڵەتەکانی دیکە.

لە ئاکامدا دەوڵەتەکان لەوانەیە بچنە نێوجۆرەها لە پەیمانگەلی سەربازی یا سیستمەکانی ئەمنی بەکۆمەڵ. مەبەستی سەرەکی دابینکردنی ئارامی [امنیت] نەتەوەیی بە مەبەستی بەدواچوونی قازانجی نەتەوەیی‌یە. مەبەست لە پێکهێنانی پەیمانو یەکیەتیەکان بردنەسەری دەسەڵاتی نەتەوەیی بە تێکەڵ بوون لەگەڵ دەسەڵاتەکانی دیکەیە. زۆرجار پێکهاتنی هەر پەیمانێك، پەیمانگەلی دیکەش بەدوای خۆدادێنێ. هەربۆیە هەندێك لە رەخنەگران، پێکهێنانی پەیمانەکان لە نیهایەتدا بە دابینکەری قازانجی دەوڵەتەکانو ئاشتیو ئارامی ئەوان نازانن، بەڵکوو وەك هۆکارێك لە توندکردنی‌موناقسەکانو پێکهێنانی نائارامیو شەڕ لە ئاستێکی گەورەتردا لێك دەدەنەوە. لە ماوەی شەڕی سارددا، رێکخراوی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری (ناتو)و پەیمانی وەرشەو لەو بیچمە پەیمانانە بوون.

بە پێچەوانەوە، مەیل بۆلای پەیمانەکانی ئارامی بەکۆمەڵ لە ئاستی جیهانی دا، پێویستی بە پەیمانە سنووردارو بەرتەسکەکانو مەترسیەکانیان کەم دەکاتەوە. لە پەیمانگەلی ئارامی بەکۆمەڵ لە ئاستی جیهانی‌دا، هەموو دەوڵەتەکان ئارامیو سەربەخۆیی یەکتر لە بەرانبەر یەکتردا دەستەبەر دەکەن. بەپێی ئەم پەیمانانە هەر دەوڵەتێکی هێرشبەر، لەگەڵ دژکردەوەی هەموو ئەندامەکانی بەرورووو دەبێ. گرینگترین پەیمانی ئارامی بەکۆمەڵ بەڵێنامە [میثاق] کومەڵگای نەتەوەکانو راگەیاندراوی [منشور] رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بوون. دیارە

بە کردەوە هیچکات ئارامی دەستەجەمی بە مانای جیهانیەکەی نەهاتوەتەدیو زۆرجار دەوڵەتەکان پشت بە پەیمانی چەند لایەنە دەبەستن.

هەروەها دەوڵەتەکان لەوانەیە لە کێشەی دابینکردنی ئارامیو دەست پێڕاگەیشتن بە قازانجی نەتەوەیی خۆی، هەر پشت بە سەرچاوەکانی دەسەڵاتی خۆی ببەستێ. ئەم روانینە لەوانەیە بەشێوەی نەریکخوازی، بێلایەنی، نەبەستراوەیی بە هیچ پەیمانێك [ عدم تعهد]و ... هتد خۆبنوێنێ. دیارە لەو رۆژگارەدا وەها رەوشو تێروانینی بەهۆی پێشکەوتن لە تکنیکی سەربازی، پێوەندیەکانو بوونی هەندێك پەیمانو یەکیەتیەکان، دژوار بو.

## شەڕ

لە روانگەی یاساییەوە، لە ئارادابوونی شەڕ نێوان دوو دەوڵەت یان چەند دەوڵەت کاتێك روو دەدا کە ئەو وڵاتانە بە فەرمی حاڵەتی شەڕ لە نێوان خۆیاندا رابگەیەنن. ئاستی شەڕ لەوانەیە بێسنوورو بەربڵاو بێ، واتا لە هەموو جۆرەکانی کەرەسەی شەڕ کەڵك وەربگرنو یان بەرتەسك بێو لەودا تەنیا هێزەکانو چەکە ئاساییەکان تێی دابەشدارین. بەپێی ئامانجەکانی شەڕەکە لەوانەیە تێکشکاندنو رووخانی حکومەتی یەك وڵات بەهۆی وڵاتێکی دیکە لەبەر چاو بێو یان ئامانجێکی سنووردارتر وەك گۆڕینی هێڵی سنووری مەبەست بێ.

شەڕ وەك دیاردەیەکی چەند روخسارەو ئاڵۆز، لە لایەنی جوراوجورەوە کەوتوەتە بەرباس. لە دوورە دیەنێکی گشتییدا باس لە هۆکارو زەمینەکانو پرۆسەو دەرئەنجامەکانی شەڕ گرینگترین باسەکان بەخۆیەوە تەرخان دەکا. لە بواری هۆکارەکان دەبێ لە هۆکاری سیاسی وەك رکەبەری لەسەر سەرچاوەکانو سەرزەمینەکان، هۆکاری ئایدولوژیو هزریو هۆکاری ئابووری شەڕ، قسەکراوە. لێکدانەوەی رەوتی شەڕەکان لە بارەی تاکتیکەکان، ستراتژیەکان، ئامانجەکان، ئامرازو کەرەسەکانو ... هتد لە باسە گرینگەکانی شەڕن. هەروەها باس سەبارەت بە دەرئەنجامی سیاسی، نێونەتەوەیی، کومەڵایەتی، ئەخلاقیو ئابووری شەڕەکان گرینگیەکی سەرەکیان هەیە لەگەڵ ئەوەش شەڕەکان لە روانگەی یاسایی، کومەڵناس، مێژوویيو زانستەکانو تکنیکی سەربازی دیراسە کراون.

باسە زانستیەکان سەبارەت بە هۆکاری شەڕەکان باسگەلێکی ئالۆزن کە لەواندا هۆکاری کورتخاینو درێژخایەن، هۆکاری پێکهاتەییو مێژوویی‌و هۆکارەکانی زەینی‌و عەینی لە یەك جیا دەکرێنەوە.

لێکدانەوەی شەڕو هۆکارەکانی لە روانگەگەلێکی جوراوجور باس کراون، مارکسیستەکان لە لێکدانەوەی شەڕەکانی ئەم دوایی یانەی سەردەمی مودیرندا، سیستمی ئابووری سەرمایەداری بە هۆکاری سەرەکی شەڕەکان دەزانن. لە روانگەی ئەوانەوە لەگەڵ چەوساندنەوەی رو لە زیادیی چینی کرێکار، بازارە نێوخۆیی‌یەکان تووشی کەساتی دەبن‌و سەرمایەدارەکان بە مەبەستی دۆزینەوەی بازارە جیهانیەکان دەست دەکەن بە کردەوەی ئیمپریالیستی‌و داگیرکەرانە [توسعە طلبانە]. لینن لە کتێبی ئیمپریالسم، لوتکەی قۆناغی سەرمایەداری بەڵگەی هێناوەتەوە کە داگیرکاری سەرمایەداری سەرەتا شەڕی ئیمپریالیتی بە مەبەستی داگیرکردنی سەرزەمینی گەلی گەشە نەسەندوو [توسعە نیافتە]و پاشان شەڕی نێوخۆیی دەوڵەتەکانی سەرمایەداری لێ‌دەکەوێتەوە.

لە بەرانبەردا ئابووری زانانی لیبرال وەك ئادام ئیسمیت‌و جان ئیستوارت میل بەڵگەیان هێناوەتەوە کە کێبەرکێی ئابووری ئازاد زەمینەی ئاشتی‌و ئارامی پێك دەهێنێ. بازارگانی دەبێتە هۆی روحیەی نەرمکێشی‌و پێکەوە ژیان‌و دیالوگو لەو بوارەدا تێبینیە سیاسی‌و ئایدولوژیەکان جێی خۆیان دەدەن بە تێبینیە کرداریەکان. لە روانگەی ئەوانەوە لە ئاستی نێونەتەوەیدا بازرگانی‌و تیجارەتی ئازاد هەم دەبێتە هۆی دابەش بوونی نێونەتەوەیی کارو هەم لەگەڵ شەڕ کە زۆرجار لە گەڕانی سروشتتی سەرمایە پێشگیری دەکا، ناتەبایی هەیە. بازەرگانی ئازاد بە پیشێنەیی‌و وردە وردە زیهنیەتی ئابووری دەنێتە جێی زیهنێەتی سەربازی‌و ئایدولوژیك‌و ئەگەری روودانی شەڕ کەم دەکاتەوە. بە بۆچوونی ئابووری زانایانی لیبرال دەست تێوەردانی دەوڵەت لە کاروباری ئابووری‌و دانانی باجی پشتیوانی‌و هەوڵی دیکە، بەرگری لە بازەرگانی ئازاد دەکاو زۆرجار زەمینە بۆ کێبەرکێ ئابووری‌و سەربازی دەوڵەتەکان ئامادە دەکا. هەر بۆیە روانگەی هربرت ئیسپینسر وڵاتەکانی بە سەر دوو تاقمدا دابەش دەکرد. وڵاتانی "پیشەسازی" بە ئابووریەکی ئازاد کە مەیلیان بۆلای ئاشتی‌یەو وڵاتانی "سەربازی" بە ئابووریەکی دەوڵەتی مەیلیان بە شەڕە. یەکێك لە نووسەرەکانی ئەم دوایانە بە ناوی کوئینسی رایت، لە کتێبی دیراسەی شەڕ (١٩٦٥) بەڵگەی هێنانەوەتەوە کە

کومەڵگاکان بە هەر چەشنە سیستمێکی سیاسییەوە لە عەشیرەیەوە بگرە تا زراعی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەدارانەو کومونیستی تووشی شەڕ بوون، بەڵام بەپێی زانیاری ئاماریو مێژوویی سیستمی ئابووری سەرمایەداری کەمتر لە سیستمەکانی دیکە شەڕخوازبووە، هەر چەند بە هۆی جۆری چەك‌وچۆڵ، شەڕەکانی سیستمی سەرمایەدارانە خونیاویترو مەرگهێنەرتر بوون. نووسەرانی دیکە هەر لەم بوارەدا بەڵگەیان هێناوەتەوە کە شەڕەکان بە زۆری بە هۆی گومانەکانی ناعەقلانیو ترس‌و خەیاڵن. لە بەرانبەردا بەو رادەیەکە عەقڵی ئابووری پەرەبسێنێ، دژایەتی لەگەڵ شەڕو توندوتیژی دەچێتە سەر.

هەندێك لە نووسەرانی ئەم دوایانە وەك لوئیس ریچاردسون لە کتێبی ئاماری شەڕە خوێناویەکان (١٩٦٠) روونیان کردوەتەوە کە هۆکاری ئابووری نەخشێکی وای لە هەڵگیرساندنی شەڕەکاندا نەبوە. نووسەری ناوبراو بە لێکدانەوەی ئەو شەڕانە کە لە ماوەی ١٨٢٠ تا ١٩٤٩ روویان داوە بەو ئاکامە گەیشتوە کە هۆکاری ئابووری نزیك بە ٢٩٪ لە شەڕەکان نەخشی راستەوخۆی بوەو ئەم شەڕانەش زۆرتر شەڕی بچووك‌و بەرتەسك بوون. لە لێکدانەوەکەی ئەودا هۆکارەکانی خوارەوە وەك هۆکاری ئابووری شەڕ ناوبراون:

دانانی باج لەسەر سەرزەوینە داگیرکراوەکان [مستعمره]، یارمەتی ئابووری بە دوژمنانی ولاتێك، پێك هێنانی کوسپ لەسەر رێی بازەرگانیو گواستنەوەی سەرمایەو نارەزایەتیی ماڵیی سۆیا. لە لایەکی دیکەوە لە روانگەی نووسەرەوە داواکاریە ماڵیە گەورەکان زۆرجار لە رێگای دیپلۆماسیو نێوبژیوانی چارەسەر بوون.

هۆکارەکانی شەڕ لە روانگەی دەروونناسیشەوە خراوەتە بەر لێکۆڵینەوە. نووسەرانێ: وەك زیعل، لاسوال‌و ئەریش فروم نەخشی هۆکارگەلێکی دەروونناسانە وەك سەرنەکەوتوویی، یەکسان سازی، پەل هاویشتن [فرافکنی] ترس‌و دڵەڕاوکێ لە لەسەرهەڵدانی شەڕەکان‌و توندوتیژیدا لێك دراونەتەوە. بڕیاردەرانی سیاسیش وەك مرۆڤی ئاسایی لەوانەیە بکەونە ژێرفشاری وەها هۆکارگەلێك. بڕیاربەدەستان زۆرجار دەکەونە ژێر کاریگەری ویستگەلێکی ناعەقلانیو نەخوازراوەوە. وەها سەرمەدێك [انگیزه] لەوانەیە لە هەل‌ومەرجی جوراوجوردا وەك قەیران‌و شەڕەکان‌و هەست بە خۆ بەکەم زانینی نەتەوەیی، بەهێزو چالاك ببێ.

## یاسای شەڕ

یاسای شەڕ واتا ئەو ڕێوشوێن‌و ریسایانە کە دەبێ بەسەر کردەوەی لایەنەکانی شەڕکەردا زاڵ بێ، لە سەرەتادا وەك داب‌و نەریت وابوو، بەڵام لە کۆتاییەکانی سەدەی نوزدەهەمەوە چەندین پەیماننامەی نێونەتەوەیی چەند لایەنە بوونە بناغەیەك بۆ هاتنەکایەی یاسای شەڕ. یەك لەوانە دەبێ لە کونوانسیونی [ Convention ] پاریس ڕێکەوتی ١٨٥٦ سەبارەت بە سنووردار کردنی شەڕی دەریایی، کونوانسیونی ژنو ڕێکەوتی ١٨٦٤ سەبارەت بە کرداری مرۆڤدۆستانە لەگەڵ بریندارەکانی شەڕ، کوانسیونی لاهە ڕێکەوتی ١٨٩٩ سەبارەت بە یاساو ریسای شەڕی زەوینی، کونوانسیونی لاهە ڕێکەوتی ١٩٠٧ سەبارەت بە ماف‌و ئەرکی دەوڵەتە شەڕکەرەکان‌و بێلایەنەکان، کونوانسیونەکانی ژنو ڕێکەوتی ١٩٢٩ سەبارەت بە هەڵس‌وکەوتی مرۆڤدۆستانە لەگەڵ دیلەکانی شەڕ، پروتوکولی لەندن ڕێکەوتی ١٩٣٦ سەبارەت بە بەرتەسك کردنەوەی بەکارهێنانی ژێر دەریایەکان‌و کونوانسیونی ژنو ڕێکەوتی ١٩٤٩ سەبارەت بە کامل کردنی یاساو ریساکانی چاوەدیری بەسەر هەڵس‌وکەوت لەگەڵ دیل‌و بریندارەکانی شەڕ، ناوبرێ. مەبەست لە دانانی یاسای شەڕ ئەوەبوو کە لەبەر ئەوەی لەوانەیە نەکرێ شەڕ لە کومەڵگای مروڤایەتی دووربخرێتەوەو بە تەواوی لەنێو ببردرێ لانی کەم شەڕەکە بکەوێتە ژێر رکیفی هەندێك ڕێوشوێنی هەڵس‌وکەوتی عادیلانە.

## هەندێك لە جۆرەکانی شەڕ

**شەڕی هەمە لایەنەو بێ سنوور:** [تام عیار] شەڕێکە کە لەودا لە هەموو کەرەسەو ئامرازو سەرچاوەکانی دەسەڵات بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی بێسنوورەکانی شەڕ کەڵك وەردەگیرێ. لەم چەشنە شەڕەدا هەموو حەشیمەت دەهروژێنرێت [بسیج] شوێنە ناسەربازیەکان دەکەونە بەرهێرش، لە هەموو جۆرەکانی چەك‌وچۆڵی مودێرن کەڵك وەردەگیرێ، یاساکانی شەڕ زۆرجار دەخرێتە ژێر پێ، خەسڵەتی ئایدولوژیکی شەڕ بەشێوەیەکی روو لە پەرەگرتن دەچێتە سەرو لایەنەکانی خوازیاری تەسلیم بوونی بە بێ مەرجی یەکتر دەبن. شەڕەکانی جیهانی یەکەم‌و دووهەم شەڕی هەمەلایەنە [تام عیار] بوون.

**شەڕی بەرتەسك:** شەڕی سنوودارو بەرتەسك، وێرانکردنی سەربازی‌و یان چەك پێ دادنان، مەرجی لایەنەکەی دیکە نیە. بەرتەسکی ئەم جۆرە شەڕە لەوانەیە لە جۆری چەك‌وچۆڵی کەڵك

لێوەرگیراو، ژمارەی سەربازەکان، پانتایی مەیدانی شەڕ، یان ئامانجگەلێکی سنووردارو دیاری کراودا بێ.

کەڵك وەرنەگرتن لە چەکەناوەکیەکان بەهۆی ئەو دەوڵەتانە کە خاوەنی وەها چەکێکن، هێرش نەکردنە سەر ئامانجە ناسەربازیەکان، ڕوودانی شەڕ لە نێوان دەوڵەتە بچووکەکان بە بێدەست تێوەردانی دەوڵەتە گەورەکانو ڕوودانی شەڕ لە ناوچە جوغرافیایە دیاری کراوو بەرتەسك بە شەڕی سنووردارو بەرتەسك دەناسرێ لە سەردەمی ئێستادا مەترسی بەکار هێنانی چەکی ناوکی، دەوڵەتەکان ناچار دەکا شەڕەکان بەرتەسكو سنووردار بکەنەوە. لە شەڕی ویتنام، ئەمریکا، یەکیەتی سوڤیەتو چین هەرسێ لە گۆڕانی شەڕی بەرتەسك بە شەڕی بێسنوورو هەمەلایەنە خۆیان دەپاراست. شەڕی بەرتەسك لەوانەیە لە لایەنی جوراوجورەوە پەرەبستێنێ: وەك زۆرکردنی ژمارەی سەربازەکان، هاتنی ولاتانی دیکە بۆنێو شەڕەکە، پەرەپێدانی مەیدانو پانتایی جوغرافیایی شەڕەکە، کەڵك وەرگرتن لە چەكوچۆڵی ماڵ وێرانکەرو بەربڵاوکردنی ئامانجەکانی شەڕ.

**شەڕی سارد:** بارودۆخی شەڕی ئایدولوژیكو شەڕی نەفسیو کێبەرکێێ ئابووری، سیاسیو سەربازی نێوان دوو جەمسەری ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات پاش شەڕی دووهەمی جیهانی بە شەڕی سارد ناودەبرا. ریشەکانی شەڕی سارد دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنو تەشەنەی کومونیزمی رووسی بۆ ئۆروپای ڕۆژهەلاتی، شەڕ لەسەر دابەشکردنی ئالمانو دەرکەوتنی هاوسەنگی دەسەلاتێکی نوێ دوای شەڕی دووهەم. شەڕی سارد لە جیاتی بۆشایی دەسەلاتو سەرلێشێواوی بەهۆی تێك شکانو پارچە پارچە بوونو دارزینی دەوڵەتەکانی پاش شەڕی دووهەمی جیهانی چاودیری دەسەلاتی دووجەمسەرییەکی درێژخایەنی هێناکایەوەو بۆخۆی بەهۆی ئەو سیستمەوە توندتر بوو. پاش تێپەڕینی نزیك بە پانزدە ساڵ هۆکارگەلێك بوونە سەبەب بۆ کزکردنی بارودۆخی شەڕی سارد، یەك لەوانە چاوخشاندنەوەخوازی بەسەر ئایدولوژی کومونیسمی رووسیو بەرینتربوونەوەی کەلێنو کێبەرکێ لەنێو بلووکی [ bloc ] کومونیزمدا لەم بوارەدا کاریگەر بوون.

**شەڕی پێشگیرانە:** شەڕی پێشگیرانە بۆ کردەوەی سەربازی ولاتانێك بە کاردەبرێ کە بۆ پێشگیری لە کردەوەی سەربازیو ئەگەری هێرشی دوژمنەکانی خۆی، دەست پێشخەری دەکەنو

کوت‌وپڕ هێرش دەکەن تا هێزی سەربازی روو لە گەشەی ئەوانەی کە پێیان وایە هەرەشەن بۆ سەریان تێك بشکێنن.

**شەڕی نەفسی:** کۆمەڵێك کردەوەی سیاسی‌و ئابووری کە لە ماوەی شەڕ یان شەڕی سارد بۆ رووخانی ورەی دوژمنەکان بەکاردەبرێ‌و دەبێتە هۆی بەهێزی سەربازەکان‌و خەڵکی ئاسایی ئەو وڵاتە کە بەو کارە هەڵدەستێ، پێی دەڵێن شەڕی نەفسی ئامرازی گرینگیی شەڕی نەفسی پروپاگەندەو خەباتی ئایدولوژیك لە ڕێگای راگەیاندنی بە نووسراوەو بە دەنگە.

شەڕی نەفسی بیروڕای گشتیی دەکاتە ئامانج‌و مەبەستی پێك هێنانی بشێویی‌و گومان لە زەینی ئەو کەسانە دایە کە سەبارەت بە سیاسەتەکانی شەڕو دەرەوە بریار دەدەن.

## هەندێك لە کردەوەکانی شەڕ

یەکەم هنگاو راگەیاندنی بارودۆخی شەڕ لە نێوان دوو دەوڵەتدایە. بەپێێ کونوانسیونی لاهە رێکەوتی ١٩٠٧ دەوڵەتەکان پێش دەست پێکردنی شەڕ دەبێ مەبەستی خۆیان رابگەیەنن. بەڵام بەکردەوە ئەم بنەمایە [قاعدە] هەموو کاتەکان لەبەر چاو ناگیرێ. هەروەها دەبێ بارودۆخی نویی لە شەڕدا بوون بە ئاگاداری دەوڵەتە بێلایەنەکان بگەیەندرێ. یەکێکی دیکە لە هەنگاوەکانی شەڕ لە سەرەتاکاندا داگیرکردن‌و دەست بەسەردا گرتنی خاکی وڵاتی دیکەو دەست تێوەردان لە کاروباری نێوخۆی ئەو دایە. هەندێك پێیان وایە کە بەپێی هەل‌ومەرجێك ئەم دەست تێوەردانە رەوایە، یەك لەوانە ئەگەر دەوڵەتی دەست تێوەردەر بەپێی بەڵێنامەیەك خاوەن مافی دەست تێوەردان بێ. هەروەها ئەگەر بۆ بەرگری رەوا لە خۆی ئەو کارە بکاو هەروەها ئەگەر دەوڵەتی دەست تێوەردراو بەهۆی کردەوە هێرش بەرانە ئاشتی نێونەتەوەیی پێشێل کردبێ. زۆرجار دەستێوەردانی دەرەکی بەهۆی زهێنەرەکان‌و بۆ پاراستنی دەسەڵات‌و دەست رویشتوویی ئەوانە بەرێوە دەچێ. هەندێك جار دەستێوەردانی دەرەکی لایەنی تۆڵەسەندنەوەی هەیەو یان بە مەبەستی وەرگرتنەوەی قەرزە پێبەخشراوەکانە.

لە ماوەی شەڕی ساردا، دەستێوەردانی دەرەکی زۆرجار بە بیانووی ئایدولوژیکی بوە. بە تایبەت لە بارودۆخی شەڕی نێوخۆیی یان شۆرشگێڕانەدا کە هاوسەنگی هێزەکانی نێونەتەوەیی تێك دەدا، ئەگەری دەستێوردانی دەرەکی زیاد دەکا. هەرەشە سەبارەت بە دەسەڵاتداریەتی‌و هێزی دەوڵەتە گەورەکان لە بازنەی دەست رویشتویی ئەواندا زۆرجار دژکردەوەگەلێك هەڵ

دەخرێنێ‌و دەستێوەردانی بەکردەوەی لێ‌دەکەوێتەوە. لە ماوەی شەڕی ساردda، دەوڵەتەکانی ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکیەتی سۆڤیەت بەو هویانەی سەرەوە بەشێوەی جوراوجور لە کاروباری ولاتانی دیکەدا دەستیان وەرداوە.

یەکێکی دیکە لەو هەنگاوە باوانە کە هەڵ دەگیرێ گەمارۆی دەریایی یا زەمینی بۆ بەرگری لە هاتنی شت‌ومەك‌و خواردەمەنی بۆ دەوڵەتی دوژمنە. گەمارۆی دەریایی لە سەردەمانی ئاشتیشدا باوەو لەودا لە دەست پێڕاگەیشتنی گەمیەکان بۆ کەنارەکانی دوژمن پێشگیری دەگرێ. گەماروی زەوینیش لە ماوەی ئاشتیشدا روودەداو مەبەست ئەوەیە کە پێشگیری لە هاتووچۆو وگواستنەوەو گەیاندنی شت‌ومەك لە ولاتی جێی مەبەستە. وررووژاندنی هێزە سەربازیەکانیش یەکێك لە هەنگاوەکانی شەڕئەنگیزانەیە. بانك کردنەوەی هێزەکانی پاشەکەوت، داخستنی سنوورەکان، دەرکردنی شارومەندانی بێگانەو دانانی یاساو ریسای تایبەت بە قەدەغەکردنی هاتووچوو دەکەونە خانەی ئەو هەنگاوانە کە تایبەتن بە وررووژاندنی شەڕئەنگیزانە. کردەوەی تولەسەندنەوەی وەك دەست بە سەرداگرتنی دارایی‌و مولکی ولاتانی دیکە بەکردەوەی شەڕانە بە بێ‌پەنابردن بۆ شەڕ دەژمێردرێ.

## هەندێك ستراتژی سەربازی لە سەردەمی چەکە ناوکیەکاندا

ستراتژیگەلی سەربازی نوێ لە سەردەمی چەکە ناوکیەکاندا هاتوەتە ئاراوە. یەکێك لە ستراتژە گرینگەکان، ستراتیژی پێشگیرانەیە کە لەودا دەوڵەتێك یان کومەڵێك لە دەوڵەتەکان تێ‌دەکۆشن دەوڵەتەکانی دیکە لە بەدوادا چوونی سیاسەتە سەربازیەکان یان کردەوی شەڕانە بگیرنەوە. ستراتیژی پێشگیرانە بریتییە لە هەرەشە بە تولەسەندنەوە، بردنەسەری توانای سربازی لە بوارگەلی تایبەت‌و بەستنی پەیمان لەگەڵ دەوڵەتە دوستەکان. ستراتیژی پێشگیرانە کاتێك: سەردەکەوێ کە دەوڵەتەکانی دیکە هەرەشەکانی دەوڵەتی پێشگیر بە جیددی وەربگرن. سیاسەتی هاوسەنگی هێزو نارامی بەکۆمەڵ بەو ماناکە باسکرا بەستراوەتەوە بە ستراتیژی پێشگیرانە. لە هەردوو بابەتدا دەوڵەتێك کە ئەگەری ئەوەی لەسەر بێ بۆ شەڕەکە دەست پێشخەر بێ، دەکەوێتە بەرهەرەشەی تولەکردنەوە. پەرەسەندنی چەکەناوکیەکان لە ماوەی شەڕی ساردda، بوو بەهۆی دابەزاندنی سیستمێکی پێشگیرانەی تا رادەیەك تەواوی لە بەرانبەر یەکتردا. بناغەی ستراتیژی پێشگیرانە، ستراتیژی تولەی گەورەیە کە لەودا هەر دوولا پێیان

وایە کە ناتوانن توانای تۆڵەکردنەوەی ئەوی دیکە بەوەشاندنی گورزی کوتوپڕی یەکەم جار لەنێوبەرن‌و هەر بۆیە هەردوولا هەرەشەی تۆڵەی گەورە لە یەکتر دەکەن.

یەکێکی دیکە لە ستراتیژە سەربازیەکان لەسەردەمی چەکە ناوکیەکاندا، هاوسەنگی خۆفە کە بەهۆی ترسی هەموو دەوڵەتەکانە لەوەی کە بەهۆی شەڕی ناوکی لەنێو دەچن. لەم بارودۆخەدا هەردوولا دەزانن کە هەرکام خاوەن هێزێکی وێرانگەری مەزنن کە بەهۆی کردەوەی دیفاعی چارە ناکرێ. هەروەها هەردوولا دەزانن کە وەشاندنی گورزی یەکەم بەشێوەی کوتوپڕ لە یەکتر ناتوانێ توانای هەرکام بۆ تۆڵەکردنەوە لەنێو ببا. لە ئاکامدا تێکۆشانی هەرکام لە لایەنەکان بۆ بەرهەم هێنانی چەکی ماڵ وێرانکەرتر [مخربتر] دەبێتە هۆی کردەوەی وەك یەك لە لایەن لایەنەکەی دیکەوە. ئاکامی ئەم بارودۆخە نەرەخسانی دەرەتانی شەڕێکی هەمەلایەنە [تمام عیار]، بە واتایەکی دیکە شەڕ وەك ئامرازێك بۆ دابینکردنی ئامانجی دەوڵەتەکان لەوەها هەل‌ومەرجێکدا کارایی خۆی لە دەست دەدا.

ستراتیژی گورزی کوتوپڕی یەکەم بە مەبەستی لەنێوبردنی توانای تۆڵەکردنەوەی لایەنی دیکە، لەسەر ئەم گومانە دامەزراوە کە یەکێك لە لایەنەکان دەتوانێ گورزێکی وا گەورەو گورچووبڕ لەوی دیکە بوەشێنێ کە پێش ئەوە لایەنی گورز لێدراو بێتەوە سەرخۆ، ئەوی دیکە لە شەڕەکەدا، سەرکەوتنی بەدەست هێنابێ. کاریگەری ئەم ستراتیژی یە بەستراوەتەوە بەو گومانانە کە لایەنی هێرش بۆ سەرکراو چەندە توانای تۆڵەکردنەوەی هەیە. لە لایەکی دیکەوە توانایی هەرکام لەو لایەنانە لە پێش گرتن لە گورزی یەکەم بە پشی بەستنی بەهێزی خۆی بۆ تۆڵەکردنەوەی هەموو لایەنەو سەرانسەری، دەستەبەرکەری ئارامی دەوڵەتەکان لە سەردەمی چەکە ناوکیەکاندایە.

## ئاشتی

لە کۆتایی‌دا باشترە ئەم بابەتە لە جیاتی شەڕ بە ئاشتی تەواو بکەین، لە سەرەتادا دەبێ دان بەوەدا بنێین کە زانستی ئێمە سەبارەت بە شەڕ زیاتر لە ئاشتی‌یەو ئەمە بۆخۆی سروشتی‌یە، لەبەر ئەوەی هەروەك لە زانستی پزیشکی‌دا نەخۆشیەکان زیاتر لە باردۆخی سەلامەتی دەکەونە بەر لێکوڵینەوە، شەڕەکانیش زیات لە ئاشتی بابەتی دیراسەکردن بوو، جگە لەوەش ئاشتی هەروەك سلامەتی دۆخێکی موستەمەڕە لە زەمان دایە. لە کاتێکدا شەڕ

وەك نەخۆشی جارجار یەخەی کومەلگاو مرۆڤ دەگرێ. بەگشتی باسەکان سەبارەت بە ئاشتی زۆرتریان بە ئارمانج گەراو بایەخدارانە بوونو مەیلیان بۆلای لێکدانەوەی ئەزموونی نەبوە. هەر بۆیە لەم دواییانەدا دیراسەی ئاشتی پێی لەسەر داگیراوەو تا رادەیەك پەری سەندوە. لە ئاکامدا ژمارە دامەزراوەکانی دیراسەی ئاشتیش زیاد یان کردوە زۆر جار دوو مانا ئاشتی نەرینیو ئاشتی ئەوینی لەیەك جودادەکەنەوە. ئاشتی نەرینی [منفی] بە مانای لە گورێدا نەبوونی حالەتی شەڕ لە نێوان دەولەتەکانە، بەلام ئاشتی ئەرینی [مثبت] ئاماژە بە هاوکاریو دۆستایەتی دەکا، دیارە ئەوەی لە پلانەکانو هەولە جوراوجورەکان بۆ پێك هێنانی ئاشتی لەبەر چاو بوە، هەر ئەو ئاشتی ئەرینییە. لەگەل ئەمەشدا پاراستنی ئاشتی لە جیهاندا زیاتر لەبەر پێك هاتنی میکانیزمگەلێك بۆ پێشگیری لە شەڕ بوە. دەکرێ ئاماژە بەو میکانیزمانەی خوارە بکەین.

١ـ **میکانیزمی دابەشکردنی دەسەلات:** زۆرکەس لەسەر ئەو باوەڕەن کە شێوەی دابەشکردنی دەسەلات بە باشترین شێوەی گونجاو یەکێك لە کولەکەکانی درێژەی ئاشتییە. لەسەر بناخەی ئەم تەوەرە چوار نموونەی ئاشتی پەیدا بوە. یەکەم نموونەی یەکسانی لانیکەم کە لەودا دەسەلاتێکی زالی نێونەتەوەیی، هەروەك دەولەت لە ئاستی نێوخۆیی، دەستەبەرکەری ئاشتییە "ئاشتی رۆمی" ئاشتی کەنیسەیی" و "ئاشتی بریتانیایی" نموونەگەلێکی مێژوویيو کلاسیکن. هەندێك هەنووکە باس لە "ئاشتی ئەمریکایی" دەکەن هەرە بەو مانایە. هەندێکیش بەشێوەی دوور لە راستی [مجازاً] لە ماوەی شەڕی ساردا لە "ئاشتی ناوکیی" [صلح اتمی] باسیان دەکرد، بەم مانا کە مەترسی شەڕی ناوکی دەرەتانی روودانی [شەڕی] لەنێو بردووە. دووهەم یەکسانی لانی زۆر هەر هەمان نموونەی هاوسەنگی هێز کە لەودا هیچ دەولەتێك یان کومەلێك لە دەولەتەکان توانانی تێکشکاندنی هێزی دەولەتەکانی دیکە نیە. سێهەم نموونەی " نزمی ئاستی چەكوچۆل" یان کەم کردنەوەی چەكوچۆل کە بریتی لە جۆرەها پلان کە بۆ کونترول کردنی چەكوچۆلی هەمەجۆری لە بەردەست بەرێوەبراون، و چوارەم چەك داماڵین یان "ئاستی سفر" بە مەبەستی چەك داماڵینی گشتیی لە لایەن هەموو دەولەتەکانو سەبارەت بە هەموو چەککەکان، بەو شێوەکە هەندێك لە لایەنگرانی ئاشتی باسی دەکەن.

**٢ـ ناكۆكیەیە كتربڕەكانی نێونەتەوەیی:** جۆری ریزبەندی ناكۆكیــە نێونەتەوەییــەكان بەتایبەت نموونەی ناكۆكیەیــە كتربڕەكــان [ تعارضــات متقــاطع] لەســەر پاراســتنی ئاشــتی كاریگەری هەیە. مەبەســت لــەم نموونەیــە ئەوەیەكــە ناكۆكیــە نێونەتەوەیــەكان بــە جــۆرێكی چڕنەكەو نەگەڕ، بۆ نموونە ئەگەر دوو ولاّت لەسەر یەك تەوەرە پێكەو ناكۆكن، بەپێی تەوەرەیی ناكۆكیەكی دیكە، پێكەوە یەكگرتووبن بەوەرادەكە ناكۆكیەكان یــەكتر بــبڕنو لەیــەك تێپــەڕن، ئەگەری بێلایەنیو پاشەكشی لە كێشەكانی نێونەتــەوەیی زۆرتــر دەبــێ. بــە كــورتی كاتیــك ولاّتەكان لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا دەكەونە ژێر فشارو راكێــشان بــۆ ئەملاوئــەولا ئەگــەری درێژیكێشانی ئاشتی زیاتر دەبێ.

**٣ـ زۆربوونی وێكچوونەكانی نێــوان دەوڵەتــەكان:** بــە چوونەســەرێ وێكــچوونەكانی سیاسیو كومەلاّیەتی نێوان ولاّتو نەتەوەكان، ئەگەر درێژەكێشانی [اســتمرار] ئاشــتی زیــاتر دەبێ. نووسەرەكان لــە دوو نموونــە [الگــو] ویكــچوون باســیان كــردوە: یەكــەم "ویكــچوونی لانیكەم" كە لەودا ولاّتەكان خاوەن لانیكەمی گونجاوی ویكچوونن لەگەڵ جیاوازی بنەرەتی لە پێكهاتەو بەهاكانداو ئەم جیاوازییانە دەبێتە هۆی ئەوەی كە لەسەر قازانجو ویستی وەك یەك پێكەوە ڕكەبەریو ململانێ نەكەن. دووهەم "ویكچوونی لانی زۆر" كە لەودا ولاّتەكان خــاوەن لانی زۆری گونجاوی ویكچوونن‌و لە ئاكامدا بە سانایی دەگەن بە توافوق.

**٤ـ چارەسەری شەڕی "چــینایەتی" لــە ئاســتی نێونەتەوەییــدا:** ولاّتــەكانیش وەك تاكەكان لە ئاستی نەتەوەیی، بەپێی سامان، دەسەلاّت، سەرچاوەی سروشــتی، بــە شارســتانی بوون، بەپیشەسازی بوونو ... هتد. بە چینگەلێك دابەش دەبــنو مــەیلی گــشتیی وایــە كــە ولاّتانێك سەبارەت بە یــەكێك لــە پێورەكــانی نــاوبراو "دارا" یــان نــەدار"ن، لــە لایەنــەكانی دیكەشەوە هەوەها. بە واتایەكی دیكە مەیل بۆلای كەڵەكەكردنی ئیمتیازات بــەهێزە. پرســیار ئەمەیەكە چۆن شەڕی چینایەتی نێوان گەلان كونترول دەكرێن؟ دوو نموونە لەم بــارەوە هاتوەتــە ئاراوە: یەكەم "پتــەو و توكمەبوونی چــینی ســەرو نــەبوونی هاوپەیوەنــدی چــینی ژێــر"، لــەم نموونەدا دەوڵەتەكانی چینی سەرەوە لە رێگای بازەرگانی، دیپلوماسیو پێوەندیــەكانی دیكــە لەگەڵ یەكتر پێوەندیو پێكەوە بەســتراوەییان هەیــە. لــە لایــەكی دیكــە هاوپەیوەنــدی نێــوان دەوڵەتەكانی چینی ژێر، كەمە بەلاّم پێوەندی ستوونی لە چــینی ســەرەوە بــۆ چــینی خــوارەوە هەیە. لەوەها نموونەیەكدا ئاشتیو ئــارامی بــەهۆی دەســەلاّتی دەوڵەتــەكانی چــینی ســەرەوە

دەپارێزرێ. نموونەی دووهەم "هاوپەیوەندی یەکسان لەنێو چینی سەرەو چینی خوارەوە"ی وڵاتەکانە. وڵاتانی چینی خوارەوە، بە هاوپەیوەندیو یەکیەتی نێوخۆ، لاوازیو نەتوانی خۆیان لە بەرانبەر وڵاتانی چینی سەرەوەدا قەرەبوو دەکەنەوە. کەوابوو وڵاتانی لاوازو بێهێز بەهۆی یەکگرتن دەتوانن بۆ پێك هێنانی سیستمی دابەشکردنی عادیلانە لە ئاستی جیهانیدا تێبکۆشنو بەمجورە زەمینەی هاوسەنگی هێزەکان بەهێز بێ.

٥ـ دابەشکردنی ئەرکە نێونەتەوەییەکانو هاوپیوەندی بەرانبەر، بەپێی ئەم نموونە هەرچی دابەشکردنی ئەرکە نێونەتەوەییەکان لە نێوان وڵاتەکاندا زۆرتر بێ، ئەگەری شەڕ کەمتر دەبێتەوەو ئاشتی دەستەبەر دەبێ. رادەی هاوپەیوەندی لە نێوان وڵاتەکاندا بەپێی جۆریی، رادەومەودایی زەمەنی پێکەوە هەڵکردن هەڵ دەسەنگێندرێ. دوو نموونەی ناسەرەکی [فرعی] لێرەدا خراوەتە روو، یەکەم "هاوپیوەندی لانیکەم" کە لەو وڵاتانەدا کە خودموختارو خویژیوو بێنیاز لە یەکترنو هیچ وڵاتێك لە کاروباری وڵاتێکی دیکە دەست تێوەرنادا، لەم بارودۆخەدا "ئاشتی نەرینی" مسوگەر دەبێ. دووهەمین نموونە "هاوپەیوەندی لانی زۆر" بەپێی جۆریی، رادەو پانتایی پێکەوە هەڵکردن کە لەودا هەر دوو وڵاتو هەموو وڵاتەکان لەگەڵ یەکتر خاوەن جورەها پێکەوە هەڵکردنن. لە ئاکامدا تێچووی شەڕ زۆر دەچێتە سەرو مەیل بۆلای "ئاشتی ئەرینی" پەرەدەستێنێ.

## سەرەتا

هەنووکە لە سەرەتای سەدەی بیست‌ویەکەمی زایینی‌دا، دێموکراسی باوترین سیستمی سیاسی‌یە. دێموکراسی مۆدێرن لە سەرەتادا دیاردەیەکی ئەورووپایی‌و رۆژئاوایی بوو، بەڵام لە ماوەیی چەند سەدەی رابردوودا بە شێنەیی لەسەر زەوینەکانی دیکەشدا پەرەی سەند. لە سەدەی بیستەمدا سیستمگەلی تاك حزبی، توتالیترو فاشیستی ماوەیەك سەقامگیر بوون، بەهۆی قەیران‌و ئاریشەگەلی جۆراوجۆر لە ئاکامدا جێی خۆیان بە جۆرەها شێوە لە حکومەتی دێموکراتیك. دیارە ئێستاش دێموکراسی لەگەڵ هەموو ئەو بەرەوپێش چوونانە کە بوویەتی، سیستمێکی جیهانیگر نیەو رژێمگەلی دەسەڵاتخواو یان نیمچە دێموکراتیك لە وڵاتگەلی جۆراوجۆردا پەیدا دەبن.

لەگەڵ ئەمەشدا تەنانەت لە وڵاتانێك کە شێوەی ژیانی دێموکراتیك بوونی نیە، هێشتاش دامەزراوەکان‌و شێوازکانی هەڵقولاو لە سیستمی دێموکراسی باویان هەیە. بۆیە ناسیاری لەسەر دێموکراسی بەشێوەی جۆراوجۆری فیکری، دامەزراوەیی‌و سیاسیەکەی بۆ ناسینی سیستمە سیاسییەکانی لە بناخەدا نادێموکراتیك بە پێویستی دادەنرێ. لە هەموو وڵاتەکاندا هەندێك بنەمای حکومەتی دێموکراتیك، جۆرێك لە دەستوور، جۆرێك لە پارلمان لە بەگرووپ کردنی سیاسی، حزبایەتی، هەڵبژاردن، سیستمی هەڵبژاردن‌و بەشداری سیاسی پەرەی‌سەندوەو ناسیاری لەسەر سیاسەت‌و حکومەت لەو وڵاتانەدا، پێویستی بە دیراسەی ئەم لایەنانە (لە تەنیشت لایەنە نادامەزراوەیی [غیرنهادی]، پێوەندیەکانی دەسەڵاتی نافەرمی، نەریتەکانی هەڵسوکەوتی سیاسی، شێوەکانی گواستنەوەی نایاسایی دەسەڵات‌و ...)یش هەیە. لەم بارەوە دەتوانرێ وادابنرێ کە زانستی سیاسەتی مودێرن شتێك بێجگە لە زانستی دێموکراسی نیە. لایەنە سەرەکیەکانی ژیانی دێموکراتیك، وەك پێوەندی دەسەڵاتەکانی حکومەتی، رەوتی پێکهێنانی حکومەت، رەوتی یاسادانان‌و بەرێوەبردنی یاساکان، بەشداری خەڵك لە گرووپە سیاسیی‌و حزبەکاندا، پێوەندی بیرورای گشتیی‌و سیستمی سیاسی‌و ... هتد، لایەنە سەرەکیەکانی ژیانی سیاسی بەگشتی پێك دێنن.

## بنەما هزریەکانی دیموکراسی

دیموکراسی وەك شێوەی ژیانی سیاسی لـە جیهـانی مودێرنـدا لەسـەر بنـەماو ئوسـولێك راوەستاوە کە لە ماوەی تێپـەڕینی رەوتـی درێژخایـەنی خـەبات بـۆ پێکهێنـانی حکومـەتی دیمکراتیك، بوونیان پەیدا کردووە. گەوهەری ئەم بنەماو ئوسـوولانە دەکـرێ لـە رەسـەنایەتی [اصـالت] یەکـسانی مرۆڤـەکان، رەسـەنایەتی تـاك، رەسـەنایەتی یاسـا، رەسـەنایەتی دەسەڵاتداریەتی خەڵك و پێڕاگرتن لەسـەر مـافی سروشـتی، مـەدەنی و سیاسـی مرۆڤەکانـدا بدۆزێتەوە. مەبەست لە رەسەنایەتی یەکسانی ئەمەیە کە لە دیموکراسیدا تاکەکان، گرووپەکان چینەکانی خەڵك سەبارەت بە یەکتر لە بواری مافی حکومەت کردن، بە سەر یەکتردا زیاتریـان نیە [هەموو وەك یەکن]. مافی حکومەت کردن بۆ هەتا هەتایە بە هـیچ تـاك یـان گرووپێـك نەسپێردراوە و هیچ گرووپێك ناتوانێ وەك لەسەرەوە بوونی فیکرییان کەسیەتی بەسەر ئـەوانی دیکەداحکومەت بکا. رەوایی دەسەڵات هەر پـشتی بەرەزامەنـدی خـەڵك بـۆ گوێرایـەڵی لـە حکومەت بەستوە.

لە دیموکراسیدا وادانراوە کە خەڵك نە لەبەر ئەوە دەترسن یان زۆریان لەسەرە، بـەڵکوو لـە رووی رەزامەندی شوێن حکومەتەکە یان دەکەون و میکانیزم گـەلێك بـۆ دەسـتەبەرکردنی ئـەم رەزامەندییە بوونی هەیە. رەسەنایەتی بەم مانا کە مرۆڤ بەپێی سروشـت وەك بوونـەوەرێکی خاوەن ئاوەز حیسابی بۆ دەکرێ و لەم رووەوەدەبێ بۆ دەست نیشان کردنی بەرژەوەنـدو قـازانجی تاکیی خۆی لە بازنەی سیستمی کومەڵایەتیدا ئازادو خودموختار بێ. ئـازادی چ بـە مانـانی نەریتییەکەی (واتا ئازاد لە ئیرادەی سەرە رویانەی کەسانی دیکە)و چ بە مانا ئەرێنییەکـەی (واتا توانای هەڵبژاردن و کردەوەو بەشداری) لە سروشتی دیموکراسیدا شاراوەتەوە. رەسەنایەتی یاسا لە دیموکراسیدا بەم مانایەکە تاکەکان هەر لەو یاسانە کـە خۆیـان دایـان نـاوە پـیرەوەی دەکەن و هیچی دیکە.هەر بۆیە ئازادی و پیرەوی لە یاسا لە دیموکراسیدا جیا لەیەك نین. بەپێی بنەمای [اصل] دەسەڵاتداریەتی خەڵك، تەنیا سەرچاوەی رەوایی دەسەڵاتی حکومەت، ئیرادەی خەڵکە کە دەتوانن رازی بوون یان نارازی بوونی خۆیان لە هەڵس وکەوتی حکومەت رابگەیەنن و کاناڵی تایـەتیش بۆ دەربرینی بیرورای خەڵك لەم بـارەوە بـوونی هەیـە. لـە دیموکراسـیەکاندا هەموو خەڵك بە بێ لەبەر چاوگرتنی ناسنامەی نەتەوەیی، ئـاینی، چـینایەتی و یـان مـەیلی سـیاسی، لە مافی سروشتی، مەدەنی و سیاسی بەتایـەت مـافی دەربرینـی بـیرورا و ئەندیـشە،

بیرورای جیاوازو ناکوکی لە بیرورا دا دەبێ کەڵك وەرگـرن. لـەم وتـارەدا هەنـدێك لـە بنـەما فیکری و کوڵەکە سـەرەکیەکانی دێموکراسی شی دەکەینەوە.

## لیبرالیسم

ئایدولوژیای لیبرالیسم بە مانای ئـازادی هاوولاتیـان لـە سێبەرو چوارچـێوەی حکومـەتی یاسادا، بە بناغەی دێموکراسی دەژمێردرێ. مەبەسـتی سـەرەکی ئایـدولوژیای لیبرالیـسم لـە سەرەتای هەڵدانیەوە، خـەبات بـە دژی دەسـەلاتی رەهـاو سـەرەرۆیانە بـوە. لیبرالیـسم لـە سەرەتادا بە دژی حکومەتی رەهای کەنیسە لە رۆژئاواو پاشان لە بەرانبەر حکوەمتی شـاکانی رەها راستەوە بوو. لە جێی دەسـەلاتی رەهـا، دەسـەلاتی سـنووردارو مەرجـدارو لـە جیـاتی دەسـەلاتی سـەرەرویانە، دەسـەلاتی یاسـا، ئامـانجی سـەرەکی لیبرالیـسم بـوە. هـەر بۆیـە یاساگەرایی، جیاکردنەوەی [تفکیك] دەسەلاتەکان، مـافی مرۆڤـو حکومـەتی بونیـات نـراو لەسەر [سیستمی] نوێنەرایەتی لە بنەماکانی دێموکراسی بە حیساب دێن.

هەندێك لە نووسـەران، لیبرالیسم وەك تیۆریی حکومەتی بەستراوەو مەل کەچی ئازادی تـاك لەگەڵ سیستمی بازاری ئازادو ئابووری سـەرمایەداری بازاریی بەستراوە بـە بـەك دەزانـن. ئـەم هاوپەیاندیو بەستراوەییە هەر چەند لە بـاری مێژوویییـەوە واقعیـەتو بـوونی بـوە، بـەلام بەپێی مەنتیق بە پێویست نازانرێ. لیبرالیسم خوازیاری دابین بوونو لەبـەر چـاوگیرانی مـافی یەکسانی بۆ هەموو هاوولاتیان بە بێ لەبەر چاوگرتنی ئایین، قەومیەت، رەگـەز، چـین، ژن یـا پیاو [جنسیت]و ... هتد بوە، هەمووان لە بەرانبەر یاسـادا یەکـسانن، مافـە سـەرەکیەکانی هاوولاتیان لە روانگەی لیبرالیسمەوە بریتین لە: ئازادی بیرورا و ئەندیشە، ئـازادی را دەربـڕین، ئازادی کۆبوونەوە، ئازادی یان مافی خاوەنداریەتی [مالکیت]، ئـازادی بەشـداری لـە ژیـانی سیـاسی چ وەك دەنگدان چ بەدستهێنانی پۆستو بەرپرسایەتییو ... هتد.

## توخمـە سـەرەکیەکانی [عناصـر اصـلی] ئایـدولوژیای لیبرالیـسم بەشێوەی خوارەوە کورت دەکرێتەوە

**جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان [تفکیك قوا]:** حکومەتی سنووردارو مەرجدار لەرێگـەی جیا کردنەوەی دەسەلاتەکان. مونتسکیو (١٧٥٥ــ١٦٨٩) فەیلەسـوفی فەرانسـەوی، یەکـەم

تیوریسینی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانو دەستووری حکومەتەکان بوە. لە روانگەی ئاوبراوە دامەزراوە جوراوجورەکانی حکومەت لە دێموکراسیەکانداو هەندێکی دیکە لە جورەکانی حکومەت، واتا دامەزراوەکانی یاسادانان، بەرێوەبەریو دادوەری، بە مەبەستی لێك هەڵبڕینو جیاکردنەوەی دەسەڵاتداریەتی سیاسیو پێکهێنانی دەرەتانی کونترۆڵو چاوەدێری بە سەریاندا، ئامادەکراون، بۆیە پێکهێنانی هاوسەنگی نیوان دەسەڵاتەکانی حکومەتی، دەربڕی بارودۆخی ئایدیالە، لە روانگەی ئەوو بۆ پاراستنی ئازادی ناتوانرێ لەسەر زیهنیەتو ئەخلاقیو کەسایەتی دەسەڵاتبەدەستانو ئازادیخوازی یان [بەتەنێ] پشت ببەسترێ، بەڵکوو تەنیا لە رێگەی عەینی واتا بە پێکهێنانی هاوسەنگیو تەوازون نێوان قازانجو هێزەکان، دەکرێ ئەو ئەرکە قورسە رابەرێت.

**کومەڵگای مەدەنی:** حکومەتی مەرجدارو سنووردار [محدود]و ئازادی هاوولاتیان پێویستی بە بوونی کومەڵگایەکی مەدەنی هەمە چەشنەکە برێتی لە جورەها ئەنجوومەنو گرووپگەلی هزری، فەلسەفی، ئایینی، فەرهەنگیو سیاسی بێ. هەر بوونو هێزی کومەڵگای مەدەنی دەبێتە هۆی پروشوبلاوی لەسەر چاوەی دەسەڵات لە کومەڵگادا. ئەنجوومەنەکانی کومەڵگای مەدەنی، بیاقی خوراگری لە بەرانبەر دەسەڵاتی سەرەرۆو رەها بەحیساب دێن. ئامادە بوونی گرووپگەلی کومەڵگای مەدەنی لە مەیدانی سیاسەتو دەسەڵاتیشدا بەهۆی مونافسەو کێبەرکێی نێوانیان، پێشگیری لە پێکهاتنی حکومەتێکی یەکپارچەو دیکتاتۆری لە لایەن هەرکام لەوانە بە دژی ئەوانی دیکە دەبێ. زۆرترکردنی گرووپەکانی کومەڵگای مەدەنی بەم پێیە پێویستیی حکومەتی مەرجدارو سنووردار [محدود] وەك بنەمای سەرەکی لیبرالیسمە.

**چاوەدێری خەڵك:** رەش بینی سەبارەت بە حکومەت وەك شەڕی چارە هەڵنەکر، یەکێك لە بنەماکانی ئایدولوژیای لیبرالیسمە، جان لاك فەیلەفسوفی بریتانیایی دەیگوت کە سیاسەتوانان بەپێی سروشت [بالقوە] بوونەوەرانێکی درندەن کە لە بە کارهێنانی سەرەرویانەی دەسەڵاتی خۆیان لە راستای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیاندا سڵ ناکەنەوەو ترسیکیان نیە، کەوابوو تەنیا لە رێی دانانی دامەزراوەو کوسپگەلێکی عەینیو بە دیارو چاوەدێری "مستمر" دەکرێ ئەوانە کونترۆڵ بکرێن، کەوابوو دەبێ هەمووکات سیاسەتوانان

لەژێر چاوەدێری توندو رخنەگرانەی خەڵك دابن دەنا روو لە گەندەڵی دەكەن، چاوەدێری خەڵك بەسەر دەسەڵاتبەدەستانو كردەوەو سیاسەتەكانیان بەشێك لە بنەماكانی لیبرالیسمە.

## لە پێش بوونی [اولویت] ئازادی تاك بە سەر دادپەروەری كومەڵایەتیدا

بە پێچەوانەی وێنای باو، لیبرالیسم لە دەوڵەتی لانیكەمو لاوازو ناچالاك دیفاع ناكا، ئامانجی دەوڵەتی لانیكەم زیاتر مەبەستی "ئازادیخوازانی رادیكاڵ"و ئانارشیستەكانی راست گەڕابوە. لیبرالیسم لە روانگەی پاراستنو دابین كردنی ئازادیەكانی تاك چاوێكیشی بە مەسەلەی دادپەروەی كۆمەڵایەتیو دەست تێوەردانی حكومەت لە ئابووریدا بوە. كەڵك وەرگرتنی هەموو هاوڵاتیان لە مافو ئازادییەكانی خۆیان بەشێوەی یەكسان، لەوانەیە پێویستی بە دابەشكردنی عادیلانەی سەرچاوەكانو دابینكردنی مەجالی وەك یەك هەبێ. دیارە جۆرەكانی لیبرال سەبارەت بە رادەی یەكسانی پێویست بۆ پاراستنی ئازادی هاووڵاتیانو رادەی دەست تێوەردانی دەوڵەت، جیاوازی بیروڕایان هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا بەگشتی لیبرالیسم لەسەر ئەوەی كە دەبێ ئازادی بكەوێتە پێش یەكسانیو دادپەروەری كومەڵایەتی، تەئكید دەكا، واتا ئازادی بە ئامانجی سەرەكیو یەكسانیو دادپەرەوری بە ئامرازی گەیشتن بەو ئامانجە دەزانێ، بە واتایەكی دیكە نابێ بە بیانووی پێكهێنانی یەكسانیو عەدالەت، ئازادیە سەرەكیەكان بەرتەسكو یان لەنێو ببرێ.

## جیاكردنەوەی بیاڤەكانی گشتییو تایبەت

لیبرالیسم هەمووكات سنووری نێوان بیاڤی گشتییو تایبەتیی ژیان دەست نیشان دەكاو بۆ بیاڤی تایبەت رێزدادەنێو بە پیرۆزی دەزانێو دەبێ پارێزاو بێ لە دەست تێوەردانی دەسەڵاتی سیاسی. جان ستوارت میل فەیلەسووفی بریتانیایی هەر لەم بوارەدا، كردەی سەبارەت بەخۆو كردەی سەبارەت بە كەسانی دیكە لێك جیا دەكردو تاقمی یەكەمی بۆ بیاڤی تایبەتو تاقمی دووهەمی بۆ بیاڤی گشتیو بۆ دەست تێوەرادن بەهۆی دەسەڵاتدارانی حكومەتی دادەنا. بۆ نموونە لە رابردوودا پێگەی یاساییو كارو تێكۆشانی ئابووری ژنانو هەڵسوكەوت لەگەڵیان لەنێو خێزاندا، بەشێك لە بیاڤی تایبەت بەحیساب دەهات، لە كاتێكدا كە هەنووكە یاسادانەر

سەبارەت بە دادپەروەری لە پێوەندیەکانی نێو بنەماڵەداو مافی ئەندامامەکانی سەبارەت بە یەکتر بێ هەڵوێست نیە.

**نەرمی نواندن سەبارەت بە بیروراو ئەندیشەی کەسانی دیکە:**

رەوتی سەرهەڵدانی لیبرالیسم لە ئوروپادا لە ماوەی پاش چاخی چاکسازی ئایینی واتا لە سەدەی هەڤدەهەمدا دەستی پێکرد. شەڕو کوشتو کوشتاری ئاییینی لەو سەردەمانەدا، یەکێك لە بوارەکانی سەرتایی دانانی سنوورێك بۆ دەسەڵاتداریەتی حکومەت بوو. لە ئاکامدا کاربەدەستانی سیاسی بۆیان نەبوو نەیان دەتوانی بیرورای ئایینی بەسەر خەڵکدا بسەپێنن‌و لە کاروباری ئایینی‌و بیروباوەری خەڵکدا دەست وەربدەن. نەرم کێشی سەبارەت بە بیرورای ئایینی بۆخۆی سەرەتای نەرمکێشی سەبارەت بە بیرورای سیاسی جوراوجۆر بوو.

**راوەستانی‌و خۆراگری لە بەرانبەر دەسەڵاتدا:** لیبرالیسم لە سەرەتادا ئایدولوژی راوەستان لە بەرانبەر دەسەڵاتی رەهاو سەرەرۆیانەدا بوو. بە بۆچوونی [جان] لاك گەورەترین داکوکیکاری لیبرالیسم، کاتێك دەسەڵاتداران بە بێ بوونی ماف، دەسەڵات بەکاربێنن، خۆیان دەخەنە بارودۆخی شەڕ لەگەڵ خەڵك. کەوابوو کاتێك خەڵك لەگەڵ پێشێل کرانی ماف‌و ئازادیەکانیان رووبەروو بن، مافی راوەستان‌و شۆرشیان لە بەرانبەر دەسەڵاتداراندا هەیە.

فەیلەسوفی ناوداری فەرانسەوی لە چاخی رەوشەنگەریدا، **مارکی دوکندورسە** (١٧٤٣-١٧٩٤) پێی وابوو کە لیبرالیسم دەبێتە هۆی لاوازکردنی هەر چەشنە دەسەڵات‌و دەسەڵاتداریەتیەك چ دەسەڵاتی دەوڵەت چ دەسەڵاتی کەنیسەو یان نەریت بێ.

## مافی خاوەنداریەتی تایبەت

خاوەنداریەتی تایبەت [مالکیت خصوصی] لە روانگەی لیبرالیسمەوە یەکێك لە ئامرازەکانی پاراستن‌و درێژەکێشانی ئازادی سیاسیە. خاوەنداریەتی تایبەت یەکێك لەسەرچاوەکانی سەرەکی خودموختاری تاك‌و خوراگری ئەو لە بەرانبەر دەسەڵاتی حکومەتی بەحیساب دێ. بەپێی بۆچوونی **دیوید هیوم فەیلەسوفی بریتانیایی** (١٧١١-١٧٧٦) خاوەنداریەتی تایبەت، بە بناغەی دامەزراوە دێموکراسیەکان دەژمێردرا، لە روانگەی ئەو کردەوەکان‌و نەریتەکانی پەیوەندیدار بە خاوەنداریەتی، بەستنی بەڵێنامە، بازەرگانی‌و لێکۆڵینەوە لە حیسابات‌و ... هتد هۆکاری لە بارن بۆ لەبەر چاوگرتنی یاساکان.

مونتسکیوش بەڵگەی دەهێنایەوە کە کڕین‌و فرۆشتن رۆحیەی لێبووردەیی‌و پێکەوە هەڵکردن بەهێز دەکا، لەبەر ئەوە پێویستی کڕین‌و فرۆشتن کردەیەکی ناشەخسییەو گرینگی بە تایبەتمەندیەکانی فیکری‌و هزری‌و فەرهەنگی‌و ئایینی لایەنی موعامەلە نادات.

هەندێك لە بیرمەندان نێوان لیبرالیسم‌و دێموکراسی جیاوازی ریشەی دەدۆزنەوە. لە روانگەی ئەوانەوە پرسیاری سەرەکی لە دێموکراسیدا ئەمەیە کە "چ کە سانێك حکومەت دەکەن"، لە کاتێکدا پرسیاری سەرەکی لە لیبرالیسمدا ئەمەیە کە "دەسەڵات چۆن چۆنی بەرتەسك دەکرێتەوە". کەوابوو لیبرالیسم لەسەر حکومەتی راستەوخۆی خەڵك‌و بەشداری هەمووکاتی ئەوان لە سیاسەتدا پێ داناگرێ، هەر چەند دژایەتیەکی لەگەڵی نیە. زۆر لە لیبرالەکان لە هەمان کاتدا لە مەترسی دیکتاتۆری زۆرینەو سەرکوتی کەمینەکان بەناوی دێموکراسی باسیان کردوە. هەر چۆنێك بێ ئەوەی کە لەو رۆژگارەدا وەك چەمکی دێموکراسی دەناسرێ، منداڵی لیبرالیسم‌و تەواو کەریەتی. لیبرالیسم حکومەتی بێ‌سنوورو نایاسایی زۆرینە دیارە کە بە حکومەتی مەرجدارو بەرتەسك‌و دەستەبەرکەری ئازادیەکانی تاك نازانێ. وەها حکومەتێك لەوانەیە تەنیا بە "دێموکراسی سەرەرۆکان" ناوی ببرێ. بۆیە لیبرالەکان، دێموکراسی روسویی یان ژاکوبنی‌و یان زۆرینەیەك کە خۆی بە نوێنەری "ئێرادەی گشتیی"و بەرژەوەندی هەمووان بزانێ، بە دێموکراسی راستەقینە نازانن بە واتایەکی دیکە کاتێك "ئیرادەی گشتیی"، "خێرو قازانجی کومەڵگا"، "دادپەروەری"و "بەختەوەری" ببێتە جێ‌نشینی بنەمای بەرزی لیبرالیسم واتا ئازادی، سیاسەت‌و حکومەت بەرێگەگەلی‌نادێموکراتیك پاڵ پێوەدەنێ. لەم بوارەدا بووکە ئالکسی دوتوکویل، نووسەری فەرانسەوی لە مەترسی دیکتاتۆری زۆرینە وەك دوژمنی تاك‌و خودموختاری‌و ئازادی تاك باسی دەکرد.

هەر چۆنێك بێ ئێستا کە، لیبرالیسم حکومەتی دامەزراو لەسەر نوێنەرایەتی وەك بناغەی دێموکراسی بە پێویست دەزانێ‌و ئەوە بە تەنیا رێگەی کونترۆڵی دەسەڵاتی‌سیاسی، دابینکردنی بەشداری کومەڵایەتی‌و دەستەبەرکردنی هەست بە بەرپرسایەتی دەسەڵاتداران لە بەرانبەر خەڵکدا دادەنێ. دێموکراسی لیبرال بەم مانایە لەسەر جوراوجوریی‌و زۆرایەتی بەرژەوەندیەکان‌و گروپگەلی کومەڵایەتی‌و نەبوونی دەرەتانی تلفیق‌و پێکهێنانی یەکیەتی لەنێو ئەوانەدا لەژێر چەمکگەلێکی نا روون وەك ئیرادەی گشتی‌و بەرژەوندی هەمووان پێ‌دادەگرێ‌و هەر بڕوای وایە

که دەکرێ لە چوارچێوەی بە روالەت حجێی پەسەندی گشتیی، بکرێ ناکوکی لەسەر قازانجەکان بە وتووێژ چارەسەر بکرێ تا ژمارەیەکی هەرچی زیاتر لەبەرژەوەندیەکانو گرووپەکانی کومەلآیەتی بە تەوافوق بگەن.

## پراگماتیسم

پراگماتیسم بە بناغەی فەلسەفی دێموکراسی دەژمێردرێ، کە کاتێکدا وەك دیتمان، لیبرالیسم وەك فەلسەفەی سیاسی دێموکراسی حیسابی بۆ دەکرێ. پراگماتیسم بزووتنەوەیەکی فەلسەفیە کە بروای وایە کە دەبێ ماناو حەقیقەتی کاروبارو ئەندیشەکان لە قازانجو ناکامەکانیاندا بدۆزێتەوە. کەوابوو نەدەکریو نە دەبێ بە شوین حەقیقەتی نیهایی‌دا بگەرێی. قازانجی کردەیی تیوریو ئەندیشەکان گرینگترین پیوەری "حەقیقەت"ی ئەوانەیە. گرینگترین فەیلەسووفەکانی پراگماتیست چارلز پیرس (١٩١٤ـ ١٨٣٩)، ویلیامجیمز (١٩١٠ــ١٨٤٢)و جان دیسویی (١٩٥٢ـ١٨٥٩) بوون. سەرەرای جیاوازی بۆچوون لە نێوان ئەم نووسەرانەدا، لەسەر ئەو چەمکە گشتییە کۆك بوون کە بیرو ئەندیشەکان ئەو کاتە راستەقینەن کە بە سوودبنو خەلکی بەختەوەر بکەن. راستیی [حقیقت] ئەندیشەکان لە پێشدا روونو دیار نین، بەلکوو پاشان لێیان دەردەکەوێ، ئەندیشەکان کاتێك دەبن بە راستیی کە رێگەو ئامانج بدەن بە ژیانی خەلك واتا بە سوودبنو رەزامەندی پێك بێنن، کەوابوو پێوەری راستیی دەبێ لە ژیانی بەکردەوە بدۆزیتەوە، نە لە بواری ئەندیشەگەلی هەلێنجراو.

هەندێك لە نووسەران، پراکماتیسم وەك "شێوەی هزری ئەمریکایی" وەسف دەکەن. بنەمای سەرەکی پراگماتیشم ئەوەیە کە مرۆڤەکان خۆیان بخەنە بەر دیدی رێفۆرمو گورانەکانی داهاتوو لەشێوازی ژیانو هزرو ئەخلاقدا. بایەخو گرینگی پراگماتیسم لە دێموکراسی‌دا ئەوەیە کە خەلك خۆیان لە بەستراوەیی بە بیرو ئەندیشەو نەریتی چەق بەستووە وەك مەخزەنی راستەیەکان رزگار بکەنو لە رووداني هەر ئالۆگۆرێكو داهێنانێك کەبۆ ژیانی مرۆڤ بەسوود بێ، پێشوازی بکەن. بەم مانایە پراگماتیسم، فەلسەفەی ئەزموون، نوژەنکردەی یەك لە دوای یەكو رزگاری لە دەست رابردووو نەریتە لە دەستو پێ ئالآوەکانەو لەم روانگەوە لە بەرانبەر رەهاییگەریو دوگماتیسم [ Dogmatism ] دا رادەوەستێ. وەك ئامازەی پێکرا، هەندێك لە خاوەن بیران پاگماتیسم وەك فەلسەفەی دێموکراسی ئەمریکایی حیسابی بۆ دەکەن.

لە نەریتی دیموکراسی ئەورووپا پێشدا، (قوتابخانـەی رەسـەنایەتی سـوودو قـازانج)ی جیرمـی بنتهامو جان ستوارت میل پێگەیەکی، تایبەتی هـەبوو. بنتهـام لـە بنـەمای "لانـی زۆری شادمانی گونجاو بۆ زیاترین ژمارەی خەڵك" داکۆکی دەکرد.

## رێژەیی خوازی [ نسبی گرایی]

رێژەیی خوازی قوتابخانەیەکە کە بەهاکان بە رێژەییو بابەتی دەزانـێو بـۆ هـیچ بەهایـەکی رەهاو عەینیو گشتیی کە بکرێ بەپێی ئاوەزو زانست بسەلمێندرێ بـاوەری نیـە. هـەر چـەند دیموکراسی تـا رادەیـەکی بەرچـاو لەسـەر رێژەگـەرایی بـەهایی [ارزشـی] دامـەزراوە بـەڵام رێژگەرایی بەم مانایە بەم ئاکامە دەگا کە دیموکراسی وەك کومەڵـێك لـە بـەها سیاسـیەکان بەسەر شێوە حکومەتەکانی دیکەدا سەروەری نیە. زۆرجار فەیلەسووفو زانایـانی خوازیـاری لیبرالیسمو دیموکراسی، بە بەهاکانو مافە سروشتیو عەینیەکان ئەوانەی بۆ دۆزینـەو ناسیاری دەبن باوەریـان هەیـە. بـەو وەسـفەش رێـژەخوازی بـەهایی بـە پـشتیوانی مێتـوودی ژیـانی دیموکراتیك دەژمێردرێ، لەبـەر ئـەوەی کـە لەسـەر لێبـوردەییو نەرمکێـشان سـەبارەت بـە جیاوازییو فرەیی لە بـرواو بەهاکانـدا پـێدادەگرێ. رێـژەخوازی لـەم رووەوە دەسـتەبەری لـە بەرچاوگرتنی مافی کەمینەکان لە دیموکراسی دایە کە هاورێ لەگەڵ بنەمای زۆرنیـە، یـەکێك لە کولەکەکانی دیموکراسی بەحیساب دێ.

لە روانگەی رێژەیی خوازانەوە هەموو بەهاکانو شـێوازەکانی ژیـان لەبـەردەم ئـاوەزدا بـێ بناغەنو بۆیە هـەموو بـە یـەك رادە مـافی ژیانیـان هەیـە. هەرچـەند نـاتوانرێ بـوترێ کـە دیموکراسی لەسەر رێژەیی خوازی دامەزراوە، بەڵام بۆخۆی سیستمێکە کە زۆرترین دەرەتان بـۆ وەدیهاتنی رێژیی لە بەهاکاندا دەخولقێنـێو نـزیکترین سیـستمی سیاسـیـیە لـە بنـەماکانی رێـژەیی خـوازی. هـەروەها رێـژەیی خـوازی هەرچەشـنە باسـی یـەك لاکـەرەوە لـە چـەمکە ئەخلاقیەکان وەك دینـداریو عیبـادەتو جینایـەتکاریی لـە ژیـانی سیاسـیدا دەنێتـە لاوەو داکۆکی لەوچەمکانە دەکا کە بۆ وردبوونەوە دەبـنو دوورن لـە لایـەنی بـەهایی. جگـە لـەوە رێژەییخوازی لەگەڵ بنـەمای یەکسانی بنچینەیی نێوان مرۆڤەکان پێوەندی هەیە. لەم روانگەوە هەر چەشنە جیاوازی دانانو لەسەرەوی یەکتر دانـان [برتـری] لـە نێـوان مرۆڤـەکان دوور لـە

سروشتە، هیچ کەسێك سەروەری سروشتی نیەوهەموو پلە بەندیەکانو سیستمەکانی سەروەیی، دڵخوازانەو دەستکردە.

هەر وەك ئاماژەی پیٚکرا لە نێوان لایەنە جوراوجورەکانی رێژەییخوازیو دێموکراسی کاتی وا هەیە ناتەباییش دێتە پێش. بۆ نموونە ئەم پرسیارە دێتە پێش کە ئایا دەبێ بنەمای لێبووردەییو پێکەوە هەلکردن [تساهل] سەبارەت بە دوژمنانی لێبووردەییو پێکەوە هەلکردنیش بەرێوەبچێ یان نا؟ ئاسانی نواندن سەبارەت بە دوژمنان [تساهل] کردەیەکی بە پێچەوانەی بنەمایپەرەپێدان بە ئاسان گیریو نەبوونی [تساهل]یش سەبارەت بەوان بۆخۆی پێچەوانەی بنەمای ئاسانگیری دەبێ. کارل پوپر، فەیلەسووفی هاوچەرخ وتوویەکە تەنیا ریزپەرێك [استثنا] کە بکرێ وەربگیرێ لە بنەمای [تساهل]دا بەکار نەهێنانی ئاسانگیری سەبارەت بە دوژمنانی ئاسانگیری. هەروەك چون ئاماژەی پیٚکرا رێژەییگەرایی تەواوەتی ژیانو بەها دێموکراتیکەکان پاساو بدرێو یان دیفاعیان لێبکرێ، چۆنکو دیارە ناکرێ بەپێی قوتابخانەی رێژەییگەرایی لە شتێك وەك راستیی [حقیقت] یان بەهای نیهاییو رەها دیفاع بکرێ. بەلام رێژەگەرایی هەروەك ئاماژەی پیٚکرا بۆ پاساودانی هەندێك لایەنی وردترو نێوخۆیی دێموکراسی دەبێ.

## رەسەنایەتی پەیماننامە [اصالت قرارداد]

ئەندیشەی پەیماننامەی کومەلایەتی وەك بنچینەی سیستمی سیاسی یەکێکی دیکە لە چەمکە بنەرەتیەکانی دێموکراسییە کە مێژووەکەی دەگرێتەوە بۆ **توماس هابز**،**بندیکت دوسپینوزا**، **جان لاك**، **ژان ژاك رۆسو و ئامانویل کانت**. لە تیۆری پەیماننامەی کومەلایەتیدا بەگشتی سەرەتا "دۆخی سروشتی" واتا دۆخی بەر لە سەرهەلدانی حکومەت وەسف دەکرێو پاشان تێپەرین لەو دۆخە بۆ دۆخی مەدەنی لە رێگەی پەیماننامەو تەوافوقی گشتیی روون دەکرێتەوە. لەم تیۆریەدا، پەیماننامە بناغەی وەخۆگرتن [التزام]و گوێرایەلی سیاسیە. لەبەر ئەوەکە تاك دەبێ ئەوەی کە بۆ خۆی بەپێی بەلێنو پەیمان وەئەستۆی گرتوە، بەرێوەی بەرێ، هەروەها کاتێك پەیماننامەی جێی باس پێشێل بکرێ، مافی شۆرشو سەرهەلدان بە دژی حکومەت گونجاوە. هەرچەند تێوری بەلێننامەی کومەلایەتی زۆرجار بە

دێموکراسیەوە پێوەندی دەدەن، بەڵام دەکرێ وێنای ئەوە بکرێ کە خەڵك بەپێی بەڵێننامەی کومەڵایەتی سەرەتایی بۆ پێك هێنانی حکومەتێکی نادێموکراتیکیش تەوافوق بکەن.

لە روانگەی هابزەوە لەبەر ئەوەی خەڵك خاوەن توانایی کەمو زۆر وەك یەکن، هیچ بنەمایەکی سروشتی بۆ سیستمی سیاسی بوونی نیە، کەوابوو سیستم دەبێ بەشێوەی دەستکردو بە پێیبەڵێننامە جێبەجێ ببێ، لە پەیماننامەی کۆمەڵایەتیدا هەمووان رێك دەکەون لەسەر ئەوەکە لە مافی ژیان بەپشت بەستن بە توانایی تاکی خۆیو یان مافی پاراستنی کەسیەتیی خۆی بەپشت بەستن بەهێزی خۆی چاوپۆشی دەکەنو ئەم مافە بە کەسیەتی سێهەم [شخص ثالث] واتا دەسەڵاتداران دەسپێرن، کەوابوو دەسەڵاتدار دەتوانێ بۆ راپەراندنی ئەم کێشە گرینگە دەسەڵاتی خۆی بە هەر شێوەیەك بەکار بێنێت. دیارە دەسەڵاتدار لەوانەیە تاکێك یان تاقمێو یان کومەڵێك لە تاکەکان بێ بەڵێننامەی کومەڵایەتی لە روانگەی هابزەوە زیاتر لە جارێك نابەستریو هەموو کاتێك پێرەوی کردنی پێویستە. بە بۆچوونی لاکیش لە بارودۆخی سروشتیدا مرۆڤەکان هەموویان سەبارەت بەهێزو توانا وەك یەکنو هیچ کەسێك لەوی دیکە پێرەوی ناکا. لەگەڵ ئەوە خەڵك لەو دۆخەدا لە کومەڵێك لە یاساکانی سروشتی لە هەڵسوکەوتی خۆیاندا لەگەڵ یەکتر پێرەوی دەکەنو لەم بارەیەوە سەبارەت بە یەکتر رێز دادەنێنو لە گیانو ماڵی یەکتر پارێزگاری دەکەن، بەڵام بەرێوەبردنی کەسێتیو تایبەتی یاسای سروشتی دەستەبەری ئاشتییەکی درێژخایەنو بێپسانەوە ناکا، لە دۆخی سروشتیدا دەزگایەکی دیاریکراو بۆ بەرێوەبردنی یاسای سروشتی بوونی نیە. کەوابوو خەڵك بەپێی بەڵێننامە دەسەڵاتو مافی بەرێوەبردنی یاسای سروشتی بە تاك یان گرووپ دەسپێرنو بەم شێوەیە حکومەت دادەمەزرێ. بە بۆچوونی لاك، بە پێچەوانەی هابز، حکومەت دەبێ هەمووکات پشتیوانی زۆرینەی خەڵکی لەگەڵ بێو خەڵك هەرچۆنێك بێ مافی هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی کومەڵایەتیان هەیە.

تێگەیشتنی هابزو لاك لە چەمکی پەیماننامەی کومەڵایەتی، سەرەرای هەندێك جیاوازی، لە بناخەدا وەك یەك وابوون. بەڵام تێگەیشتنی ژان ژاك رۆسو بە تەواوی جیاواز بوو. بەپێی بۆچوونەکانی هابزو لاك، بەڵێننامەی کومەڵایەتی سەرچاوەی حکومەت بەشێوەی گشتیی روون دەکاتەوە، لە کاتێکدا روسۆ چەمکی بەڵێننامەکە بۆ رەخنە لە حکومەتەکانی لە ئاراو دامەزراندنی حکومەتێك بەکار دێنێ کە پشت بەستوو بە ئیرادەی گشتی بێ. بە بۆچوونی

رۆسۆ ئەو بەڵێننامانە کە بناغەی حکومەتەکانو کومەڵگاکانی لە ئارادایە، پەیماننامەیەکی هەڵخلەتێنانەیە کە لەودا دەست رۆیشتووەکان، هەژارەکان دەخلەتێننو گەوج دەکەن [تحمیق] تا بارودۆخی نایەکسان هەروا بمێنێتەوە. لە دۆخی سروشتیدا، دەست رۆیشتوەکان بەڵگە دێننەوەکە باشترە پەیماننامەیەك ببەسترێ تا هەمووان لە بارودۆخی نا ئارامیو ترس لە گیانو ماڵ رزگار ببێ. وەها پەیماننامەیەك درێژە بە نایەکسانیەکان دەدا، بەڵام تێگەیشتن خودی رۆسۆ لە چەمکی پەیماننامەی کومەڵایەتی، تێگەیشتنی رەوا بێنیەو بۆ بونیاتنانی سیستمێکی کومەڵایەتی رەوایە. ئەم پەیماننامە نابێتە هۆی گواستنەوەی دەسەڵاتداریەتی لە خەڵك بۆ دەسەڵاتدار [حاکم]، هەمووان مافی خۆیان دەسپێرن بە کومەڵگا بەو مەرجەی کە کومەڵگا بنەمای یەکسانی مافەکان سەقامگیر بکاو هەموو یاساکان لەسەر بناغەی "ئیرادەی گشتیی" کە چاوەدێرە بەسەر بەرژەوەندی تەواوەتی کومەڵگادا،پشت ئەستوور بێ. لە روانگەی رخنەگرانەوە، تیۆری پەیماننامەی کومەڵایەتی رۆسۆ بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ بۆچوونەکانی هابزو لاك هەڵگری مەیلو ویستی سەرەکی بۆ دامەزراندنی "دیکتاتۆری زۆرینە" بە ناوی خێرو ئیرادەی گشتیی بوە.

گرینگترین تیۆریسنی پەیماننامەی کومەڵایەتی بە قەوارەیەکی نوێ لەسەدەی بیستەمدا، جان رالزە، ئەو لە کتێبی تیۆری دادپەروەری [عدالت] (١٩٧١) دۆخێکی وەهمی وەك دۆخی سەرەتاکان" رەسم دەکا کە لەودا تاکەکان دەبێ سەبارەت بە کومەڵێك لە بنەما سەرەکیەکان بۆ کومەڵگا رێك بکەون بەڵام هیچ کات نازانن کە خۆیان لەو کومەڵگایەدا چ هەلومەرجێكو چ پێگەیەکیان دەبێو کەوابوو لەپشتی "پەردەی نەزانی"دا جێی دەگرن. بە بۆچوونی رالز ئێمە لەوەها دۆخێکی سەرەتایی لەسەر سێ بنەما پێ دادەگرین. یەکەم دەمانەوێ بێ لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە چ پێگەیەکمان لە کومەڵگادا دەبێ، ببین بە خاوەن هەندێك لە مافو ئازادیە سەرەکیەکان. دووهەم دەمانەوێ بە بێ لەبەر چاوگرتنی ئەمەکە لەو کومەڵگادا چ توانایيو پسپۆریەکمان ببێ، دەرەتان گەلێك بۆ بەرێوەبردنی ئەوانە لە ئارادا ببێ. سێهەم سەبارەت بە دۆخی ئەو کەسانەی کە لەو کومەڵگادا تووشی بێ بەشین، نیگەران دەبین، لەبەر ئەوەی لەوانەیە خۆشمان لەو بارودۆخەدا بین. کەوابوو دەمانهەوێ هەر بەو رادە نابەرابەری لە کومەڵگادا ببێ کە پێویستی بەرەوپێش بردنی خۆشگوزرانی بێبەشانی کومەڵگایە، چوونکە

زادەی نابەرابەری بەهۆی پێك هێنانی خوازیاریی کارو چالاکیی بە قازانجی هەموو تاکەکان تەواو دەبێ.

تیۆری رالز کێشەی بۆچوونەکانی هابزو لاك چارەسەردەکا، بەم مانایە کە پەیماننامەکەنەوەك رووداوێکی مێژوویی بەڵکوو وەك چەمکێکی وەهمی چاو لێدەکا. ئەگەر لە دێموکراسیدا وا دانراوە کە دامەزراوە سیاسیەکانی کومەڵگا دەبێ بۆ گشت تاکەکانی کومەڵگا جێی پەسەند، رەواو گونجاو بێ، لەو کاتدا مانای رێككەوتن‌و تەوافوقی وەهمی رالز پاساوەێك دەداتە دەست کە هەمووان لە هەموو هەلومەرجێکدا وەری بگرن.

## ڕەسەنایەتی ڕەزامەندیو پەسەندی گشتیی

یەکێکی دیکە لە چەمکە سەرەکیەکان لە فەلسەفەی سیاسی دێموکراسیدا، چەمکی ڕەزامەندی هاوولاتی لە پیرەویکردن لە حکوومەتە. لەم ڕوانگەوە ڕەوایی دێموکراسی لەسەر کردەی حکوومەت هاوتا لەگەڵ ویستو ڕەزامەندی هاوولاتیانە. دێموکراسی بە بێ ڕەزامەندی گشتیی مومکین نیەو ڕەوایی بەهۆی وەها ڕەزامەندییەك، بناخەی دێموکراسی پێك دێنێ. لە ڕوانگەی لایەنگرانی دێموکراسی، مرۆڤەکان بوونەوەرگەلێکی عەقلانیو توانای هەڵبژاردنیان هەیە، بۆیە دەتوانن لە ڕێگەی نیشانەگەلێك پەی بە ڕەزامەندی یان ناڕازیبوونی ئەوانە سەبارەت بە حکوومەتەکەی ببرێ. ڕەزامەندی بەم مانایە، ئازادی بەشێوەیەکی عەقلانیو گونجاو بەرتەسك دەکاتەوەو دەیگۆڕێ بە پیرەویو پابەندی [التزام]. وەها پابەندبوونو گوێڕایەڵی بۆخۆی یەکێك لە ڕواڵەتە سەرەکیەکانی ئازادیی سیاسیی تاکەو دەبێتە هۆی دەستنیشانو دیاریکردنی. ڕەزامەندیو پەسەند بناخەی، وەرگرتن [پذیرش]و پیرەوی لە حکومەت بەشێوەی ئازادانەیەو نوێنەرایەتیو پارێزەری [وکالت] وەك یەکێك لە ڕێگە باوەکانی دێموکراسیش پشت بەستوو بە ڕەزامەندییە.

کەوابوو ڕەزامەندی لە مانایەکی چالاكو ئەرێنیدا، زەمینەی وەرگرتنی بەڵێنو پابەندیو دەربڕی مافو ئازادییەکانی تاکەکەسییە. یەکێك لە ڕوانگە گرینگەکان لە فەلسەفەی سیاسیی هاوچەرخدا لە زەمینەی پابەندیو دەسەڵاتداریەتی سیاسی هەر ئەم ڕوانگەی "اجتماع"یان پەسەندە. لەم ڕوانگەیەدا پەسەند [قبول]و ڕەزامەندیی تاك تەنیا سەرچاوەی بەڵێن [تعهد]و پابەندی لە پیرەوی لە یاساکانی دەسەڵاتداریەتی حکوومەت بەحیساب دێ. بە پێی لێکدانەوەی جۆراوجۆر لەم تیورییە، وەها ڕەزامەندییەك لەوانەیە ڕاستەوخۆ، ناڕاستەوخۆ (نیابی) یان تەنانەت وەهمی بە مانایەك بێ کە لە کاتی بەستنی پەیماننامەکاندا لەبەر چاو دەگیرێن. لەسەر ڕەزامەندیی ناڕاستەوخۆ بەتایبەت پێی زۆر داگیراوە، لەبەر ئەوەی ناتوانرێ نموونەگەلێکی زۆر لە ڕەزامەندیی ڕاستەوخۆ سەبارەت بە پیرەوی لە حکوومەت بدۆزرێتەوە. ئەندیشەی ڕەزامەندی وەهمی [فرضی] دەگەڕێتەوە بۆ ڕوانگەی ئامانوئێل کانتو ئاماژە بە کاروبارێك دەکا کە تاکە کەسەکان بە پێی پێویستو قاعیدە دەبێ سەبارەت بەوانە هەست بە ڕەزامەندیو وەرگرتن بکەن.

لەم رووەوە دەکرێ دامەزراوە سیاسییە پەسندکراوەکان بە بێ ئەوەی کە رەزامەندیی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی گشتیی لە پابەندی بێیان راگەیەندرابێ، وەك پەسندکراو بابەتی پیرەویو پابەندیی هاوولاتیان دابنرێ. جان لاك، فەیلەسووفی ئالّمانی بەلّگەی دەهێنایەوە کە هەر خووی مانەوە لە ولاتێکدا کە تاك دەتوانێو بۆی هەیە بەجێی بێلێ، بە مانای راگەیاندنی رەزامەندی بە بێ دەربڕین [ضمنی] لەسەر پابەندی [التزام] بە دەسەلاتداریەتیی حکوومەتو یاساکانیەتی. رەخنەگران وەها رەزامەندییەکیان بە چاوشۆڕانە وەسف کردووەو بەشداریی هەمەلایەنەو راستەوخۆ لە ژیانی سیاسیدا بە تەنیا نیشانەی مانداری راگەیاندنی رەزامەندیو لە خۆگرتنی پابەندی لە دێموکراسییەکاندا دەزانن. دیوید هیوم بە رەخنە لەسەر بۆچوونەکانی لاك بەلّگەی دەهێنایەوە کە خووی درێژەدان بە مانەوە لە ولاتی جێی لە دایك بوون ناتوانرێ وەك هەلّبژاردەیەکی ئازاد بە مانای راستەقینەی خۆی وەسف بکرێ. لەبەر ئەوە زۆرجار کۆچکردن تێچووی مادیو دەروونی [رۆحی] زۆر بەسەر تاکدا دەسەپێنێ. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو رەخنانە کە لە مانای رەزامەندی بە بێ دەربڕین [ضمنی] وەك بنەمای پاساودانی ئەخلاقی پابەندی سەبارەت بە دەسەلاتداریی حکوومەت هاتۆتە ئاراوە، لایەنگرانی ئەم دوایییانەی کۆدەنگیی [اجماع]و پەسەند، ئۆگرییەکی زیاتریان بۆلای تەئکید لەسەر چەمکی رەزامەندیی وەهمی پەیدا کردوە.

## رەسەنایەتی یەکسانی (یەکسانیی مەدەنی)

رەسەنایەتی یەکسانی بەم مانایە کە هەموو مرۆڤەکان بەهایەکی یەکسانیان هەیەو دەبێ لەگەلّ هەموو بە شێوەیەکی یەکسان هەلّسوکەوت بکرێ، لە بنەما سەرەکییەکانی دێموکراسییە. کەوابوو دێموکراسی لەگەلّ نایەکسانییەکانی یاساییو سیاسی ناتەبایەو لەگەلّی رێك ناکەوێ. رەسەنایەتیی یەکسانی لە مانا بنەماییەکەی خۆیدا بەم مانایە کە هەموو مرۆڤەکان بە پێی مرۆڤبوونی خۆیان یەکسانن و بەسەر یەکتردا بالادەستییان نییە. لە رووی سیاسییەوە، رەسەنایەتیی یەکسانی بەم مانایە کە هاوولاتیان لەبەر دەم یاساو لە رووی مافو ئازادیەکان لەگەلّ یەك یەکسانن. لە دێموکراسیدا هاوولاتیان لانیکەم دەبێ لە رووی مانەوە لەگەلّ یەکتر بەرابەر بن، هەرچەند دابین کردنی یەکسانی لە رووی کۆمەلایەتیو ئابووری، سەرەڕای [مطلوب]بوونی ، ناگونجێ. لە سیستمی ئاغاواتیو دەرەبەگایەتیدا

[فئودالی] پێگه جۆراوجۆرەکانی خەڵك لە ڕووی یاسایی لە مافو باڵادەستییە تایبەتییە [امتیازات] جۆراوجۆرەکان کەڵکیان وەردەگرت، کەوابوو لە ڕووی یاساییەوە یەکسان نەبوون. لە خەباتی سەرەتاکاندا خەبات بۆ سەقامگیرکردنی دێموکراسی، کەڵك وەرگرتن لە مافە مەدەنییەکان بەسترابۆوە بە موڵکداریەتی. پاشتر موڵکداریەتی وەك بنەمای کەڵك وەرگرتن لە مافەکان کەوتە بەر ڕەخنە تا ئەوە کە دەرئەنجام هەر خودی ئەندامەتی یا هاووڵاتی لە کۆمەڵگای سیاسیدا، بوو بە بنەمای کەڵك وەرگرتنی یەکسان لە مافی وەك یەك. کەوابوو خەڵك بە بێ لەبەرچاوگرتنی موڵکداریەتی، بە کارێکەوە خەریك بوون [اشتغال]، فێرکاری، قەومییەت، دین، زمانو ... هتد لە ڕووی یاساییەوە یەکسان چاویان لێ دەکرا. ئەوەی کە وەك یەکێك لە بنەماکانی حکومەتی دێموکراتیك گرینگی هەیە، مافی کەڵك وەرگرتن لە یەکسانی لە مافە مەدەنییەکان وەك ئازادیی بەیانو ڕادەبڕینو مافە سیاسییەکان وەك مافی دەنگدانو مافی بەدەستهێنانی پۆستو مەقام [منصب]ە.

یەکسانی لە ڕووی ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە بەشێك لە بنەماکانی دێموکراسی نیە، بەڵکوو لە پێگەیشتنو گەشەی دێموکراسیدا چاوەڕوانی لێ دەکرێ. بە واتایەکی دیکە بەرابەریو یەکسانی سەرەکی لە دێموکراسیدا، یەکسانی لە دەرەتانەکاندایە، نە بە ناچاری [لزوماً] لە دەسەکەوتەکاندا. ئەو کەسانە کە بە شێوەی یەکسان لە ژێر چاودێریو پشتیوانیی یاسادا بن، دەتوانن لەو دەرەتانە کە سیستمی کۆمەڵایەتیو سیاسی دەیڕەخسێنێ، کەڵك وەربگرنو بکەونە بەشداریو کێبەرکێ لە ژیانی سیاسیدا. بە واتایەکی دیکە یەکسانی پێویست بە نەبوونی هەڵاواردن [تبعیض] لە نێوان تاکەکان لە هەر بیچم بە تایبەت لە ڕووی ڕەگەز، قەومییەت، نێرو مێ [جنسیت] دین، بڕوای سیاسیو ... هتد دەکا.

لێکدانو تێکەڵکردنی چەمکی یەکسانی هاووڵاتیان لە ڕووی سیاسیو یاساییەوە لەگەڵ چەمکی یەکسانی کۆمەڵایەتیو ئابووری کێشەگەلی هزریو کردەکی زۆری بۆ دێموکراسی دروست کردوە. بە جۆرێك کە زۆر جار بە بیانووی دابین کردنی یەکسانیی کۆمەڵایەتی، ئازادییە مەدەنیو سیاسییەکان کەوتوونەتە بەر هەڕەشە. دێموکراسی لانیکەم بە مانای ئازادیو یەکسانی یاساییو سیاسیی تاکەکانە، دەبێ لە دێموکراسیدا لانی زۆر [حداکثر] کە لەودا ئازادییەکانو یەکسانیی کۆمەڵایەتیو ئابووریش لە ئاستێکی گونجاودا دابین دەکرێن، لێك جیا بکرێنەوە. بە بێ دێموکراسی لانیکەم (واتا لانیکەمی بەشداریو کێبەرکێ لە نێوان

گرووپ‌و هێزە گرینگە سیاسییەکان‌و دەستاودەست کردنی دەسەڵات لە نێوانیان دا) دێموکراسی لانی زۆر (بەشداریی گشتی لە سیاسەتدا لە باروودۆخێکی یەکسانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری ڕێژەیی‌دا مومکین نابێ. لە لایەکی دیکەوە هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دێموکراسی لانی زۆر (دابین کردنی یەکسانیی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی بە مەبەستی ئامادەکردنی کاروبارەکانی سەرەتایی بەشداریی گشتی) زۆرجار بە بنەما سەرەکییەکانی دێموکراسیی زیانی گەیاندوە. لانی زۆری مانایەك کە دەکرێ بۆ یەکسانی کۆمەڵایەتی لە دێموکراسیی سیاسی‌دا لەبەر چاو بگیرێ، یەکسانی ڕێژەیی لە دابەشکردنی سەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسی لە نێوان یاریکەران‌و هێزە سیاسیە چالاکەکان لە کۆمەڵگا دایە، ئەوەی کە هێزو گرووپە سیاسییە جۆراوجۆرەکان دەبێ بتوانن لە سەرچاوەکانی دەسەڵات (سەرچاوەی ماڵی، پێوەندی، فێرکاری‌و ... هتد) کەڵك وەربگرن، یەکێك لە دەرئەنجامەکانی بنەمای گشتیی یەکسانی‌یە.

## خودموختاریی تاك

خودموختاریی تاك تێگەیشتنێکی تایبەت لە ئازادی‌یە کە لە ڕوانگەی هەندێك لە لایەنگرانی دێموکراسی تەنیا لەم چەشنە حکوومەتەدا دەگونجێ. مرۆڤی خودموختار کەسێکە کە بڕیاراتی پێوەندیدار بە ژیانی خۆی دەیداو بەڕێوەی دەبا. ڕۆسۆ یەکەم فەیلەسووفی گەورەیە کە لە نێوان خودموختاریی تاك‌و دێموکراسی‌دا پێوەندی‌یەکی سەرەکی دەبینێ، لە ڕوانگەی ڕۆسۆوە لە کتێبی پەیماننامەی کۆمەڵایەتی (۱۷٦۳) ئازادی بریتی‌یە لە گوێڕایەڵی بۆ یاسایەك کە تاك ئەو یاسایە لە دڵەوە وەربگرێ، کەوابوو مەسەلەی سەرەکی پێکهێنانی سازان‌و تەوافوق لە نێوان ئازادیی تاك‌و بوونی دەوڵەت وەك سەرچاوەی یاسا بەم شێوە چارەسەر دەکرێ، بەم مانایە کە هەموان دەبێ لە دانانی یاسادا کە هەموان دەبێ ملکەچی بن، نەخشیان هەبێ. بەم شێوەیە لە ڕێگای دێموکراسی بەشداریەکی ڕاستەوخۆ، خودموختاریی تاك لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەت دەگەنە سازان. دیارە گرفتی ڕێگەچارەی ڕۆسۆ ئەمەیە کە بۆ دابین کردنی خودموختاریی ڕاستەقینەی تاك، هەموو یاساکان دەبێ بە کۆدەنگی هەموان دانرابن‌و لەبەر ئەوە وەها کارێك لە هەموو کاتدا ناگونجێ، کەوابوو خودموختاریی تاك لە ژێر تیشکی یاسادا بۆ دابینکردن نابێ. لەم ڕووەوە هەندێك لە نووسەران پێیان وایە کە هەر لە ئانارشیسم دا خودموختاریی ڕاستەقینەی تاك مسۆگەر دەبێ.

بەڵام وەها تێگەیشتنێك لە لایەك وێنایەكی زیادە گەورە كراو [اغراق‌آمیز] لە دیموكراسیی تاكی لە خۆ گرتووەو لە لایەكی دیكەوە ئەو خاڵە لەبەرچاو ناگیردرێ كە بوونی دەوڵەت بۆخۆی دابین كەری بەهاگەلێك وەك ئارامیو رێكوپێكیو یاسایەكە بە رادەی خودموختاریی تاك گرینگیان هەیەو تەنانەت ئەگەر خودموختاریی تاك بە تەواوی لە دیموكراسییەكاندا دابین نەكرێ، هەر دەبێ بڵێین كە دیموكراسی باشترین رێگەی گونجاو بۆ دابین كردنی لانی زۆری خودموختاریی گونجاو بۆ تاك لە بارودۆخی ئامادەبوونی حكوومەت دایە.

## یاساو یاساخوازی

دەستوور [قانون اساسی] وەك كۆمەڵەیەك لە بنەماو یاساو رێسای سەرەكیو گشتیی، چوارچێوەیەكە بۆ رێكخستنی پێوەندیی دەسەلات لە حكوومەتدا. دەستوور پێویستیی حكوومەتێكی سنووردارو مەرجدارە، وەها حكوومەتێكیش بۆ دیموكراسی پێویستە، هەرچەند خودی دیموكراسی نیە. لەگەڵ ئەمەش لە نێوان پابەندبوون بە یاسای بنچینەیی (دەستوور)و دیموكراسی لەوانەیە ناتەبایی دروست ببێ، بەم مانایە كە هەیئەتێكی دەسەلاتدار ناتوانێ لە هەمان كاتدا كە بەرانبەر بیرورای گشتیی ئەوكاتو ساتە بەرپرس بێو هەم پابەند بە یاسایەك بێ كە پێشینیان دایان ناوە. لە وەها روانگەیەكەوە دیموكراسی پێویستیی بەوە هەیە كە دەرەتانی گۆڕینی دەستوور بەهۆی خەڵك هەموو كات برەخسێ. ئەگەر دەستوور ببێ بە یاسایەكی نەگۆڕ، گشتیو پیرۆز، خەسڵەتێكی نادیموكراتیك پەیدا دەكا.

لە بەرانبەر وەها روانگەیەكدا ئەوانەی كە وەك دەستوور قسە دەكەن نیگەرانیی زیادەرەویەكانی زۆرینە لە دیموكراسییەكاندان، دەستوور وەك پێویستییەك بۆ دیفاع لە مافو ئازادییەكانی سەرەكیی تاك لە بەرانبەر سەرۆییەكانی زۆرینەدا دادەنێن. هەر چۆنێك بێ لە هەردوو روانگەوە دەستوور ئامرازێكی "دژە زۆرینە"یە، واتا لە لایەك كۆسپە بۆ دەربڕینی ویستە راستەقینەكانی زۆرینەو لە لایەكی دیكەشەوە كۆسپە لەسەر سەرەڕۆیی ئەو [زۆرینە]. لەگەڵ هەمووی ئەمانە لە دیموكراسیەكانی ئەوڕۆیدا، دەستووری نووسراوە (بێجگە لە بریتانیاو زیلاندی نوێ) یەكێك لە كۆمەڵە سەرەكییەكانی دیموكراسییە. لەگەڵ ئەوەش لە دیموكراسییەكاندا دەستوورەكان لە گۆڕانو دەستكاریكردن ناپارێزرێن. ئەو پشتیوانیانە كە هەموو دەستوورەكان لە مافو ئازادییەكانی تاك دەیكەن، بناغەی دیموكراسی پتەو دەكەن،

هەرچەند نابێ لەم خاڵە ئەو دەرەنجامە وەربگیرێ کە دەرکی بیرکردنەوەو تێفکرین سەبارەت بە یاساو ڕێساکانی دەستوور دادەخرێ. مەبەستی سەرەکی لە دانانی دەستوور، کونترۆڵی دەسەڵاتدارانی هەڵبژێردراوو نوێنەرانی خەڵکو پێشگیری لە هەڵسوکەوتی ناڕەوایە کە لەوانەیە ئەوان بە ناوی خەڵك بەڕێوەی بەرن.

کەوابوو دەستوور لە یەك لاوە پێوەندیی نێوان هەڵبژێردەرانو هەڵبژێراوان کۆنترۆڵو ڕێك دەخەن. تا ڕادەیەك هیچ ڕێگەیەکی جێی دڵنیایی دیکە بۆ مسۆگەرکردنی ئەمەکناسی دەسەڵاتدارانی هەڵبژێردراو سەبارەت بە ویستی خەڵك بوونی نیە. خودی سیستمی هەڵبژاردن بۆ ئەم مەبەستە وەڵامدەر نیە. دەستوور پردی نێوان خەڵكو دەسەڵاتداران لە دێموکراسی دایە. جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی حکومەتی بە پێی دەستوور بە خەڵكو یا بە زۆرینەی خەڵك ئەو دەرەتانە دەبەخشێ کە وەك دەڵێن لە نێوان حکومەتکەران واتا نوێنەرانی خۆیان "دووبەرەکی بنێنەوەو حکوومەت بکەن". جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان [تفکیك قوا] لە نێوان دەسەڵاتی یاسادانانو بەڕێوەبەری، نێوان ئەنجومەنەکانی یاسادانان،و هەروەها لە نێوان ئاستە جۆراوجۆرەکانی حکومەت لە دەوڵەتی فیدراڵدا دەرەتانی چاودێریی خەڵك بەسەر حکومەتدا زیاد دەکا. ئەندامانی هەر ولاتێك لانیکەم لەباری بەرژەوەندی پیشەییو ڕێکخراوەیی خۆی بەسەر هەڵسوکەوتی دەسەڵاتەکانی دیکەدا چاودێری دەکەن. کەوابوو دەستوور ئامرازێکی نیهایی چاودێری خەڵك بەسەر کاربەدەستانی هەڵبژێردراوی خۆیەتی. بەم پێیە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانو چاودێرییان بەسەر یەکتردا پێویستیی حکوومەتی دێموکراسییە. بەم هۆیە دەرەتانی گۆڕانی سووكو ئاسان لە دەستووردا بناغەکانی حکوومەتو دێموکراسی سستو لاواز دەکا.

بەگشتی ئەرکی سەرەکیی دەستوورەکان، یەکەم ناچارکردنی بەرپرسانی سیاسیی هەڵبژێردراو بە دووپات کردنەوەی بەڵێنو پەیمان لە گەڵ خەڵك لە هەڵبژاردنەکان، دووهەم بەڕێوەبردنی چاودێری ناڕاستەوخۆی خەڵك بەسەر بەرپرسان لە نێوان هەڵبژاردنەکانداو سێهەم دروست کردنی دووبەرەکی [تفرقه] نێوان دەسەڵاتبەدەستان بەهۆی بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بە مەبەستی ئاسان کردنی مسۆگەربوونی دەسەڵاتداریەتی خەڵك. کەوابوو بە پێچەوانەی گومانی باو، ئەرکی دەستوور هەر تەنیا پێشگیری لە دیکتاتۆریو سەرەڕۆیی نیە. بە واتایەکی دیکە دەستوور هەم ئەرکی پێشگیری لە دیکتاتۆریو هەم ئەرکی یارمەتیدان بە

دێموکراسیيەو دەرەتانی حکوومەتی خەڵك بەسەر خۆیاندا ئاسان دەکا. لەم رووەوە ناتوانین دێموکراسی هەر بە هۆی حکوومەتی زۆرینە لە مانا رۆسۆیەکەی دا بەرتەسکی بکەینەوە.

حکوومەتی زۆرینە رەوایی بڕیاردانەکانی بە تەنێ هەر [صرفاً] لە سەرچاوە یان بیچمی ئەودا دەگەڕێ. بە واتایەکی دیکە ژمارە پێوەرە بۆ رەوایی. هەر بۆیە هەر بڕیارێك کە زۆرینە بیدات، چ عادیلانە یا ناعادیلانە، چ یاسایی‌و چ نایاسایی، دەبێ بە پێوەرەو سەرنج نادرێتە سەر ناوەرۆکەکەی. بەڵام ناکرێ دێموکراسی هەر بە ویستو هەواو هەوەسی کاتیی زۆرینە کەم بایەخ بکرێ. بۆیە یاساو یاساگرۆیی پشتیوانەی دێموکراسیيە. لەم حاڵەتەدا زۆرینە ناتوانێ بە دڵخوازی خۆی‌و بە پشت بەستنی بە ژمارە، کەمینەکان لە مافی بەیانو کۆبوونەوەکان بێبەش بکا، لەبەر ئەوەی یاسا وەها مافێکی بۆ هەمووان بە فەرمی ناسیوە. کەوابوو حکوومەتی زۆرینە بە بێ دەستوور دەتوانێ ببێ، بەڵام دێموکراسی لە مانای تەواوی خۆی‌دا، بە بێ دەستوور ناتوانێ ببێ. بە شێوەیەکی گشتی تەوافوقی سەرەکی‌تری خەڵك لە دێموکراسییەکاندا سەبارەت بە مافو ئازادییە سەرەکییەکانی تاکەکان هەر ئەو دەستوورەیە، هەر چەند ئەم تەوافوقە بۆ لێکدانەوەو گۆڕانیش بێ. هەر چۆنێك بێ هەروەك باس کرا، دەرەتانی چاوپێ خشاندنەوەو رێکوپێك کردنی دەستوور بە مەبەستی لەبەرچاوگرتنی داخوازیی نەوەکانی دیکەش هەموو کات کەمو زۆر بوونی هەیە، لە هێندێك وڵات دا ئەم کارە لە رێگای لێکدانەوەو شیکردنەوەی دادوەری، بەڕێوە دەچێ. هەر بۆیە بە پێچەوانەی وێنای هەندێك لە نووسەران، درێژەکێشانی دەستووری کۆن کە نەوەی کۆن دایان ناوە، بەو مانایە نییە کە حکوومەتی مردووەکان بەسەر زیندووەکاندایە.

## هاووڵاتی‌بوون [شهروندی]

پێگەی هاووڵاتی‌و مافو ئەرکەکانی لە چەمکەکانی سەرەکی ژیانی دێموکراتیك دا حیسابی لەسەر دەکرێ. هاووڵاتیان لە رووی مافو ئەرکەکانیان لەگەڵ یەك یەکسانن. لە دێموکراسییە کۆنەکانی [باستان] یونانو رۆمیش پێگەو شوێنی هاووڵاتی بە مانای هەبوونی مافو ئەرکی یەکسان لەبەر دەم یاساو بەشداری‌کردنیش لە کاروباری سیاسی‌و گشتیی کۆمەڵگادا بوو. مافی حکوومەت کردنو گوێڕایەڵی لە حکوومەت هەر دوو بەشێك لە پێگەی هاووڵاتی‌بوونن، بەو حاڵەش لە "ئاتێن" پێگەی هاووڵاتی تەنیا لە پیاوە ئازادەکان دا بەرتەسك دەکرایەوەو کویلەکان وەك هاووڵاتی حیسابیان بۆ نەدەکرا. لە ئیمپراتووری روم دا

پێگه [شأن] هاوولاتی هەموو خەڵکی ولاتو خەڵکی ولاتانی تێك شکاویشی دەگرتەوە. لەگەڵ ئەوەش لە روم پێگەی هاوولاتی زیاتر بە مانای نەرێنی مافی کەڵك وەرگرتن لە ئارامیو ئاسایشی یاسایی بوونە بە مانای ئەرێنی بەشداریی چالاکانە لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگادا. دواتر چەمکی هاوولاتی لە ئیتالیا چاخی رونێسانس زیندوو کرایەوە. بە بۆچوونی رووناکبیرانی سەردەمی رونێسانس مرۆڤایەتی تاك تەنیا وەك هاوولاتی کۆمەڵگایەکی ئازادو خودموختار مسۆگەر دەبێ. چەمکی هاوولاتی لە شۆڕشی فەرانسەدا گەیشتە لوتکەی گەشەکردنی خۆیو لە راگەیەندراوی مافی مرۆڤو هاوولاتی ساڵی ١٧٨٩دا بە روونی دەرکەوت.

ژان ژاك رۆسۆ چەمکی راستەقینەی هاوولاتی بە شێوەیەکی ئایدیالیستی لە بە سەرەکیتر زانینی خێرو قازانجی گشتی بەسەر قازانجەکانی تایبەتیدا پێناسە دەکرد. هاوولاتیی راستەقینە کەسێکە بتوانێ بەرژەوەندیی گشتیی داوا بکا، واتا خاوەن "ئیرادەی گشتیی"و "فەزیلەتی مەدەنی" بێ، بەلام لە سەدەی نۆزدەهەم دا وەها پێوەندییەك لە نێوان چەمکی هاوولاتیو بەرژەوەندیی گشتیی لە نێو چووو هاوولاتیان وەك کەسانێك لێك درانەوە کە لە بناغەدا جیاوازیی بەرژەوەندییان هەیەو لە پەیجۆری خێرو قازانجی خۆیاندان. کەوابوو پێگەی هاوولاتی لە چاخی مۆدێرندا وەك پێویستییەك بۆ دابین کردنی خۆشگوزەرانیی تاك لێك درایەوەو، نە بەرژەوەندیی گشتیو کۆمەلایەتی.

پێگەی هاوولاتی بە مانای کەڵك وەرگرتن لە مافگەلێکی وەك ئازادیی بەیان، یەکسانی لە بەرانبەر یاسادا، مافی کۆبوونەوەو ... هتد بە بێ سەرنج دان بە پێگەی چینایەتی، جنسیو رەگەزیو ...، چەمکی باوی هاوولاتی لە سەدەی نۆزدەهەم دابوو، بەلام لە سەدەی بیستەم سەرهەڵدانی چەمکی "مافی کۆمەلایەتی" پەرەیەکی زۆرتری بە ناوەرۆکی هاوولاتی دا. مەبەست لە مافی کۆمەلایەتی کەڵك وەرگرتن لە خزمەتگوزاریی کۆمەلایەتی، تەندروستی، فێرکاری، بیمەی کۆمەلایەتی [تأمین اجتماعی]و هتد. بەم شێوە چەمکی هاوولاتی ئیتر تەنیا خەسڵەتی یاساییو سیاسی نیە، بەڵکوو مانای کۆمەلایەتیو ئابووریشی پەیدا کردوەو بەم شێوە ناتەبایی بنەڕەتی نێوان سەرمایەدارانو پێگەی هاوولاتیان کە زۆر جار هۆی نیگەرانیی لایەنگرانی دێموکراسی بوە، تارادەیەك دابەزینی بە خۆیەوە دیوە.

هێندێك لە نووسەرانی ئەم دواییانە کە وەك لایەنگرانی "هەسەنایەتیی کۆمەڵ" (communitarianism) ناودێر کران، لەسەر خەسڵەتی تاك خوازانەو قازانج ویستانەی

چەمکی هاوولاتیی مۆدێرن رەخنەگەلێکیان هەبوە، لەبەر ئـەوەی بـە بۆچـوونی ئەوانـە وەهـا چەمکێك رەدکردنەوەی ئەندیشەی بەرژەوەندی گشتیو فەزیلەتی مەدەنی بـە مانـای بـاو لـە ئەندیشەی سـەرەتایی دێموکراسیدا (بـۆ نموونـە رۆسـۆ)ی لـێ دەکەوێتـەوە. لـە روانگـەی لیبرالەکانەوە، هاوولاتی بریتییە لە توانایی تاکەکان لە پێکهێنانو بەدواداچوونی تێگەیشتنی خۆیان لە چەمکی خێرو بەرژەوەنـدی، بـە لەبەرچـاوگرتنی رێـزو حورمـەت بـۆ تێگەیـشتنی کەسانی دیکە لەو چەمکە. کەوابوو چەمکی خێری گشتی بە مانـای کلاسـیکەکەی بـۆ بـاس نابێ. بەلام لە روانگـەی لایـەنگرانی رەسـەنایەتیی کۆمەلـەوە، چـەمکی خێـری گـشتی بـە شێوەیەکی سەرەکی گرینگتر لە تێگەیشتنی تاکەکان لە بەرژەوەندیەکانو مەیلەکانی خۆیـان و هاوولاتیش لە بـاغەدا بە مانای توانایی بۆ ناسینو لەبەرچاوگرتنی خێری گشتییە. لە لایەکی دیکەوە لیبرالەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کە وێنای خێرو بەرژەوەندیی گـشتی، خـاوەن ماناگـەلو توخمی توتالیتێرییەو دێموکراسی بە مانای زۆرینـەخوازی، لەگەل وەهـا وێـنایەکـدا ناگونجـێ. لەراستیدا کۆمەلگای نەریتیو پێش دێموکراتیش لەسەر وەها ئەندیـشەیەك لـە بەرژەوەنـدیی گشتی بوون کە لە چوارچێوەی ماناگەلێك وەك ناسنامەی دینیدا، خۆی دەردەخست. کـەوابوو پێداگرتن لەسەر پێویـستیی سـەرنجدانی هاوولاتیـان بـە خێـرو بەرژەوەنـدی گـشتیی لەگـەل ئەندیشەی ئازادی ناتەبایە. کۆمەلگای دێموکراتیکی مۆدێرن ناکرێ لەسەر بناغەی یەك جۆر تێگەیشتن لە خێرو قازانجی گشتی دابمەزرێ. وەهـا تێگەیـشتنێك لەگـەل مانـای "تـاك" لـە ئەندیشەی دێموکراتیك دا لە بنـەڕەت دا ناتەبایی هەیە. بەمجۆرە چەمکی هاوولاتی بـە مانـای کلاسیك لەگەل چەمکی تاکایەتی [فردیت] لە لیبرالیسم دا دژایەتی پەیدا دەکا.

چەمکی هاوولاتی مۆدێرن لەم سەردەمەدا لە لایەنەکانی دیکەشەوە کەوتۆتـە بـەر هێـرش. توندبوونەوەی ناسنامەی قەومیو نەتەوەیی لە چوارچێوەی نێوخۆی دەولەتە نەتەوەییەکانـدا، ناسنامەی تاك وەك هاوولاتی کۆمەلگای دێموکراتیك دەخاتە ژێـر سـێبەری خـۆی. هـەروەها سەرهەلدانی مەیلی لیبرالـی نـوێ لەگـەل رەدکردنـەوەی توخمـەکانی کۆمەلایـەتیو ئـابووری هاوولاتی جارێکی دیکە ئەو هەر وەك چەمکێکی یاسایی پـەتی دادەبـەزێنێ. هـەروەها بـە جیهـانیبوونی پێوەندییـەکانی ئـابووریو کۆمەلایـەتیو سـنووردارببوونی رۆژ لـەدوای رۆژی دەولەتە نەتەوەییەکان لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا، پێویستی چاوخشاندنەوە بـە مانـای بـاوی هاوولاتی دا بە تایبەت بە پێی چەمکی مافی مرۆڤ بەشێوەی گشتی زەرووری دەکا.

## دەسەڵاتداریەتیی خەڵك [حاكمیت مردم]

دەسەڵاتداریەتیی خەڵك یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی دێموکراسیەیە. مانای سەرەکیی دەسەڵاتداریەتیی خەڵك ئەمەیە کە حکوومەتەکان هێزو دەسەڵاتی خۆیان لە سەرچاوەیەکی دیکە بێجگەی لە ویستو کۆدەنگیو ڕەزامەندی گشتیی خەڵك بەدەست ناهێننو خەڵك دەتوانن حکوومەت بگۆڕنو یان لەسەر کار لای بەرن. کەوابوو دەسەڵاتی سەرەکیو نیهایی بۆ خەڵکە، هەرچەند سەبارەت بەمە کە چۆن ئەم دەسەڵاتداریەتیە بەکار دەبرێ، لە نێو قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی دێموکراسیدا جیاوازیی بیروبڕا هەیە، یەکێك لە مەسەلە گرینگەکان هەموو کات ئەمە بووە کە ئایا دەسەڵاتداریەتیی خەڵك راستەوخۆ بەکار دەبرێ یا لە ڕێگای نوێنەرەکانیان لە پارلمانو دەوڵەتدا خۆی دەنوێنێ. هەروەها ئەمە کە ئایا لە بناغەدا خەڵك دەتوانێ دەسەڵاتداریەتی بەکار بێنن یان ئەمە کە گرینگترین تایبەتمەندیی دێموکراسی دادوەریی خەڵکە سەبارەت بە سیاسەتەکانی حکوومەتو وەرگرتنی یان وەرنەگرتنی ئەوانەیە. دیسان ئایا خەڵك دەبێ هەر قەوارەو بێچمی حکوومەت بە پێی دەستوور دیاری بکەن یان ڕەزامەندیی خۆی سەبارەت بە سیاسەتو بڕیار وەرگرتنەکانیش رابگەیەنن.

لە ئاستێکی نزمتردا پرسیارگەلێکی لەم چەشنە دێنە بەر باس: ئایا لە سیستمی سەرۆکایەتیدا دەسەڵاتداریەتیی خەڵك باشتر بەڕێوە دەچێ یان لە سیستمی پارلمانیدا؟ هەروەها ئایا دامەزراوەکان پێوەندیی نێوان خەڵكو حکوومەت بە تایبەتی حیزبە سیاسییەکان، گرووپە بەدەسەڵاتەکانو ڕاگەیەنە گشتیەکان، بەڕێوەبردنی دەسەڵاتداریەتی خەڵك ساناترو یان دژوارتر دەکەن؟ لە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانەدا دەبێ بوترێ کە بنەمای دەسەڵاتداریەتیی خەڵك لە دێموکراسییەکاندا لە بیچمو پلەی جۆراوجۆردا ڕەنگی داوەتەوەو مسۆگەر بووەو دیارە هۆکارەکانی مێژوویيو فەرهەنگی لە پێکهاتەی ئەم بنەمادا کاریگەر بوون. کەوابوو بنەمای دەسەڵاتداریەتیی خەڵك بە جۆرێك لە جۆرەکان بنەمایەکی زاڵ بەسەر هەموو دێموکراسییەکاندایە، تا ئەو جێگایە کە دەکرێ بوترێ ئەم بنەمایە [اصل] لە دێموکراسییەکانی کۆنو سەقامگرتوودا بەشێکی "خۆنەویست"ـە [بنەمایەکی وا جێگرتوو کە کەس گومانی تێدا نیە] لە سیستمی سیاسیو لە چالاکییەکانی هەڵبژاردن داو یان لە

وتووێژەکانی پارلمانیدا سەبارەت بە پێویستیو گرینگیەکەی بۆ دێموکراسی باسی لێ ناکرێ [پێی وایە ئەوە جێگەی موناقشە نیە].

بە واتایەکی دیکە، خەبات لە سەر دەسەڵاتداریەتی نەتەوەیی، زۆر لە مێژە لە رۆژئاوادا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. بوونی دەستوورەکان لە دێموکراسییەکاندا خۆی گرینگترین چاوگەی بنەمای دەسەڵاتداریەتیی خەڵکە. کەوابوو لەم بارەوە جیاوازیی بۆچوونێك نیە کە خەڵك مافی خۆیانە یەکەم دەستووری وڵاتی خۆیان بەشێوەی گونجاو دابینێنو دووهەم، سەبارەت بە گۆڕینو چاکسازیی دەستوور راوێژیان لەگەڵ بکرێو روانگەکانی خۆیان رابگەیەنن. بنەمای دەسەڵاتداریەتیی خەڵك یەکێك لە بنەماکانی دایکی دێموکراسیەکانی کۆنە کە لە چەمکەکانو بنەماکانی دیکەدا کە لێکمان داوەتەوە، وردتر دەردەکەوێ. بە پێچەوانەی ئەوەی کە سەبارەت بە دێموکراسییەکانی کۆنو جێگرتوو باس کرا، چەمکی دەسەڵاتدارەیەتیی خەڵك لە بارودۆخی تێپەڕین لە سیستمگەلی پێش لە دێموکراتیك بە دێموکراسی زەق دەبێو ناگایانە دەکەوێتە بەرباسو سەرنج. یەکێك لە کۆڵەکەکانی بیرکردنەوەی سیاسی لەم سەردەمانەدا ئەوەیە کە خەڵك لە بەرانبەر خۆدا، نەریتەکان، دەسەڵاتدارانی نەریتی، یاساگەلی ئایینیو... هتد تا چ رادەیەك خاوەن دەسەڵاتداریەتی بوون. لە ئورووپا لە سەردەمانی تێپەڕین لە سەدەکانی نێوەڕاست بۆ چاخی نوێ، پادشاکان کە لە سەرەتادا رەوایی خۆیان لە کەنیسەکان وەردەگرت، لە سەرەتادا بە مەبەستی سەلماندنی سەربەخۆیی خۆیان لە کەنیسە، رەوایی یاسایی خۆیان راستەوخۆ لە خوداوە دەزانیو دواتر لە سەرەخۆ بنەمای ئیرادەو دەسەڵاتداریەتی خەڵکیان وەك بناغەی رەوایی خۆیان وەرگرت.

## مافی مرۆڤ

چەمکی مافی مرۆڤ وەك کۆمەڵە مافێك کە مرۆڤەکان تەنیا لەبەر ئەوەی کە مرۆڤایەتی حوکم دەکا کەڵکی لێ وەردەگرن، لە سەدەی حەڤدەهەمدا برەوی سەند و جێی چەمکی کۆنتری "مافی سروشتی" گرتەوە کە مرۆڤەکان بە پێی "یاسای سروشتی" کەڵکیان لێ وەردەگرت. چەمکی مافی مرۆڤ بە مانایەکی بەربلاوتر لە مافی سروشتی کەڵکی وەردەگیرا، تا ئەو مافانەش بگرێتە خۆ کە بە سانایی ناکرێ وەك مافی سروشتی حیسابی بۆ بکرێ، بەڵکوو تەنیا لە کۆمەڵگاو دەوڵەتدا دەردەکەون. بە بۆچوونی زۆر لە لایەنگرانی دێموکراسی،

مافی مرۆڤ بەم مانایە گەوهەری دێموکراسی پێك دێنێ. بنەماکانی دیکەی دێموکراسی وەك بەشداریی گشتیو حکوومەتی زۆرینە لە سەردەمانی پێش مۆدێرنیش دا ریشەیان بوە، بەڵام چەمکی مافی مرۆڤ چەمکێکی نوێو هەڵقولاو لە بارودۆخی چەرخی مۆدێرن بوو. لە چەرخی پێش مۆدێرندا زۆرجار فێرکاریەکانی سیاسیو ئەخلاقی لەسەر ئەرکەکانی تاك تەئکیدیان دەکرد. دیارە پێشینەی مێژوویی چەمکی کۆنی مافی سروشتی دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفە [رواقی]یەکانی یونانی کۆن کە بە مافی سروشتیو یەکسانی هەموو مرۆڤەکان باوەڕیان هەبوو. لە روانگەی ئەوانەوە مافی سروشتی بە هۆی یاسا نەگۆڕەکانی سروشتەوە بوو.

یاساکانی رۆمیش لەسەر بوونی هەندێك مافی گشتیو جیهانی سەرەڕای مافی هاووڵاتی هەر وڵاتێك تەئکیدی دەکرد. لەگەڵ هەمووی ئەمانە لە جیهانی کۆندا، فەیلەسووفانێك وەك ئەرەستوو تۆماس ئاکوێنیاس مافی یەکسانی‌یان بۆ هەموان رەد دەکردەوەو هەندێك مرۆڤیان بە پێی سروشت وەك بەردە حیساب دەکرد. پاش رۆنیسانسو لە سەدەی نوێدا فەیلەسووفە سیاسییەکانی لیبراڵ تێگەیشتنێکی مۆدێرنیان لە تیئوریی مافی سروشتی دەخستە ئاراوەو بەڵگەیان دەهێنایەوە کە مرۆڤ لە گەوهەری خۆیدا لە مافی ژیان، خاوەنداریەتیو ئازادی لە ئیرادەی سەرەڕۆیانەی کەسانی دیکە کەڵك وەردەگرنو پاش بەشی پەیماننامەی کۆمەڵایەتیو هاتن بۆ نێو کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا مافی بەڕێوەبردنی مافی سروشتی بەستراوە بە یاسای سروشتی لە دەست دەدا.

تێگەیشتنی مۆدێرن لە چەمکی مافی سروشتی لە سەدەی هەژدەهەم بۆ کۆلۆنیەکانی ئەمریکاییش تەشەنەی کردو لە راگەیەندراوی سەربەخۆیی ١٧٧٦ی ئەمریکادا رەنگی دایەوەو بە پێی ئەم راگەیەندراوە "هەموو مرۆڤەکان یەکسان خەلق کراونو خودا مافگەلێکی هەتا هەتایی کە وەرگرتنەوەی بۆ نیەو دەستنیشان کراون، پێ بەخشیوە، گرینگترینی ئەم مافانە بریتین لە: "مافی ژیان، ئازادیو بەدواداچوونی بەختەوەریو بەباش ژیان" لەگەڵ ئەمەش هەندێك لە لایەنگرانی چەمکی مافی مرۆڤ، دەرکێشانی مافی مرۆڤەکانیان لە یاسای سروشت خستۆتە بەر رەخنە. بۆ نموونە جان ستوارت میل بەڵگەی دەهێنایەوە کە مافی مرۆڤەکان لەسەر قازانج دانراوە، واتا ئامرازی بەرەوپێش بردنی شادیو بەختەوەریی مرۆڤەکان، دەنا هیچ چەشنە یاسایەکی عەینیو زاتی بوونی نیە. بەو حاڵەش تیئۆریی یاسای سروشتی گرینگترین

تیئۆری لە روونکردنەوەی سەرچاوەی مافی مرۆڤ بوە، هەرچەندە تێگەیشتنگەلێکی جۆراوجۆر لە چەمکی یاسای سروشتی خراوەتە روو کە بۆخۆی بۆتە هۆی گەشەی [تکامل] ئەو چەمکە.

ساکارترینو کۆنترین لێکدانەوە لە یاسای سروشتی، هەر ئەو تێگەیشتنەی "رواقیون" بوو کە بە پێی ئەو تەواوەتی جیهان بە پێی یاساکانی سروشتیەو شتەکانو گیانلەبەران لە رووی پێویستیو یان بە پێی سروشت [غریزە]، لەو یاسانە پێرەوی دەکەن، هەرچەند مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی ئاوەزمەند دەتوانێ لەوانە پیرەوی بکا یان نەکا. بەلاّم هەر خودی ئەقلّ بەشێك لە یاساکانی سروشتیە. کەوابوو مرۆڤ بۆ شوێن کەوتنی ئەو یاسانە لەراستیدا لە ئەقلّی خۆی پیرەوی دەکا. ئەم لێکدانەوە بە ئاشکرا دوو مانا لە یاسا لەگەلّ یەك تێکەلّ دەکا، لە مانایەکدا یاسا وەك رێوشوێن پێویستی سروشتی لێك دەدرایەوەو لە مانایەکی دیکەدا، رێوشوێن گەلێك [قواعد] حیسابی بۆ دەکرا کە مرۆڤ دەیتوانی بە دلّخوازی خۆی پیرەوی لێ بکا. بە واتایەکی دیکە چەمکی یاسا لەم شیکردنەوەدا، هەم پێکهاتەی سروشتو هەم بنەماکانی ئەخلاق دەگرێتە خۆی. لەم رووەوە تیئۆریەکی دووهەم لە ژێر ناوی تیئۆریی سروشتی تایبەتیی مرۆڤ هاتە ئاراوە کە بە پێی ئەو تیئۆریە دەبێ یاساکانی پێوەندیدار بە سروشتی مرۆڤ لە یاساکانی پێوەندیدار بە سروشتی شتەکانو گیانلەبەران جوێ بکرێتەوە.

لەسەر ئەم بناخە مرۆڤ خاوەن سروشتێکی تایبەتەو بنەما گشتیەکانی یاسا سروشتیەکەی بە یەك رادە بۆ ئەقلّی مرۆڤەکان بۆ وەرگرتن دەبێ. کێشەی سەرەکیی لەم لێکدانەوەدا ئەوە بوو کە بە سەرنج دان بە گۆرانی مێژوویی لە بارودۆخی مرۆڤ، ناتوانرێ لە سروشتی چەق بەستووو نەگۆرو ناچالاكو یاسای سروشتی هەموو کاتی مرۆڤ قسە بکرێ. هەربۆیە تێگەیشتنێکی سێهەم لە چەمکی یاسای سروشتی خرایە روو کە بە پێی ئەو، سروشتی مرۆڤ هەر ئەو کەلّك وەرگرتنە لە ئەقلّو یاسای سروشتیش هەر ئەقلّی دروستی مرۆڤە. دیارە کێشە لەم لێکدانەوەدا ئەوە بوو کە ئایا ئەوەی کە ئەقلّ دەی دۆزێتەوە، عەینیو دەرەکیەو یان دروست کراوی ئەقلّی ئێمەیە کە لەو حالّەدا ئیتر ناکرێ لە چەمکی سروشت بە مانای جێکەوتووی قسە بکرێ. دەرئەنجام بە سەرنجدان بە ناتەواویی لێکدانەوەکانی ناوبراو، یاسای سروشتیی وەك راستییەکی مێژووییو چالاك لێك درایەوە.

لە لێکدانەوەی یاسای سروشتی بە نێوەرۆکی گۆرانکار [متغیر]، لەگەلّ گۆران لە کۆمەلّگاو پێداویستیەکانی مرۆیی، رێوشوێنی یاسای سروشتی ئالوگۆری بەسەردا دێ. بەم شێوە دەکرێ

چەمکی یاسای سروشتی لەگەڵ مافی مرۆڤ بە مانای [پویا] [بە پەلە بە شوێن مەسەلەکان بگەرێی، هەوڵ بۆ دۆزینەوەی شتی نوێ بدرێ] پێوەند بدرێ. لە راستیدا سروشت لەم لێکدانەوەدا هەر هەمان فەرهەنگە. سروشتی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا پێ دەگا [تکامل]و هەموو کات مافی مرۆڤیش لەگەڵی پەرە دەستێنێ. گەشەو پێگەیشتنی [تکامل] فیکری‌و ئازادیی مرۆڤ تەنانەت مافەکانی نوێش دەخوڵقێنێ.

## ٢
# پێشڕەوانی ئەندیشەی دێموکراسی

بەشێوەی گشتی دێموکراسی وەك سیستمی حکوومەتیی، پێش لە سەدەکانی نوێ لە روانگەی هەموو فەیلەسووفو زانایانی سیاسیەوە، وەك سیستمێکی نەخوازراو [نامطلوب]و گەندەڵ حیسابی بۆ دەکرا، ئەفلاتوون کە خۆی دیفاعی لە حکوومەتی فەیلەسووفەکانو هەڵکەوتووەکان دەکرد، دێموکراسی بە حکوومەتی خەڵکی نەزانو بێئاگا لە راستییەکانی رەها دەزانی. ئەرەستۆیش لەگەڵ ئەوەی قازانجگەلێکی بۆ جۆرەکانی حکوومەت دادەنا، دێموکراسی بە حکوومەتی هەژاران دەزانێ کە وەك دەوڵەمەندەکان دوورن لە گەورەیی [فضیلت] میانەڕەوی‌و نەرمکێشی. حکوومەتی دڵخوازی ئەرەستوو حکوومەتی چینی نێونجی بوو کە بە بۆچوونی ئەو نەرمکێش‌و میانەڕەو بوون. خاوەن بیرانی دیکەی سەردەمی کۆن [باستان]و سەدەکانی ناوەڕاست، لانی زۆر دێموکراسیان وەك یەکێك لە بەشەکانی سیستمگەلی سیاسی تێکەڵ، لا پەسند بوو کە لە پێکهاتەگەلی توخمەکانی حکوومەتی پادشایی‌و ئەشرافی، دەبووە هۆی هاوسەنگی‌و تەوازونی سیستمی سیاسی. بە پێچەوانە لە چەرخی مۆدێڕن‌و لە سەدەکانی نوێ بەدوادا، دێموکراسی بە شێوەیەکی خێرا وەك باشترین شێوەی رێکخستن بۆ ژیانی سیاسی هاتە بەرباس. دیارە جیاوازیی بیروڕا سەبارەت بە ناساندن‌و ناوەرۆکی دێموکراسی لە نێو تیئۆریسیەنەکان دا، زۆر بەربڵاو بوو. بەڵام دڵخوازی‌و دڵگیری [مطلوبیت] دێموکراسی لە جیهانی مۆدێڕندا تا ئەو جێگە چوەتە پێش کە تەنانەت نادێموکراتیکترین حکوومەتەکانیش خۆیان بە دێموکراتیك دەزانن.

بەشێوەی گشتی ئەو بۆچوونانە کە سەبارەت بە دێموکراسی لە دێرزەمانەوە تا ئێستا خراونەتە روو، بە سەر دوو دەستەی گەورەدا دابەش دەکرێن: یەکەم، تیئۆریەکانی ئارمانج خوازانەو دووهەم، تیئۆرییەکانی واقیع خوازانە.

روانگەی ئارمانج خوازانە یا دێموکراسی لانی زۆری، هەر ئەو روانگە کلاسیکەو سەبارەت بە دێموکراسیەکە کە لەسەر ئازادیی تاك، بەشداریی گشتی لە سیاسەتدا، فەزیلەتی مەدەنی، ئازادیی ئەرێنی، مەیل بۆ لای بەرژەوەندیی گشتی‌و حکوومەتی زۆرینە تەئکیدی دەکا. لەم گۆشەنیگاوە دەنگی خەڵك، دەنگی خودایەو زۆرینە هیچ کات هەڵە ناکات، بیروڕای

گشتیی هەموو لایەك راستو دروستەو دەکرێ هەموو کات بە ئەقڵو گەورەیی‌و دانایی خەڵك پشت ببەسترێ، ئەقڵی خەڵك هەر ئەو ئەقڵە سەلیمەیە. هەر لەم روانگەوە هەموو بەرپرسایەتییەکان دەبێ بە هەڵبژاردن بن‌و لە ریفراندۆم‌و رووکردنە دەنگی گشتی وەك یەکێك لە گرنگترین ئامرازەکانی حکوومەتی دیموکراتیك موستەمەر کەڵك وەربگیردرێ.

لە بەرانبەردا واقیع گەراکان هەموو کات لە ئەگەری سەرهەڵدانی دیکتاتۆریی زۆرینە، سەرکوتی کەمینەکانی فیکری، مەیلی سیاسەت بۆ لای توندڕەوی لە دەرئەنجامی بەشداریی پەیتاپەیتای کۆمەڵانی خەڵك، دەرەتانی دامەزراندنی حکوومەتی سەرەڕۆ بە ناوی ئیرادەی گشتی‌و فەزیلەی مەدەنی‌و لە بەین چوونی رێوشوێنە یاساییەکان بە سەر دەسەڵاتدا نیگەران بوون‌و لەسەر لە بەرانبەردا لە مافەکانی تاك، نەخشی زانستو ئاگاهی‌و رووناکبیری لە هاوسەنگ کردنی حکوومەتی زۆرینە، ئازادیی ئەرێنی بە مانای رزگاری لە ئیرادەی سەرەڕۆیانەی تاکەکان‌و گرووپەکان‌و زۆرینەو رەسەنایەتی بەرژەوەندو قازانجی تاك دیفاعیان کردوە.

لە روانگەی واقیع‌گەراکانەوە، دەسەڵات هەر چۆنێك بێ مەترسیدارەو دەبێ بە شێوەی یاسایی کۆنترۆڵ بکرێ‌و دیموکراسی لەڕاستیدا حکوومەتی یاسایە. دەسەڵاتی رەهای زۆرینە هەر بەو ڕادەیە یان زیاتر لە دەسەڵاتی رەهای گرووپەکانی کەمینە بۆ مافو ئازادی مەترسی خوڵقێنە. هەر بۆیە لەم روانگەدا لە بەر گرینگیی فێرکردن‌و پەروەردە بۆ دیموکراسی، پێکهێنانی مەیل بۆ لای مەسایلی گشتی، پێکهێنانی "زۆرینەی کاریگەر" لە جیاتیی زۆرینەکانی ژمارەیی‌و بێ عەلاقەو مەیل، بەرتەسك کردنەوەی دیموکراسی بە راوێژکردن لەگەڵ خەڵكو دادوەری ئەوان، لە جیاتی حکوومەتی کۆمەڵانی خەڵكو پێویستی پەروەردەکردنی کارناسان لە کاروباری سیاسەتدا تەئکید دەکەن.

یەکێك لە لقەکانی سەرەکی روانگەی واقیع بینانە، تیئۆریەکانی دیموکراسی زۆرینەخوازانەی هاوچەرخن. لەم تێڕوانینەدا گەوهەری دیموکراسی دەبێ لە جیهانی ئەوڕۆدا نە لە حکوومەتی زۆرینەی خەڵك، بەڵکوو لە حکوومەتو کێبەرکێی چەندین گرووپی هەڵبژاردە یان هێزی سیاسیدا بدۆزرێتەوە. کەوابوو یەکەی دیموکراسی، تاك نیە، بەڵکوو گرووپە. زۆرینەخوازان لەسەر زۆرایەتی‌و زۆربوونی گرووپەکانی دەسەڵات لە دیموکراسییەکانداو مەیلی دەسەڵاتی سیاسی بۆ لای پرش‌و بڵاوی تەئکید دەکەن. کێبەرکێ لە دیموکراسییەکاندا نە لە

نێوان خەڵكو گرووپەكانی دەسەڵات، بەڵكوو لە نێوان گرووپەكان بۆخۆیان بەڕێوە دەچێ. دیارە ئەم كێبەركێیە دێموكراتیكە، لەبەر ئەوەی "یاساو ڕێسای گەمەی دێموكراسی" تێیدا لەبەرچاو دەگیرێ، هێندێك لە تیئۆریسیەنەكان، دێموكراسییان لەم مانەیە وەك پۆلیاریشی[1] (حكوومەتی چەند گرووپ) لێكیان داوەتەوە. لەم ڕوانگەوە لە بناخەدا دێموكراسی شێوازێكە بۆ هەڵبژاردنی دەسەڵاتدارانو بڕیار وەرگرتنو لەگەڵ ئەوەی كە لە بۆچوونەكانی كلاسیك دا وەك بەهاكانی دێموكراتیك (بۆ نموونە ئازادیی كەسیەتی، بەشداریی گشتی، هەست كردن بە ئەركی مەدەنیو ... هتد) لێك دەدرێتەوە، پێوەندییەكی نیە. دێموكراسیش وەك سیستمی بازاڕی ئازادە كە لەوەدا یاریكەران بۆ بەدەستهێنانی دەنگی زیاتر لەگەڵ یەكتر لە كێبەركێ دان.

لە كۆمەڵگای ئەوڕۆیدا ئازادیو زانیاریو مافی هەڵبژاردنی كەسییو حكوومەتی زۆرینەی تێگەیشتوو هەرچەند دڵخوازە، بەڵام مومكین نیە. تەنیا دەكرێ لە ڕێگای لەبەرچاوگرتنی یاساو ڕێسای گەمەی دێموكراسی، هاوسەنگییەك لە هێزەكان لە مەیدانی سیاسەتدا پێك بهێنرێو لە ژێر سێبەری ئەو هاوسەنگیەدا، لە مافی تاكەكان پارێزگاری بكرێ.

تاكەكان بەشێوەی سروشتی ئۆگرییەكی یەكسانیان بۆ بەشداری لە سیاسەتدا نیەو لە ئیمكاناتو زانیاریی یەكیسانیش لەم بارەوە كەڵك وەرناگرن. لەم ڕووەوە مەسەلەی سەرەكی لە دێموكراسییەكانی ئەوڕۆیدا، نە ئازادیی تاكو حكوومەتی زۆرینە، بەڵكوو هاوسەنگیی نێوان هێزە سیاسییەكانە تا بەهۆی داگیركردنی سەرچاوەكانی دەسەڵات، لێك بڵاو بێو دەرەتانی كێبەركێی نێوان هێزە سیاسیە ڕێكخراوەكان ئامادە بكرێ. لەم ڕوانگەوە دێموكراسی پێكهاتەی حكوومەتێكی تایبەتییە كە زۆریش پێویستی بە هاووڵاتیانی دێموكراتو خاوەن دانایی مەدەنی، بە مانای كلاسیكەكەی نیە. تەنانەت لە پێكهاتەی پلۆراستی دەسەڵاتدار، دەوڵەت بە دەست زەختو فشارو داخوازیەكانی ڕاستەوخۆو توندڕەوانەی كۆمەڵانی خەڵك هەم ڕزگار دەبێو هەم سیاسەت دەگات بە هاوسەنگی. لەم ڕوانگەوە بەشداریی ڕاستەوخۆو بێ سەرەوبەرەی كۆمەڵانی خەڵك لە سیاسەتدا، دەبێتە هۆی خەڵك خڵەتاندنو ناسەقامگیریو زاڵبوونی تێڕوانینگەلی ناواقیعی. بەشداریی سنووردار، بەڵام ڕێكوپێكو هەڵسەنگێندراوو

---

[1] - polyarchy

ئەقلانی خەڵك باشتر لە بەشداری هەڵنەسەنگێندراو ئیحساسی ئەوانە. لەم وتارەدا بە كورتی ئاماژە بە گرینگترین بیروڕای زانایانی كۆنو نوێ سەبارەت بە دێموكراسی دەكەین.

## ئەرەستوو (٣٢٢ - ٣٨٤ پ - ز)

ئەرەستوو وەك بیرمەندێكی سیاسی دیراسەی دەوڵەت شارەكانی (polis) یونانی دەكردو لەگەڵ ئەم دیراسەكردنە سەرنجیدایە پێوەندیی نێوان دێموكراسیو سروشتی سیاسیی مرۆڤەكان. لە روانگەی ئەوەوە مرۆڤ دیارە ئاژەڵێكی سیاسییە كە لە دەوڵەت شاردا دەژی، هەر دەرەندەكانو خوداكان دەتوانن لە دەرەوەی دەوڵەت شارەكان بژین. مرۆڤ لەبەر توانای كەڵك وەرگرتن لە هێزی تایبەت بەخۆی واتا قسەكردنو ئاخاوتن دەتوانن سەبارەت بە دروستیو نادروستی، قازانجو زیانو راستی [حقیقت]و هەڵەی كاروبارەكان قسە بكەن. كەوابوو ژیانی مرۆڤ پێویستیی ژیان لە كۆمەڵگایە كە مرۆڤ بتوانێ لەودا سەبارەت بە كاروبارە گشتیەكان ئازادانە قسە بكا. لە فەلسەفەی سیاسیی ئەرەستوودا تاك هاوتای بێگیان، [جماد] بنەماڵە، هاوتای دارو گژو گیا، گوند هاوتای ئاژەڵو دەوڵەت شار هاوتای مرۆڤە. مرۆڤ وەك هاوولاتی لە دەوڵەت شاردا كەسێكە كە لە بڕیاردان لە سەر كاروبارە گشتیەكانی كۆمەڵگا بەشداری دەكاو بە نۆرە لە بەدەستەوەگرتنی دەسەلاتیش بەشداری دەكا. ئەگەر وا نەبێ مرۆڤ ئاژەڵێكی زمان بەستراو دەبێ.

بەكارهێنانی مافی هاوولاتی تەنیا لە دەوڵەتێكدا دەگونجێ كە زۆرینەی خەڵك لەودا بەشدار ببێ. دەوڵەت شار یان كۆمەڵگای سیاسی دڵخواز كە لەودا مرۆڤ لە هێزی ئەقڵو ئاخاوتنی خۆی كەڵك وەردەگرێ، دەوڵەتێكە كە لەودا ژمارەیەكی زۆر لە خەڵك بە قازانجی خۆیان حكوومەت دەكەنو لەبەر ئەوە زۆرینەی خەڵك هەژارن، كەوابوو دێموكراسی حكوومەتی هەژارانە. لە نیهایەتدا باشترین حكوومەتی گونجاو لە روانگەی ئەرەستۆوە حكوومەتێك بوو كە تایبەتمەندیی جۆرەكانی باوو ناسراوی حكوومەت واتا دێموكراسیو ئولیگاریشی لەگەڵ یەك تێكەڵ بكا، بەم شێوە كە ژمارەیەكی زۆر لە هاوولاتیان لە حكوومەتدا بەشداری بكەن، بەلام ئەم ژمارە ئەوەندە زۆر نەبێ كە حكوومەت بداتە دەست هەژارەكان.

## بنكديت دو سپينوزا (١٦٧٧ ـ ١٦٣٢)

سپینوزا، فەیلەسووفی هوڵەندی وەك یەكەم تیئۆریسیەنی دێموكراسی لە چاخی نوێدا حیسابی بۆ دەكرێ. لە روانگەی ناوبراوەوە باشترین حكوومەت، حكوومەتێكە كە لەسەر بناخەی دەنگی زۆرینە دامەزرابێ‌و لەودا هەركەس بتوانێ ئازادانە بیر بكاتەوەو قسە بكا.

سپینوزا لە نێوان دێموكراسی‌و زانستو زانستی ئەقڵانی پێوەندییەكی نزیكی دەدی. لە ئەندیشەی رابردووەكاندا، دێموكراسی دەبووە هۆی زاڵبوونی دەسەڵاتی هەژارەكانو فەزیلەتی مەدەنی‌و فێركردنی ئەقڵانی‌و لە نیهایەتدا بەرژەوەندی گشتیی دەخستە مەترسییەوە. ئازادییە دێموكراتیكەكان لە روانگەی فەیلەسووفەكانی پێشۆوە هەرچەند لە كورتخایەندا دەبوە هۆی گەشەی هزرو فەلسەفە، بەڵام دەرئەنجام ناخۆشی لێ دەكەوتەوە. لەم روانگەوە فەیلەسووفەكانی كۆن لەسەر ئەو باوەڕە بوون كە وا باشە دێموكراسی لەگەڵ توخمگەلێك [عناصر] لە ئاریستۆكراسی، مونارشی‌و ئۆلیگاریشی رێك بخرێن تاكوو دەرەتانی پەروەردەكردنی سیاسەتوانانو هاووڵاتیانی تێگەیشتووو زانا بڕەخسێنێ. لەم رووەوە فەیلەسووفەكانی پێشوو، دێموكراسی پەتی‌یان لە نیهایەتدا بە دژمنی هزرو فەلسەفە دەزانی.

سپینوزایش وەك فەیلەسووفەكانی پێشووتر بڕوای وابوو كە ژیانی فەلسەفی دڵخۆشكەرترین چەشنی ژیانە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوان تەئكیدی لەسەر ئەوە دەكرد كە باشترین قەوارەی حكومەتە بۆ بردنەپێشی ئازادیی ئەندیشەو فەلسەفەو فەزیلەتی راستەقینە. بە بۆچوونی ئەو، دێموكراسی، سروشتی‌ترین‌و پەسندترین قەوارەی حكوومەتە، لەبەر ئەوە مشتو مڕی ئازادی لە نێوان بۆچوونە دژ بە یەكەكاندا بە ڕەوا دەزانێ. مەبەستی سەرەكیی حكوومەت دابین كردنی دەرەتانی درێژەكێشانی مانەوەی مرۆڤەكانە كە تەنیا لە چوارچێوەی حكوومەتی ئەوان بەسەر خۆیاندا بەشێوەی ئەقڵانی دەگاتە لووتكەو ئەم ئامانجەش هەر لە دێموكراسی‌دا دێتە دی یان مسۆگەر دەبێ. بناخەی حكوومەتی دێموكراسی بە بۆچوونی سپینۆزا، پەیمانێكە كە تاكەكان بۆ دابین كردنو پاراستنی "ذات"ی یەكتر [صیانت نفس] دەیبەستن. هەر لە دێموكراسی‌دا، هاووڵاتیان مافی دەست تێوەردان [حق مداخله] لە دانانی سیاسەتە گشتییەكانیان دا هەیە.

## جان لاك (١٧٠٤ ـ ١٦٣٢)

لاك له دامەزرێنەرانی سەرەكیی دێموكراسی لیبراڵە. ناوبراو مامۆستای پزیشكی له زانكۆی ئاكسفۆرددا بووو له ژیانی سیاسیی بریتانیای ئەو سەردەمەدا نەخشێكی چالاكانەی بووەو بەهۆی دژایەتی لەگەڵ دیوانی پادشاهی بۆ چەندین ساڵ بریتانیای بەجێ هێشتو له هولەندا دەژیا. ئیلمنتە سەرەكییەكانی [عناصر اصلی] لیبرالیسمی لاك، تەئكید له سەر ئازادیو یەكسانیی سروشتیی مرۆڤەكان، مافی ژیانو خاوەندارێتیی مرۆڤەكان، حكوومەتی سنووردارو مەرجدار بە یاسای سروشتیو ڕەزامەندیی خەڵك، ئاسانكاریی ئایینی، جوداكردنەوەی دەسەڵاتەكانی حكوومەتی، ڕەسەنایەتیی كۆمەڵگا له بەرانبەر دەوڵەتو مافی شۆڕش به دژی دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆ دەكرد. ئەم ئەندێشانە بەتایبەت له دوو نووسراوەی حكوومەت (١٦٨٩) بەرهەمی گرینگی لاك دا هاتوونەتە بەر باسو ناوبراو له نووسراوەی یەكەم دا تیئۆریی مافی خودایی شاكانی دەخستە بەر ڕەخنەو ڕەدی دەكردەوەو بەتایبەت له سەر ڕوانگەی پارێزگارانو سەڵتەنەتخوازان كه حكوومەتی پاشایەتییان دامەزراو لەسەر كتێبی پیرۆزو سازگار لەگەڵ باوكسالار له بنەماڵەدا دەزانێ، ڕەخنەی هەبوو.

لاك پاشان له نووسراوەی دووهەم دا، بنەماكانی حكوومەتی له ئەقڵی مرۆڤ دەردەهێناو مرۆڤی له هەڵبژاردنی بیچمە جۆراوجۆرەكانی حكوومەتدا سەربەست دەزانیو بنەماڵەو سیاسەتی وەك دوو بواری جیا له یەكی ژیانو تێكۆشانی مرۆڤ بە حیساب دێناو لەم نووسراوەدا، لاك باروودۆخی سروشتی واتا باروودۆخی پێش له دامەزرانی دەوڵەتی وەك باروودۆخێك وەسف دەكرد كه لەودا مرۆڤەكان ئازادو یەكسان بوون. مرۆڤ له باروودۆخی سروشتیدا، تەنیا گوێڕایەڵی ئەقڵی خۆیەتیو بڕیارەكانی ئەقڵ، هەر ئەو یاسای سروشتییەیە. بە واتایەكی دیكە لەو هەلومەرجەدا مرۆڤ بەستراوەو گوێڕایەڵی ویستی كەسێكی دیكە نییە. یەكسانیی سروشتی مرۆڤەكان كۆسپی سەر ڕێی زاڵبوونی ئیرادەی یەكێك بە سەر یەكێكی دیكە له دۆخی سروشتیدا دەبێ. لەو حاڵەدا، یاسای سروشتی یان ئەقڵ، مرۆڤەكان هان دەدا كه ڕێز بۆ مافی یەكتر دابنێن. پێش له دامەزرانی حكوومەت، مرۆڤەكان له باروودۆخی سروشتیدا له ڕێگای كارو تێكۆشانی خۆیان، خاوەندارێتییان بەدەست دەهێناو له ڕێگای پەیماننامەگەلێكەوە بنەماڵەیان پێك دەهێناو منداڵەكانی خۆیانیان پەروەردە دەكرد. كەوابوو

بیاڤی ژیانی ئابووری‌و بنەماڵەیی لە پێش بیاڤی ژیانی سیاسی‌و جودا لەو بوو. کەوابوو گەوهەری ژیان‌و دەسەڵاتی سیاسی لە گەوهەری دەسەڵاتی ئابووری‌و ژیانی خێزانی لە بناخەدا جیاوازە.

دەسەڵاتی سیاسی، سامان‌و ماڵ‌و ملك نیە کە بۆ خاوەنەکەی بێ‌و بۆ بەدەستهێنانی قازانج کەڵکی لێ وەربگیرێ، هەروەها دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵ دەسەلات لە بنەماڵەدا کە دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەکردنی تاکەکانی پێ نەگەیشتوو نەزان بەهۆی تاکەکانی پێگەیشتوو ئازاو ئاقڵ یەکسان نیە. مرۆڤ لە هەلومەرجی سروشتی‌دا بە بڕیاری ئەقڵ‌و ئاوەزو یاسای سروشتی لە مافی ژیان، ئازادی‌و مافی خاوەنداریەتی کەڵك وەردەگرێ. بەڵام لەو بارودۆخەدا ناکۆکیی بچووك لەوانەیە ببێتە هۆی ڕوودانی شەڕگەلێکی گەورەو بێکۆتایی نێوان مرۆڤەکان‌و لەم ڕووەوە کەڵك وەرگرتن لە مافەکانی ژیان، ئازادی‌و خاوەنداریەتی گرنتی نیە. کەوابوو مرۆڤەکان هەلومەرجی سروشتی بەجێ دێڵن‌و "کۆمەڵگای مەدەنی" پێکەوە دەنێن. بەڵام لەبەر ئەوە مرۆڤەکان بە پێی سروشت ئازادو یەکسان‌و سروشت هیچ کەسێکی بۆ گوێڕایەڵی ئەوی دیکە دانەناوە، حکوومەتێك لە بارودۆخی مەدەنی‌دا دادەمەزرێ، ناتوانێ لەگەڵ یاسای سروشتی ناتەبا بێ‌و دەبێ بە ڕەزامەندیی خەڵك پێك بێ. مرۆڤەکان لە کۆمەڵگای مەدەنی‌دا تەنیا مافی داوای سزای [کیفرخواهی] کەسانی دیکە دەنێنە لاوەو لە ئازادیی سروشتیی خۆیان تا ئەو جێگە دەست هەڵدەگرن کە بۆ پاراستنی ژیان‌و ئازدیی خۆیان‌و خەڵکی دیکە پێویست بێ. ئەو پەیمان‌و بەڵێنی‌و ڕەزامەندی‌یە کە تاکەکان دەکا بە ئەندامی هەتاهەتایی کۆمەڵگای مەدەنی‌و ڕەوایی دەدا بە حکوومەت، پێویست دەکا لە لایەن هەر نەوەیەکی نوێ لە خەڵك سەرلەنوێ دەربڕێ‌و رابگەیەندرێ، کەوابوو ڕەزامەندیی باوو باپیرانیان بەس نیە. بۆیە حکوومەتگەلێك کە خەڵك پێیٍ ڕازی نین، شایستەی ئەوە نین ئەمرەکانیان بەڕێوە بچێت.

مەبەستی سەرەکیی حکوومەت لە ڕوانگەی "لاك"ەوە هەر ئەوەیە کە مافی ژیان، ئازادی‌و مولکداریەتیی تاکەکان پارێزراو بێ ئەو مافانە کە مرۆڤەکان لە بارودۆخی سروشتی‌دا بوویانە، بەڵام گرنتی‌یان بۆ نەبووە. کەوابوو مەبەستی حکوومەت بە تەواوی پارێزگاری لە "سامانی" خەڵك کە بریتی لە گیان‌و سامان‌و ئازادی‌یە. بە واتایەکی دیکە بە پێچەوانەی وێنای پێشینیان [قدما] حکوومەت ئەرکی دابین کردنی ڕزگاریی ڕوحیی خەڵك‌و ڕێنوێنی فکریی ڕاگەیاندن‌و تەبلیغی ڕاستییەکان [حقیقت]‌و شتی لەو بابەتە نیە. لە ڕووی ئەو بۆچوونەوە لاك

لە نامەیەکدا سەبارەت بە "تساهل" بەڵگە دێنێتەوە کە حکوومەت دەبێ سەبارەت بە هەموو ئایینو بڕواکان ئاسانگیری لە خۆ نیشان بدا، مەگەر ئەو باوەڕانە کە زیان بە مافی شارستانیی تاکەکان دەگەیننو یان بە تەواوەتی کۆمەڵگا خەسار دەگەیەنن.

هەروەها بە بۆچوونی لاك حکوومەت تەنانەت لە چوارچێوەی ئەم ئامانجە بەرتەسکانەی خۆیشیدا ناتوانێ لە دەسەڵاتی رەها کەڵك وەربگرێ. ئەو دەسەڵاتە کە ئامانجەکەی پارێزگاری لە سامانی خەڵکە، ناتوانێ لە هەناوی خۆیدا دیکتاتۆرو رەهاو سەرەڕۆ بێ. بۆیە لاك پێی وابوو یاسای سروشتی بەسەر یاسا پەسندکراوەکانی حکوومەتدا ئەولەوییەتیهەیەو لە پێشترەو ئەم یاسایانە ناتوانن یاساکانی سروشتی بنێنە لاوە، هەرچەند یاسای سروشتی نەنووسراوەیە. کەوابوو لە روانگەی "لاك"ەوە، کۆمەڵگاو خەڵك بەسەر حکوومەت یان دەوڵەتدا ئەولەوییەتیان هەیەو لە پێشترن. هەرچەندە لاك بە پێچەوانەی تیئۆریسینەکانی دیکە وەك ژان ژاك رۆسۆ، لە دەسەڵاتداریەتیی خەڵك، وەك سەرچاوەی دەسەڵاتی رەها باس ناکا، کەوابوو سەنتەری [کانون] تیۆری لاك خەڵك نیە، بەڵکوو مافو یاسای سروشتیی خەڵکە. بەم پێیە دەکرێ بوترێ کە لاك "یاساخواز" بوون "خەڵك خواز". خەڵك بە بڕیاری زۆرینەو بە رەزامەندیی خۆیان، قەوارەیەك لە حکوومەت دادەمەزرێنن کە لاك ئەوی "یاسا یان حکوومەتی سەرەتایی" ناو لێ ناوە، یاسایەك کە پێش لە هەموو یاساکانی دیکەیە. کاتێك خەڵك دەسەڵاتی خۆیان لە رێگەی ئەو یاساوە بگوێزنەوە بۆ دەسەڵاتداران تا ئەو کاتە کە حکوومەت لەسەر پێیە، ناتوانن دەسەڵاتەکەی خۆیان وەربگرنەوە. بەڵام هەروەك ئاماژەی پێ کرا، لاك مافی شۆڕشو راپەڕین بۆ خەڵك بە پارێزراو دەزانێ. لەبارەی قەوارە جۆراوجۆرەکانی حکوومەت، لاك لەسەر ئەو رایە بوو کە زۆرینە لەوانەیە بۆخۆی دەسەڵاتی یاسادانان بەڕێوەبەریو بەم شێوە "دێموکراسییەکی تەواو" دامەزرێنێو یان ئەوەی کە ئەو دەسەڵاتە بسپێرێ بە تاقمێکی بچووك (ئولیگاریشی)و یان تەنانەت بیداتە دەست پادشا (مونارشی). کەوابوو دەرەتانی دامەزرانی حکوومەتی "نادێموکراتیك" (لە هەمان کاتدا بەڕێوەبەری ویستی زۆرینە) بۆخۆی خۆدەرخستنێك لە دێموکراسییە. لەگەڵ ئەمەش لاك پادشایی رەهای ناتەبا لەگەڵ مافە سەرەکیەکانو سروشتی مرۆڤەکان دەزانێ. هەرچۆنێك بێ لاك پێی وابوو کە بە بێ لەبەرچاوگرتنی قەوارەی حکوومەت، دەسەڵاتی یاسادانانو دەسەڵاتی بەڕێوەبەری نابێ

له دەست کەسانێك کۆ ببێتەوە، دەنا یاسادانەران بۆخۆیان لە بەڕێوەبردنی ئەو یاسایە کە بۆخۆیان دایان ناوە، خۆ دەبوێرن.

## مۆنتسکیۆ (١٧٥٥ ـ ١٦٨٩)

شارل لویی مۆنتسکیۆ، تیئۆریسنی سیاسی فەرانسەیی، بیرۆکەی جیاکردنەوە [تفکیك]و هاوسەنگیی دەسەلاتی حکومەتی لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی واتا روح القوانین (١٧٤٨)دا باس کردوە. مۆنتسکیۆ لەو کتێبەدا سێ بەڵگەی سەرەکی هێناوەتەوە: یەکەم ئەمەی کە دابەشبوونی کلاسیکی رژێمە سیاسییەکان بەسەر مونارشی، ئاریستۆکراسیو دێموکراسیدا بە تەواوی ماناکە ناگەیەنێ [رسا نیست] بەڵکوو دەبێ رژێمەکان بەشێوەی مونارشی، دیکتاتۆریو کۆماری (دێموکراتیك یان ئەشرافی) ریزبەندی بکرێن. بناخەی ئەم ریزبەندییە لە بنەماڵەکانی هەرکام لەم رژێمانە پێك دێن کە بریتین لە: شانازیخوازی (بناخەی مونارشی)، ترس (بناخەی دیکتاتۆر)و فەزیلەتی شارستانی [فضیلت مدنی] (بناخە کۆماری). بنەماو بناخەی هەر رژێمێك ئامرازە تایبەتییەکانی حکومەتی ئەو رژێمانە دیاری دەکەن. دووهەم ئەوەی کە حکومەتگەلی نەرم رەو ماقووڵ ئەوانەن کە لە نێوان دەسەلاتی بەڕێوەبەری، یاسادانانو دادوەری جیاکردنەوەو هاوسەنگی پێك هێنابێ. ئازادی لە گرەوی جیاکردنەوەی دەسەلاتەکانە. هەرکام لە سێ دەسەلات دەبێ بەهۆی بونیاتو دامەزراوەی سەربەخۆ بەڕێوە بچێو نوێنەرایەتیی پێگەیەکی کۆمەلایەتی جیاواز بێ. نەجیب زادەکان دەبێ بەسەر دەسەلاتو هەوڵسوکەوتەکانی کۆمەلانی خەڵك دا چاودێری بکەنو خەڵکیش لە بەرانبەردا هەروەها دەبێ بتوانن دەسەلاتی چاودێری بەسەر نەجیب زادەکانیان دا بێ. هەروەها پێویستیی درێژەکێشانی جیاکردنەوەو هاوسەنگیی دەسەلاتەکان، بوونی دامەزراوەو رێکخراوەکانی مەدەنی پردی نێوان حکومەتو تاك وەك کەنیستە، ئەنجومەنە پیشەییەکانو سینفە جۆراوجۆرەکانە. هاوسەنگیی هێزەکان لە ئاستی نەتەوەییدا دەبێتە هۆی دابین کردنی ئازادیو لە ئاستی نێونەتەوەییدا دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی ئارامی.

سێهەم ئەمە کە بە بۆچوونی مۆنتسکیۆ، هەڵسوکەوتو کردەوەی تاکەکانو حکومەتەکان لە هەر رێگایەکدا تەنیا بەهۆی یاساکان دیاری ناکرێ، بەڵکوو بەستراوەتەوە بە کۆمەڵێك هۆکاری ئاڵۆز وەك ئایین، نەریت، رەسمو روسوومو ئاوو هەواو هۆکارەکانی جوغرافیاییە کە

ویستی گشتی‌یه‌و لەم رووەوە خودی ئازادی‌یە. رۆسۆ موخالیفی پارلمانتاریسم‌و بنەمای نوێنەرایەتی بوو. بە بۆچوونی ئەو پارلمان ناتوانێ نوێنەری ویستی گشتی بێ. خەڵك بە ئەسپاردنی مافەکانی خۆیان بە نوێنەران، ئازادیی خۆیان لە دەست دەدەن. تەنیا هەموو خەڵك بە شێوەی راستەوخۆ دەتوانن ویستی گشتی دەربڕن. لەم رووەوە، دەنگی خەڵك، دەنگی خودایە.

## ئالکسی دوتوکویل (١٨٠٥ ـ ١٨٥٩)

توکویل مێژوونووس‌و بیرمەندی سیاسیی فەرانسەوی لە بنەماڵەی نەجیب زادەکان بوو سەرەڕای ئەوەی کە بنەماڵەکەی بەهۆی شۆڕشی فەرانسە زیانی زۆری پێ گەیشت، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەندیشەی سەرەکیی دێموکراسی، واتا ئازادی وەها رەوایی‌یەکی بەدەست هێناوە کە ناکرێ لە بەرامبەریدا راوەستێ. ئەو خۆی بەهۆی پشتیوانی‌کردن لە پادشای لیبراڵی لویی فیلیپ لە پێشینەی ئەشرافی خۆی دوور کەوتەوەو کەوتە دیفاع لە دێموکراسی‌و لیبرالیسم‌و لە مەودای نێوان ساڵەکانی ١٨٣٩ تا ١٨٥١ ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران بوو بەهۆی دژایەتی لەگەڵ کودیتای لویی ناپلئۆن ناچار بە دەست کێشانەوە لە کاروباری سیاسی بوو. گرینگترین بەرهەمی ئەو لە بواری دێموکراسی‌دا کتێبێکی دێموکراسی لە ئەمریکادا (١٨٣٥ ـ ٤٠) بوو. بەڵگەی سەرەکیی توکویل لەم کتێبەدا، ئەوەیە کە جیهانی مۆدێرن، جیهانی دێموکراتیکەو ئیتر دەرەتانی دامەزراندنی دەسەڵاتداریەتیی رەوا لەسەر بناخەی نادێموکراسی لە نێو چووە. بە واتایەکی دیکە ویستی یەکسانی، گرینگترین تایبەتمەندیی جیهانی مۆدێرن‌و سیاسەتی نوێیە، هەرچەند لەوانەیە سیستمگەلی دامەزراو لەسەر ئەندیشەی‌یەکسانیی مرۆڤەکان بەختەوەری یان رۆژەڕەشی ژیانی سیاسیی لێ بکەوێتەوە.

ویستی یەکسانی لە لایەك لەوانەیە هەرچەشنە پوان [امتیاز]و لەسەر بوونی تاکەکەسی لە نێو بباو لە زۆرینەی دەسەڵاتداردا مەیلێك بۆ پێك هێنانی دیکتاتۆری بەرهەم بێنێ. وەها تێگەیشتنێك لە یەکسانی دژی تاکایەتی‌یە [فردیت] کە بۆخۆی لە چەمکە سەرەکییەکانی دێموکراسی‌دا حیسابی بۆ دەکرێ. دیکتاتۆری زۆرینە بە بۆچوونی توکویل دەبێتە هۆی لاوازکردن‌و رووخاندنی دامەزراوەو ئەنجومەنەکانی کۆمەڵگای مەدەنی وەك پاڵپشتی سەرەکی خۆڕاگری لە بەرانبەر دەسەڵاتداریەتی دەوڵەت داو ئەمەش بۆخۆی لەگەڵ روحی دێموکراسی لە

ناتەبایی دایە. دێموکراسی پێویستیی بە پێوەندییە مەدەنییەکانو ئەنجومەنگەلی کۆمەڵایەتی وەك پردی نێوان تاكو حکومەت هەیە. لە نەبوونی کۆمەڵگای مەدەنیو ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکاندا، بارودۆخێك دەخولقێ کە توکویل ناوی لێناوە "تەنیا کەوتن" [تفرّد]و مەبەستیشی تاکایەتی [فردیّت] نییە، بەڵکوو تەریك کەوتنەوەو تۆزناسابوونی تاکە لە کۆمەڵگایەکدا کە دواتر بە کۆمەڵگای کۆمەڵانی بەرینی خەڵك [تودەای] ناوی لێ نرا. "تەنیا کەوتن" لەوانەیە وەها بە لاوازکردنی [تاکایەتی] تەواو بێت کە تاکەکان بە سانایی تووشی زاڵبوونی بیروڕای گشتیو تەنانەت گیرۆدەی حکوومەتی ڕەهای سەرەڕۆیانێك ببن کە هەر وادەی یەکسانی کۆمەڵایەتیو ئابووریان پێ دەدەن. لە لایەکی دیکەوە ویستی یەکسانی لە کۆمەڵگای مۆدێرندا دەتوانێ دەرئەنجامی ئەرێنیی لێ بکەوێتەوەو بە ویستی یەکسانیی سیاسیو ئەخلاقی لە نێوان کەسانێك دابگرێ کە سەبارەت بە شێوەی ژیانی خۆیان دەست بە دانانی یاسا دەکەن. ئازادیو یەکسانیی دێموکراتیك تەنیا لە ڕێی بەشداری لە حکومەت بەسەر خۆدا دەردەکەوێ. لەم بارەوە توکویل بە توندی لە ژێر کاریگەریی ژان ژاك ڕۆسۆدا بوو.

سەبارەت بە دێموکراسی ئەمریکایی، توکویل پێی وابوو کە سیستمی سیاسیی ئەمریکا ناتوانێ لە نیهایەتدا مەترسیی دیکتاتۆریی زۆرینە لە نێو ببا. لەگەڵ ئەمەش لێهاتوویی خەڵکی ئەمریکا بۆ دابینکردنی دامەزراوەو ئەنجومەنگەلی کۆمەڵگای مەدەنی لە هەموو بوارەکاندا، ئەم مەیلە دادەبەزێنێو دەبێتە کۆسپ لەسەر ڕێی بارودۆخی "تەنیا کەوتن" [تفرّد]. دامەزراوەی کۆمەڵگا مەدەنییەکان لە ئەمریکادا هەروەك قوتابخانەیەکن کە خەڵك لەوانەدا وانەی دێموکراسی فێر دەبن. لە سیستمی دێموکراسیی ئەمریکایی نێوان ئەندیشەی یەکسانی دێموکراتیكو دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەم چەشنە پێوەندی دادەمەزرێ. بەڵام تێکەڵاوێکی تایبەت کە لە دامەزراوەکانی سیاسیو کۆمەڵایەتی لە ئەمریکادا پێك هاتوە، لە وڵاتانی دیکەدا بەو سانایە ناتوانێ دووپات بێتەوە، لەبەر ئەوە زۆرجار نێوان دەسەڵاتداریەتی میللەت کە حەزی لە دیکتاتۆریی زۆرینەیەو دامەزراوەو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کە مەیلیان بۆلای ڕاوەستان لە بەرانبەر ئەوان دایە، ناتەبایی دێتە ئاراوە. ئەو تێکەڵاویە تایبەتە کە تا ئاستێکی زۆر بە بۆچوونی توکویل بەرهەمی سازانی ڕوحی ئایینی پرۆتستان لەگەڵ ڕۆحی ئازادی بوە. لەبەر ئەوەی ئایینی پرۆتستان لەسەر پێگەیشتن [تکامل]خوازی، ئازادیو تێکۆشانو بونیاتنانی مرۆڤ لە جیهاندا پێ دادەگرێ. ئازادی

پێویستی بە زانایی مەدەنی بووەو زانایی مەدەنی [فضائل مدنی] بە بۆچوونی توکویل بەهۆی ئایینی پرۆتستان دابین دەبێ.

## تۆماس جیفرسۆن (١٨٢٦ - ١٧٤٣)

تۆماس جیفرسۆن، سێهەمین سەرکۆماری ئەمریکاو لە داکۆکیکەرانی سەربەخۆیی ئەو وڵاتە لە ئیمپراتوری بریتانیا، نووسەری سەرەکیی راگەیەندراوی سەربەخۆیی ئەمریکاو دامەزرێنەری نەریتی سەرەکی دێموکراسیی ئەمریکایی واتا دێموکراسی جیفرسونی بوو. روانگەی جیفرسۆن سەبارەت بە ئازادی، یەکسانی، بەشداریی هاووڵاتیانی بە فەرهەنگ لە سیاسەتو بەرپرسایەتی وەخۆگری حکومەت، کۆڵەکەی دێموکراسیی ئەمریکایی پێك دێنێ. جیفرسۆن مرۆڤەکانی بە پێی سروشتی کۆمەڵایەتیو سیاسیو موحتاجی بەشداری لە حکوومەت بە مەبەستی پەرەپێدان بە تواناکانی سروشتی خۆی دەزانی. بە بۆچوونی ئەو بەشداریی سیاسی، پێویستی بە دەوڵەمەندی ئابووری بوو، هەر بۆیە ئەو لە دێموکراسی جووتیارانو خاوەن زەویەکانی نێوەنجی پشتیوانیی دەکرد.

جیفرسون چوار بنەمای [اصل] سەرەکیی بۆ دێموکراسی بە پێویست دەزانی: یەکەم بەشداریی سیاسی، دووهەم یەکسانیی ئابووری، سێهەم فێربوونی زانایی مەدەنی چوارەم نوێنەرایەتیی خەڵك بەهۆی نەجیب زادەیی سروشتی. ئامانجی جیفرسون دامەزرانی دەوڵەت شارگەلێکی بچووك بوو کە هەرکام نزیك سەد بنەماڵە لە خۆ بگرێو لەوێدا دێموکراسی راستەوخۆ بگونجێ. بەو حاڵەش بە سەرنجدان بەو مەسەلە کە ناکرێ وڵاتێکی گەورە وەك ئەمریکا بە سیستمی دەوڵەت شارگەلی بچووك بەڕێوە ببرێ، سیستمێکی فیدراڵی پێشنیار کرد کە لەودا وەها دەوڵەت شارگەلێك لە نێو کۆمارەکانی گەورەتردا کۆ ببنەوە. نوێنەرانی خەڵك لەم کۆمارانەدا دەبوایە لە هەناوی ئەشرافیەتی سروشتی زانستو زانیاری، هەڵبژێردرێن تاکوو لە زاڵبوونی دەستکردی [مصنوعی] رەگەزو بنەماڵەو سامان پێشگیری بکا. بەم شێوە جیفرسون دەیویست دێموکراسی راستەوخۆی کلاسیك لەگەڵ سیستمی دێموکراسی نوێنەرایەتی مۆدێرن تێکهەڵکێش بکا. جیفرسون هەروەها خوازیاری پێشگیری لە کۆبوونەوەی زەویەکانی جووتیاران لە چنگ گرووپگەلی بچووكو هەروەها خوازیاری دابەشکردنی زەوی لە نێو کەسانی بێزەویدا بوو [اصلاحات ارضی]. بە بۆچوونی ئەو بەشداریی سیاسی بە بێ کەڵك وەرگرتن لە

رادەیەك مولّكداریەتی، ئیمكانی نەبوو. لەم رووەوە ئەو یان وەك لایەنگری "دێموكراسی جووتیارانی ئازاد" ناو بردووە.

## جیمز مادیسون (١٨٣٦ ـ ١٧١٥)

مادیسۆن لە دامەزرێنەرانی دێموكراسیی ئەمریكایی‌و چوارەمین سەركۆماری ئەو ولاّتە بوو. هەروەها ئەو وەك یەكێك لە تیئۆریسینە هەلّكەوتووەكانی دێموكراسی حیسابی بۆ دەكرا. ئەو كاتەی دەستووری نوێی ئەمریكا بۆ پەسندكردن نێردرا بۆ هەرێمەكان، ئەلیكساندر هامیلتون داوای لە جیمز مادیسون وەك نوێنەری ویرجینیا لە كۆنفوانسیۆنی (Convention) [كنگرە] دەستوور كرد تا لەگەلّ خۆی‌و "جان جی" ریزە وتارێك بۆ دیفاع لە پەسندكردنی دەستوور لە رۆژنامەكانی نیۆیۆركدا بنووسن. بەم شێوە هەشتاو پێنج وتار نووسرا كە پاشتر لە ژێر سەردێڕی فیدرالیست دا ناوبانگیان دەركرد. مادیسون بیست‌و نۆ وتاری نووسی. بە بۆچوونی مادیسون لەو وتارانەدا حكوومەت دەبوا نە تەنیا بەسەر خەلّكدا، بەلّكوو بەسەر خۆیشی‌دا چاودێری‌و كۆنترۆلّ بكا. سیستمی نوێنەرایەتی‌و پارلمانی بەرپرسایەتی حكوومەت لە لای هاوولاّتیان دابین دەكا، بەلاّم ناتوانێ لە بەڕێوەبردنی دەسەلاّت‌و دیكتاتۆریی زۆرینە بەسەر كەمینەدا پێشگیری بكا. بە بۆچوونی مادیسون، كۆمەلّگا بریتی‌یە لە زۆر چین‌و گرووپی كۆمەلاّیەتی‌و بەرژەوەندی گرووپەكانی كەمینە زۆرجار لە بەرانبەر بەرژەوەندیی یەكگرتووی زۆرینە خەسارەتی پێ دەگا. لە روانگەی مادیسونەوە لە كۆماری راوەستاو لەسەر سیستمی فیدرالّ، زۆریی بەرژەوەندەكان‌و گرووپەكان ئەوەندە دەبێ كە پێش بە پێكهاتنی زۆرینەیەكی یەكگرتووو یەكپارچە دەگرێ. مادیسون ئەم بیرۆكەیە لە بەرانبەر بەلّگەهێنانەوەی كەسانێك دێنا گۆڕ كە باوەڕیان وابوو حكوومەتی دێموكراسی تەنیا لە ولاّتانی بچووك دا دەتوانێ درێژە بكێشێ. ناوبراو رۆلّێكی كاریگەری لە بە پەسندگەیاندنی دەستووری ئەمریكاو دە چاكسازی [اصلاحیە]ی یەكەم دەستووردا گێڕاوە.

## ئاندرو جاكسون (١٨٤٥ ـ ١٧٦٧)

جاكسۆن حەوتەمین سەركۆماری ئەمریكا بووو لە بەرانبەر نەریتی دێموكراسیی مادیسونی، لە ئامانجی یەكسانی لە دێموكراسی‌دا پشتیوانیی دەكرد. ئەو لە پەرەپێدانی مافی دەنگدان بۆ چینە هەژارەكان دیفاعی دەكردو دەیهەویست تا نەریتی كۆماری بە مانای رۆسۆیەكەی زیندوو

بکاتەوە. لەگەڵ ئەمەش دیموکراسیی جاکسۆنی تەنیا خوازیاری مافی یەکسانی بۆ پیاوەکانی سپی پێست بووو ژنانو کۆیلەکانی نەدەگرتەوە. جاکسون لە سەردەمی سەرکۆماریی خۆیدا لە مافی کۆمەڵانی خەڵك لە بەرانبەر گرووپە دەست ڕۆیشتوەکانو بە دەسەڵاتدا دیفاعی دەکرد. هەر بۆیە ئەو خوازیاری هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی سەرکۆمار لە لایەن کۆمەڵانی خەڵك (لە جیاتی کولیجی هەڵبژاردن) بووو ریزە هەنگاوێکی لە ڕاستای کونتڕۆڵی گرووپە دەست ڕۆیشتووەکان لە دەزگای ئیدارەی ئەمریکادا هەڵگرت. جاکسون بەتایبەت پێی وابوو کە مۆنۆپولەکانو ئیمتیازاتی [Distinctions] یاسایی بانکەکانی ئەمریکا بنەمای یەکسانی لە نێوان هاووڵاتیان دا خەوش دار دەکاو هێزی روو لە زۆربوونی بازرگانیو ئابووری بەسەر ژیانی تاکە ئاساییەکاندا دەسەپێنێ. لەم بارەوە کەوتە خەبات بە دژی ئەو ئیمتیازاتانەو لەو خەباتەدا دەرئەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێنا. جاکسون لە خولی دووهەمی سەرکۆماریدا، هێرشی خۆی بۆسەر بانکەکان پەرە پێ داو ئەوانی بە هاودەستی چینە چەوسێنەرەکانو دوژمنی چینە زەحمەتکێشەکان ناساند. لەسەر یەك دیموکراسیی جاکسونی سەرەڕای سنوورداربوونی خۆی، زیانگەلێکی بە بنەمای نوخبەگەرانەی دیموکراسیی ئەمریکایی گەیاند.

## جان ستوارت میل (١٨٧٣ - ١٨٠٦)

جان ستوارت میل، فەیلەسووفی سیاسیی بریتانیا یەکێك لە تیئۆریسینە گرینگەکانی ئازادیو دیموکراسی بووو هەوڵی دا تاکوو ریفۆرمی کۆمەڵایەتی لە ڕاستای قووڵکردنەوەی دیموکراسیدا وەك بەشێك لە نەریتی لیبرالیسم بناسێنێ. ئەندیشە سەرەتاییەکانی میل سەبارەت بە دیموکراسی لە ژێر کاریگەریی بیری جیرمی بنتهایم فەیلەسووفی قازانج گەرای بریتانیدا بوو. ئەو لە سەرەتادا بڕوای وابوو کە مافی دەنگی گشتی، هەڵبژاردنی ئازادو دەنگی نهێنی بۆ سەقامگیرکردنی دیموکراسی بەسە. وەها ئامرازگەلێك لە ڕوانگەی ئەوەوە لە گەندەڵی حکومەت کە هۆیە سەرەکییەکەی هەوڵدان بۆ قازانجی تایبەتی بەهۆی کاربەدەستانی گشتیە، پێشگیری دەکا. کەوابوو لە ڕوانگەی قازانج ویستانەی میل، دیموکراسی ئەم قازانجە سەرەکیەی هەبوو کە گەندەڵی سیاسی لە نێو دەباو هەر بەم هۆیە پاساو دەدرێ، نە بە هۆی ئەمە کە بۆ نموونە ئازادیو تاکایەتی [فردیت] [individvality] یان مافەکانی سەرەکی مرۆڤەکان باشتر دابین دەکا.

بەڵام پاش ماوەیەك، میل لەم روانگە قازانج ویستانە دوور کەوتەوەو زیاتر کەوتە ژێر کاریگەریی نەریتی سوسیالیزمی فەرانسەوی‌و هەروەها فەلسەفەی یاسای بریتانیایی. پرسیارێك کە پاشان زەینی میلی بە خۆیەوە خەریك کردبوو، ئەمە بوو کە ئایا خەڵك لە دێموکراسیدا خاوەن زانست‌و توانایی بیرکردنەوەی پێویست بۆ دانانی یاسا یان دانانی سیاسەتی دروست‌و کاریگەریان دەبێ یان نا[؟]. بە بۆچوونی میل خەڵك نەخۆشگەلێکن کە هەست بە نەخۆشی دەکەن، بەڵام خۆیان دەرمانی دەردی خۆیان نازانن‌و دیارە خەڵك دەتوانن دەرمانی پێشنیارکراوی سیاسەتوانان وەربگرن یان رەدی بکەنەوە.

کەوابوو لە سیاسەتیش دا کارناسانێك هەن کە سیاسەتی دروست بۆ خەڵك پێشکەش بکەن. کەوابوو میل لە کتێبی تێبینی‌گەلێك سەبارەت بە حکوومەتی دامەزراو لەسەر نوێنەرایەتی (١٨٦١) بەڵگە دێنێتەوە کە نوێنەرەکانی خەڵك‌و خودی خەڵك توانایی‌و لێهاتوویی پێویستیان بۆ دانانی یاساو بەڕێوەبردنی حکوومەت نیە. بەو حاڵەش بە بۆچوونی ئەو، بوونی پارلمان‌و نوێنەرەکان بۆ بەڕێوەبردنی کۆنترۆڵ بەسەر حکوومەتدا پێویستی هەیە.

کەوابوو دێموکراسی‌یەکی بە ئەزموونتر ئەو حکوومەتەیە کە لە لایەك پشت بەستوو بە دەنگی زۆرینەو بۆچوونی زۆرینەو نوێنەرەکانی‌و لە لایەکی دیکەوە خاوەن دەنگ‌و لێهاتوویی "کەمینەی پەروەردە بوو" لە یاسادانان‌و بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا بێ. بۆیە میل پێشنیاری دەکرد کە کۆمیسیۆنێك بۆ یاسادانان دابنرێ کە ئەندامەکانی لە نێو رووناکبیران‌و پەروەردەکراوان دا دیاری بکرێن‌و گەلاڵە یاسایی‌یەکان بۆ پەسندکران پێشکەش بە پارلمانێك بکەن کە نوێنەرەکانی بریتی بن لە نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵك. میل هەروەها پێشنیاری دەکرد کە خەڵکی خوێندەوارو دەرس خوێندوو مافی دەنگدانێکی زۆرتریان هەبێ. بە بۆچوونی میل، سیستمی نوێنەرایەتی رێژەیی بە مەبەستی دابین کردنی ئامادەبوونی کەمینەکان لە پارلماندا، بەتایبەت گرووپگەلی پەروەردەکراو رووناکبیر بنەمای زۆرینە هاوسەنگ دەکا. کەوابوو میل لەسەر پێویستیی تێکەڵی زانست‌و پسپۆڕی‌و زۆرینەی ژمارەیی لە دێموکراسیدا پێی دادەگرت‌و پێی وابوو دێموکراسیی راستەقینە دەبێ وا تێکەڵی‌یەکی هەبێ. بە پێچەوانە، دێموکراسیی پشت بەستوو بە زۆرینەی ژمارەیی، بە بۆچوونی ئەو، دێموکراسی‌یەکی درۆزن بوو کە باشترین نموونەکەی دێموکراسیی ئەمریکا پێکی دێنا. بۆچوونی میل زۆرینەی ژمارەیی، بریتی لە خەڵکانێکی نە زۆر شارەزاو نە زۆر هیچ نەزان [میان مایە] کە خاوەن دەنگ‌و

بۆچوونێك نین. بۆیە دێموكراسی، دێموكراسیی زۆرینەی كەم تواناكان [فرو مایگان] لێهاتوویی‌و كەسایەتیی زانایان لەبەرچاو ناگرن‌و سەلیقەی كۆمەڵانی خەڵك لە كۆمەڵگادا زاڵ دەكەن.

دێموكراسیی ژمارەیی، دێموكراسیەیەكی درۆزنە، لەبەر ئەوەی جیاوازییە سروشتییەكان لە نێوان خەڵكدا لەبەرچاو ناگرێ، لە بەرانبەردا، دێموكراسیی راستەقینە بۆ ئەندامە جۆراوجۆرەكانی پێكهێنەری كۆمەڵگا، دەست رۆیشتوویی‌و نەخشی لەبار لەبەرچاو دەگرێ. كەوابوو دێموكراسیی راستەقینە لە جیاتی نوێنەرایەتیی تاكەكانی پەرش‌و بڵاوو پڕ ژمارە، دەرەتانی نوێنەرایەتیی گرووپەكان‌و بەرژەوەندە جۆراوجۆرەلان لە دامەزراوە سیاسییەكان دا بە دیاری دێنێ.

## ویلیام جیمز (۱۹۱۰ ـ ۱۸٤۲)

ویلیام جیمز، فەیلەسووفی ئەمریكایی‌و یەكێك لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی پراگماتیسم، لە بەرهەمە گرینگەكانی خۆیدا یەك لەوان پراگماتیسم (۱۹۰۷)و مانای راستی [حقیقت] (۱۹۰۹)، فەلسەفەی تیئۆریی بە یەكێك لە ئامرازەكانی تێگەیشتنی راستیی رەوان [سیال Fluid] دەزانی. پێوەندیی نێوان زەینی مرۆڤو راستیی دەرەوە لە پێش دا دارێژراو نیە، بەڵكوو مرۆڤ هەموو كات تێگەیشتنی خۆی لە راستییەكانی دەوروبەری نۆژەن دەكاتەوەو پێوەری ئەم نۆژەن كردنەوە، هێزو دەسەڵاتی وەها تێگەیشتنگەلێك لە بەرەوپێش بردنی بەكردەوەی ژیانی مرۆڤو بە واتایەكی ساناتر، قازانجی ئەو تێگەیشتنانەیە. كەوابوو تێگەیشتنی مرۆڤ لە راستی، بەستراوەتەوە بە پێوەندیی دامەزراو لە نێوان زەین‌و راستیدا، واتا لە نیهایەتدا بە قازانجی كاروبارو شتەكان جیمز لە وەها هەڵوێستێكی فەلسەفییەوە كەوتە دیفاع كردن لە لیبرال دێموكراسی. لەبەر ئەوەی كە هەموو كات راستییەكان لە گۆڕان دان، مرۆڤ لە بیابانی ئازادیدا دەژی‌و پابەندی هیچ راستییەكی رەهاو نەگۆڕ نیە. تاك دەتوانێ بۆ چارەسەری كێشەكانی خۆی روو لە هەر ئایدۆلۆژییەك بكاو پێوەری راستی ئەو ئایدۆلۆژیانە تەنیا سوودەكەیەتی. هەر ئەم زۆر بوون‌و گۆڕانگەرایی راستییەكانە، پاساودەری سەرەكیترین بنەمای فیكری دێموكراسی لیبراڵ، واتا بنەمای ئاسانگیری‌و ئاسانكارییە [تساهل].

## جان دیویی (۱۹۵۲ ـ ۱۸۵۹)

جان دیویی فەیلەسووفی پراگماتیستی (قازانج گەرا) ئەمریکایی، بە یەکێك لە تیئۆریسینە گرینگەکانی دێموکراسی دەژمێردرێ. ناوبراو مامۆستای فەلسەفەی زانکۆی شیکاگۆو پاشان زانکۆی کولومبیا بووو، لە روانگەی دیوییەوە مرۆڤەکان سروشتی نەگۆڕو سەقامگرتوویان نیە، بەڵکوو هەموو کات لەگەڵ گۆڕان بەرەوڕوون. مرۆڤ هەموو کات لە حاڵی گۆڕان و پێگەیشتنە [تکامل]و بەرەو ئامانج مل دەنێ کە بۆ ناسین نابێ. بە بۆچوونی ئەو بۆ گەیشتن بە ئامانجە دێموکراتیکەکان واتا ئازادی، یەکسانیو پێشکەوتن، هەر دەکرێ لە ئامرازەکانی دێموکراتیك کەڵك وەربگیرێ. لە روانگەی دیویی، دێموکراسی، فێرکردنو زانست پێوەندیی بەرانبەرو بەهێزکەریان سەبارەت بە یەکتر هەیە. پەرەگرتنی دێموکراسی، پێویستی بە فێرکردنە دێموکراتیکەکان هەیە. دێموکراسیش خۆی زەمینەی گەشەی زانستو پێشکەوتن ئامادە دەکا، لە روانگەی دیویی یەکسانی بناخەی دێموکراسییە، دێموکراسی لەسەرم باوەڕەیە کە هەموو خەڵکێك خاوەن ئاوەزنو هیچ تاك یا گرووپێك ناتوانێ بە خۆڕانان بە زانستو عەقڵی خۆی، بە سەر خەڵکی دیکەدا حکوومەت بکا.

دیویی لە نێوان ئازادیی نەرێنیو ئازادیی ئەرێنیدا جیاوازی دادەناو ئازادیی ئەرێنیی بە مەرجی دێموکراسی دەزانی. ئازادیی نەرێنی تەنیا بە مانای ئازادی لە هێرشو دەست تێوەردانی کەسانی دیکەیە، بەڵام ئازادیی ئەرێنی بە مانای هەوڵدان بۆ پەروەردەکردنی خۆیە. دێموکراسی هەروەك وترا، بە فێربوونەکەی دەژی، لەبەر ئەوەی وتووێژی ئازاد زەینی هەموان پەروەردە دەکاو خەڵك بۆ ژیانی بەکۆمەڵ ئامادە دەکا. لە نێوان دێموکراسیو زانست دا، پێوەندییەکی نزیك هەیە، لەبەر ئەوە شێوەی دڵخواز لە دێموکراسیدا، ئیمتیحانو ئەزموونو لێکۆڵینەوەی بەردەوام لە ئەندیشەکانو بڕواکانو سیاسەتەکان دایەو ئەمە هەر ئەو شێوازەی زانستە.

## هارۆڵد لاسکی (۱۹۵۰ ـ ۱۸۹۳)

تیئۆریسنی سیاسیی بریتانیا، مامۆستای زانکۆکانی هارواردو لەندەنو خاوەن زۆر بەرهەمی گرینگ وەك قەیرانی دێموکراسی (۱۹۳۳)، دەوڵەت لە تیئۆریو کردەوەدا (۱۹۳۵)و دەسەڵاتی دەوڵەتی مۆدێرن (۱۹۱۹) بوو. لاسکی لەسەر بنەماکانی زۆرینەخوازی دێموکراسیو گرینگی گروپگەلی کۆمەڵایەتی لە سیستمی دێموکراسیدا، پێی دادەگرتو لەم بارەوە سەبارەت بە بایەخی دەوڵەتی بەهێزو کۆکراوە [متمرکز] بۆ دێموکراسی گومانی پێك

هێنا. له روانگەی ئەوەوه تاکەکان لە بناخەدا سەبارەت بە گرووپە کۆمەڵایەتییەکانو دامەزراوه نادەوڵەتییەکان، وەك كەنيسەكانو يەكيەتيەكان هەست بە ئەمەكناسیو هاوپەيوەندی دەکەن، نە سەبارەت بە دەوڵەتی گەورەو ناوەندخواز [متمركز]. بۆيە بناخەی دێموکراسی هەر ئەم دامەزراوانەو ئەم گرووپانەنو بە مەبەستی پاراستنو بەهێزکردنیان، دەسەڵاتی دەوڵەتی دەبێ لاواز بکرێو ناوەندگرایی وەلا بنرێ. خەڵك ئەمەكناسییەكی تاقانەيان نيه، بەڵکوو ئەمەکناسیەکەیان چەند لایەنەو پڕ ژمارەو مەرجی پاراستنی ئازادی، پاراستنی وەها ئەمەکناسیگەلێکە. لەگەڵ ئەمانەش لاسکی لە بەرهەمەکانی دیکەیدا، لەسەر بیرۆکەی لاوازکردنی دەوڵەتو بەهێزکردنی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان نەماو بەڵگەی دەهێنایەوە کە مەبەستی رێك خستنی ئارمانجگەلی یەکسانیو ئازادی، دەوڵەت دەبێ لە راستای دابینکردنی پێویستییە مادیەکانی چینەکانی خوارەوە دەست تێوەردان بکا. بەجۆرە لاسکی وردە وردە لە ئەندیشەی لیبراڵی دوور کەوتەوەو نوگرییەکی زۆرتری بۆ سوسیالیسم پەیدا کرد. لە دوایین بەرهەمە گرینگەکەی خۆیدا واتا دێموکراسی لە ئەمریکادا (١٩٤٨) بەڵگەی هێناوەتەوە کە دێموکراسی لە جیهانی مۆدێرن دا بەهۆی زاڵبوونی سەرمایە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، گەندەڵ بووەو کەوابوو لە بناخەدا لەگەڵ سەرمایەداری هاوئاهەنگی نیه.

## هارۆڵد لاسول (١٩٧٨ - ١٩٠٢)

لاسول، زانای سیاسیی ئەمریکاییو مامۆستای زانکۆکانی شیکاگۆو ییل، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەکرێ لە رێگەی پێشکەوتنی ناسینی زانستی لە بواری سیاسیدا بە مسۆگەربوونی کۆڵەکەکانی دێموکراسیو پێشگیری لە رووخانی بەهۆی تێوەگلان لە قەیرانەکاندا، هیوادار بوو. ئەو لە کتێبی خەسارناسی دەروونیو سیاسەت دا (١٩٣٠) بەڵگەی دەهێنایەوە کە تاك لە مەسەلەی سازان لەگەڵ دەوروبەری [محیط] لە گۆڕاندایە [متغیر] کە ئەرکی تایبەتی "خۆ" یان "ئیگۆ"یە [EGO] بە دەست تێوەردانو کۆسپەکانی سیمپاتی (SYMPATHY)و سەرەتایی هەڵقولاو لە بیاڤی "من"و "سەرتر لە خۆ" [فراخود] رووبەڕوو دەبێ. هەرچەند "خۆ" گەشە دەکا، تاك بۆی دەردەکەوێ کە لە دەسەڵاتی باوکدا زیادەڕەوی کراوە. لەگەڵ ئەوەش تاکی مرۆیی هەر ئەم پێویستیە بە باوك ئامانجیو بەهێزی کەلە زەمیری ئاناگا یان خۆنەویستدا [UNCONSCIOUS] شاردراوەتەوە، لە رێبەر یان حاکمو دامەزراوەکانی دیکەی باوکانەی

سیاسی‌دا ده‌بخاته روو. که‌وابوو پێویستیی به‌هێزکردنی دێموکراسی، به‌هێزکردنی "خۆ"یه له به‌رانبه‌ر راکێشانه‌کانی "من"و "سه‌رتر له خۆ"یه. "خۆ" ئه‌رکێکی ئه‌قلانی هه‌یه، "خۆ" پێویستی به په‌ره‌پێدانی بیاڤی زانایی‌و هزره که دادوه‌ریه‌کانی ئه‌قلانی‌و به به‌های له‌سه‌ر دامه‌زراون. له‌م رووه‌وه زانایان بۆ به‌ره‌وپێش بردنی دێموکراسی، به‌رپرسایه‌تی‌یه‌کی مه‌زنیان له‌سه‌ر شانه. مه‌به‌ستی فێرکردن له بواری دێموکراسی‌دا ده‌بێ پێکهێنانی به‌رپرسایه‌تی له تاك دا، له کیشه‌ی به‌کارهێنانی ده‌سه‌ڵاتدا بێ. له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ش فێرکردنی فیکری‌و ده‌روونی به‌س نیه، به‌ڵکوو وه‌دیهاتنی ئامانجه‌کانی دێموکراسی پێویستی به ئامرازی سیاسی وه‌ك جیاکردنه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵاته‌کان‌و چاودێری‌کردن به‌سه‌ریاندایش هه‌یه. له روانگه‌ی ئه‌وه ده‌سه‌ڵات هۆی سه‌ره‌کی دڵه‌ڕاوکێ‌و ململانێی کۆمه‌ڵایه‌تی‌یه‌و ته‌نیا رێگه‌ی رزگاریی تاك‌و کۆمه‌ڵگایه. له لاوازکردنی هه‌رچی زیاتری پێکهاته‌ی ده‌سه‌ڵاتدا شاردراوه‌ته‌وه.

## ژوزف شومپیتر (١٩٥٠ - ١٨٨٣)

شومپیتر له نه‌مسا له دایکبووو له زانکۆی ویه‌ن ئابووریی خوێندو له ساڵی ١٩٣٢دا به‌ره‌و ئه‌مریکا کۆچی کردو له زانکۆی هاروارد ده‌ستی به وانه وتنه‌وه کرد. ئه‌و له کتێبه به‌ناوبانگه‌که‌ی خۆیدا واتا سه‌رمایه‌داری، سوسیالیزم‌و دێموکراسی (١٩٤٣) باسی له دێموکراسی وه‌ك شێوازێك بۆ هه‌ڵبژاردنی رێبه‌رانی سیاسی هێناگۆڕ، ئه‌وه‌ه له کاتێکدا بوو که تیئۆریسینه‌کانی پێشوو، دێموکراسی‌یان وه‌ك ئامانج چاو لێ ده‌کرد. به واتایه‌کی دیکه روانگه‌ی شومپیتر سه‌باره‌ت به دێموکراسی واقیع گه‌رایانه بوو، نه ئارمانج خوازانه. بۆچوونه‌کانی ئه‌و له سه‌رهه‌ڵدانی قوتابخانه‌ی پلۆرالیستی سیاسی یان دێموکراسی گرووپگه‌لی هه‌ڵبژارده له ئه‌مریکادا زۆر کاریگه‌ر بوو.

شومپیتر له ژێر کاریگه‌ری لێکۆڵینه‌وه ئابووریه‌کانی خۆیدا، سیاسه‌تی وه‌ك بازاڕێکی موناڤسه ده‌شوبهاند که له‌ودا خه‌ڵك به شوێن قازانجه‌کانی خۆیان دان‌و یاریکه‌رانی سیاسی بۆ به‌ده‌ستهێنانی ده‌نگی خه‌ڵك له‌گه‌ڵ یه‌کتر ده‌که‌ونه کێبه‌رکێ. له تیئۆریه کلاسیکه‌کاندا، دێموکراسی وه‌ك باشترین قه‌واره‌ی حکوومه‌ت بۆ مسۆگه‌رکردنی ئیراده‌و به‌رژه‌وه‌ندیی گشتی لێك ده‌درایه‌وه. هه‌م فه‌یله‌سووفگه‌لێکی ئامانج خواز وه‌ك رۆسۆو هه‌م تیئۆریسینگه‌لێکی واقیع گه‌را وه‌ك بنتهام، دێموکراسی‌یان به ئامرازی دابین کردنی به‌رژه‌وه‌ندی یان خێرو شادیی گشتی ده‌زانی.

بەڵام لە روانگەی شومپیتر چەمکی بەرژەوەندی گشتی، چەمکێکی وەهمیو خەیاڵییە. لەگەڵ ئەوەش ئەو یەکێك لە بابەتە سەرەکییەکانی تیوریگەلی کۆنی دیموکراسی واتا هەڵسوکەوتی ئەقڵانی مرۆڤ لە بواری سیاسەتدای رەد دەکردەوەو پێی وابوو کە هاووڵاتیان بە شێوەیەکی گشتی دەکەونە ژێر کاریگەریی هۆگەلی نائەقڵانی لە سیاسەتیش دا. دیارە وەها تێڕوانینێك، لەگەڵ تێڕوانینی سەرەکیی ئەو لەبارەی شوبهاندنی بازاڕی سیاسەت بە بازاڕی شتومەك لە دژایەتیدا بوو. لە روانگەی شومپیترەوە دیموکراسی لە بناخەدا شێوەیەکە بۆ دەست نیشانکردنی سیاسەتوانانو یان بە وتەیەکی روونترۆ شێوەیەکە بۆ بڕیاروەرگرتن بەهۆی رێبەرانێکە کە دەسەڵاتی خۆیان لە رێگەی کێبەرکێ بۆ بەدەستهێنانی دەنگی خەڵك بەدەست هێناوە. لەم رووەوە هەمووی ئەوە کە لە تیوریەکانی کلاسیکی دیموکراسیدا وەك بەها لێك دەدرایەوە (هەر وەك بەرژەوەندی گشتی، تاکایەتی [فردیت] ئازادی، یەکسانی) جێی خۆی دا بە دیموکراسی وەك باشترینو جێی باوەڕترین شێوەی دەستنیشان کردنی دەسەڵاتداران [حکام]، بە بێ رووداني توندوتیژیو ناسەقامگیری دیموکراسی باشترینو تەنیا رێگەی گونجاو بۆ خۆ لادان لە دیکتاتۆریو سەرەڕۆییە.

## ریمون ئارون (١٩٨٣ ـ ١٩٠٥)

ئارون فەیلەسوفو نووسەری فەرانسەوی، بە توندی لایەنگری دیموکراسی بووو هێرشی دەکردە سەر کۆمۆنیسم، فاشیسمو تۆتالیتاریسم. بڕوای وابوو کە ئازادیو بایەخی مرۆڤ، تەنیا لە ژێر سێبەری بیرو هزری یەکسانیخوازانەی چەرخی مۆدێرندا دەتوانێ دابین بکرێ. ئارۆن لە کتێبی دیموکراسیو تۆتالیتاریسمدا لە سیستمەکانی زۆرینەخوازیو دیموکراتیکی هاوچەرخ وەك سیستمگەلی یاساتەوەر [قانونمند]و مەدەنی دیفاعی دەکرد. ئەرکی سەرەکیی ئەم سیستمانە بە بۆچوونی ئەو، نە لە نێوبردنو پووکانەوە، بەڵکوو نەرمکێشیو کەم کردنەوەی ململانێکانی کۆمەڵایەتییە.

گەوهەری دیموکراسیی کێبەرکێی، بە یاساییکردنو جۆراوجۆریی زۆر کردنی مەیلەکانو ئازانجەکانی کۆمەڵایەتییە. لە بەرانبەردا سیستمەکانی توتالیتێر تێدەکۆشن لە رێگای ئایدئالیستییەوە کێشە کۆمەڵایەتییەکان ریشەکێش بکەنو لەم رووەوە، ئازادی، بەشداریو مونافیسەیش لە نێو بەرن. بە بۆچوونی ئارۆن، دیموکراسی لە سەردەمی مۆدێرندا، بە بێ

سەقامگیری دەوڵەتی خۆشگوزەرانی [رفاهی] کە پێداویستییەکانی جێی نیاز بۆ کەڵك وەرگرتنی تاك لە ئازادیە دێموکراتیکەکان ئامادە بکا، مانای نیە. بەڵام لە لایەکی دیکەوە لە روانگەی ناوبراو، دامەزراندنی یەکسانی لە کۆمەڵگای مۆدێرندا مومکین نیە، لەبەر ئەوەی کۆسپگەلێکی پێکهاتەیی گران لەسەر رێی سەرهەڵدانی کۆمەڵگای یەکسان، بوونی هەیە. بە بۆچوونی ئارۆن هەوڵدان بۆ دامەزراندنی یەکسانی بە تەواوی لە کۆمەڵگادا، تەنیا سەرەڕۆیی و تۆتالیتاریستی لێ دەکەوێتەوە.

## ئیزایا بیرلین (١٩٩٧ ـ ١٩٠٩)

بیرلین، فەیلەسوفی سیاسیی هاوچەرخ لە لاتویا لە دایك بووو لە بریتانیا خوێندی. وتارە بەناوبانگەکەی لە ژێر سەردێڕی "دوو چەمکی ئازادی" (١٩٥٨) کە پاشتر لە کتێبی چوار وتاری سەبارەت بە ئازادی (١٩٦٩)دا بڵاو کرایەوە، بریتی بوو لە بنەماکانی بیروڕای ئەو سەبارەت بە ئازادیو دێموکراسی. لەوێدا دوو چەمکی ئازادیی نەرێنیو ئەرێنی لە یەك جیا دەکاتەوە. ئازادیی نەرێنی [منفی] کە بە مانای رزگاری لە دەست تێوەردانی ئیرادەی سەرەڕۆیانەی دیکەیە، گەوهەری لیبرالیسم پێك دێنێ. لە بەرانبەردا ئازادی ئەرێنی [مثبت]، کە بە مانای ئازادی بۆ کردە بە پێی بارودۆخی ئەقڵی گشتیيە، ژێرخانی دیکتاتۆریو توتالیتاریسمە. بە واتایەکی دیکە ئازادیی ئەرێنی پێویستی بە باشترزانینی [ترجیح] بەشی ئەقڵانی، لەش بەسەر هەوەسو نائەقڵانی ئەوە. ئەوەی کە پەسندکراو [معقول]و ئەخلاقیيە، زۆرجار بەهۆی کۆمەڵگا یان خەڵکانی دیکە دیاریو دەناسرێو لەم رووەوە ئازادیی ئەرێنی لە ئاکامدا بە مانای تەسلیم بوون بە ئیرادەی کەسانی دیکەیە. "ئەو کەسانەی دیکە" کە بەرژەوەندی [مصلحت] "راستەقینە"و "ئەقڵانی" تاك دەناسێنن. هەر ئەم ئەندیشە بۆخۆی بناخەی تۆتالیتاریسمو دیکتاتۆری گشتگیری مۆدێرن پێك دێنێ. لەڕاستیدا خوازیارانی ئازادیی ئەرێنی، تاك ناچار بە ئازادبوون دەکا. بە شێوەیەکی گشتی، بیرلین بڕوای وابوو کە دێموکراسی سیستمێکە کە لەودا دەرەتانی هەڵبژاردن لە نێوان هەڵبژاردە [گزینە]ی جیاواز بۆ تاکەکان بوونی هەیە. دیارە لە نێوان بە هادڵخوازەکانی مرۆیی هەموو کات دژ بە یەکی هەیە [تعارض]و ئەم دژ بە یەکیە ناتوانرێ بە هیچ جۆرێك، تەنانەت بەهۆی دێموکراسیش چارە بکرێ، بەڵام دێموکراسی دەرەتانی هەڵبژاردنی نێوان بەهاکانو ئامانجە جیاوازەکانی ژیان بۆ مرۆڤ ئامادە دەکا.

## موریس دوو رژه

دوو رژه لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٥ تا ١٩٨٥ مامۆستای کۆمەڵناسیی سیاسیی زانکۆی پاریس بوو، ئەو لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا حیزبە سیاسییەکان لە نێوان سیستمگەلی هەڵبژاردنو سیستمی حیزبی، پێوەندییەکی دۆزیەوە کە وەك "یاسای دوو رژە" ناسراوە. بەم مانایە کە سیستمی هەڵبژاردنی زۆرینەی ساکار دامەزراو لەسەر ناوچەی تەك نوێنەری کە لەودا یا لیوارێك کە زۆرترین رادەی دەنگەکانی بەدەست بێنێ، دەستی دەگاتە کورسیی پارلمان، دەبێتە هۆی سەقامگیری سیستمی دوو حیزبی. لە لایەکی دیکە بە بۆچوونی ئەو، سیستمی نوێنەرایەتیی رێژەیی بە سەقامگیری پتر لە دوو حیزب یارمەتی دەدا. بە شێوەیەکی گشتی بە بۆچوونی دوو رژە نێوان ژمارەی کورسیەکان لە هەر ناوچەیەکی هەڵبژاردنو ژمارەی حیزبە سەرەکیەکان پێوەندییەك هەیە. بە بۆچوونی ئەو دوو هۆکاری سەرەکی دەبێتە هۆی دامەزراندنی ئەم پێوەندییە: یەکەم هۆکاری تکنیکیو دووهەم هۆکاری دەروونی. مەبەست لە هۆکاری یەکەم، نەبوونی توانا لە حیزبە بچووکەکان دا بۆ بەدەستهێنانی دەنگ لە سیستمی زۆرینەیی لە ناوچەی تەك پالێوراویداو مەبەست لە هۆکاری دووهەم، نەبوونی بڕواو متمانەی گشتیی دەنگدەران سەبارەت بە بەفیڕۆدانی دەنگی خۆیان بە حیزبە بچووکەکان کە توانای سەرکەوتنیان نییە. لە ئاکامی کاریگەریی ئەم هۆکارەدا، دەنگی وەها حیزبگەلێك زۆرجار وەبەر یەکێك لە دوو حیزبە سەرەکیەکە دەکەوێ. بەڵام کاتێك سیستمی هەڵبژاردن رێژەیی بێ، هیچ کام لەم دوو هۆکارە کاریگەری نابێو لە ئاکامدا توانایی حیزبە بچووکەکان بۆ بەدەستهێنانی کورسیی پارلمانی زیاد دەبێ. لەم سیستمەدا، ناوچەکانی هەڵبژاردن چەند پالێوراوین. هەر ئەندازە کورسیەکانی ناوچەکان زۆرتر بن، ژمارەیەکی زۆرتر لە حیزبەکان دەتوانن نوێنەر بەدەست بێن. نووسەرەکانی دوایی لەگەڵ تەییدی بۆچوونەکانی دوو رژە ئاماژەیان کردوە بەوە کە دوو هۆکاری ناوبراو لەوانەیە تارادەیەکیش لە سیستمەکانی رێژەییشدا کاریگەرییان هەبێ. کەوابوو ئەوان یاسای "دوو رژە"یان بە شێوەی خوارەوە پۆلێن کردوە.

کاتێك ناوچەی هەڵبژاردن تاك پالێوراوی بێ، ژمارەی حیزبەکان لە دوو حیزب دا بەرتەسك دەکرێتەوە، بەڵام هەرچی ژمارەی کورسیەکانو پالێوراوەکان لە ناوچەی هەڵبژاردن دا زیاد بکا، ژمارەی حیزبە گرینگەکانیش زیاد دەبن.

## کارل پوپێر (١٩٩٤ ـ ١٩٠٢)

پوپێر، فەیلەسووفی زانستو زانای گەورەی نەمسایی لە بواری دێموکراسیداش تیئۆریی دارشت. لەڕاستیدا گشت بەرهەمەکانی کاریگەری لە ئەم ئەندیشەی سەرەکیەوە وەردەگرت کە ئازادیو ڕاستی پێکەوە بەستراونەتەوە. گرینگترین بەرهەمی سیاسی ئەو کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی بوو. لەم کتێبەدا پوپێر کەوتە ڕەخنەگرتن لە بیروڕای دوژمنانی ئازادییە دێموکراتیکەکانو کۆمەڵگای کراوەو فەیلەسووفانێك وەك ئەفلاتوون، ئەرەستوو، هێگڵو مارکسی بە بەرپرسی سەقامگیریی کۆمەڵگای داخراوو دیکتاتۆری سیاسی زانی. ئەو شێوەی ئەقڵگەرایی ڕەخنەگرانەی خۆی لە بواری زانستەکاندا بۆ بواری کۆمەڵگاو سیاسەتیش گواستەوە. هەروەك چۆن زانست لە ڕێگای پووچەڵکردنەوەی تیئۆرییەکانی جێکەوتوو دەچێتە پێش، کۆمەڵگاو سیاسەتیش بۆ بەرەوپێش چوون پێویستی بە ڕەخنەی بەردەوام [مستمر] هەیە. کۆمەڵگای داخراو، کۆمەڵگایەکە کە لەودا هەموو ڕاستییەکان بە دۆزراوە دەزانن، لە کاتێك دا بە پێی بەڵگەهێنانەوەی پوپێر، هیچکات ناتوانرێ ڕاستی نیهایی بدۆزرێتەوە. ناتوانرێ پرۆسەی داهاتووی مێژوو بناسرێ، لەبەر ئەوەی ناتوانرێ شوناسی زانستی داهاتوو هەر ئێستا پێش بینی بکرێ، ئەگەر وا نەبوایە دەبوا ئێستا زانستی داهاتووش لەبەر دەست دابوایە. کۆمەڵگای داخراو بە پێی ئەم داواکارییە [ادعا] کە پشتی بە ڕاستییەکانی لە پێش دا دیاریکراو بەستوە، دەرەتانێك بۆ ڕەخنەو پووچەڵ کردنەوەی سیاسەتەکان ناهێڵێتەوە. گرینگترین تایبەتمەندی دێموکراسی بە سەر جۆرەکانی دیکەی حکوومەتدا بە بۆچوونی پوپێر، ئەوەیە کە لەودا دەتوانرێ دەسەڵاتدارانی ناشایستو گەندەڵ لە کار وەلا بنرێن. بە شێوەی گشتی بە بۆچوونی پوپێر، دێموکراسی لەگەڵ بنەمای گشتیی زاڵ بەسەر ئەندیشەی ئەو واتا کراوە بوونی جیهانو ناحەتمیو ناتەواو بوونی هەموو ڕاستیەکان پێوەندییەکی سەرەکی هەیە.

## رابرت دال

دال تیئۆریسینی گرینگی دێموکراسیو لە زانایانی گەورەی ئەمریکایی، چەمکی "پۆلیارشی" بۆ ناساندنی سیستمە دێموکراتیکەکانی هاوچەرخو بەکاربراو [متداول]ی، کرد بە باو. لە ڕوانگەی ئەوەوە دێموکراسی بە مانای ئارمانجیو کلاسیکەکەی بۆ دابەزاندن نابێ، بەڵکوو تەنیا دەتوانرێ بۆ هەڵسەنگاندنی ڕادەی نزیکی دێموکراسییەکانی باو بە باروودۆخی ئارمانجی لەبەر چاو بگیردرێ. بە واتایەکی دیکە بۆچوونی داڵ سەبارەت بە دێموکراسی، بۆچوونێکی واقیع

بینانەیە کە بە تایبەت لە ژێر کاریگەریی روانگەکانی ئیلتیەخوازەکان [نخبەگرا] بووە. ئەو لە یەکەم کتێبی گرینگی خۆیدا واتا سەرەتایەك لەسەر تیئۆری دێموکراسی (١٩٥٦) تیئۆریەکانی زۆرینەیی و بەشداریەتی یان ئایدیالیستی دێموکراسی خستۆتە بەر رەخنەو لە بەرانبەردا چەمکی پۆلیارشی بۆ وەسفی دێموکراسیی باوو مومکین بەکار بردوە. بە مانای چەندیی دەسەڵاتدارە هەڵکەوتوەکان، سنووری دڵخوازی بەشداریکردنو موونافیسەی سیاسی پێك دێنێو لە سەرهەڵدانی دیکتاتۆری زۆرینە پێشگیری دەکا. حکوومەتی دێموکراسیی راستەقینە نە حکوومەتی زۆرینەو نە حکوومەتی کەمینە، بەڵکوو حکوومەتی چەندین کەمینەیە. کەوابێ تیئۆریی پۆلیارشی، تیئۆریی پلۆرالیسم یان زۆر بوون [تکثر] لە سەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسیيە. داڵ لە کتێبی گرینگی دوایی خۆیدا لە بواری تیئۆریی دێموکراسی، واتا پۆلیارشی (١٩٧١) دەستی بە هەڵسەنگاندنی بارودۆخی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابووریو فەرهەنگی لەبار بۆ سەرهەڵدانی دێموکراسی کرد. بە پێی هەڵسەنگاندنی ئەو سەرهەڵدانی دێموکراسی بەرهەمی هاتنەدیی هاوکاتی کۆمەڵێك هەلومەرجەکە بە دەگمەن رێك دەکەون. بە شێوەی گشتیی لە روانگەی "داڵ"وە دێموکراسی وەك شێوەی هەڵبژاردنی رێبەرەکانو مسۆگەرکردنی چاودێریی هاوولاتیان بە سەریان دا بایەخێکی زۆرتری هەیە تا وەکوو سیستمێك بۆ دابین کردنی مافو ئازادیيەکانی تاكو بەشداریکردنو موونافیسەی هەمەلایەنە.

## سیمون مارتین لیپست

لیپست (ـ ۱۹۲۲) کۆمەڵناسی هاوچەرخی ئەمریکایی، توێژینەوەگەلێکی بەربڵاوی سەبارەت بە هەلومەرجی گۆڕانی دیموکراسی لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی خۆیداو یەك لەوان مرۆڤی سیاسی (۱۹۸۱)و کۆدەنگی [اجماع]و ململانێ [منازعە] (۱۹۸۵) بە ئەنجام گەیاندوە. ئەو لە بەرهەمانەدا لە نێوان شێوەژیانی دیموکراتیك، حکومەتی یاسا، نایەکسانیی بەرتەسك، هێزی چینی نێونجیو فەرهەنگی سیاسی نەریم کێش دا هاوپشتیيەکی بەهێز دەدۆزێتەوە. یەکێك لەو بابەتانە کە لیپست ئۆگری بوو، لێکدانەوەی هۆکارگەلێکە کە گێرەو کێشە سیاسییەکانی لە نێو چوارچێوەیەکی گشتیتری دۆستیو کۆدەنگیدا کۆنترۆڵ دەکەن. کەوابوو لە دیموکراسیەکاندا، کەمینەکان، ناتەباییەکانو کێشە کۆمەڵایەتیو سیاسیيەکان بە جۆرێك لەگەڵ کۆدەنگیو دۆستی هاوژیانی پەیدا دەکەن. یەکێك لە هۆکارەکانی پاراستنی سەقامگیریی کۆمەڵایەتیو سیاسی، کەمینە یەکتربڕەکان [متقاطع] کە دەبنە کۆسپ لەسەر ڕێی تێکەڵبوونو سەر یەك کەوتنی هێڵەکانی ناکۆکیو شەڕ. کەمینە یەکتر بڕەکان لە توندبوونەوەی دژایەتیەکانو ئیحساساتی[1] سیاسی کەم دەکەنەوەو دەرەتانی ئەوە دەرەخسێنن کە تا کەسانێك کە لە یەك لایەنەوە لە کەمایەتی دان، لە لایەنێکی دیکەوە لە زۆرینە دابن. بە بۆچوونی لیپست، یەکێك لە هەلومەرجە سەرەکیەکانی دامەزرانی دیموکراسی، بوونی ئەو دامەزراوانەن کە هەم دەرەتانی ململانێو ناکۆکی دەڕەخسێنێ، هەم دەبنە هۆی پاراستنی دۆستیو ڕێککەوتن.

## ئانتۆنی داونز

داونز، نووسەری کتێبی تیئۆری ئابووریی دیموکراسی (۱۹۵۷) نەخشێکی گرینگی لە پەرەپێدانی تیئۆریزەکردنی دیموکراسیو بەتایبەت "تیئۆریی هەڵبژاردنی گشتیی" گێراوە. بە بۆچوونی ئەو سیاسەتوانانو حیزبە سیاسییەکان لە هەڵبژاردنەکاندا بەشێوەی سەرەکی لە ئەندیشەی ئەوە دان کە هەڵبژێردرێنو لە ئاکامدا سیاسەتگەلێك بەکار بێنن کە لەگەڵ ویستو داخوازەکانی دەنگدەران بێتەوە.

---

[1] – Sentimentals

ئەو لەو کتێبەدا نموونەیەکی ساکار سەبارەت بە کێبەرکێی حیزبە سیاسییەکان دەخاتە روو. بە پێی ئەم نموونە، حیزبەکانی موونافیس بە پێچەوانەی بیروڕا و وێناکانی پێشوو، مەیلو حەزێکی بەهێزیان بۆ خستنەڕووی سیاسەتەکانو وادەکانی یەکسانو وەك یەك هەیە.

داونز بەم جۆرە هەڵسوکەوتی یاریکەرانی سیاسی بە پێی چەمکی "دەستنیشانکردنی (CHOOSING) ئەقڵانی" روون دەکاتەوە. نموونەی کێبەرکێی سیاسیی حیزبی لە تیئۆری ئەودا لەسەر چەند بیرۆکەی [SPPOSSE] سەرەکی راوەستاوە: هەموو حیزبە سیاسیو پالێوراوەکانی حیزبی بە شێوین بەرژەوەندیی تاکەکەسی واتا سەرکەوتنن، هەر دەنگدەرێك بە حیزب یان پالێوراوێك دەنگ دەدا کە چاوەڕوان دەکرێ سیاسەتەکانی دڵخوازی ئەو بەرێوە بەرێ، سیاسەتەکانی هەر حیزبێك یان پالێوراوێکی حیزبی هەر بۆ ئاسانکردنی سەرکەوتن لە هەڵبژاردن دا ئامادە دەکرێن. بە پێی وەها تێگەیشتنێك، داونز بەو ئاکامە دەگا کە لە سیستمە دوو حیزبیەکاندا، سیاسەتی حیزبەکانو کاندیداکان بۆلای ویستو داخوازەکانی "دەنگدەری ئاستی نێونج" دەکێشرێ. لە ئاکامدا، حیزب یان کاندیدای سەرکەوتوو لە هەڵبژاردن دا، بە جیاوازییەکی کەم بەسەر موونافیسەکەی خۆیدا سەردەکەوێ. رەخنەگرانی داونز بڕوایان وایە کە ناتوانرێ لەسەریەك نموونەی ئەقڵانی لە کێبەرکێی حیزبەکاندا قسە بکرێ، بەڵکوو نموونەگەلی ئەقڵانی جیاواز دەکرێ بدۆزرێتەوە.

## ٣
# پێشینە مێژووییەکان و زەمینەگەلی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دێموکراسی

هەرچەند دێموکراسی لە قەوارە بەرتەسکەکەیدا، پێشینەیەکی دوورو درێژی هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یۆنان و ڕۆمی کۆن، بەڵام دێموکراسی بە مانا نوێیەکەی، بەرهەمی گۆڕانکاریی فیکری و کۆمەڵایەتیی سەدەکانی نوێ بووە. زۆر لە خاوەن رایان لە نێوان دێموکراسی، سەرمایەداری، کۆمەڵگای پیشەسازی، نوێبوونەوەو فەرهەنگی نوێ پێوەندییەکی نزیک دەبینن. لە ئورووپای ڕۆژئاواییدا، هۆکارگەلێکی جۆراوجۆر وەك فئودالیسم و پرش و بڵاویی دەسەڵاتی سیاسی، بزووتنەوەی چاکسازی ئایینی کریستیان، گەشەی چینەکانی بازرگانی پیشەی نوێ و سەرهەڵدانی روخساری بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، شۆڕشە دێموکراتیکەکان و شۆڕشی پیشەسازی لە گووران [تکوین] و سەقامگرتنی دێموکراسیدا نەخشی سەرەکیان هەبوو. ئەم کۆمەڵە هۆکارە لە ناوچەکانی دیکەی جیهاندا، نەگوورا و[گەشەی نەکرد] لە ئاکامدا ئەزموونی دێموکراسیی ڕۆژئاوایی لەواندا دووپات نەکرایەوە. دێموکراسی بۆخۆی لە ڕۆژئاوادا، قۆناخگەلێکی بڕی و لە قەوارەی بەرتەسك و سەرمایەدارانەکەی تا قەوارەی گشتگیرترو خۆشگوزەرانیتر گەشەی کرد. لەم وتارەدا سەرەتا بە هەندێك پێشینەی مێژوویی دێموکراسی لە جیهانی کۆندا ئاماژە دەکەین و پاشان زەمینەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و فەرهەنگیی سەرهەڵدانی دێموکراسی لێك دەدەینەوە.

## زەمینە مێژووییەکان

یەکەمین دامەزراوەکانی دێموکراتیك لە یونان و ڕۆمی کۆن [باستان] سەریان هەڵدا. هەروەها یەکەمین ئەندیشەگەلی فەلسەفی سەبارەت بە دێموکراسی لە لایەن فەیلەسووفەکانی ئەو سەرزەمینانەوە هاتە ئاراوە. لە چاخی رونیسانس لە ئورووپادا، ئەزموونی کردەکی و تیئۆری دێموکراسی سەردەمی کۆن بۆ جارێکی دیکە سەرنجی ڕاکێشا و لە نێوان ئامانجی کۆماری نوێ و دێموکراسیی کۆن پێوەندییەك پەیدا بوو. بیرمەندانی رونیسانس لەسەر لاساییکردنەوەی

ئەزموونی یونانو رۆمی تەئکیدیان دەکرد. بۆیە بنەماکانی دێموکراسیی ئاتنی [پێتەختی یونان] سەرلەنوێ سەرنجی بیرمەندانی بۆلای خۆی راکێشا.

دێموکراسیی یونانی، ئەزموونێکی سیاسی بوو کە لە نێوان ساڵەکانی ٥٠٨ تا ٣٣٨ پ. ز لە ئارادا بوو. ئاسنا [آتن] گەورەترین دەوڵەت شاری یونانیو بەهێزترین دەوڵەت شاری دێموکراتیك لە نێوان دەوڵەت شارەکانی یونانـدا بـوو. هەرچـەند سیـستمی "ئۆلیگارشـی"یـش دەرەتـانی پێکهێنانی ئەنجومەن بۆ بڕیاردانی لە کاروباری سیاسیدا ئامادە دەکرد، بەڵام بەشداریی سیاسی لەودا لە گرووپێکی بچووك لە دەوڵەتەکاندا بەرتەسك دەبۆوە. لە بەرانبەردا دێموکراسی دەرەتانی بەشداریی ژمارەیەکی بەربڵاوتری لە هاوولاتیان لە ژیـانی سیاسـیدا دەرەخـساند، دیـارە ژنـان، کۆیلەکانو غەریبەکان وەك شارومەندی ئـاتن حیـسابیان بـۆ نـەدەکرا. گـۆڕانی سـەرەتایی لـە سیستمی سیاسیی ئاتندا لە ئاریستۆکراسی بۆ دێموکراسی لە پێشدا، لـە ئاکـامی چاکسازیی سولون، ڕێبەری هەڵبژاردەی ئەو دەوڵەت شارە لە ساڵی ٥٩٤ی پ. ز دەستی پـێ کـرد. بـۆ ئـەم مەبەستە سولون لە پـەیجۆری هاوسـەنگی لـە دابەشـکردنی سامانـدا، کـۆنترۆڵی مەسـروفاتو جوانکـاری [تجمـل]، رزگـارکردنی هەنـدێك لـە کۆیلـەکانو دابینـکردنـی بەشـداریی سیاسـیی بەربڵاوتردا بوو. بەڵام چاکسازییەکانی سولون زۆری نەخایانـدو جێـی خـۆی دا بـە حکوومـەتی دیکتاتۆرەکان.

یەکێکی دیکە لە دامەزرێنەرانی دێموکراسی ئاتنی، کلیـستنی[١] بـوو کـە لـە کۆتاییـەکانی سەدەی شەشەمی پ. ز هەوڵی بۆ بەهێزکردنی دامەزراوە دێموکراتیکەکانداو دەستی بـە نـوژەن کردنەوەی شـاری ئـاتن کـردو پێکهاتـەی عەشـیرەیی ئـەویی سەروبن کـرد. لـە ئاکـامی ئـەم گۆڕانکاریانەدا، ئاتن لە سەدەی پێنجەمی پ. ز گەشەی دامەزراوە مەدەنیە دێموکراتیکـەکانی سەرەتایی بەخۆوە بینی. ئەنجومەنی شارومەندان، جێی کۆمەڵی ئەشرافی گرتەوەو بەشداریکردن لەودا بۆ هەموو هاوولاتیان ئازاد کرا. ئەنجومەنێکی بەڕێوەبەری تایبـەت ئاجنـدای هـەرکام لـە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی هاوولاتیـانی ئامادە دەکرد. ئەنجومەن لە هەر ساڵدا نزیك بە ٤٠ جـار کۆ دەبوەوە. ئەندامەتی لە ئەنجومەنی بەڕێوەبەریدا بە پێی تـیرو پـشك [قرعـە] بـوو و هـەموو مـانگێك دەگۆڕا. سەرۆکی شووراش [ئەنجومەن] بە پێی تیرو پشك دیاری دەکراو هەموو جارێـك دەگۆڕا. هەموو پۆستەکانی دیکە لە شاریشدا بە پێی تیرو پشك دیـاری دەکـران. نزیـك ١٠٠٠

---

[١] - Cleisthenes

پۆست [منصب] هەموو ساڵێك بەم شێوە پڕ دەكرانەوە. دەسەڵاتدارانی گشتیی لە كۆتایی هەر ساڵ لە خزمەتی خۆیان دا دەكەوتنە بەر تەفتیش تا روون بوایەتەوە كە تووشی هەڵەو گەندەڵی، بەتایبەت لەباری مالییەوە نەبوون. گرینگترین پۆستی هەڵبژاردە شار، دە فەرماندەی سەربازی بوون. پەریكلس، رێبەری گەورەی دێموكراسیی ئاتن، خۆی یەكێك لەو دە فەرماندەرە هەڵبژێردراوە بوو بۆ ماوەی بیست ساڵ هەموو ساڵێك بەهۆی خەڵك بۆ پۆستەكەی خۆی هەڵدەبژێردرایەوە. دێموكراسیی ئاتن لەسەر یەك ١٧٠ ساڵ درێژەی كێشاو سەرئەنجام لەگەڵ داگیركرانی ئاتن بەهۆی فیلیپی مەقدونی لە ساڵی ٣٣٨ی پ. زدا كۆتایی پێ هات.

لە رۆم ئەزموونی دێموكراسی لە هەناوی حكوومەتی كۆماریدا سەری هەڵدا. بە پێی نووسراوەكانی پۆلیپ نووسەری یونانی، مێژووی رۆم، سیستمی كۆماریی ئەو وڵاتە لە سێ توخمی [عنصر] شاهی (كونسولەكان)، [CONSOL]، ئەشرافی (پیران)و دێموكراسی (ئەنجومەنەكانی خەڵك) پێك هاتبوو. كاتێك شاكان نزیك بە ساڵی ٥٠٩ی پ. ز رووخان، دەسەلات كەوتە دەست پیران [سنا]، ئەشرافی. ئەندامەكانی ئەنجومەنی پیران بۆ تا مردن [مادام العمر] لە لایەن خەڵكەوە، هەڵدەبژێردران‌و لەم رووەوە [ئەنجومەنی] پیران بۆخۆی سەرچاوەی خەڵكی بوو. بەڵام ئەندامەتی لە "سنا" لە چەند خانەدانێكی بە دەسەلاتدار بەرتەسك دەكرایەوە. سەنا تا سەدەی یەكەمی پ. ز هەروەها دەسەلاتی لە دەست دابوو، هەرچەند ئەنجومەنەكانی خەڵكی لەم سەردەمانەدا دەست رۆیشتوویییەكی زۆریان پەیدار كردو هەروەها مەحكەمە دادوەریەكان وەك دامەزراوە گەلی پارێزەری مافی خەڵك پێك هاتن. هەموو پۆستە دەوڵەتیەكان بریتی لە كونسولەكان، بە ماوەی ساڵێك لە لایەن ئەنجومەنەكانی خەڵكی هەڵدەبژێردران، كونسولەكان نوێنەرانی دەوڵەتی رۆم لە لای وڵاتەكانی دەرەوە بوون‌و سەنایان بە فەرمی پێك دەهێنا، بەڵام هیچ دەسەلاتێكیان بە سەر پرۆسەی بڕیاردان دا نەبوو. كونسولەكان لە كاتەكانی قەیران‌و ئالۆزی دەیانتوانی پێشنیاری كۆكردنەوەی دەسەلات لە دەست كەسایەتییەكدا وەك "دیكتاتۆر" بۆ ماوەی شەش مانگ بێنە گۆڕ. دەسەلاتدارانی سەربازی‌و سویل مافی ئەوەیان بوو كە ئەو یاسایە كە پێیان وابوو لەگەڵ مافەكانی خەڵك ناتەبا بوون، ویتۆی بكەن‌و ئەنجومەنەكانی خەڵكی بۆ دەربڕینی بیروڕا كۆ بكەنەوە. رادەربڕینی ئەنجومەنەكانی خەڵك بەم شێوەیە (پلبیسیت) دەبوو بە یاساو پێویستی بە دان پێدانانی سەنای نەدەكرد. ئەنجومەنەكانی گشتیی بەرپرسایەتی تایبەتیان هەبوو. ئەنجومەنی ئەشراف دەسەلاتداران‌و دادوەرەكانیان دەست

نیشان دەکرد، شەڕو ئاشتییان رادەگەیاندو سەبارەت بە پێشنیاری کونسولەکان دەنگیان دەدا. لەو ئەنجومەنەدا باسی گشتی نەدەکرا. دەوڵەمەندەکان لە پێشدا دەنگیان دەداو دوای ئەوە کە زۆرینەی دەنگەکان مسۆگەر دەبوو، دەنگدان کۆتایی پێ دەهات. لە ئەنجومەنی "خێڵەکی" کە کەم کەم بایەخی پەیدا کرد، هەندێك یاسا پەسندو هەندێك لە پۆستەکان دەست نیشان دەکران. لە کۆتایی سەدەی دووهەم، کۆماری رۆم تووشی گەندەڵیو فەوتان بوو، حیزبە سیاسییەکان کەوتنە ململانێو هەوڵە چاکسازیەکان بوونە هۆی سەرهەڵدانی کەلێن لە نێوان رێبەرانی نەریتی سەناو دەسەڵاتەکەیان بەسەر چارەنووسی وڵاتدا کز کرد. لە سەدەی یەکەمی پ. ز لەگەڵ پەرەسەندنی کێشمەکێشەکان، رێبەرانی کۆماریی هەرکام بۆخۆی سوپایەکی تایبەتیی پێك هێناو کەوتنە شەڕو پیلانگێڕی بە دژی یەکترو هەندێك لە رێبەرەکان بەشێوەی کاتی دەسەڵاتی بێ مونافیسیان بەدەست هێنا.

لە ساڵی ٤٤ی پ. ز دوژمنەکانی سیزار لە ترسی ئەوە کە دەسەڵاتی سەنا [پیران] لاواز بکاو حکوومەتێکی سەرەڕۆیانەو تاکەکەسی دامەزرێنێ، کوشتیان، بەڵام پاش ئەوە کە زڕکوڕەکەی سیزار لە ساڵی ٣١ی پ. ز بەسەر دوژمنەکانیدا زاڵ بوو، سیستمی کۆماریو سەناو ئەنجومەنە خەڵکییەکان جێی خۆیان دا بە حکوومەتی ئیمپراتوری.

هەندێك لە نووسەران قەوارە جۆراوجۆرەکانی حکوومەتیان لە سەدەکانی ناوەڕاستو نوێ لە سەدەی یازدەهەم تا سەدەی حەڤدەهەم دا وەك زەمینەو پێشینەی سەرەتایی دامەزراوە دێموکراتیکەکان ناو بردوون. بەتایبەت دەوڵەت شارەکانی باکووری ئیتالیا، فلۆرانسو وێنیز، کۆنفێدراسیۆنی سویسو هولەندا لەم بارەوە کەوتنە بەرباس، لەم سیستمانەدا بنەمای دەسەڵاتداریەتی خەڵکیو سیستمی نوێنەرایەتی لە قەوارەی جۆراوجۆردا بەڕێوە چوو، هەرچەند حکوومەت لە بناخەدا لە دەست کەمایەتییەك لە ئەشرافە خاوەن موڵکەکانو بازرگانەکان دابوو، کەوابوو نە دێموکراسی، بەڵکوو بە ئولیگارشی دەژمێردرا. بەهۆی جۆراوجۆر لە سەرەتاکانی سەدەی یازدەهەم، شارەکانی ئورووپایی بایەخو گرینگی ئابووریی سیاسی زۆریان پەیدا کرد. ئەم بارودۆخە بەتایبەت لەو شوێنانە پێك هات کە دەوڵەت لەوێدا بەهێز نەبوو، وەك باکووری ئیتالیا، ناوچەی راینو هولەنداو بلژیك. لە ئاکامدا شارگەلێکی نوێ خودموختارییەکی بەرچاویان پێ براو پاساوگەلی تیوریو یاسایی جۆراوجۆریان بۆ سەربەخۆیەکی رێژەیی خستە روو.

دەوڵەت شارەکانی ئیتالیایی، ناوی "کۆمۆن"یان لەسەر دانابوون کە بە مانای ملّک و ماڵی هاوبەش بوو. کۆمۆنەکانی ئیتالیایی لە سەدەکانی یازدەهەم و دوانزدەهەم دا لە شارە جۆراوجۆرەکان وەك بولونی، جنوا، پیزا و پیزتوا پێك هاتن. لە سەرەتادا بەشداریی سیاسی لە حکومەتدا لە نێو خاوەن ملّك و ماڵەکاندا بەرتەسك کرابوویەوە. وەك نەریتی لێ هاتبوو کە هەر شارێك لە شارێکی دیکە خاوەن مەنسەبێك (پودستا) وەك دادوەر و دەسەلاتدار بۆ ماوەی شەش مانگ دەکرا تا بە سەر بەڕێوەچوونی عادیلانەی کاروبارەکاندا چاودێری بکا. لە سەدەی سێزدەهەم دا چینەکانی بازرگان و پیشەسازی کە بزووتنەوەگەلێکی پیشەیی جۆراوجۆریان وەڕێخستبوو، دەسەلاتیان گرتە دەست و دامەزراوەگەلێکی بەڕێوەبەرییان بەناوی "سەرکردەکانی خەڵك" پێك هێنا کە لە تەنیشت "پودستا" لە راستای پشتیوانی لە بەرژەوەندی چینی تاجرپیشە خزمەتیان دەکرد. رێژەی سەدی ئەو کەسانەی کە بە کردەوە لە کاروباری حکومەتی کۆمۆنەکاندا بەشدارییان دەکرد، کەم بوو. لە کۆماری وێنیز کە لە سەرەتاکانی سەدەی چواردەهەمدا نزیك بە ١٢٠ هەزار کەس حەشیمەتی بوو، پۆستە سیاسییەکان لە دەست نزیك بە ٢٠٠ خێزانی ئەشرافی دا بوو کە ئەندامی ئەنجومەنی مەزن [کبیر] بوون. هەروەها لە کۆماری فلۆرانس‌دا کە لە سەرەتای سەدەی شانزدەهەم خاوەن ٦٠ هەزار کەس حەشیمەت بوو، نزیك بە ٣٥٠٠ هاوولاتی پیاو چینی سیاسی و خاوەن پۆست و دەسەلات بوون. هەڵبژاردن بەو شێوە بوو کە لیستەیەك لە پاڵێوراوەکانی جێی متمانە بۆ بەدەستەوەگرتنی پۆستەکان بەهۆی لیژنەی هەڵبژاردن دیاریی دەکرا، پاشان ناوی پاڵێوراوەکان لە سەتیلماسکی جیاجیادا نووسران و تیلماسکەکانیان دەخستە نێو توورەکەیەکی قایش [چرم]، پاشان لە رێی تیروپشکەوە بەرپرسەکانیان دیاری دەکرد. زۆرجار لەسەر ئەوەی چ کەسانێك ببن بە ئەندامی لیژنەی هەڵبژاردن، کێشەی سیاسی بەربلاو ساز دەبوو. هەندێك لە بنەما لە دەست رۆیشتوەکان لە سەر دانانی ئەندامانی لیژنەکەی هەڵبژاردن دەسەلاتیان بەکار دەهێنا. لە ماوەی سەدەی چواردەهەم زۆر لە دەوڵەت شارەکانی ئیتالیایی کەوتنە بەر هێرشی سەرکەوتوانانی بێگانە و یان شایەت حاڵی زاڵبوونی دەسەلاتدارە دیکتاتۆرە نێوخۆییەکان بوون و یان ئەوەی کە کەم کەم خەسڵەتی کۆماری و دیموکراتیك بوونی خۆیان لە دەست دا و گۆڕان بە "ئولیگارشی"گەلێکی ئەشرافی.

پێشینەی کۆماری و دیموکراسی لە سویس دا کە وەك کۆنفیدراسیۆنی سویس ناوبانگی دەکردوە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٩١ واتا کاتێك لە سێ کانتۆن یان هەرێمی گرینگ بە

مەبەستی پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان لە بەرانبەر پادشاکانی هابسبورگ یەکیان گرت. کانتۆنەکانی سویس بە پێچەوانەی کۆمارەکانی ئیتالیا زۆرجار لە جووتیارەکانو جەماعەتی گوندی پێك دەهاتن. بەو حاڵەش گوندیەکانو شارەیەکان شارومەندانی هاوسەنگ بوون. هەرکام لە کانتۆنەکان خاوەن دەسەڵاتی یاسادانان بوون، حکوومەتیش لە هەر کامیان دا بە پێی دابو نەریتی ناوچەیی دیاری دەکرا. خودی کونفیدراسیۆنەکەش دەسەڵاتێکی ئەوتۆی بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەندامەکانی خۆی نەبوو.

لە سەدەی شانزدەهەمو حەڤدەهەم دا، خەڵکی سویس بۆ پێشگیری لە هەڵوەشانی کۆنفیدراسیۆنەکەی خۆیان، هەڵوێستێکی بێلایەنانەیان لە زەمینەی سیاسەتی دەرەوەدا گرتە پێش. لەو سەدانەدا نوگری بۆلای هەڵکردن لەگەڵ ئولیگارشیە بە میرات بوەکان زیادی کرد.

## سەرمایەداری [Capitalism] و دێموکراسی

دێموکراسیی نوێ [مۆدێرن] لە هەلومەرجو بارودۆخی جۆراوجۆردا گووراوە [تکوین]و هۆکارگەلێکی زۆر لە سەرهەڵدانیدا کاریگەرییان بووە. زۆرجار دەوترێ کە سەرمایەداری یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکان لە پەرەسەندنی دێموکراسیدا بووە. بەو حاڵەش سەرمایەداری لەگەڵ زۆر چەشن لە رێژیمە سیاسییەکان هاوژیان بووە. پێوەندیی نێوان سەرمایەداریو دێموکراسی، بابەتی مشتو مڕێکی زۆر بووە. یەکێك لە بۆچوونە گرینگەکان لەو بارەوە، سەرمایەداریو دێموکراسی بە دوو روخساری راستییەك دەزانن. توخمە سەرەکییەکانی دێموکراسی واتا ئازادی، پەیماننامە، کێبەرکێ، بەشداریو ... هتد، توخمەکانی سەرمایەداریشن. لە رووی مێژووییشەوە سەرمایەداریو دێموکراسی کەمو زۆر هاوکات سەریان هەڵ داو یەکتریان بەهێز کرد. لە رووی دیراساتی ئامارییەوە، پێوەندییەکی نزیك لە نێوان چوونەسەری ئاستی گەشەی سەرمایەدارانەو گەشەی دێموکراسی دەبینرێ. لەگەڵ ئەمەشدا پێوەندیی نێوان دێموکراسیو سەرمایەداری زۆر ئاڵۆزە. سەرمایەداری لەگەڵ سیستمە دیکتاتۆرەکان، فاشیستیو دەسەڵاتخوازیش هاوئاهەنگو هاورێ بووە. لە لایەکی دیکەوە نەریتی دێموکراسی لەوانەیە لە هەلومەرجی گەشەنەکردنی سەرمایەداریش دا سەقامگیر ببێ، هیندوستان زۆرجار وەك نموونەیەك ناو دەبرێ. زۆر جۆر لە دێموکراسییە کۆنەکان وەك دیتمان، لە بارودۆخی پێش سەرهەڵدانی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری دا دامەزران. لەگەڵ ئەمەش

ئەوانەی کە دیفاع لە بوونی پێوەندی سەرەکی لە نێوان دێموکراسیو سەرمایەداریدا دەکەن، بەڵگە دەهێننەوە کە هەر سیستمەکانی دێموکراسی دەتوانن بەسەر مەسایلی سیاسیو ئابووریی ئاڵۆز کە لە سیستمەکانی سەرمایەداریدا سەر هەڵدەدەن، سەر بکەون. هەروەها لەم روانگەوە نێوان هەڵبژاردنی شتومەك [کالا] لە بازاڕی ئابووریو هەڵبژاردنی سیاسی لە بازاڕی دەنگەکان، پێوەندییەکی گەوهەری بوونی هەیە. بە واتایەکی دیکە بە بێ ئازادیی ئابووری، ئازادیی سیاسی مانای نیەو بە بێ ئازادیی سیاسی، ئازادیی ئابووری ناگاتە لووتەی گەشەکردنی خۆی. سەرمایەداریو دێموکراسی لەسەر گوتارو ئەقڵانییەتێکی تاك راوەستاونو ناسنامەکانو کردارگەلێکی یەکسان بۆ مرۆڤەکان لەبەرچاو دەگرن.

هەروەها لە نێوان دێموکراسیو سەرمایەداریدا لە رووی چینایەتییەوە پێوەندییەکی سەرەکی بوونی هەیە، لەبەر ئەوە لە هەردوو دا، بورجیوازی وەك هۆکاری کەڵکەبوونی سەرمایەو پارێزەری ئازادی ئەخشو رۆڵی سەرەکیی هەیە. لانیکەم دێموکراسی بورژوازی بە پێی سیستمی سەرمایەداری ئازاد مومکین نیە. هەرچەند چینی بورجیواز لە بەشداریی هەموان لە سیاسەتدا پشتیوانیی نەدەکرد، بەڵام سەرئەنجام هەر خودی پشتیوانی لە ئەندیشەی ئازادی، زەمینەی بۆ بەشداریی سیاسیی هەموو چینەکان پێك هێنا. تێگەیشتنی دیکە لەم بەڵگەهێنانەوە ئەوەیە کە نێوان دێموکراسیو هێزی چینی نێونجی پێوەندییەك هەیە. بە پێی ئەم تێگەیشتنە چینە نێونجییەکان بە پێچەوانەی چینەکانی سەرەوەو خوارەوە، زۆرجار روحیەیەکی نەرمو لەسەرەخۆ [معتدل]و لێبوردەییو ئاسانگیریو نەرمکێشان هەیەو خۆ لە توندڕەوی دەپارێزن. لانیکەم ئەمە کە لە نێوان چینە سەرەکیەکانی کۆمەڵایەتی وەك خاوەن مولکەکان، جووتیارانو کرێکاران، چینی نێونجی سەرمایەداری نزیکایەتییەکی روحی زۆرتر سەبارەت بە دێموکراسیو سەرمایەداری هەیە.

بە شێوەی گشتی نووسەرە جیاوازەکان ئاماژەیان بە هاوئاهەنگیو ناهاوئاهەنگیی جۆراوجۆر نێوان سەرمایەداریو دێموکراسی کردوە. لەگەڵ هەمووی ئەمانە دەکرێ بوترێ کە دێموکراسیو سەرمایەداری کاتێك هاوئاهەنگییان هەیە کە هەردوو یارمەتی بە بەرەوپێش بردنی ئامانجی یەکسانی رێژەیی لە کۆمەڵگادا لە باری ئابووری، سیاسیو کۆمەڵایەتی بدەن. سەرمایەداری کاتێك ببێتە هۆی سەرهەڵدانی نایەکسانیگەلی سەرەکیو بەرچاو، دیارە لەگەڵ ئامانجی دێموکراسی ناهاوئاهەنگ دەبێ. هەروەها دێموکراسی کاتێك دەرەتانی وەدیهاتنێکی زۆرتر پەیدا

دەکا کە لە دەسەڵاتی سیاسی تارادەیەکی زۆر لـە ئاسـت دەسـەڵاتی ئابووریـدا سـەربەخۆ بـێ. سەرمایەداری بە پێی رەوتی دەرەتـانی سـەربەخۆیی دەسـەڵاتو دەسـەڵاتداریەتیی سیاسـی لـە موڵکداریەتی ئابووری پێك دێنێ، بەڵام دەبێ دەربکەوێ کە تا چ رادەیـەك بـەکردەوە، جێبـەجێ دەبێ.

## زەمینەگەلی کۆمەڵایەتی

لە کاتێك دا کە پێوەندی سەرمایەداریو دێموکراسـی بوەتـە هـۆی هاتنـە ئـارای مـشتومڕی گشتیو مەزن، باسەکانی نوێتر سەبارەت بە زەمینەگەلی کۆمەڵایەتی، دێموکراسـی بەرتەسـكو روونتر بوون. تیئۆری دانان سەبارەت بە هەلومەرجی سەرهەڵدانو گۆڕانی [تکوین] دێموکراسـی بەم مانایە یەکێك لە پیشە باوەکانی زانایانی سیاسیی نوێ بووە لەم تیئـۆری دانانـەدا، لـە سـەر نەخشو کاریگەریی هۆکارە جۆراوجۆرەکانی دەوروبەر لە سەر سیستمی سیاسی تەئکیـد کـراوە. کاتێك پێوەندیی ئەم هۆکارە جۆراوجۆرانەیش پێکەوە لەبەرچـاو بـێ، تیئۆریگـەلێکی ئـاڵۆزتر دەست دەکەوێ. زەمینەگەلی ئابووری، کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی زیاتر لە هۆکارەکانی دیکە وەك سەرەتای پێویست بۆ سەرهەڵدانی دێموکراسی سەرنجی پێ دراوە، تا ئەو جێگەیە کـە تارادەیـەك نەخشی زەمینەکانی سیاسی لە سەر یـەك لەبەرچـاو نـەگیراوە. یـەکێك لـە روانگـە گـشتیەکان سەبارەت بە سەرهەڵدانی دێموکراسـی، روانگـەی رەسـەنایەتیی کردەوەیـی تـاڵکوت پارسـۆنز، کۆمەڵناسی گەورەی ئامریکایی بووە کە لەودا لە سەر پێوەنـدیی دوولایەنـەی نێـوان سیـستمی سیاسیو باقیی سیستمەکانی کۆمەڵگا پێ داگیراوە. لەم رووەوە گۆڕانی دێموکراسـی پێویـستی بە ئاڵوگۆڕ لە بوارەکانی دیکەدا هەیە. ئەم چەشـنە بەڵگەهێنانـەوە گـشتییە بـۆ نموونـە نێـوان گەشەی ئابووریو سەرهەڵدانی دێموکراسی پێوەندییەکی هاوبەستراوەیی پـڕ مانـای هەیـە. لـە سوودەکانی روونتری ئەم روانگەیە، بەڵگـە هێنراوەتـەوە کـە کۆمـەڵێك گۆڕانکـاریی پێکـەوە بەسـتراو لـە بـواری ئـابووری، فێرکـردنو پێوەندیـەکان سـەرەتای سـەرهەڵدانو سـەقامگیری دێموکراسییە. سیمون مارتین لیپست کۆمەڵناسی دێموکراسی نێوان گۆڕان لـە بـواری هۆکـاری ئابووریو کۆمەڵایەتیو سەرهەڵدانی سیماکانی دێموکراسی، پێوەندییەکی نزیکی دۆزیوەتـەوە. ئەو لە توێژینەوەکانی خۆیدا بەم ئاکامە گەیشت کە بە هەڵسەنگاندنی وڵاتگەلی جۆراوجـۆر بـە پێی نیشانەگەلێك وەك پەرەسەندنی پیشەسـازی، فێرکردنو بەشاریی بوون [مدنی] دەکرێ بـوترێ

کە نێوان دیکتاتۆرەکانی ناسەقامگیرو دیموکراسیەکانی سەقامگرتوو، لەو بارەوە جیاوازیگەلێکی سەرەکیو پڕ مانایەك بوونی هەیە. لە توێژینەوەی دیکەدا کە لە ژێر کاریگەریی ئەم دیراساتەدا کە سەبارەت بە ٧٥ وڵات کراوە، لە نێوان گەشەی نیشانەکانی پەرەسەندنی ئابووریو چوونە سەری کێبەرکێی سیاسی وەك یەکێك لە نیشانەکانی سەرەکیی دیموکراسی، پێوەندییەکی ئەرێنیو مانادرای دۆزیوەتەوە. لە دیراساتی هاوشێوەی دیکەدا دەرکەوتوە کە دامەزراندنی دیموکراسی لەگەڵ پەرەگرتنی دامەزراوەکانی ئابووریی مۆدێرن، سیستمی سیاسی، سیستمی پێوەندیو رادەی شارنشینی پێوەندییەکی هاوبەستراوەیی زۆر هەیە. لە توێژینەوەیەکی هاوچەشن سەبارەت بە وڵاتانی ئەمریکای لاتین، دەرکەوتوە کە هەرچی نیشانەکانی گەشەی ئابووری سەرتر بڕوا، بەشداریی سیاسیو یاساگەرایی خەڵك دەچێتە سەر.

ئەم جۆرە دیراساتە هەرچەند پەرەی زۆریان سەندوە، بەڵام رەخنەگەلێکیشی لەسەرە. بۆ نموونە هەندێك لە رەخنەگرەکان وتوویانە کە سەرتر لە ئاستی گەشەی کۆمەڵایەتیو ئابووری دیاریکراو، هیچ پێوەندییەکی روونو راستەوخۆ لە نێوان پەرەسەندنی دیموکراسیو نیشانەکانی گەشەی کۆمەڵایەتیو ئابووری ناتوانرێ بدۆزرێتەوە. هەروەها رەخنە گیراوە کە ئەم چەشنە دیراساتە تەنیا پێوەندی پێکەوەلکانو هاوپێوەندی نیشان دەدەنو بە شێوەی هۆکارو دەرئەنجام [علت و معلول] دەری ناخەن کە ئایا بۆ نموونە پەرەسەندنی خۆشگوزەرانیو فێرکردن، تاکەکان بۆ بەشداریو کێبەرکێی دیموکراتیك ئامادە دەکاو یان ئەمە کە لە بناخەدا دیموکراسی بۆخۆی دەگەیەتە خوشگوزەرانیو فێرکردنی سەرتر. لە ژێر رۆشنایی ئەم رەخنانەدا توێژینەوەی دیکە بەرێوە چوو تا پێوەندییەکی دەستنیشانکەرتر نێوان بوارەکانی جێی سەرنج بدۆزرێتەوە. بۆ نموونە دانیل لرنر یەکێك لە کۆمەڵناسانی کلاسیکی دیموکراسی، پەرەسەندنی بەشداریی سیاسی وەك نیشانەی سەرەکیی دیموکراسی بەستۆتەوە بە رووداني چەند قۆناخی گەشەی پشت سەر یەك بەتایبەت پەرەسەندنی شارنشینی، پەرەسەندنی فێرکردنو گەشەی کەرەسەی پێوەندی. لە روانگەی ناوبراوەوە لە هەموو شوێنێك شارنشینی لەگەڵ چوونە سەری خوێندەواریو فێرکردنو ئەمەش بە نۆرەی خۆی بوەتە هۆی پەرەگرتنی پێوەندیەکانو ئەویش پەرەسەندنی بەشداریی سیاسی لێ کەوتۆتەوە.

لە دیراساتی هاوشێوەی دیکەدا لەسەر نەخشی دیاریکەری پەرەسەندنی شارنشینی لە گەشەی ئابووریو هروژاندنی کۆمەڵایەتیو کاریگەریی شوێندانەری ئەم دووە لەسەر هاتنە کایەی

بەرژەوەندی گرووپی دیارو سەرهەڵدانی حیزبەکانو کێبەرکێی سیاسی پێ داگیراوە. لەم چەشنە توێژینەوانەدا بەشێوەی گشتی دێموکراسی بە بەرهەمی ئاڵوگۆڕەکانی ئابووریو کۆمەڵایەتی ناسراوە، بەڵام لە روانگەی رەخنەگرانەوە، گەشەو پەرەگرتنی نیشانەگەلی [شاخص] گەشەی شاریی، کۆمەڵایەتیو ئابووری بە ناچاریو خۆی لە خۆیەوەو لانیکەم لە کورتخایەن دا سەقامگیری دێموکراسیی لێ ناکەوێتەوەو یان ئەمە کە هەندێك لە دێموکراسییەکان وەك هیندوستان لە رووی ئابووریو کۆمەڵایەتی گەشەسەندوو نین. کەوابوو وا دێتە بەرچاو کە دەبێ نەخشی هۆکاری دیکە بە تایبەت پێکهاتەی دەسەڵات لە بواری سیاسیدا کەوتبێتە بەر سەرنج. بە واتایەکی دیکە هۆکارە کاریگەرەکانی دێموکراسی بە تەنێ هەر کۆمەڵایەتیو ئابووری نین، بەڵکوو نەخشی پێکهاتەی دەسەڵات لەم پێوەندییەدا گرینگە. لە ژێر تیشکی ئەم جۆرە رەخنانەدا، هەندێك توێژینەوە وایان نیشان داوە کە پێشینەی سەرهەڵدانی دێموکراسی لە رۆژئاوا دەگەرێتەوە بۆ پێش گەشەی ئابووریو کۆمەڵایەتی. لەم توێژینەوانەدا تەئکید کراوەتە سەر ئەوە کە دێموکراسی لەو وڵاتانەدا کە بە رواڵەت سەقامگرتوون کە خاوەن نموونەی گوورانی [گەشەی] سیاسیی پێش وەختو گەشەی ئابووری دوایی‌تر بوون. بە پێچەوانە لەو وڵاتانەی کە پێش لە سەقامگیریی دێموکراسی، بەرەوپێش چوون لە زەمینەی گەشەی ئابووریو کۆمەڵایەتی تێیاندا رووی داوە، دێموکراسی نەیتوانیوە خۆ بگرێ.

تێگەیشتنەکانی سەرەوە بەشێوەی گشتی دەرخەری روانگەی کلاسیك لە کۆمەڵناسیی دێموکراسیدانو لەسەر نەخشی هۆکارە نێوخۆیییەکان لە سەرهەڵدانو هاتنەکایەی دێموکراسیدا تەئکید دەکەن. لە بەرانبەردا، ئەو سەردەمە کە سەبارەت بە شەپۆلەکانی دێموکراسی باس دێتە ئاراوەو پاشتر دێینە سەر باسیان، نەخشی هۆکارە ناوچەییو جیهانییەکان لە بەرەوپێش بردنی دێموکراسیدا زیاتر جێی سەرنجە.

## کۆمەڵگای مەدەنی

هەندێك لە نووسەران کاتی باس لە زەمینەگەلی کۆمەڵایەتیی دێموکراسی، بوونی کۆمەڵگای مەدەنیی بەهێز وەك مەرجی سەرەکیی سەقامگرتنو بەردەوامیی دێموکراسیدا دەنێن. کۆمەڵگای مەدەنی کۆمەڵێك لە دامەزراوەکان، ئەنجومەنەکانو رێکخراوەکانی کۆمەڵایەتییەکە بەستراوە بە دەوڵەتو دەسەڵاتی سیاسی نین، بەڵام نەخشێکی دیاریکەریان لە قەوارەپێدان بە

دەسەڵاتی سیاسی هەیە. بە بۆچوونی زۆر لە نووسەران کۆمەڵگای مەدەنی، کۆڵەکەکانی سەرەکی دیموکراسین کە بۆخۆ لێ لادان نابن. کۆمەڵگای مەدەنی کاتێك دەتوانێ رەگ دابکوتێ کە نە تەنیا سەبارەت بە دەسەڵاتی سیاسی، سەربەخۆو خود موختار بێ، بەڵکوو بیشتوانی دەسەڵاتو دەست رۆیشتوویی خۆی بە سەر دەوڵەتدا بەکار بێنێ. کۆمەڵگای مەدەنی بە پێی شوناس، دەبێ بریتی بێ لە کۆمەڵێك لە بوارەکانی گشتیی خودموختار کە لە نێویاندا، ئەنجومەنەکانو دامەزراوە مەدەنیەکان بتوانن کاروباری خۆیان رێكوپێك بکەنو پارێزگاری لە بەرژەوەندیی ئەندامەکانی خۆیان بکەن.

هەروەها بوارە ناوبراوەکان دەبێ هەموو کەس دەستیان پێی رابگاو دەرەتانی بەشداریی گشتی لەوانەدا بوونی هەبێ. بە شێوەی گشتی دەبێ لە نێوان کۆمەڵو دامەزراوە مەدەنییەکان لە لایەكو لە نێوان کۆمەڵگای مەدەنیو دەوڵەت لە لایەکی دیکەوە، پێوەندییەکی ئورگانیك بوونی هەبێ تا دیموکراسی گونجاو بێ. پاوان کردنی دەسەڵاتو سەرچاوەی (آمریت) لە دەست هەر گرووپێکی کۆمەڵایەتی یان دامەزراوەی سیاسیدا، بە شێوەیەك کە کۆسپی سەر رێی بەشداریو کێبەرکێی باقیی گرووپەکانو دامەزراوەکان بن، کۆسپی سەر رێی وەدیهاتنی کۆمەڵگای مەدەنیو دیموکراسی دەبن. پێوەندیی ئورگانیكو رەگ داکوتاو لە نێوان کۆمەڵگای مەدەنیو دەوڵەتدا، زۆرجار لە چوارچێوەی دامەزراوە پارلمانیو حیزبیو راگەیەنە گشتییەکاندا بەرێوە دەچێ. ئەنجومەنەکانی یاسادانان، پارتە سیاسییەکان، چاپەمەنیو راگەیەنەکان، کاناڵە جێکەوتووەکانی پێوەندیی نێوان کۆمەڵگای مەدەنیو دەوڵەتن. پێکهاتەی کۆمەڵگای مەدەنی دیارە لە کۆمەڵگاکانو سەردەمانی جۆراوجۆردا، جیاوازنو بەستراونەتەوە بە هۆکارگەلێکی جۆراوجۆر وەك پێکهاتنی کەلێنە کۆمەڵایەتییەکان، چەشنو چالاکیی هێزە کۆمەڵایەتیەکان، پەوی یان رێکخراوەیی چینە ئابوورییەکان، جۆری فەرهەنگی سیاسیو نەریتەکانی مێژوویی، رادەی درێژەکێشانی ناسنامەکانی نەریتی، ناوەرۆکی کۆمەڵایەتیی رێژیمی سیاسی، رادەی تێکۆشانی سیاسیی بەشەکانی کۆمەڵگای مەدەنیو ... هتد.

کۆمەڵگای مەدەنی بەم مانایە لە سەدەی حەفدەهەمو هەژدەهەم لە ئورووپادا سەری هەڵداو زەمینەی وەدیهاتنی بەشداریو کێبەرکیو باقیی بنەما سەرەکییەکانی دیموکراسی ئامادە کرد.
تۆرێك لە هێزو گرووپەکانی چینایەتی، قەومی، ئایینی، پیشەیی، هزریو ... هتد لە یەکترو لە دەوڵەت سەربەخۆییان وەرگرتو بۆ بەرەوپێش بردنی ئامانجەکانی خۆیانو بەشداری لە گۆرەپانی

دەسەڵاتی سیاسیدا چالاك بوون. شارەكانی ئەورووپاییش لەم سەردەمانەدا خاوەن رادەیەكی زۆر لە خودموختاری فەرهەنگیو كۆمەڵایەتی بوون.

جۆری پێوەندیی نێوان كۆمەڵگای مەدەنیو دەوڵەت لە وڵاتانی ئەورووپاییدا لە ژێر كاریگەریی هۆكاری جیاواز وەك رادەی پێشكەوتوویی ئایدۆلۆژی لیبرالیسمی سیاسیو ئابووری، وێناكانی باو سەبارەت بە ئەركی تایبەتیی دەوڵەت، جۆری شۆڕشەكان یا چاكسازیەكان كە لەوان دا رووی دا، رادەی بورووكراتیك بوونی دامەزراوە سیاسییەكانو دەوڵەت لە رووی مێژوویی، چەشنو ناوەرۆكی بزووتنەوەگەلی كۆمەڵایەتیو نارەزایەتی، لاوازیو دەسەڵاتی چینی بورجیوازیو ... هتد دیاری كرا. لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، لە ژێر كاریگەریی هۆكارە جیاوازەكان وەك پێداگرتن لەسەر یەكسانیو ئازادی، لاوازیی مێژوویی دامەزراوەی دەوڵەت، پێ داگرتن لەسەر دەستوورو خۆ لە بەرپرسایەتیدانی دەسەڵاتداران، نەبوونی پێشینەی حكوومەتەكانی پادشایی، ئەشرافیو فئودالیو باقیی هۆكارەكان، كۆمەڵگای مەدەنی گەشەكردنێكی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیو دێموكراسیی لیبراڵی لەسەر بناخەكانی ئەو گەشەی كرد.

بێچمی كۆمەڵگای مەدەنیش بە لەبەرچاوگرتنی ئایدولۆژیای سیاسیی تایبەت كە هەر كات بەسەر دەوڵەتدا زاڵ بوو، گۆڕانی بەسەردا هاتو لە ئاكامدا لەسەر ناوەرۆكی دێموكراسی كاریگەریی دانا. ئایدولۆژیا و دەوڵەتی لیبراڵ بەرزترین بواری تێكۆشانی بۆ كۆمەڵگای مەدەنی پێك هێنا. لەگەڵ قەیرانو سەرولێژ بوونەوەی لیبراڵیزمو دەوڵەتی بچووكو بێ بەرپرسایەتی لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەهەمو لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەندیشەی دەوڵەتی بەرپرس لە رووی كۆمەڵایەتیو ئابووریو پێویستیی دەست تێوەردانی دەوڵەتی، كۆمەڵگای مەدەنی فەزایەكی بەرتەسكتری پەیدا كردو دێموكراسی قەوارەیەكی نوێی بەخۆوە گرت. لەگەڵ پەرەسەندنی بوارەكانی تێكۆشانە دەوڵەتییەكان، وادیارە رێژەی سەربەخۆییو تێكۆشانی دامەزراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنی هەر بەو رادەیە بەرتەسكتر دەبێتەوە. بە فەرهەنگ بوونی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی لە رۆژئاوا پاش شەڕی جیهانیی دووهەم، هەندێك سنووری لەم بوارەدا دادەنا، بەڵام بە لاكردنەوە لە ئایدۆلۆژیای نیولیبراڵیسمو پێداگرتن لە سەر دەوڵەتی بچووك لە دەیەی ١٩٨٠دا فەزایەكی نوێ بۆ پەرەگرتنی دامەزراوەكانو رێكخراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنی هاتە ئاراوە. نۆژەنكردنەوەی پێوەندییەكانی نێوان كۆمەڵگای مەدەنیو دەوڵەت لە هەر حاڵ دا

هەموو کات بە مانای پێناسەی سەر لە نوێی بواری دەسەڵاتەکان و تێکۆشانی دەوڵەت و گۆڕان لە بێچم و قەوارەی دێموکراسی دایە. بۆیە نەخش و تێکۆشانی کۆمەڵگای مەدەنی یەکێك لە پێوەرە سەرەکییەکان لە ریزبەندیی رژێمە سیاسییەکان بەگشتی و دێموکراسییەکان بە تایبەتی یە. جیاکردنەوەی رژێمەکانی دێموکراتیك، بێچم دێموکراتیك، دەسەڵاتخواز، تۆتالیتێر، فاشیستی و ... هتد بە پێی پێوەری تێکۆشان و توانایی کۆمەڵگای مەدەنی و پێوەندیی ئەو لەگەڵ دەزگای دەسەڵاتی دەوڵەتی مومکین دەبێ. دێموکراسییەکانی لیبراڵ، کۆمەڵایەتی، خوشگوزەرانی، ئەنجومەنی و . . . هتد بە پێی بەربڵاوی و قەوارە و تێکۆشانی کۆمەڵگای مەدەنی لێك جیا دەکرێنەوە.

لە لێکدانەوەی بەرتەسکتر لە پێوەندیی دێموکراسی و کۆمەڵگای مەدەنی لە سەر گرینگیی ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان وەك تۆخمی پێکهێنەری کۆمەڵگای مەدەنی لە گووران و سەقامگیریی دێموکراسی دا تەئکید دەکرێ. ئەنجومەنەکان، دامەزراوەگەلێکن کە هاووڵاتیان لە کۆمەڵگاکانی هاوچەرخ دا بۆ بەرەوپێش بردنی داخوازی و بەرژەوەندیی هاوبەشی خۆیان دایان دەمەزرێنن. دێموکراسی بە بێ بوونی تۆڕێکی بەربڵاو لە ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان، لە بناخەدا مومکین نیە. بەو رادەیە کە پێکهاتەی ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان بەربڵاوتر و ئاڵۆزتر بێ، دێموکراسی بە ئەزموونتر و پێگەیشتووتر دەبێ. هەر بۆیە کە زۆر لە نووسەران، ئەنجومەنەکان بە بنەمای رێکوپێك کردنی سیستمی دێموکراتیك دادەنێن. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لە لایەنگرانی دێموکراسی، زۆربوونی کۆمەڵەکان و ئەنجومەنەکان بە مەترسی بۆ سەر یەکیەتیی سیاسیی کۆمەڵگا دەزانن. بە شێوەی گشتی لایەنگرانی دێموکراسی ژاکوبنی یان رۆسۆیی، تێڕوانینێکی رەشبینانەیان سەبارەت بە زۆربوونی دامەزراوەکان و ئەنجومەنەکانی کۆمەڵگای مەدەنی هەبوو و ئەوانیان بە کۆسپی سەر رێی وەدیهێنانی ئیرادەی گشتی دەزانی. لە روانگەی ئەوانەوە، ئەنجومەنەکان و یەکیەتییەکان بە هۆی پشتیوانی لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان، گەورەیی مەدەنی و ئەمەکناسی بۆ دەوڵەت وەك نوێنەری بەرژەوەندیی گشتی لاواز دەکەن و ئەمەکناسی بەڵێنە بچووکەکان سەبارەت بە خۆیان پێك دێنن. لە لایەکی دیکەوە لایەنگرانی دێموکراسیی لیبراڵ بە پێداگرتن لە سەر ئەگەری سەرهەڵدانی دیکتاتۆریی زۆرینە، لە زۆرینەخوازی و ئەنجومەنە مەدەنییەکان وەك بناخەی دێموکراسی پشتیوانییان کردوە. بە بۆچوونی ئەوان وەها ئەنجومەنگەلێك تەواوکەر و تەنانەت زەمینەی کرداری دامەزراوەکانی

فەرمی دێموکراسی واتا ئەنجومەنەکانی یاسادانان‌و حیزبەکان‌و سیستمی فرەحیزبی بە بێ بوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنیی چالاك‌و ئەنجومەنگەلی کۆمەڵایەتیی زۆر [متعدد] وێنا ناکرێ.

هەروەك بینیومانە، لایەنگرانی دێموکراسیی لیبراڵ‌و کۆمەڵگای مەدەنی، بیرمەندانێك وەك جیمز مادیسون، توکویل‌و جان ستوارت میل ئاماژەیان بە مەترسی دیکتاتۆریی زۆرینە کردوە. توکویل لەسەر ئەو رایە بوو کە ئەنجومەنەکان پارێزەری ئازادی‌و رەنگاورەنگی [تنوع] لە دێموکراسییەکانی خەڵکی دان.

تیئۆرییەکانی پشتیوانی لە نەخشی ئەنجومەنە مەدەنییەکان وەك بەردی بناخەی دێموکراسی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دا برەوێکی زۆری سەند، بەڵام لە دەیەکانی دوایی‌دا بەهۆی پەرەگرتنی پێکهاتەی دەوڵەتی خوشگوزەرانی، روویان لە کزی کرد، هەرچەند جارێکی‌تر لە کۆتایی‌یەکانی سەدەی بیستەم دا گیانێکی تازەیان وەبەر هاتەوە، لە وەها روانگەیەکەوە، ئەنجومەنەکان لە جێی دەوڵەت، سەنتەری سەرەکیی ژیان‌و کۆمەڵگای دێموکراتیك پێك دەهێنن، لە کاتێکدا کە لە بۆچوونەکانی لیبراڵی کۆندا، بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ دەوڵەت، نەخشی پلە دوویان بوو. "ئەنجومەن خوازن" "چەمکی دەوڵەت وەك چەمکی رێك‌وپێك کەری [سامان بخش] کۆمەڵگای دێموکراتیك وەرناگرن. لە روانگەی ئەوانەوە، وەرگرتنی دەوڵەت لەگەڵ مانای ئازادی لە ئەندیشەی لیبراڵی دا دژایەتی پەیدا دەکا. دیارە ئەوان چەشنێك لە سیستمی سیاسی نائاوەندی [غیرمتمرکز]و سنووردارییان لا پەسندە، بەڵام دەبێ ئەنجومەنەکان بەڕێوەبەریی کاروباری کۆمەڵایەتی بگرنە ئەستۆو لە مافی خۆدگەردانی کەڵك وەربگرن. دەوڵەت هەر دەبێ یاسا و ئاسایشێك کە ئەنجومەنەکان خۆیان ناتوانن بۆخۆیان دابینی بکەن، دابین بکا. بەڕێوەبردنی نەخشێکی زیاتر لەوە لە لایەن دەوڵەتەوە، مەترسی‌یە بۆ ژیانی ئەنجومەنە مەدەنییەکان. بە بۆچوونی ئەوان ئەنجومەنەکان لە سەر رەزامەندیی دەوڵەت‌و لەسەر ئیزنی دەوڵەت دانەمەزراون، بەڵکوو پشتیان بە هەبوونی خۆیان بەستوە. پێویستیی پاراستنی ئارامی‌و یاسا بێجگە لە بوونی دەوڵەتێکی بچووك نیە.

روانگەکانی ئەنجومەنخواز نەیانتوانی لە ماوەی سەدەی بیستەم دا لەگەڵ ئایدولۆژییە سەرەکییەکان واتە لیبراڵیسم‌و سوسیالیزم بکەونە رکەبەری‌و لە ئاکام دا تا کۆتایی‌یەکانی سەدەی بیستەم لە برەو کەوتن‌و ئەنجومەن خوازان خوازیاری لاوازیی دەوڵەت‌و لامەرکەزیی سیاسی بوون، لە کاتێك دا لە سەدەی بیستەم دا پێك هێنانی دەوڵەتی بەهێز یەکێك لە پێوەیستییەکانی

دیفاعی دەرەکی‌و پێشکەوتنی نێوخۆیی بە حیساب دەهات. دەوڵەتی خۆشگوزەران بۆخۆی یەکێك لە دەرکەوتنە گرینگەکانی دەوڵەتی بەهێز بوو. لە ئاکام دا ئەنجومەنەکانی کۆمەڵگای مەدەنی نەخشی گرینگ بەڵام بە پلەی دووهەم لە سیستمی دێموکراتیك دا کەوتە ئەستۆیان. لیبرالیسم ئەو نەشخە سەرەکییە بنچینەیی‌یە کە ئەنجومەنخوازەکان بۆ ئەنجومەنەکانی کۆمەڵگای مەددنی دەیانویست، لای پەسند نەبوو. بەڵام لە کۆتاییەکانی دەیەی ۱۹۷۰ پێ‌داگرتن لەسەر دەوڵەتی گەورە، بوروکراسی‌و دەست تێوەردانی حکوومەت لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌دا، لەگەڵ پەرەسەندنی ئایدولۆژی نیولیبرالیسم رووی لە کزی کرد. لە رووی نێونەتەوەیی‌یەوە، بەجیهانی‌بوونی بازرگانی‌و مەسایلی دارایی، توانایی دەوڵەتەکانی لە بەڕێوەبردنی ئابووری‌دا لاواز کرد. بە کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، پاساودانی کۆکردنەوەی دەسەڵاتی سەربازی‌و ئابووری لە دەوڵەتەکاندا کەم رەنگتر بووە. هەروەها لەبارەی تیئۆریی ئابوورییەوە لەسەر خەسڵەتی توانای گەشەسەندنی دامەزراوە بچووکەکانی ئابووری‌و نێونجی تەئکید کرا. هەر بۆیە بە شێوەی گشتی لەسەر نەخشی ئەنجومەنەکانی کۆمەڵگای مەددەنی لە وەدیهێنانی دێموکراسی بە مانای تەواوتری تەئکیدی زۆر دەکرێ.

## زەمینەگەلی فەرهەنگی‌و فەرهەنگی سیاسی

هەندێك لە نووسەران، دێموکراسی وەك کۆمەڵێك لە تێگەیشتنەکان، بۆخۆی بە بەشێك لە فەرهەنگی سیاسی دەزانن، فەرهەنگی سیاسی کۆمەڵێك لە تێگەیشتنەکان‌و بەهاگەلێکە کە بە رەوتەکان‌و ژیانی سیاسی مانا دەبەخشن. باسی فەرهەنگی سیاسی لە سەدەی بیستەمدا بە تایبەت لە پێوەندی لەگەڵ زەمینەگەلی فەرهەنگی سەرهەڵدانی دێموکراسی هاتۆتە ئاراوە. پرسیاری سەرەکی ئەمە بووە کە چ جۆرێك لە فەرهەنگی سیاسی لێهاتوە بۆ پەرەپێدانی دێموکراسی‌یە. پرسیاری ناسەرەکی [فرعی] ئەمەیە کە چ زەمینەگەلێکی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و مێژوویی، بوونەتە هۆی گەشەی خودی فەرهەنگی سیاسیی دێموکراتیك؟ بابەتی تێگەیشتنەکانی باو لە فەرهەنگێکی سیاسی‌دا، شێوەی هەڵسوکەوتی دەزگای دەسەڵاتی دەوڵەتی، ئەو جۆرە کە دەبێ ببێ‌و ئەو جۆرە کە هەیە، لەم رووەوە فەرهەنگی سیاسی کە دەتوانرێ بەشێوەی فەرهەنگی گشتی، بەسەر دوو بەشدا دابەش بکرێ: فەرهەنگی سیاسیی ئایدئال‌و فەرهەنگی سیاسیی واقیعی.

لەگەڵ ئەمە مەبەست لە فەرهەنگی سیاسی لە باس لە دێموکراسییەکانی ئیمڕۆدا، هەر ئەو فەرهەنگە سیاسییەی واقیعییە. هەندێکی دیکە لە نووسەران، فەرهەنگی سیاسی دەکەنە دوو بەش: یەکەم، فەرهەنگی سیاسیی گرووپە هەڵبژێردراوە دەسەڵاتدارەکانو ئەوی دیکە فەرهەنگی سیاسیی کۆمەڵانی خەڵك. پێوەندیی نێوان ئەم دووانە لە باسی دێموکراسیدا زۆر گرینگە. بەهۆی جۆراوجۆر لەوانەیە لە نێوان ئەو دووەدا ناهاوئاهەنگی بێتە پێش. لەوانەیە گرووپە هەڵبژێردراوەکان لە رووی حەزکردن لە دێموکراسی، لە کۆمەڵانی خەڵك لە دواتر بن (هەروەك لە رێژیمە نەریتییەکان دا بینراوە)و یان لە پێشتر بن (هەروەك لە رێژیمە تازە بونیاتنراوەکاندا دەبینرێ). هەر چۆنێك بێ کەلێنی نێوان ئەم دوو بەشە لە فەرهەنگی سیاسی زۆر ناخایانێ.

نووسەرە کۆنەکان کاتێك لە بەها سیاسییەکان وەك پشتوانەی دێموکراسی قسەیان دەکرد، مەبەستیان لە راستیدا فەرهەنگی سیاسیی دێموکراتیك بوو. هەندێك لە نووسەران وەها فەرهەنگێك لە بنەمادا بە هەڵقوڵاو لە هەلومەرجی ژیانی چینگەلێکی تایبەت دا (بۆ نموونە چینی نێوەنج، چینی بازرگانپیشەو ... هتد) دەزانیو پێیان وابوو کە بۆ هەموو خەڵك تەشەنە دەکات. لەگەڵ پەرەسەندنی زانستی مرۆڤناسیی فەرهەنگی پاش شەڕی دووهەمی جیهانی، تـوێژینەوە لە فەرهەنگی سیاسیی قەومەکانو نەتەوەکان دا بە شێوەی گشتی پەرەی سەند. نووسەرگەلێکی زۆر لە کەسایەتیی [کاراکتر] نەتەوەی ئەمریکاییەکان، رووسەکان، یابانییەکانو ئاڵمانییەکان باسیان کردو نێوان ئەوان لە گەڵ ئەزموونی دێموکراسی یان دیکتاتۆری پێوەندییەکیان دۆزیەوە. کەسایەتیی [کاراکتر] نەتەوەیی بەتایبەت لە سەر بناخەی پرۆسەی کۆمەڵگاخوازی سەرەتایی لە خێزاندا پێناسە دەکرا. لەم بارەوە پێوەندیی نێوان کۆمەڵگاخوازی لە خێزانو دێموکراسی بوو بە خاڵی جێی سەرنج. لەم روانگەوە تێگەیشتنگەلێك کە پرۆسەو رەوتەکانی کۆمەڵگاخوازیی سەرەتایی پێك دێنێ، وەك هەست بە متمانە یان نەبوونی متمانە بە کەسانی دیکە، هەستی متمانە بە خۆو سەربەخۆیی تاکەکەسی، چاوەڕوانی لە کەسانی دیکەو ... هتد، لە سەر قەوارەبەستنی هەڵسوکەوت، تێڕوانینی سیاسی کاریگەرن. کاناڵی پاش سەرەتایی کۆمەڵگاخوازی وەك فێرکردنی گشتیو سیاسی، بەستراوەییەکانی پیشەییو . . . هتد، لەوانەیە تێڕوانینگەلێك بەهۆی رەوتی کۆمەڵگاخوازیی سەرەتایی قامگرتوو بکەن یان لە گەڵی بکەونە دژایەتی. سەبارەت بە خێزان [بنەماڵە]، بێچمی پێکهاتەی دەسەڵاتی باو لەودا لە روانگەی زۆر لە خاوەن رایانی کۆمەڵگاخوازی [جامعەپذیری]

و لەسەر بنەمای توێژینەوەکانی بەردەست، لە سەر تێڕوانینی لەبار یان نالەبار سەبارەت بە بەشداری، مونافیسەو دێموکراسی، کاریگەریی دەبێ. زۆرجار سێ جۆری پێکهاتەی دەسەڵات لە خێزانێك دا جیا دەکرێتەوە: ١) دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان ئەندامانی بنەماڵە یان کۆکردنەوەی دەسەڵات لە چنگی یەك کەس دا واتا باوك، ٢) دەسەڵات لە دەست باوك دا لەگەڵ پێوەندییەکی گەرمو پڕ خۆشەویستیو ٣) کۆبوونەوەی دەسەڵات لە دەست باوکدا لەگەڵ ئیرتباتێکی توند لەگەڵ سزای جەستەیی.

لە هەندێك لە توێژینەوەکان دا دەرکەوتوە کە باوکەکان لە خێزانە رووسەکاندا تەنیا لە کاتی سزای جەستەییدا دەردەکەون، لەگەڵ منداڵەکانی خۆیان گەمە ناکەن، منداڵەکان مافی شەڕکردنیان لەگەڵ یەکتر نیەو دەبێ هەموو ناکۆکییەکانی خۆیان ببەنە لای باوکیان. بە پێی هەر ئەو توێژینەوە، بارودۆخەکە لە بنەماڵەکانی ئەمریکاییدا بە پێچەوانەیە. بە پێی توێژینەوەیەکی دیکە فەرهەنگی خەڵك لە باشووری ئیتالیا کە شوێنگەی مافیا بووە، خێزان تەوەرە، بەو مانایە کە پێوەندیی متمانەو بەستراوەیی پشتیوانی لە یەکتر لە نێو بنەماڵەدا بەهێزە، بەڵام بنەماڵەکان سەبارەت بە یەکتر بێمتمانەن. هەر ئەمە بۆخۆی کوسپێکە لەسەر رێی بەشداری لە ژیانی گشتی دا. هەندێك توێژینەوە سەبارەت بە فەرهەنگی سیاسیی کۆمەڵگای ئاسیایی وا دەردەخەن کە لە بنەماڵەی ئاسیاییدا هەڵسوکەوتی باوكو دایك لە نێوان خۆشەویستیی تەواوو تووڕەیی رەها لە هاتوچۆ دایەو منداڵەکە بەو ئاکامە دەگا کە لەسەر هەڵسوکەوتی کەسانی دیکە بە سەر خۆیدا دەسەڵاتێکی نیە. بۆیە لە روانگەی ئەوە جیهان نائەقڵانی، ناسەقامگرتووو بۆ متمانە نابێ. تەنیا رێگەی دابین کردنی ئارامیو ئاسایش گوێڕایەڵی کوێرکوێرانە لە گەورەترەکانو سەرچاوەکانی دەسەڵاتە. منداڵەکان زۆرجار هەستی خۆیان سەبارەت بە دایكو باوکەکان دەبەنە نێو کۆمەڵگاو دەوڵەتو هەر ئەمە بۆخۆی دەبێتە هۆی گەشە [گووران]و بەردەوامی کەسایەتیی نەتەوەیی. بەڵام زۆری نەخایاند کە بابەتی جێی گومانی کەسایەتیی نەتەوەیی کەوتە بەر رەخنەیەکی زۆرو جێی خۆی دا بە باسی روونتر واتا فەرهەنگی سیاسیو لە ئاکامدا زەمینە بۆ توێژینەوە سەبارەت بە ماناکانی فەرهەنگی کردەوەی دێموکراتیکی سیاسی ئامادەتر بوو.

لەم توێژینەوانەدا لە جێی پێداگرتن لە سەر نەخشی کاناڵەکانی کۆمەڵگاخوازی سەرەتایی، بەتایبەت بنەماڵە لە سەر کاناڵەکانی کۆمەڵگاخوازی دووهەم دەرکەوتە

[ثانویه EPOPHENOMENON]و ڕەوتی پێوەندییەکان لە بەدیهاتنی تێڕوانینەکانو مەیلەکان پێ داگیراوە. لە گەڵ ئەوەش قەوارە بەستنی فەرهەنگی سیاسی بە مانای تایبەتیی وشەکە خاڵی سەرەکیی جێی سەرنج بوو. لەم نەریتە دا، هەندێك لە نووسەرەکان چەمکی "فەرهەنگی مەدەنی"یان بۆ وەسف کردنی توخمەکانو کۆڵەکەی سەرەکیی فەرهەنگی سیاسیی دێموکراتیك داناو فەرهەنگی سیاسیی دێموکراسی لەم ڕوانگەوە بریتیی لە ڕووکردنەکان سەبارەت بە سیاسەتو حکوومەتە کە هەڵگری ئاستێکی بەرز لە زانیاریی سیاسی، هەست بە خۆبژیوی [خودکفایی]و توانایی تاکەکەسی، خوازیاری بۆ هاوکاری لەگەڵ کەسانی دیکەو مەیل بۆ بەشداری لە بڕیاردانەکانی گشتی، "فەرهەنگی مەدەنی" بەم مانایە لە گەڵ سەقامگیریی سیاسیو دێموکراسی، پێوەندییەکی مانادار پەیدا دەکا. هەندێکی دیکە لە نووسەران ئەو جۆرە فەرهەنگە سیاسییە زیاتر بە لەبار بۆ سەرهەڵدانو سەقامگیریی دێموکراسی دەزانن کە یەکەم لێبوردەییو ئاسانگیری سەبارەت بە بیروڕای جیاوازو دووهەم متمانە سەبارەت بە کەسانی دیکە لەودا زەق بێتەوە.

گابریێل ئاڵموندو سیدنی وریا دووکەس لە زانایانی سیاسیی ئەمریکایی، لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیاندا لە ژێر ناوی فەرهەنگی مەدەنی (١٩٦٣) بەڵگەیان هێناوەتەوە کە دێموکراسیی سەقامگرتوو بە گشتی پێویستی بە هاووڵاتیانێکە کە هەم خاوەن فەرهەنگێکی هاووڵاتیو هەم فەرهەنگی بەشداری بن. لە بەر ئەوەی یەکەم بناخەی هەستی گوێڕایەڵیو ئەمەکناسی سەبارەت بە حکوومەتە، لە کاتێك دا دووهەمی ژێرخانی ئابووریی خەڵك بە بەشداریو ڕکەبەری لە ژیانی سیاسیدا پێك دێنێ.

ئەم نووسەرانە جۆرەکانی فەرهەنگی سیاسی لە سەر بنەمای دوو تەوەر دیاری دەکەن: یەکەم لە بناخەی تەوەری جۆری لایەنگری تاکیی سەبارەت بەسیستمی سیاسی کە بریتین لە: ١) تێڕوانینی هەست پێکردن [ادراکی] ٢) تێڕوانینی بەهایی [ارزشی]و ٣) تێڕوانینی هەستیاری [احساسی]. دووهەم لە سەر بناخەی تەوەری بابەتی لایەنگیرییەکان کە بریتین لە: ١) کەسانی دەسەڵاتدار، ٢) سیاسەتەکانی حکوومەتو ٣) پێکهاتەی حکوومەتی. لەم ڕوانگەوە بەو ڕادەیە کە فەرهەنگی سیاسی هەست پێکراوترو بگەڕێتەوە بۆ بابەتەکانی گشتیتر زیاتر بۆ دێموکراسی لەبار دەبێ.

هەندێکی دیکە لە نووسەران، فەرهەنگی سیاسییان لە کۆمەڵگاکانی دێموکراتیک و لە کۆمەڵگاکانی نەریتی و نادێموکراتیک خستۆتە بەر دیراسەو توێژینەوەی جۆری هەڵسەنگاندن [تطبیق]. لە روانگەی ئەوانەوە لە سیستمگەلی دێموکراتیک کاناڵە سەرەتاییەکانی کۆمەڵگاخوازی لە تاکدا هەستێك لە متمانە سەبارەت بە کەسانی دیکەو پێوەندیی مرۆیی ساز دەکەن، بەڵام کاناڵەکانی [مجاری] دووهەم دەرکەوتە [ثانویە] لە ناخی ئەم متمانە گشتییە، سەبارەت بە دامەزراوە سیاسییەکان هەستی رەشبینی و گومانای لە تاکەکاندا پێك دێنن و، پێویستی سنووردارکردن و بەرتەسك کردنی دەسەڵات فێر دەکەن. لە بەرانبەردا لە فەرهەنگە نەریتییەکاندا، کاناڵەکانی کۆمەڵگاخوازیی سەرەتایی هەستی بێمتمانەیی سەبارەت بە کەسانی دیکەو پێوەندیی مرۆیی لە تاك دا پێك دێنن، لە حاڵێکدا کەناڵەکانی (ثانویە) چاوەڕوانی لێیان هەیە کە سەبارەت بە دامەزراوەکان و رێبەرانی سیاسی بڕوای تەواویان هەبێ.

## کەسایەتیی دێموکراتیك

هەندێك لە نووسەران، مەسەلەی زەمینەگەلی فەرهەنگی دێموکراسییان بەرتەسکتر کردۆتەوەو زیاتر لە سەر چەمکی کەسایەتیی دێموکراتیك چڕ بوونەتەوە. مەبەست لە کەسایەتیی دێموکراتیك لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی دا، ئەو جۆرە کەسایەتییە کە ئامادەی بەشداری لە ژیانی گشتیدا بێ و ژیانی سیاسی بە گۆڕەپانی تێکۆشان لە نێوان تاکەکانی یەکساندا بزانێ و لە لایەك لەخۆ سەپاندن بە سەر خەڵکدا و پاوانخوازی بپارێزێ و لە لایەك لە گوێڕایەڵی و شوێن کەوتن بێ سێ و دوو لێکردن و چاوبەستراوەیی لە دەسەڵاتبەدەستان (کە دوو تایبەتمەندی سەرەکی و لە دوانەی کەسایەتیی دەسەڵاتخوازە) خۆ دوور بگرێ. شێوەی پێگەیشتن و گەشەی کەسایەتیی دێموکراتیك، دیارە باسێکی دژوارە، بەڵام لانیکەم لەم بارەوە کۆدەنگی ڕا، هەیە کە ئەم جۆرە لە تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی لە هەناوی پێکهاتەو رەوتەکانی دێموکراتیك دا پێی دەگەن و لە لایەن خۆشیانەوە لە سەر بەهێزکردنی ئەو پرۆسەو پێکهاتانە کاریگەری دادەنێن. لەم روانگەوە، کەسایەتیی دێموکراتیك وەك چەمکێك [مقولە] لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا چاودێر نییە بە سەر تایبەتمەندییەکانی خودی تاکدا، بەڵکوو بەرهەمی پرۆسەو رەوتگەلێکی ئاڵۆزی کۆمەڵگاخوازییەو هۆکاری جۆراوجۆر بەتایبەت بێچمی پێکهاتەی دەسەڵاتی سیاسی بە سەر پێك هاتن یان پێك نەهاتنیدا کاریگەرییەکی بەرچاوی دەبێ. هەروەك پێشتریش ئاماژەی پێ کرا، یەکەم کەسێك کە باسی چەمکی کەسایەتیی

دێموکراتیکی لە مەیدانی سیاسەت‌و حکوومەتدا هێنا گۆڕ، هارۆڵد لاسول بوو. لاسول کەسایەتی یان ئەخلاقی دێموکراتیکی بە خاوەن چوار تایبەتمەندیی سەرەکی دەزانی: یەکەم، کراوەیی‌و کۆمەڵایەتی بوونی‌و لە ئاکامدا پێوەندیی‌یەکی بەربڵاو لەگەڵ خەڵکانی دیکە، دووهەم بایەخ دانان بۆ ئەو بەها و پێویستییانە کە خەڵکانی دیکەش بایەخی پێ دەدەن‌و خوازیاریانن، سێهەم، متمانە بە چاکیی سروشتی مرۆڤەکان لە گەڵ متمانە بە خۆ، چوارەم، جێگربوونی ئەم سێ تایبەتمەندیە لە زەمیری خۆنەویستی [ناخودآگاه] تاك دا. بە بۆچوونی لاسول، کۆمەڵگای دێموکراتیك پێویستی بە کەسایەتیی دێموکراتیکە‌و لە نێوان ئەو دوانەدا پێوەندییەکی دوو لایەنە هەیە. زۆر لە نووسەران لە نێوان تایبەتمەندی‌یەکانی کەسایەتی‌و بەشداری لە ژیانی سیاسی‌دا پێوەندی‌یەکی نزیکیان دۆزیوەتەوە. تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی بوون، کراوەیی [برون گرا]، خۆش بینی، متمانە بە خۆ، هەستی خۆبژێوی [خودکفایی]و ئوگریەکی لاواز بۆ دەسەڵاتخوازی‌و پاوانخوازی، لەگەڵ بەشداری لە ژیانی سیاسی‌دا هاوپێوەندی‌یەکی نزیکیان بووە. لە بەرانبەر چەمکی کەسایەتیی دێموکراتیك، کەسایەتیی دەسەڵاتخواز لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی وەك زەمینەی دەروونناسی سیستمگەلی نادێموکراتیك‌و داخراو لێك دراوەتەوە. ئەم چەمکە بە کۆمەڵێك لە تایبەتمەندییەکانی‌کەسایەتی‌یەك لەوانە تەسلیم خوازی لە بەرانبەر دەسەڵاتی بەرزتر، دەسەڵاتخوازی بۆ سەر ژێر دەستەکان‌و، هەست نەکردن بە یەکسانی لە گەڵ کەسانی دیکە (واتا هەستی لەسەرتر بوون یان لە خوارتربوون لە کەسانی دیکە) دەگوترێ. بە پشت بەستن بە هەندێك توێژینەوەی کلاسیك تئۆدور ئادرنۆ لە کتێبی کەسایەتیی دەسەڵاتخواز (١٩٥٠)، کەسایەتیی دەسەڵاتخواز کەسیەتییەکی لە بناخەدا لاوازو بەستراوەو نائارامە کە بۆ دەست پێڕاگەیشتن بە هەست کردن بە ئارامی‌و دەسەڵات، جیهان بە خاوەنی سیستم‌و رێك‌وپێك دەبینێ‌و یان دەیهەوێ وەها سیستمێکی رێك‌و پێك دابمەزرێنێ. یەکێك لە کەرەسە باوەکان لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی بۆ هەڵسەنگاندنی دەسەڵاتخوازی کەسیەتی "لە ئاستی فاشیسم" [مقیاس فاشیسم]ە کە لە سەر بنەمای تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیی دەسەڵاتخواز رێك خراوە. بە پێی ئەو توێژینەوانە کە کراون، کەسانێك کە پلە یەکی سەرتر لەسەر ئەم ئاستە [مقیاس] بە دەست دێنن، بەشداری‌یەکی دێموکراتیکی کەمترێك لە خۆ نیشان دەدەن. کەسایەتیی دەسەڵاتخواز خوازیاری کۆمەڵگایەکی پلەبەندی‌کراوی رێك‌و پێك کە لە گەڵ کۆمەڵگایەکی کراوە‌و دێموکراتیك پێوەندییەکی ئەوتۆی نیە.

## ٤
## بنەماکانی حکوومەتی دێموکراتیك

لەم وتارەدا لێکۆڵینەوە لە سەر بنەماکانی حکوومەت لە دێموکراسییەکانی هاوچەرخدا کە بە دێموکراسیی ناڕاستەوخۆ ناسراون و پشتیان بە بنەمای نوێنەرایەتی و پارلمانتاریسم بەستوە، دەکەین. گرینگترین باسی گشتیی حکوومەتی دێموکراتیك وەك ئازادییەکانی مەدەنی و سیاسی، کۆماری، بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵات بۆ پێشگیری لە دیکتاتۆری و کۆکردنەوەی دەسەڵات، پارلمانتاریسم، ڕەوتی پێك هێنانی حکوومەت لە دێموکراسییەکاندا، ڕەوتی بڕیاردانی سیاسی و بەرپرسایەتیی بەرپرسە حکوومەتییەکان لە بەرانبەر خەڵك دا لە ژێر سەردێڕی چەمکی بنەماکانی حکوومەت لە دێموکراسییەکاندا دێتە بەرباس.

### مافە مەدەنییەکان

دێموکراسی لە بنەڕەتدا لە سەر ناسینی کۆمەڵێك لە مافە مەدەنییەکان بۆ هاووڵاتیان [شهروندان] ڕاوەستاوە. مافە مەدەنییەکان، مافگەلێکن کە هاووڵاتییان بە پێی دەستوور و ماباقیی یاساکان هەیانەو دەبێ کەڵکی لێ وەربگرن. چەمکی مافە مەدەنییەکان لە تەنیشت مافی مرۆڤ بە مانا گشتییەکەی، بەکار دەبرێ. مافی مرۆڤ هەروەك لە گوتاری بابەتە گشتییەکاندا بینیمان، مافگەلێکن کە هەرکەس بە پێی ئەوە کە مرۆڤە، هەیەتی، لەوانەیە: پارێزراوی گیان، مافی ژیان، مافی موڵکداریەتی و ... هتد. جاڕی جیهانیی مافی مرۆڤ کە لە ساڵی ١٩٤٨دا لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بڵاو کرایەوە، گرینگترین مافەکانی مرۆڤی لە خۆ گرتوە. مافی مرۆڤ دیارە سەرچاوەی مافەکانی مەدەنیی هاووڵاتیانە [شهروندان]، بەڵام مافەکانی مەدەنی، هەم لە یاساکانی نێوخۆییدا بە شێوەیەکی شەفاف روون دەکرێنەوەو هەم بە تایبەتی بەسەر پێوەندییەکانی نیوان تاکەکان یان هاووڵاتیان و حکوومەت چاودێری دەکەن، بۆ نموونە ئازادیی پێکهێنانی ئەنجومەنەکان و کۆبوونەوەکان و وەڕێخستنی خۆپیشاندان بە مەبەستی بەکارهێنانی فشار بۆ سەر حکوومەت بۆ پێڕاگەیشتن بە سکاڵاکان و

نارەزایەتییەکانو یان بە مەبەستی راگەیاندنی دژایەتی لە گەڵ سیاسەتەکانی حکومەت، یەکێك لە مافو ئازادییە سەرەکییەکانی مەدەنی لە دێموکراسیەکان دایەو دەستوورەکان زۆرجار پێی لە سەر گرینگیی ئەوانە داگرتوە.

یەکەم چاکسازی لە دەستووری ئەمریکادا (١٧٩١)، ئازادیی ئەنجومەنو کۆبوونەوەی لە تەنیشت ئازادیی بەیانو بلاوکردنەوەی بیرورا، بە مافی سەرەکیی تاکەکان دادەنێ. دەستووری زۆر لە دێموکراسییەکان دواتر لەم چاکسازیە نموونەیان وەرگرت. هەروەها زۆر لە راگەیەندراوەکانو پەیماننامەکانو بەڵێننامەکانی نێونەتەوەیی، یەك لەوان جارنامەی جیهانیی مافی مرۆڤ، بەڵێنامە [میثاق] نێونەتەوەیی مافەکانی مەدەنیو سیاسیو . . . هتد لە سەر مافی ئەنجومەنو کۆبوونەوە پێیان داگرتوە، دیارە زۆرتر لەسەر خەسڵەتی ئاشتیخوازانەو یاساییبوونی کۆبوونەوەکان تەئکید دەکرێ. لەگەڵ ئەوەش ئاستی لێبوردەییو ئاسانگیری سەبارەت بە کۆبوونەوەکانو ئەنجومەنەکان جیاوازن. لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا راگەیاندنی بێزاریو دەربرینی قسەی "پرمەترسی [خطرناك]" تا ئەو کاتە نەبوەتە کردەوەی نایاسایی ئازادە، لە کاتێکدا زۆر لە ولاتەکان وەها بزووتنەوەیەکیان لا یاساخە. دەوڵەتی بریتانیا لە ساڵی ١٩٨٦دا بەهۆی نیگەرانی لە چوونەسەری رادەی کۆبوونەوەکانو خۆپیشاندانەکان کە دەیانتوانی مەترسیدار بن، یاسایەکی بەناوی یاسای رێکوپێکی گشتی [نظم عمومی] پەسند کردو هەندێك لەو بارەوە سنووری دانا.

ئازادیی بەیان، گرینگترین مافی مەدەنیو سیاسی لە دێموکراسیەکانی ئەو سەردەمە دایە. بە واتایەکی گشتیتر ئازادیی بەیان بە مانای ئازادیی پێوەندی بە شێوەی زارەکیو نووسراوەی نێوان هاوولاتیانە. ئەم پێوەندییە لەوانەیە لە رێی رۆژنامەکان، کتێبەکان، راگەیەنەکانو . . . بەڕێوە بچێ. بۆیە لە دێموکراسیەکاندا فەرهەنگو هونەرو ئەدەب، گۆرەپانی ئازادیی بەیانو بەدەر لە دەسەڵاتی دەوڵەتییە.

ئازادیی بەیان پێویستی بە ئازادیو دەسەڵات لە دەست بەسەرداگرتن [تصرف]و بە موڵك کردنی ئەو کەرەسانەیش هەیە. ئازادیی بەیان بناخەی جودابیرییە کە یەکێك لە بنەماکانی شێوەی ژیانی دێموکراتیك پێك دێنێ. لەم شێوە لە ژیان دا، ناتوانرێ جودابیر بە تاوانی بیرورای جیاوازو دژایەتی لەگەڵ حکومەت، بخرێتە بەر ئازارو ئەشکەنجە. بە شێوەی گشتی ئازادیی بەیان دەبێتە هۆی گەشەی زەینو تواناکانی هاوولاتیان بۆ بەشداری لە ژیانی کۆمەڵایەتیو

سیاسیدا، دەرەتانی دەست پێڕاگەیشتن بەو بۆچوونانە کە لەڕاستی نزیکترن، زیاد دەکا، لە سەرەڕۆیی سیاسیو پاوانکردنی دەسەڵات بەرگری دەکا. بە پێکهێنانی دەرەتانی رەخنە، بە دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی کراوە یارمەتی دەداو توانایی هاوولاتیان لە هەڵبژاردن لە نێوان رێگەی جیاواز کە شێوەکانی باو لە ژیانی دیموکراتیک دایە بەرز دەکاتەوە.

کۆڵەکەی سەرەکیی کۆمەڵگای مەدەنیو بیاڤی گشتیی ئازاد، هەر ئەو ئازادییەیانەیە. مانای هاوولاتی بە بێ ئازادیی بەیان مومکین نیە. هەروەك ئاماژەی پێ کرا لە روانگەی ئەرەستۆوە، مەنتیقو بەیان تایبەتمەندیی سەرەکیی مرۆڤ بوو، لە سیستمە دیکتاتۆرەکاندا مرۆڤ دەبێتە ئاژەڵێکی زمان بەستراو، بەڵام لە پۆلیتیدا، سیاسەت بە مانای پێوەندیی یەکسان لە نێوان کەسانێکە کە ئەندیشەیان هەیەو قسە دەکەن. کەوابوو دانایی سیاسی بە بێ ئازادیی بەیان مومکین نابێ. جان میلتۆن نووسەری سەدەی حەڤدەهەمو یەکەم داکۆکیکەر [مدافع]ی گەورەی ئازادیی بەیان بەڵگەی دەهێنایەوە کە دانایییەك کە لە رێی ئازادیی بەیانەوەو ئازادانە دەست نەکەوتبێ، بایی ناوەکەی نیە.

گرینگترین مافەکانی مەدەنیو سیاسی لە دیموکراسییەکانی ئەورۆییدا، مافی دەنگدانە. مافی دەنگدان دەبێ گشتی، یەکسان، نهێنیو راستەوخۆ بێ. ئەم تایبەتمەندییانە بە چوار بنەمای سەرەکیی مافی دەنگدان لە دیموکراسییەکانی ئەورۆییدا دەژمێردرێن. مەبەست لە گشتی بوونی مافی دەنگدان، ئەوەیە کە هەموو هاوولاتیانی یەك ولات بە بێ لەبەرچاوگرتنی قەومییەت، رەگەز، زمان، ئایین، خوێندەواری، مولکداریەتی، پێگەی چینایەتی، بڕوای سیاسی، ئایدولۆژیو ... هتد مافی دەنگدانیان هەیە. لە گەڵ ئەمەش دا دانانی مەرجی تایبەت وەك تەمەنێکی دیاریکراو، هاوولاتی بوون، نیشتەجێی، تەندروستیی دەروونیو نەبوونی پێشینەی تاوان دژی بنەمای گشتی نیە. مەبەست لە بنەمای یەکسانی لە مافی دەنگدان ئەمەیە کە بایەخی دەنگی تاکەکان وەك یەکن. بە واتایەکی دیکە ناکرێ دەنگی خەڵك بە پێی قورساییو بایەخی ئابووری، فێرکاری، بیروڕا، رەگەزی، چینایەتیو جینسی [ژنو پیاو] هەڵسەنگێندرێو لە نێواندا جیاوازی دابنرێو بایەخی زۆرتر یان کەمتر بدرێ بە دەنگەکان. هەم بەم پێیە بۆ چینێکی تایبەت لە خەڵك، ژمارەیەکی تایبەت لە نوێنەران تەرخان بکرێ. بە پێی بنەمای نهێنیبوونی، دەنگی تاکەکان بە شێوەی نهێنی، بە بێ ئاگاداری کەسانی دیکەو بە بێ واژۆکردن [امضا] دەبێ بخرێنە نێو سندووق. بنەمای چوارەمی مافی دەنگدان بەم مانایە کە دەنگدەران، خۆیان نوێنەرانی

خۆیان هەڵدەبژێرن، نە ئەوەی کە کەسانێك هەڵبژێرن و ئەوان کە بە بێ لەبەرچاوگرتنی دەنگی ئەوان، کەسانی دیکە وەك نوێنەری ئەوان دیاری بکەن.

## بنەمای نوێنەرایەتی

بنەمای نوێنەرایەتیی بەرەتی بەشداریی ناراستەوخۆی خەڵك لە حکومەت دا لە رێگای نوێنەرەکانی خۆیانەوەیە. دیارە لە دێموکراسیەکاندا، هەموو کاربەدەستان و کارگێرانی گشتی بەهۆی خەڵك هەڵنابژێردرێن، بەڵام ئەوانەی راستەوخۆ هەڵنابژێردرێن، دەبوایە بەهۆی ئەوانەی کە راستەوخۆ لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێن، دەست نیشان بکرێن. بۆ نموونە لە ئەمریکا خەڵك کالیجی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار هەڵدەبژێرن و کالیجیش سەرکۆمار دیاری دەکا، سەرکۆماریش بە راکێشانی روانگەی ئەنجومەنی پیران [سنا] هەموو کاربەدەستان و کارگێرانی دەوڵەتی فیدراڵ دەست نیشان دەکا. لە حکومەتگەلی بە تەواوی "کۆماریی" یان دێموکراتیك هیچ پۆست و مەنسەبێك ئیرسی و یان تا مردن [مادام العمر] نیە. بۆیە ئەنجومەنێك وەك ئەنجومەنی ئەعیانی بریتانیا کە هەندێك لە نوێنەرانیان بە ئیرس بۆیان ماوەتەوە و بەشێکی دیکە تا مردن پێیان براوە، جورێك لە سنووردانان و بەرتەسك کردنی دێموکراسی پشت بەستوو بە نوێنەرایەتیی بە حیساب دێ. لە دێموکراسیەکانی چاخی کۆن [باستان] کە پشتی بە بەشداریی راستەوخۆی هاوولاتیان بەستبوو، نوێنەرایەتی بوونی نەبوو. هەندێك لە بەرپرسانی سیاسی لە رێی تیروپشك هەڵدەبژێردران و بە شێوەی گەران [چرخش] دەسەلاتیان دەگرتە دەست. بەڵام لە دێموکراسیەکانی ئەورۆیی‌دا بەشداریی راستەوخۆی هاوولاتیان لە حکومەتدا نەگونجاوە و بۆیە بۆنیات و بنەمای نوێنەرایەتی بە ناچارییە. پارلمانەکان لەو سەردەمەدا وەك گرینگترین دامەزراوەی نوێنەری خەڵك بە حیساب دێن و بە تایبەت ئەنجومەنی یەکەم واتا ئەنجومەنی سەرەکی لە دەسەلاتی یاسادانانێکی بەربلاو کەڵك وەردەگرێ. ئەنجومەنی دووهەم بەتایبەت لە زەمینەی بریاردانە داراییەکاندا دەسەلاتێکی کەمتریان هەیە.

یەکەم جار تۆماس هابز فەیلەسوفی بریتانیایی، چەمکی نوێنەرایەتی هێنا ئاراوە. بە بۆچوونی ئەو حکوومەتی پشت بەستوو بە نوێنەرایەتی، حکوومەتێکە کە بە ویستی خەڵك پێك هاتبێ، بە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە حکوومەتەکە پادشایی و ئیرسی و یان خاوەن ئەنجومەنی بەدەسەلات بێ. بە بۆچوونی ئەو سەڵتەنەتی رەها وەك نوێنەری خەڵك باشتر

دەتوانێ پارێزەری ئاشتی‌و ئارامی‌و ئاسایش‌و یاسا بێ. لە بەرانبەردا، جان لاك بڕوای وابوو کە حکوومەتی دامەزراو لە سەر نوێنەرایەتی بە مانای راستەقینەی وشەکە، حکوومەتی ئەنجومەنێکە کە هەڵبژاردەی خەڵك بێ‌و یاسادانان بگرێتە ئەستۆ. لەگەڵ ئەوەش جان لاکیش لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەگەر سەرۆکی دەسەلاتی بەڕێوەبەری تاکەکەس بێت‌و لە دەسەلاتی ویتۆ کەلك وەربگرێ، دەکرێ بڵێین کە نوێنەری تەواوەتی کۆمەڵگایە، دیارە بە مەرجێك کە هەڵبژاردەی خەڵك بێ. لە سیستمی ئەمریکا کە بەگشتی لەسەر ئەندیشەی لاك دامەزراوە، سەرکۆمار وەك نوێنەری گەل حیسابی بۆ دەکرێ. لە حاڵێك دا کۆنگرەش نوێنەری بەرژەوەندی ویستەکانی کۆمەڵایەتی تایبەت لێك دەدرێتەوەو بە شێوەی گشتی لە سیستمەکانی سەرۆکایەتی‌دا، لە بەرانبەر سیستمی پارلمانی‌دا، سەرکۆمار وەك نوێنەری خەڵك حیسابی بۆ دەکرێ. لە سیستمە دوو ئەنجومەنییەکاندا، ئەنجومەنی یەکەم زیاتر لە ئەنجومەنی دووهەم وەك نوێنەری خەڵك لێك دەدرێتەوەو ئەنجومەنی دووهەم کەمتر لە ژێر چاودێریی خەڵکدایە. دێموکراسییەکانی ئەم سەردەمە بە شێوەی گشتی چەمکی هابزی نوێنەرایەتیی خەڵك بەهۆی رێبەر یان دەسەلاتداری تاك‌و چەمکی کۆنتر نوێنەرایەتیی خەڵك، بەهۆی ئەنجومەنەکان پێکەوە لێك دراون.

لە کاتێکدا هەندێك لە نووسەران، بنەمای نوێنەرایەتی‌یان وەك جێ‌نشینێ بە ناچاری‌و نە زۆر دڵخوازانەی دێموکراسیی راستەوخۆ وەرگرتوە، هەندێکی دیکە ئەوەیان بەرزترو باشتر لەم چەشنە دێموکراسی‌یە [راستەوخۆ] زانیوە. دامەزرێنەرانی کۆماری ئەمریکا لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە نوێنەرایەتی دەبێتە هۆی فێربوونی سیاسیی خەڵك‌و بەرەوپێش چوونی باسە گشتییەکان، لەبەر ئەوە نوێنەرایەتی وەك گرووپی هەڵبژێردراوی هاوولاتیان بە شێوەی هەڵسەنگێندراوترو بە ئەزموونتر راوێژو دیالۆگ دەکەن. خەڵك تەنیا لە دەسەلاتی هەڵبژاردنی دەسەلاتداران‌و دادوەری سەبارەت بە سیاسەتەکانیان کەلك وەردەگرن‌و توانایی حکوومەتی راستەوخۆیان بە سەر خۆیاندا نیە. بەم حاڵەش بە بۆچوونی ئەوان، نوێنەرایەتی بە تەنیایی دەستەبەرکەری حکوومەتی دڵخواز نیەو ئەنجومەنی نوێنەران لەوانەیە عەیبی جۆراوجۆر پەیدا بکا. بۆیە ئەوان نێوان ئەنجومەنی پیران‌و دەسەلاتی دادوەری‌و دەسەلاتی بەڕێوەبەری، لەگەڵ خەڵك هەندێك مەودایان داناو دەسەلاتیان پێ دان کە ئەگەر پێویست بوو بەهۆی کۆنترۆڵ‌و بەرتەسك کردنەوەی ئەنجومەنی نوێنەران، دەسەلاتی خەڵك هاوسەنگ‌و کۆنترۆڵ بکەن.

له بەرانبەردا نووسەرانێکی دیکە وەك رۆسۆ، رەخنەگری سەرەکیی نوێنەرایەتی بوون. لە روانگەی ئەوانەوە نوێنەرایەتیی نێوان خەڵكو نوێنەرەکان مەودا دادەنێو لە ئاکامدا زۆر جار لە نێوان ویستو بڕوای نوێنەرەکانو خەڵك کەلێن پەیدا دەبێ. بەو حاڵەش لەو سەردەمەدا بەهۆی بەرەوپێش چوونی تکنیکی پێوەندی، پێوەندیی نێوان خەڵكو حکوومەت، هەر بە نوێنەرەکانەوە نابەسترێتەوە. خەڵك بۆخۆی راستەوخۆ بیروڕای خۆی لە رێگای راپرسییەکان، وتووێژە رادیۆ ـ تەلەویزیۆنییەکانو باقیی ئامێرەکانی پێوەندی بۆ لای حکوومەت دەگوازنەوە. هەندێك تەنانەت دەڵێن کە تلویزیۆن دێموکراسیی راستەوخۆی ئەمریکای گۆڕیوە بە دێموکراسیی راستەوخۆی شێوازی ئاتنی.

## حکوومەتی کۆماریی

لە ئەندیشەی سیاسیی کۆن چەمکی حکوومەتی کۆماریی لە بەرانبەر حکوومەتی پادشایی بەکار دەبرا. کۆماری بەم مانایە، حکوومەتێکی ئازاد بوو کە لەودا خەڵك، بێ ترس لە دەسەڵاتی سەرەڕۆ شارو وڵاتی خۆیان بەڕێوە دەبرد. کەوابوو حکوومەت نە موڵکی تایبەتیی شا، بەڵکوو ئیشو کاری گشتیی (Res Poblica) خەڵك بوو. قەوارەی سەرەتایی کۆماریی هەر ئەو دەوڵەت شارەکانی یونانی بوو کە لەودا شارومەندان بە سەر خۆیاندا حکوومەتیان دەکرد. ئەزموونی بەربڵاوتری حکوومەتی کۆماریی، لە کۆماری رۆم دا پەیدا بوو. حکوومەتی کۆماری لەو وڵاتەدا بە مەبەستی بەربەرەکانی لەگەڵ سەرکەوتنەکانی دەسەڵاتدارانی دیکتاتۆری بێگانەو لایەنگرانی نێوخۆیی لە دیکتاتۆریو ستەم، دەبوایە توانایی سەربازیی پێویست بۆ پارێزگاری لە خۆ بەدەست بێنێ. لەم رووەوە لە ئەدەبیاتی سەرەتاییدا لە سەر تایبەتمەندییەکانی ئازایەتیو شەڕکەرانەی کۆمارەکان تەئکید دەکرا، هەرچەند ئەم خەسڵەتە تەنیا ئامرازێك بۆ دیفاع لە بنەمای حکوومەتی ئازاد بوو. شارومەندانی کۆمارەکان دەبوایە بەرپرسایەتیی سەربازیو حکوومەتیان بوایەو دیفاع لە ئازادیو حکوومەتی ئازاد پێویستی بە ئازایەتیو نەترسی، نیشتمانپەروەریو شەڕکەری بوو. دیارە لە کۆمارەکانی سەرەتاییدا هەموو خەڵکەکە حیسابی شارومەندیان [هاوڵاتی] بۆ نەدەکرا.

له ئـاتن [ئاسنا] ژنان، کۆیلەکانو بێگانـەکان وەك شارومەند بە حیساب نـەدەهاتن. پـاش هەزار ساڵ هەروەك بینیمان، جـارێکی دیکە لـە سەدەی دوانزەهەم دا حکوومەتی کۆمـاریی‌و ئەندیشەی کۆماریەت لە دەوڵەت شارەکانی ئیتالیاوە وەك وێنیزو فلۆرانس زینـدوو کرایـەوە. لەو کۆمارانەدا ئەنجـومەنگەلو دامەزراوەی جۆراوجـۆرو پوستـگەلی زۆر بـۆ مـسۆگەرکردنی بڵاوکردنی دەسەڵات لە نێوان هاووڵاتیانـدا بـەڕێوە چـووو بـە پێـی ئەوانـە بەشـێکی زۆر لـە شارومەندان دەیانتوانی لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا بەشداری بکەن. بەو حاڵەش کۆمارەکانی ئیتالیا لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست لەگەڵ مەترسیی هێرشـی حکوومەتـە پادشـاییەکانی نـوێ‌و سەرهەڵدانی دەسـەڵاتدارانی سـەرکوتکەر لـە نێوخـۆدا بـەرەوڕوو بـوون. نیکـو لوماکیـاولی تیئۆریسینی ناوداری سیاسیی سەردەمی رونیسانس سەرچاوەی ئەندیشەی کۆماریی بـووو لـە پێویستیی پەروەردەکردنی هاووڵاتیانی ئازادو ئازا بۆ بەرگری لە شارەکەی خۆیانو هـەروەها پێکهێنانی ئایینێکی مەدەنی لە جیاتی کریستیان [مسیحیت] بـۆ هانـدانی شـارومەندان بـە بەشداری لە حکوومـەتو گوێڕایەڵی‌و بەگـوێ‌کردنی دەسەڵاتداران قسەی دەکرد.

یەکێکی دیکە لە پارێزەرانی کۆماری هاووڵاتیانی ئازاو جەنگاوەر، نووسەری بریتانی جیمـز هرینگتون بوو کە لە کتێبی وڵاتی ئوقیانووسیە (١٦٥٦) وێنایـەکی لـە (مەدینـەی فازیلـە) کۆماری ئایدئاڵ هێنا ئاراوە کە لەودا هاووڵاتیانی ئازادو جەنگاوەر بە نـۆرە لـە بـەڕێوەبردنی کۆماردا بەشـداری دەکـەن. لـە سـەدەی هەژدەهـەم ژان ژاك رۆسـۆ لـە کتێبـی پەیماننامـەی کۆمەڵایەتی (١٧٦٢)ی خۆیدا، ئامانجی کۆماری کلاسیکی جارێکی دیکە زینـدوو کـردەوە. کۆماری دڵخوازی رۆسۆ لە سەر بوونی یاسـادانەر وەك نوێنـەری ئـیرادەی گـشتی، بەشـداریی راستەوخۆی خەڵك لە مەسەلەی حکوومەتدا، ئایینی مەدەنی، (واتا ئایینێك کە ببێتـە هـۆی پێك هاتنی پێوەندیی مەدەنی [شارسـتانی]و بەڵێندەر بـە ئـیرادەی گـشتیی کۆمـەڵگا بـێ)و روحیەی جەنگاوەرانـەی شـارومەندان راوەسـتا بـوو. پێوەنـدیی بیرۆکـەی کۆمـاری بـە مانـا کلاسیکەکەی لـە گەڵ جەنگاوەری‌و تایبەتمەندی سەربازی‌و ئازایـەتی‌و ئـازادیخوازی‌و هەسـتی هاووڵاتی وەك سەرچاوەی ئیرادەو بەرژەوەندیی گـشتی، لـە بەرهەمـەکانی رۆسـۆدا گەیـشتە لووتکەی خۆی. لە بەرانبەردا لە سەردەمی نوێدا کۆماریی لەگـەڵ روحیـەی بازرگـانی‌و تـاك گەرایی پێوەندییەکی زۆری پەیدا کرد. لە روانگەی جیرمی بنتهـام فەیلەسـووفی قازانجگـەرای

بریتانی، کۆماریی حکوومەتێکە کە لەودا داخوازە تایبەتەکانی خەڵك جێبەجێ دەبێو حکوومەتیش، دەبێ لە بەرانبەر ئەم داخوازانەدا بەرپرس بێ.

بەم شێوە لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەندیشەی کۆماریی زۆر لە تایبەتمەندیەکانی کلاسیکی خۆی لە دەست داو بوو بە کۆماری لیبراڵ یان بورژوازیی مۆدێرن کە لەودا مانای ئازادی نە لە دیفاع لە دەوڵەت شاری ئازاو جەنگاوەرو چالاکی گشتی، بەڵکوو لە ئازادییەکانو مافی تایبەت بە سەردەمی ئاشتیدا شاردرابوونەوە. بۆیە هەندێك لە رەخنەگرانی کۆمارە لیبراڵەکانی نوێ نیگەرانی ئەوە بوون کە هاوولاتیان لەم چەشنە دەوڵەتانەدا بە بیانووی ئازادیو کەڵکوەرگرتن لە مافەکانی تاك، لە پەراوێز بکەونو پاسیوو سەبارەت بە کاروبارو داخوازە گشتیەکان بێتەفاوەت بن. هەندێك لە نووسەرانی ئەم دواییانە وەك هانا ئارنت فەیلەسووفی ئاڵمانی کەوتنە دیفاع لە کۆماری کلاسیكو رەخنە لە کۆماریی لیبراڵو سەرمایەدارانەی مۆدێرن. بە بۆچوونی ئەو سەرمایەداری روحیەی تایبەتی خستۆتە جێی روحیەی گشتیی تاك لە کۆماری ئایدئالو کلاسیکدا.

## جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان [تفکیك قوا]

مەبەست لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، سپاردنی دەسەڵاتە سەرەکیەکانی حکوومەتیی واتا دەسەڵاتی یاسادانان، بەڕێوەبەریو دادوەری بە دامەزراوە جیاوازەکانە. ئامانجی سەرەکیی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان وەك یەکێك لە کۆڵەکەکانی دێموکراسی پێشگیرییە لە سەرهەڵدانی دیکتاتۆریو سەرەڕۆییو کۆکردنەوەو پاوانکردنی دەسەڵاتو یان بە واتایەکی دیکە مسۆگەرکردنی ئازادییە. بۆ سەرچاوەی ئەم تیئۆرییە دەبێ لە مانای حکوومەتە تێکەڵاو ئاسادەکاندا بگەڕێی کە یەکەم جار لە ئەندیشەی سیاسیی یونانییەکان دا هاتە ئاراوە. بە تایبەت پۆلیپ مێژوونووسی یونانی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەکرێ لە رێگەی سەریەك خستنی بنەماکانی حکوومەتگەلی جۆراوجۆر واتا مونارشی، ئاریستوکراسیو دێموکراسی حکوومەتێکی نەرم رێ [معتدل]و سەقامگرتوو پێك بێ، لەبەر ئەوە هەرکام لەم بنەماو توخمانە نوێنەری چینێکی کۆمەڵگان. رووناکبیرانی لیبراڵی سەرەتاکان پێیان وابوو کە یەکێك لە ئامرازەکانی دەستراگەیشتنی حکوومەت بە مەبەستە سەرەکییەکەی واتا پارێزگاری لە مافە سروشتیو بنەڕەتییەکانی خەڵك، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی

حکوومەتییە. لاك پێی وابوو کە دەبێ لە نێوان سێ دەسەڵاتی یاسادانان، بەڕێوەبەری و "فیدراتیو" جیاکردنەوەی دەسەڵات پێك بێت. دەسەڵاتی یاسادانان دەبێ بە تایبەت لە کاروباری دارایی دەسەڵاتی بەرزتر بێ. دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە دەست پادشا، بەرپرسە لە بەڕێوەبەریی یاساکاندا، بەڵام دەتوانێ یاساکان ڤیتۆ بکاو هەروەها لە ژێر چاودێری نیهایی پارلماندا، چۆن بە باشی بزانێ بۆ دابین کردنی بەرژەوەندیی گشتی تێ بکۆشێ. بە بۆچوونی لاك دەسەڵاتی دادوەری لە ژێر دەسەڵاتداریەتی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری دایە، بەڵام ئەو لە دەسەڵاتێکی دیکە بە ناوی دەسەڵاتی "بەستنی پەیمان"[(١)] قسەی دەکرد کە دەبوا ڕێكو پێك کردنی پێوەندیی دەرەوەی حکوومەتو کاروباری تایبەت بە شەڕو ئاشتیو دیپلۆماسی لە دەست دابێ. دیارە لە کردەوەدا ئەم دەسەڵاتە لەگەڵ دەسەڵاتی بەڕێوەبەری یەك بوون، لە بەر ئەوەی هەردووك پێویستییان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی بوو. بەو حاڵەش هەرچەند دەسەڵاتی بەڕێوەبەری دەبوا لە ژێر چاودێری دەسەڵاتی یاساداناندا بێ، بەڵام دەسەڵاتی "بەستنی پەیماننامە" بەهۆی یاسا بۆ کۆنترۆڵکردن نابێو کەوابوو دەبێ دەسەڵاتداران چۆنی بە باش بزانن بەکاری بێنن، لە بەر ئەوەی ناتوانرێ سەبارەت بە کارەکانو هەڵسوکەوتی دەسەڵاتدارانی دەرەکی لە نێوخۆدا یاسا دابنرێ.

بەناوبانگترین شیکەرەوەی تیئۆریی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، مۆنتسکیۆ بوو کە سیستمی سیاسی بریتانیای وەك نموونە ئایدئالی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان نیشان دەدا. لەم سیستمەدا پارلمان پێك هاتبوو لە دوو ئەنجومەن: یەکەم ئەنجومەنی ئەعیانو ئەوی دیکە ئەنجومەنی گشتی [عوام]. دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە دەستی پادشا دایە کە تەنیا بەڕێوەبەری یاساکانو مافی ڤیتۆی نیە. شا پارێزراوی هەیە [مصونیت]، بەڵام وەزیرەکان بۆ لێپرسینەوەو سزادان دەبن. دەسەڵاتی دادوەری وەك دەزگای سەرەکی دابین کردنی ئازادیو ئاسایشو ئارامیی شاروەندان بە حیساب دێ.

سیستمی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بە مانا مۆدێرنەکەی، یەکەم جار لە دەستووری ئەمریکا دابین بوو. دامەزرێنەرانی کۆماری ئەمریکا سەرنجی زۆریان دەدا بەم بنەمایە. جیمز مادیسون بڕوای وابوو کە جیاکردنەوەی دەسەڵات نابێ ڕەها بێ. بەڵکوو دەبێ ئامرازەکانی چاودێری پێك بێت کە ببێتە هۆی هەماهەنگ کردنی ڕێژەی دەسەڵاتەکان. بۆ نموونە

(١) - Federative Power

دەسەڵاتی بەڕێوەبەری دیارە نابێ یاساданان بگرێتە دەست، بەڵام باشترە لە چوارچێوەی مافی ڤیتودا بەشێکی تێدا بێ تا بتوانێ کۆنگرە کۆنترۆڵ بکا. باشترین ڕێگەی جیاکردنەوەو هاوکێش کردنی دەسەڵاتەکان بە بۆچوونی مادیسۆن ئەوە بوو کە هەرکام لە سێ دەسەڵاتەکە خاوەن ئامرازەکانی یاسایی پێویست بۆ راوەستان لە بەرانبەر دەست درێژیی دوو دەسەڵاتەکەی دیکەدا بن. دەسەڵات دەبێ لە بەرانبەر دەسەڵاتدا راوەستێ تا کۆبوونەوەی دەسەڵات [تمرکز قوا] نەیەتە پێش. بۆ دابینکردنی لەبەر چاو گیری [رعایت] بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بەهۆی کۆنگرە کە وەك لقی سەرەکیی حکوومەت حیسابی بۆ دەکرا، دوو ئەنجومەنی پیران‌و نوێنەران بە مەبەستی کۆنترۆڵ‌و چاودێری بە سەر یەکتردا پێك هاتن. جیاوازیی ئەو دوو ئەنجومەنە لە رووی شێوەی هەڵبژاردنی ئەندامان‌و، هەروەها لە رووی دەسەڵات (دەسەڵاتی تایبەتیی ئەنجومەنی نوێنەران لە کاروباری دارایی‌و دەسەڵاتی تایبەتی ئەنجومەنی پیران لە کار باری سپاردنی بەرپرسایەتی [انتصابات] دەرەتانی چاودێری ئەو دوانەی بە سەر یەکدا بەهێز دەکرد. هەروەها لە راستای مسۆگەرکردنی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، هیچ جۆرە ئەخشێك لە هەڵبژاردنی سەرکۆمار بۆ کۆنگرە لەبەر چاو نەگیراوەو پەسەندکراوەکانی یاسایی کۆنگرەش بە شێوەیەکی مەرجدار بۆ ڤیتوکردن دەبن. هەروەها ئەخشێك بۆ کۆنگرە سەبارەت بە دەستێوەردان لە مەعاش‌و یارمەتیی مانگانەی ئەندامانی دوو دەسەڵاتەکەی دیکە لەبەر چاو نەگیراوە.

لە سیستمە پارلمانیەکاندا، جیاکردنەوەی دەسەڵات بەشێوەی رێژەیی بوونی هەیە. پارلمان یاسادانەرو هەیئەتی دەوڵەت بەڕێوەبەری یاسایەو بەو حاڵەش هەیئەتی دەوڵەت بۆخۆی لە لایەن زۆرینەی پارلمانەوە دەست نیشان دەکرێ. لەگەڵ ئەمەش لە سەدەی بیستەم دا بە سەرنج دان بە چوونەسەری ئەخشی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری، هاوسەنگیی دەسەڵاتەکان نێوان پارلمان‌و هەیئەتی دەوڵەت لە سەر یەك لە بەرژەوەندیی دەسەڵاتی بەڕێوەبەریدا لە حاڵی گۆڕان دایە. لە ئەمریکای سەدەی نۆزدەهەم بە شێوەی گشتی سەدەی زاڵ بوونی کۆنگرە بوو، بەڵام لە سەدەی بیستەم دا جیاکردنەوەی دەسەڵات هۆکاری سەرەکی لێنەهاتوویی حکوومەت، نارێك‌و پێکی لە یاساданان‌و لاوازیی چەمکی بەرپرسایەتی‌خوازی کاربەدەستانی گشتی لە لای خەڵکە. لە سەدەی بیستەم دا بە گشتی بە بردنە سەری ئەرکەکانی حکوومەت، دەسەڵاتی

دەوڵەتی فیدراڵ زیادی کرد، زۆر لەو چالاکیانە کە پێشتر وەك ئەرکی یاسادانان لێك دەدرایەوە، بەهۆی سەرکۆمارو دەسەلاتی بەڕێوەبەری بەڕێوە چوو.

## چاودێریی دەسەڵاتەکان بە سەر یەکتردا

مەبەست لە پێش بینیی ڕێگەگەلی جۆراوجۆر بۆ چاودێری سێ دەسەڵاتەکەی یاسادانان، بەڕێوەبەریو دادوەری بە سەر یەکتردا، پێکهێنانی هاوسەنگی لە نێوانیان دایە. وەها ڕێگەگەلێك زۆر جار لە دەستووری دیموکراسییەکاندا پێش بینی دەکرێ. زەروورەتی بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان چاودێری کردنە بە سەر یەکتردا. لە سیستمە پارلمانییەکاندا کە ئەندامانی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە نێوان ئەندامانی پارلماندا هەڵدەبژێردرێن، ئەندامانی دەوڵەت دەکەونە بەر پرسیارو لێپێچینەوەی پارلمان. لە سیستمەکانی فرەحیزبی دا کە لەسەر نوێنەرایەتیی ڕێژەیی دامەزراون، سەرۆك کۆمار، ڕێبەری ئەو حیزبەی کە زۆرینەی کورسیەکانی پارلمانی پێیە وەك سەرۆك وەزیران دەست نیشان دەکاو سەرۆك وەزیریش کابینەکەی خۆی لە ئەندامانی پارلمانی حیزبەکەی خۆی یان ئەو حیزبانە کە ئیئتیلافیان لەگەڵ کراوە، پێك دێنێ. بەم شێوە لە دیموکراسییە پارلمانییەکاندا ئەندامانی هەیئەتی دەوڵەت بە شێوەی گشتی لە ئەندامانی پارلمانن. بە پێچەوانە لە دیموکراسییەکانی سەرۆکایەتی یان بێچمی ئەمریکایی، ئەندامانی پارلمانو دەسەڵاتی یاسادانان ناتوانن ئەندامی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری بن. لەم شێوە سیستمانەدا ئەندامانی هەر دەسەڵاتێك، بە شێوەگەلی جۆراوجۆرو جیا لە یەكو بۆ خولی جیاجیا هەڵدەبژێردرێن. لە ئەمریکادا ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بۆ ماوەی دوو ساڵ لە نێو ٤٣٥ ناوچەی هەڵبژاردندا بە شێوەی تاك نوێنەری هەڵدەبژێردرێن، لە حاڵێکدا ئەندامانی ئەنجومەنی پیران بۆ ماوەی ٦ ساڵ هەڵدەبژێردرێنو هەر هەرێمێك بە بێ لەبەر چاو گرتنی حەشیمەتەکەی، دوو نوێنەر دەنێرنە ئەنجومەنی پیران [سنا] سەرکۆماری ئەمریکا بەهۆی زۆرینەی ٥٣٨ دەنگی ئەندامانی کالیجێك هەڵدەبژێردرێ کە بەهۆی دەنگدەران لە هەرێمەکاندا هەڵبژێراون. لەو وڵاتەدا کۆنگرە لە ڕێگای بەکارهێنانی بیروڕای خۆی لە سەر دانانی یاساکان سەرەڕای ڤیتۆی سەرکۆمار، بە سەریدا چاودێری دەکا. ئەنجومەنی سنا [پیران] دەسەڵاتگەلێکی تایبەتی لە پێوەندی لەگەڵ پێشنیارەکانی سەرکۆمار بۆ مەنسەبەکانی بەڕێوەبەری ئاستی سەرەوە هەیە. زۆرینەی دوو لە

سێی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران دەتوانن سەرکۆمار بخەنە ژێر پرسیارو لە سەر کار لای بەرن [استیضاح]، بەو مەرجەی دوو لە سێی ئەندامانی ئەنجومەنی پیرانیش دەنگ بە تاوانباریی سەرکۆمار بدەن. لە لایەکی دیکەوە سەرکۆمار بە هۆی هەبوونی مافی ڤیتۆ، دەتوانێ بەسەر کۆنگرەدا چاودێری بکا، پەسندکراوەکانی کۆنگرە دەبێ بۆ واژۆ [امضا]کردن پێشکەش بە سەرکۆمار بکرێ. ئەگەر ئیمزای کرد، پەسندکراوەکە دەبێ بە یاسا، دەنا لەگەڵ بەڵگەکانی ڤیتۆکردنی سەرکۆمار دەدرێتەوە بە کۆنگرە. ئەگەر هەردوو ئەنجومەن بە زۆرینەی دوو لە سێ پەسەند کراوەکە بۆ جارێکی دیکە پەسەند بکەنەوە، دەبێتە یاسا. سەرکۆمار دەتوانێ تەواوەتی پەسەندکراوەکەی کۆنگرە ڤیتۆ بکا، ناتوانێ بەشێك تەئید بکاو بەشێك ڤیتۆ بکا. هەر ئەمە بۆ خۆی سنوورێك بۆ دەسەڵاتی ڤیتۆی سەرکۆمار دادەسەپێنێ. سەرکۆمار هەمو دادوەرەکانی فیدراڵو یەك لەوان دادوەرەکانی دیوانی بەرز [عالی] بە ئەنجومەنی پیران دەناسێنێو سەنایش بە دەنگی زۆرینە ئەوانە دەست نیشان دەکا.

## پارلمانو پارلمانتاریسم

پارلمان یان ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك کە گرینگترین ئەرکی سەر شانی یاسا دانانە، دڵی زیندووی دێموکراسی بە حیساب دێ. هەرچەند لە سیستەمە نادێموکراتیکەکانیش دا پەیدا دەبێ. قەبارەی پارلمانەکان لە رووی ژمارەی نوێنەرەکانەوە، هاوسەنگیی ئاشکرای لە گەڵ حەشیمەتی وڵاتەکان نیە. ئەندامانی پارلمان زۆر جار لە نێوان ١٠٠ تا ٣٠٠ کەس بە شێوەی نێونجی. پارلمانی لیختشتین ١٥ ئەندامی هەیە. هەندێك لە پارلمانە کۆنەکانی ئورووپا زیاتر لە ٦٠٠ ئەندامی هەیە. ئەنجومەنی نوێنەران لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا ٤٣٥ کەس ئەندامی هەیە. بناخەی رەوایی نوێنەرانی پارلمان وەکالەتو نوێنەرایەتییەکە کە لە لایەن هاووڵاتیانەوە کە هەڵیان بژاردوون، پێیان دراوە. نوێنەرەکان لە رووی پێگەو پلەو پایەوە وەك یەکن. پارلمان لانی کەم شوێنی مشتو مڕ سەبارەت بە کێشە گشتییەکانە، بەڵام بە شێوەی گشتی دامەزراوەی یاسادانانو رێك خستنو پەسەند کردنی میزانیەی [بودجە] وڵاتیشە.

لە سیستەمەکانی سەرۆکایەتیدا وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجومەنی نوێنەرەکان خاوەن دەسەڵاتێکی بەربڵاو سەبارەت بە یاسادانانو پەسەند کردنی میزانیە [بودجە]یە. لە

سیستمە پارلمانییەکاندا دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لەم بوارەدا ڕۆڵێکی گرینگی هەیە، بەم مانایە کە زۆر لە [لایحە[1]]کان بۆ بە یاساکردن بە ئەنجومەن پێشنیار دەکاو لە پرۆسەی پەسەندکردنەکانیشیدا کەمو زۆر ڕۆڵی هەیە. لە سیستمگەلی جێی باس لە لایەکی دیکەوە پارلمان لە دەستنیشانکردنی ئەندامانی دەسەڵاتی بەڕێوەبەرییدا ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕێ. ئەندامانی ئەم دەسەڵاتە [بەڕێوەبەری] بە زۆری لە نێوان ڕێبەرانی پارت یان حیزبە بە دەسەڵاتەکان لە پارلماندا هەڵدەبژێردرێن. لە زۆربەی سیستمەکاندا پارلمانەکان بە شێوەگەلی جۆراوجۆر بە سەر کاروباری دەسەڵاتی بەڕێوەبەرییدا چاودێری دەکەن، بە کەم بوونەوەی توانایی پارلمانەکان سەبارەت بە یاساداناںو ڕێکخستنی [تنظیم] میزانیە گرینگیی ئەم چاودێرییە زیاتر بووە.

بناخەی ڕەوایی پارلمانەکان لە سەر نوێنەرایەتی لە لایەن خەڵکەوە دامەزراوە. لە هەندێك لە دێموکراسییەکاندا، وەك بریتانیا، ئەنجومەنی دووهەم بەشێك لە پاشماوەی ئەشرافییەتی کۆنە، لە سەر بناخەی نوێنەرایەتی لە لایەن خەڵکەوە ڕانەوەستاوە. بەڵام لە هەموو دێموکراسییەکاندا ئەنجومەنی سەرەکی، هەڵدەبژێردرێ. بەو حاڵەش پارلمانەکان لە ماوەی مێژووی دێموکراسیدا لە یەك ئاستدا دێموکراتیك نەبوون، بەربلاویو ژمارەی دەنگدەرانو لابردنی مەرجە جۆراوجۆرەکان لە دەنگدان دا، زەروورەتی دێموکراتیکترکردنی پارلمانەکان بوون. نزیك بە یەك لە سێی پارلمانەکان لە ئاستی جیهاندا بریتین لە دوو ئەنجومەن. ئەندامانی نیوەی هەر ئەم ئەنجومەنە دووهەمانە ڕاستەوخۆ لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێنو ئەندامانی نیوەکەی دیکە یان دەستنیشان دەکرێن یان ناڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن. بەو حاڵەش لابردنی [حذف] ئەنجومەنی دووهەم داواکاری زۆری نییە، بەڵکوو مەیل بۆ پاراستنو هێشتنەوەی ئەنجومەنی دووهەم هەروەها بەهێزە، بە تایبەت لە وڵاتانی فیدراڵدا وەك ئامریکاو ئاڵمان کە ئەنجومەنی دووهەم نوێنەری هەرێمەکانە.

لەگەڵ پەرەسەندنی مافی دەنگدان، پارلمانەکان دێموکراتیکتر بوون. لە سەرەتادا لە زۆر لە وڵاتەکاندا مافی دەنگدان لە خاوەن مۆڵکەکاندا بەرتەسك دەبوویەوەو لە قۆناخی پاشتر مافی دەنگدان وەبەر هەموو پیاوەکان کەوت، پاشان کوسپی ڕەگەزیو ژنو پیاویو قەومییەت هەلگیرا. تەنیا مەرجی ئێستا بۆ دەنگدان تەمەنە، زۆر جار تەمەنی دەنگدەران

(١) ـ کەڵاڵەی یاسا کە لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ پەسەند کردن دەدرێ بە پارلمان [وەرگێڕ]

١٨ سالّیه. لەگەڵ پەرەگرتنی مافی دەنگدانو پەیدا بوونی حەشیمەتێکی یەکجار زۆر لە دەنگدەران زەروورەتی ڕێکخستنیان هاتە ئاراوە. بە پێی بنەماکان حەشیمەتی دەنگدەر بە پێی ناوچەی جوغرافیایی دابەش دەبنو نوێنەرەکان، نوێنەری ئەو ناوچانەن. بەم پێیە شێوەی کۆنی دابەشکردنی حەشیمەت بە لەبەرچاو گرتنی پێگەی کۆمەلایەتیو چینایەتی کە لە ئەنجومەنەکانی پێش سەردەمی دێموکراسی باو بوو، هەڵوەشایەوە. هەروەها پارتە سیاسییەکان لە نێوخۆو دەرەوەی پارلمانەکان لە رووی لایەنگری لە ئایدولۆژیاو فیکرییەوە حەشیمەتەکە ڕێك دەخەن. ئەرکی سەرەکیی پارتە سیاسییەکان دەستنیشانکردنی کاندیداکان، هەڵبژاردن، هاندانی دەنگدەران بە بەشداری لە هەڵبژاردنەکان، ئامادە کردنی پرۆگرامو پلانی تایبەتو مسۆگەر کردنی شان دانە بەر بەرپرسایەتیی نوێنەران سەبارەت بە دەنگدەرانە.

جیاکردنەوەی شوێنی هەڵبژاردنەکان بە پێی ولاتەکان دەگۆڕێ. لە ئامریکا ناوچەکانی هەڵبژاردن یەکەم جار بە پێی حەشیمەت لە نێوان هەرێمەکاندا دابەش دەکرێ، پاشان پارلمانی هەرێمەکان ناوچەکانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران بە شێوەیەك دیاری دەکەن کە ناوچەکان لە رووی حەشیمەتەوە یەکسان بنو کەمینە قەومییەکانیش بتوانن پشکی گونجاوی خۆیان لە کورسیەکان بەدەست بێنن. لە زۆربەی ولاتانی ئورووپایدا ناوچەکانی هەڵبژاردن بەهۆی کۆمیسیۆنەکانی دادوەریو ناحیزبی دیاری دەکرێن. لەم ولاتانەدا نەریتی حەشیمەتی یەکسان بە وردی بەرێوە ناچێ.

لە نزیك بە نیوەی دێموکراسییەکانی ئەورۆدا لە هەر ناوچەیەکی هەڵبژاردن چەند نوێنەر هەڵدەبژێردرێن. لە ئاکام دا پارتە جیاوازەکان دەتوانن بە پێی نوێنەرایەتیی ڕێژەیی، بە پێی ڕێژەی ئەو دەنگانە کە هێناویانە، کورسیی پارلمانی بە دەست بێنن. زۆر لە ولاتەکان بە مەبەستی بەرگرتن لە زۆر بوونی لە ڕادەبەدەری پارتە سیاسییەکان، مەرجی بەدەست هێنانی ٥٪ لە تەواوی دەنگەکانی ولات بەهۆی هەر پارتێك، پێش لە دیاریکردنی بەشی ئەوان لە کورسییەکانی پارلمان سەپێندراوە.

هەڵبژاردن بۆ پارلمانیش لە زۆربەی ولاتەکاندا مەرجی بۆ دانراوە. مەبەست لە دانانی ئەم مەرجانە گەرەنتی توانایی ئەندامانی پارلمان بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکو بەرپرسایەتیەکانیانە. یەك لەو مەرجانە زۆر جار بوونی تەمەنی لانیکەم ٢١ ساڵ (لە ئامریکا تەمەنی ئەندامانی

ئەنجومەنی نوێنەران لانیکەم ٢٥ ساڵو ئەندامانی ئەنجومەنی پیران [سنا] لانی کەم ٣٠ ساڵ دانراوە)، هاووڵاتی بوونو نیشتەجێ بوونی لەو وڵاتەدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، نەبوونی پێشینەی تاوانباریو دەست بە کار نەبوون لە هێندێك بەرپرسایەتییە دەوڵەتییەکان بە پێی وڵاتەکان.

ئەرکی نوێنەران هەر بە تەنێ دەنگدانەوەی ویستی هەڵبژێردەران نییە، بەڵکوو بە سەرنج دان بەوەی کە ئەوانە ئەزموونی پارلمانیو سیاسی پەیدا دەکەن، دەبێ لە ڕێكو پێك کردنی داخوازە پرشو بڵاوەکانی دەنگدەران، ڕێکخستنی سیاسەتەکانو خستنە بەردەستی ڕێگەچارەکانو بەشێوەی گشتی ئاگادار کردنەوەی هەڵبژێردەرانی خۆیانیش چالاك بن.

## پێکهاتەی پارلمان

نوێنەرانی پارلمان کە بە پێی یاسا لە گەڵ یەکتر یەکسانن، لە کاتێکدا دەتوانن بگەن بە وەرگرتنی بڕیارێك بە کۆدەنگ کە نموونەیەك لە پێوەندیی پێکهاتەییو ڕێکخراوەییدا جێ بگرن. پارتەکان هەرکام لە درێژەی مێژووی خۆیاندا، شێوە ڕێکخراوی تایبەت بە خۆیان پەیدا کردوەو لەگەڵ ئەوەش ئاگایانە ڕێکخراوو شێوەی بەڕێوەبەریی تایبەت بۆ خۆیان دادەنێن. لە ئاکامدا لە پارلمانەکان دا کە ئەندامەکانی یەکسانن، دابەش کردنی بەرپرسایەتیو پلە بەندیی دەسەڵات سەر هەڵدەدا کە دەتوانێ بڕیاردان مسۆگەر بکا.

پارلمانەکان پێویستە بە کۆمەڵێك لە بەرژەوەندییەکانو گرووپەکان وەڵام بدەنەوە، بۆیە کومیتەگەلێکی پسپۆڕی بۆ هەرکام پێك دێنن. بۆ نموونە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا ٢٢ کومیتەی هەیە. لە وڵاتانی ئورووپایی دا بە شێوەی نێونجی لە نێوان ١٠ تا ٢٠ کومیتەی پسپۆڕیو شارەزایی [تخصصی] لە پارلمان دا هەیە. لە پارلمانی بریتانیا، زۆر لە کومیتەکان بە شێوەی کاتی بۆ پێڕاگەیشتن بە کێشەیەکی تایبەت پێك دێو پاشان هەڵدەوەشێتەوە. هەر ئەمە بۆ خۆی یەکێك لە هۆکارەکانی لاوازیی ڕێژەیی پارلمانی بریتانیا لە بەرانبەر دەسەڵاتی بەڕێوەبەریو ڕێبەرانی پارتەکانو دەزگای دیوانی دەوڵەتە. یەکێك لە ئەرکەکانی کۆمیسیۆنەکانی پارلمانی بە شێوەی گشتی بەکار هێنانی چاودێری بە سەر وەزارەتە جۆراوجۆرەکان دایە کە دەکرێ بڵێین بە ڕادەی دانانی یاساکان بایەخی هەیە. کومیتە پارلمانییەکان لە چاودێری راوێژکاریو پسپۆڕی لە لیژنەگەلی شارەزاو کارناسیش سوود

وەردەگرن. کۆنگرەی ئەمریکا خاوەن ٣٠٠ ئەندامی لیژنە کارناسیەکانە کە لە بواری جۆراوجۆردا خاوەن شارەزایین.

پارتە سیاسییەکان لە نێو پارلماندا خۆیان ڕێك دەخەن. ئەندامانی پارلمان کە لە پارتێکی تایبەت بن، ڕێبەرانی خۆیانو هەروەها سەرۆکی پارلمانو هەندێ جار سەرۆکی کومیتە پارلمانییەکان هەڵدەبژێرنو سەبارەت بە کێشەکانی باس کراو لە پارلمان دا، سیاسەتەکانی تایبەت بە خۆیان دێنە گۆڕ. دەرئەنجام، دەنگی ئەندامانی پارلمان، پێکهاتەی حیزبی پەیدا دەکا. پێکهاتەی حیزبی دەنگەکان لە پارلمانەکاندا لە هەموو دێمورکاسییەکاندا، بێجگە لە ئامریکا، زۆر بەهێزە. لە کۆنگرەی ئەمریکا نزیك بە نیوەی کۆی دەنگەکان، پێکهاتەی حیزبییان هەیە. بەم مانایە کە زۆرینەی نوێنەرەکانی دێموکرات دژی زۆرینە نوێنەرەکانی کۆماریخواز، دەنگ دەدەن. لە باقیی دێموکراسییەکان دا ئەم ژمارە بە ٩٠ لە سەد دەگا. لە سیستمە پارلمانییەکاندا کاتێك دەوڵەت لە حیزبی خاوەن زۆرینە لە ئەنجومەن دابێ، ڕێكو پێکی حیزبی پارلمان بە دەسەڵاتداریەتی زۆرتری دەوڵەت تەواو دەبێ. بە پێچەوانە لە سیستمی سەرۆکایەتیی ئەمریکا کە لەودا پۆستی سەرکۆماریو کۆنگرە لە دەست دوو حیزبی دێموکراتو کۆماریخواز دایە، پتەویی حیزبی لە کۆنگرەدا لاوازیی دەوڵەتی لێ دەکەوێتەوە. لە وەها کاتێکدا تەنیا ئامرازی دەست ڕۆیشتووی دەوڵەت بە سەر کۆنگرەدا مافی ویتوی سەرکۆمارە.

ئاستی دەست ڕۆیشتوویی کومیتەو پارتەکان بە سەر بڕیاردانەکانی پارلمان بەستراوەتەوە بە شێوەو شێوازی یاساو ڕێساکانی نێوخۆیی پارلمان. یاساو ڕێساکان، شێوەی بەڕێوەچوونی وتووێژەکانی گشتیو ڕێگەی چارەسەری کێشەکانی نێوان دوو ئەنجومەنی یاسادانان دەست نیشان دەکەن. یاساو ڕێساکان [ئایین نامە] پارلمانی لەوانەیە بە نووسراوە بن یان تێکەڵێك لە دابو نەریتو نۆرمی نارەسمیو باوو ئاسایی لە پارلمان دا بن. ڕێوشوێنە نێوخۆییەکانی زۆر لە پارلمانەکان لە یاساو ڕێساکانی پارلمانی سەرەتاکان لە بریتانیا وەرگیراوە. لە سەر یەك ڕێوشوێنە پارلمانییەکان، لە بنەڕەت دا لەسەر نەریت، پێشینەو ڕێوڕەسمەکان دامەزراوە تا وەکوو دانانی یاسای نوێ. یاساو ڕێساکانو ڕێوشوێنە نێوخۆییەکانی پارلمانی لە دابەشکردنی دەسەڵات لە نێو کۆمیتەکانی پارلمانی، لە نێوان کومیتەکانو تەواوی پارلمان،

نێوان زۆرینەو کەمینەو هەروەها لە دەست نیشان کردنی شێوە لێکدانەوەی لایحەکان [پـرۆژەی یاسایی]، کاریگەرییـان هەیە.

یاسا دانان بە بڕیاردان لـە سەر لایحەکان دەست پـێ دەکـا. لایـەنەکان بـەهۆی ئەنـدامانی پارلمان (لە کـۆنگرە ئەمریکا) یان کـابینە (لە سیـستمە پارلمانییەکاندا) یان هەرێمەکـان (لـە سیستمگەلـی فیدراڵ)، یان دەنگـدەران (لـە زۆربـەی ولاتانـدا) پێـشکەش دەکـرێن. لـە زۆر کاتدا، لایحەکان دەدرێتە کومیتەکـان، تا دوای پێداچوونەوەو هاوسـەنگ کردنی دەنێردرێتـەوە پارلمان. بە پێـی بابـەت بڕیـاردان سـەبارەت بـە لایحـەکان لەوانەیـە بـە زۆرینـەی سـاکاریی ئـەندامانی ئامادە یان زۆرینەی رەهای هـەموو ئەندامان یان زۆرینەی سـێ لە پێنج یـان دوو لە سـێو سـێ لە چواری ئەندامـان بەڕێوە بچـێ. بە پێی رێوشوێنە نێوخۆیییـەکان دەنگـدان لەوانەیە زارەکی، یان بەهـۆی دەست هەڵهێنان، یان هەستانە سەر پێ یان بە نووسینو نهێنـی بەڕێوە بچـێ.

کاتێک پارلمان بریتی لە دوو ئـەنجومەن بێ، پرۆسەی بـڕیاردان ئاڵـۆزتر دەبـێو رێوشوێنی تایبەتی شێوەی پێـک هێنـانی سـازان لـە نێـوان دوو ئەنجومەنەکـە دیـاری دەکـا. لـە ولاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کومیتەی راوێژکاریی هـاوبەشی دوو ئـەنجومەن بۆ پێکهێنانی سازان لـە بەر چاو گیراوە. ئـەم کومیتەیە لـەوانەیە لـە زیاتر لـە سـەد کـەس لـە ئـەندامانی دوو ئەنجومەنەکـە پێك بێت. لـە ولاتانی دیکەی وەك کاناداو فـەرانسە، لایحە یاساییەکان لـە نێوان دوو ئەنجومەنـدا ئەوەندە دەستاودەست دەبێ تا ئەو کـاتە کە هەردووك لـە سەر دەقێـك ساغ دەبنەوە. لـە هەندێ ولاتی وەك ئاڵمانو بریتانیـا، بڕیـاری نیهاییـی ئەنجومـەنی یەکـەم دەیدا. مشتو مڕو دیالۆگی گشتی لـەسەر لایحەکان لـە پارلماندا زۆر جار لـە سـێ کەرەت دا بەڕێوە دەچێ. ماوەی وتووێژ بە پـێی یاساو رێسـاکانی گشتی سـنوورداره. زۆر جـار رێبـەری پارتەکان لـە پارلمان پاش رێکەوتـن لــە نێـو خۆیـان دا، مـاوەی باسـکردنی هــەر کـام لـە ئەندامەکان لە وتووێژەکاندا دەست نیشان دەکـەن. ئـەرکی سـەرەکیی ئەنجوومـەن، پاراسـتنی ئـارامیو هێمنـی لـە وتووێـژەکانو پێـشگیری لـە قسەی سـووکی ئەندامانـە. لـە زۆر لـە پارلمانەکاندا سعاتو کاتی تایبەت بۆ پرسیارو لێپێچینەوە لـە سـەرۆك وەزیـرو وەزیـرەکان لـەبەرچاو دەگیرێ تاکوو خەڵك بـە گشتی بتوانن لە پرۆسـەی کێشەکە ئاگادار بن. لــە سـەر

یەك ڕێك خستنو ڕیشوێنە نێوخۆیی‌یەكانی پارلمان، كۆمەڵێك كەسانی هاوتاو یەكسانو هاودەسەلات دەكا بە ڕێكخراوێكی هاوپێوەندو ئورگانیك.

گرینگترین رەخنەگەلێك كە لە سەر پارلمانەكان هەیە، بریتین لە: چۆنیەتیی نایەكسانیی ئەندامان، لایەنگری نوێنەران لە هەڵوێستی حیزبی لە جێی بەرژەوەندیی ناوچەی هەڵبژێرانی خۆی، پێوەندیی نزیكی نێوان نوێنەرانو گرووپە دەست ڕۆیشتووەكان، سازبوونەوەی كێشەی قەومیو كۆمەڵایەتی لە ئاستی پارلمان. لاوازیو نەتوانی بۆ ڕاكێشانی سەرنجی گشتیی خەڵك بۆ لای چالاكیو كردەوەی خۆیان بە شێوەی موستەمەڕ، خەسڵەتی بووروكراتیكو ئاڵۆزی ڕوو لە زیاد بوونی پێكهاتەی پارلمانی، هەڵسوكەوتی دووانەی نوێنەران لە سازانی پەنامەكی لە گەڵ ڕكەبەرەكان لە لایەكو ڕكەبەری ڕواڵەتی [شەڕی زێڕینگەری] لە گەڵیان لە لایەكی دیكەو، كەم بوونەوەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژی نەخشی سەرەكیی پارلمان واتا یاسا دانان.

## دێموكراسیی پارلمانیو دێموكراسیی سەرۆكایەتی

سیستمگەلی پارلمانیو سەرۆكایەتی دوو شێوەی گرینگی حكوومەتی دێموكراتیكن. لە سیستمە سەرۆكایەتییەكاندا، سەركۆمارو پارلمان (یان كۆنگرە) هەركام بە جیاواز بۆ ماوەیەكی دیاری كراو هەڵدەبژێردرێن. كۆنگرە ناتوانێ سەركۆمار لە سەر كار لابەرێ، هەرچەند بە دەگمەن دەتوانێ سەركۆمار بخاتە ژێر پرسیارو لێپێچینەوە [استیضاح]. لە لایەكی دیكەش سەركۆماریش ناتوانێ كۆنگرە هەڵبوەشێنێتەوە. بە پێچەوانە لە سیستمە پارلمانییەكاندا، سەرۆكی دەوڵەت (زۆر جار سەرۆك وەزیر) لەوانەیە بەهۆی وەرگرتنەوەی دەنگی متمانەی پارلمان لە سەر كار وەلا بنرێ. سەرۆك وەزیریش دەتوانێ پارلمان هەڵوەشێنێتەوەو هەڵبژاردنێكی نوێ بەڕێوە بەرێ. كەوابوو لە سیستمی سەرۆكایەتیدا دابەش كردنی دەسەلاتەكان بەهێزترە. بەلام لە سیستمی سەرۆكایەتیدا نێوان دوو دەسەلاتی بەڕێوەبەریو یاسادانان، لە هەمان كاتدا كە جیان، هاوكاریش بوونی هەیە. لە سیستمە سەرۆكایەتییەكاندا سەركۆمار بەهۆی خەڵكو ڕاستەوخۆ یان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ (لە ڕێگای كالیجی هەڵبژاردن) هەڵدەبژێردرێ، بەلام لە سیستمە پارلمانییەكاندا خەڵك تەنیا نوێنەرانی خۆیان لە پارلمان دا هەڵدەبژێرنو ئەوانیش سەركۆمار دەست نیشان دەكەن. لە سیستمە پارلمانییەكاندا سەرۆكی وڵات (سەركۆمار یان شا) دەسەلاتی بەڕێوەبەرییان نیەو،

حکوومەت لە دەست دەوڵەت یان سەرۆك وەزیرە. لە سیستمە سەرۆکایەتییەکاندا هەندێك سنوور بۆ هەڵبژاردنەوەی دووبارەی سەرۆك کۆمار دانراوە، بەڵام لە سیستمەکانی پارلمانی سەرۆك وەزیر دەتوانێ تا ئەو کاتە کە پارتەکەی و یان ئیئتیلافی حیزبەکانی پشتیوانی دەوڵەت لە پارلمان دا زۆرینەیان لە دەست دابێ، لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە.

لە سیستمەکانی سەرۆکایەتیدا، خەڵك کاتی هەڵبژاردن زیاتر سەرنج دەدەنە سەر کەسایەتیی پاڵێوراوەکانی سەرکۆماری هەتا پلان و پرۆگرامی پارتەکان. دەرئەنجام لەوانەیە کەسێك بۆ سەرکۆماری هەڵبژێردرێت کە پشتیوانیی هیچ پارتێکی لە پشت نەبێ و لە ئاکامدا نەتوانێ کارایی پێویست لە خۆی نیشان بدا. بەڵام لە سیستمە پارلمانییەکاندا، ئەو سیاسەتمەدارە کە دەیهەوێ ببێتە سەرۆك وەزیر، دەبێ لە پشتیوانیی بەربلاوی حیزبێك یان ئیئتیلافی چەند حیزب کەڵك وەربگرێ و پشتیوانیی حیزبی زۆرینە یان کۆمەڵێك لە حیزبەکان لە پارلماندا بەدەست بێنێ. لە سیستمە سەرۆکایەتییەکاندا، پاڵێوراوەکانی سەرکۆماری، ئەگەر تێك بشکێن، لەوانەیە بە شێوەیەکی گشتی لە گۆڕەپانی سیاسەت بچنە دەرەوە، بەڵام لە سیستمەکانی پارلمانیدا، رێبەریی حیزبی تێك شکاو لە هەڵبژاردن دا، دەبێتە رێبەری ئۆپۆزیسیۆن.

لە سیستمەکانی پارلمانیدا تەنیا پارلمان رەوایی دێموکراتیکی پێیە و دەتوانێ سەرۆك وەزیر دابنێتەوە یان دەر بکا. بەڵام لە سیستمەکانی سەرۆکایەتیدا، سەرکۆمار و کۆنگرە هەردووکیان کەڵك لە رەوایی دێموکراتیك وەردەگرن. لە کاتی سەرهەڵدانی ناکۆکی و شەڕ لە نێوان ئەو دووەدا، تەنیا رێگەچارەی کێشەکە، سپاردنی بە بۆچوونی دیوانی بەرزو یان دیوانی دەستوورە. لە ئەمریکا ئەگەر سەرکۆمار پشتیوانییەکی بەهێزی لە پشت نەبێ، لە بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی خۆیدا تووشی تەنگ و چەڵەمەی گەورە دەبێ و لە هەمان کاتدا دیارە ناشتوانێ کۆنگرە هەڵوەشێنێ.

هەندێك لە سیستمەگەلی دێموکراتیك نیوە سەرۆکایەتیشیان پێ دەڵێن. لەم سیستمانەدا هەم سەرکۆمار هەڵبژێردراوە، هەم سەرۆك وەزیرانێك هەیە کە بە دەنگی زۆرینەی پارلمان هەڵبژێردراوە. سەرکۆمار زۆر جار لە پێوەندیی دەرەوە و کاروباری دیفاعی دەسەڵات بەکار دێنێ و سەرۆك وەزیرانیش لە کاروباری بەڕێوەبەریدا سەرقاڵ دەبێ. لەوانەیە سەرکۆمار لە حیزبێك بێ و سەرۆك وەزیرانیش لە حیزبێکی دیکە.

## ڕەوتی پێکهێنانی دەوڵەت

ڕەوتـی پێکهێنـانی دەوڵـەتو یـان دەسـت نیـشان کـردنو دانـانی ئەنـدامانی دەسـەڵاتی بەڕێوەبەری لـە پرۆسـە گرینگـەکانی ژیـانی سیاسـی لـە دێموکراسـییە پارلمانییـەکان دایـە. ئەنجومەنی وەزیران لە دێموکراسییە پارلمانییەکاندا زۆر جار وەك کابینە یان ئەنجومەنی وەزیران ناو دەبرێ. لـە سـەرەوەی ئەنجومـەنی وەزیـران، سـەرۆك وەزیـر یـان ڕاوێـژکار [صـدراعظم] دانیشتوە. ئەنجومەنی وەزیران زۆر جار حەوتووی جارێـك کـۆ دەبێتـەوە. ژمـارەی ئەنـدامانی کابینە زۆر جار لە نێوان ١٠ تـا ٣٠ کەسـەو بڕیارەکـان بـە کـۆی دەنـگ پەسـەند دەکرێن. ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران هەم وەك خۆیان بـە تـاكو هـەم بـە کـۆ لـە بەرانبـەر پارلمانـدا بەرپرسن. پارلمان دەتوانێ بە وەرگرتنەوەی متمانە لەسەر کار لایان بەرێ. لـە هەندێك ولاتـدا، هەندێك لە ئـەندامانی کابینە بەرپرسـایەتیی هـیچ وەزارەتخانەیـەکیان لـە ئـەستۆ نیـە. لـە دێموکراسیـیە پارلمانییەکانـدا پێکهێنانی دەوڵەت بە سێ مەبەستی سەرەکی بـەڕێوە دەچـێ: یەکەم، دیاری کردنی وەزیرەکان بۆ چاودێری بە سەر دەزگای دیوانیدا، دووهەم، ئامادە کردنی بەرنامەکان، سیاسـەتو شێوەگەلی حکوومـەتیو سـێهەم دەسـت نیـشان کردنـی پـشتیوانانو موخالفانی حکوومەت لە پارلماندا. پرۆسـەی پێکهێنـانی دەوڵـەت لـەو سـەردەمەدا لـە ژێـر کۆنترۆڵی حیزبە سیاسییەکان دایە. لـە سیـستمە دوو حیزبییەکانـدا، پـارتی سـەرکەوتوو بـە شێوەی پاونکراو هەڵدەستێ بە پێك هێنانی دەوڵەت، لـە سیـستمە چـەند حیزبییەکانـدا، بـە تایـەت ئەگەر هـیچ کـام لـە حیزبـەکان نـەیانتوانی زۆرینـەی دەنگـەکان بـەدەست بێـنن، دەرەتـانی کەڵك وەرگرتنی دەسەڵات بەو شێوە لە ئـارادا نامێنێ. بە پێـی ئـەوەی کـە چـەند حیزب لە دەسـەڵات دا بەشدارنو حیزبی سەرتر تا چ ئاستێك لە دەنگەکانی پێیە، جورگـەلێك لە هەینەتی دەوڵەت پەیدا دەبێ. ئەنجومەنی وەزیران لەوانەیە کابینەیەکی تـەك حیزبـیو یـان ئیئتیلافی بێ. لە کابینەی ئیئتیلافی دا دوو یان چەند حیزب بەشدارن. بەو حـاڵەش لـەوانەیە حیزبی وا هەبێ بە بێ ئەوەی لە کابینەش دا بەشدار بێ، پشتیوانی لە دەوڵەت بکا. زۆر جـار ئەو حیزبە پـشتیوانانە قورسـاییو بایـەخێکی ئـەوتۆیان بـۆ ئەندامـەتی لـە کابینـەدا نیـە. ئیئتیلافگەلی پشتیوانی لەوانەیە بە پێی سیاسەت کێشە جۆراوجۆرەکان لە حیزبە جیاوازەکمان پێك بێ کە لەو حـاڵەدا ئیئتیلافگەلی تێپەڕ یان پارلمانیـان پـێ دەڵـێن. بـە پێـی ئـەوەی کـە

دەوڵەت پشتیوانیی زۆرینەی پارلمانی لەگەڵ بێ یان نا، جورگەلێك لە کابینە بوونی هەیە. ئەنجومەنی وەزیرانێك کە زۆرینەی پارلمانی لە پشت بێ، دەوڵەتی زۆرینەی پێ دەڵێن، ئەگەر وا نەبێ وەك دەوڵەتی کەمینە ناو دەبرێ. دەوڵەتگەلی کەمینە زۆر جار تەمەنیان کورتتر لە دەوڵەتی زۆرینەیە. ئەو ئیئتیلافە کە هەموو حیزبەکان یان حیزبە گەورەکان لە خۆ دەگرێ، ئیئتیلافی گەورەی پێ دەڵێن. زۆر جار وەها ئیئتیلافگەلێك لە کاتی شەڕو قەیراندا پێك دێن. کابینەکانی کاتی کە بۆ بەڕێوەبەریی کاروباری وڵات بۆ ماوەیەکی دیاری کراو پێك دێن و لەو ماوەدا وتوویژ بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیران لە ئارا دایە، دەوڵەتی داشدار [سرپرست]ی پێ دەڵێن. جاری وا رێ دەکەوێ کە سەرکۆمار هەر بەو مەبەستە کابینەیەك لە کەسانی نەبەستراوە بە پارتە سیاسییەکان پێك بێنێ.

لە سیستمگەلی پارلمانیدا، سەرەتا سەرۆکی وڵات کەسێك بۆ پۆستی سەرۆك وەزیری کاندیدا دەکا. لەگەڵ ئەوەش پارتە سیاسییەکان بۆ ناساندنی سەرۆك وەزیر نەخشێکی بەرچاو دەگێڕن. لە هەندێك بواردا پارلمان راستەوخۆ سەرۆك وەزیر دەست نیشان دەکا. ئەگەر یەکێك لە پارتەکان زۆرینەی پارلمانێکی ئەوتۆی کە پشتی پێ ببەستێ لە بەر دەست دا بێ، سەرۆکی وڵات زۆر جار رێبەری ئەو پارتە بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران کاندیدا دەکاو داوای پێکهێنانی دەوڵەتی لێ دەکا، ئەگەر وا نەبوو زۆر جار وتوویژی دوورو درێژو دژوار بۆ پێکهێنانی کابینە بەڕێوە دەچێ. لەوانەیە ئەو کەسە کە بەرپرسایەتیی ئەو وتوویژانەی کەوتۆتە ئەستۆ، خۆی ئەگەر سەر بکەوێ، ببێتە سەرۆك وەزیر. ئەگەر وتوویژەکان ئاڵۆزو دژوار بن، سەرۆکی وڵات کەسێك تەنیاوەك راپۆت دەر "مخبر" یان نێوبژیوانی وتوویژەکان دەست نیشان دەکا. وەها کەسانێك زۆر جار لەگەڵ رێبەری پارتەکان پێوەندیی نزیکیان هەیە یان خاوەنی دەست رۆیشتنوویەکی بەرچاون. بەو حاڵەش لەوانەیە "مخبر" تەنیا لە رواڵەت دا وەها نەخشێکی بێ و ئەگەر لە وتوویژەکاندا سەرکەوێ، خۆی دەوڵەت پێك بێنێ. ئەگەر وتوویژەکان سەر نەکەوتن و شکستیان هێنا، سەرۆکی وڵات راسپاردەی دیکە بۆ پێك هێنانی کابینە بە کەسانی جێی سەرنجی خۆی دەداو یان کەسێکی دیکە بۆ ئەو راسپاردەیە دیاری دەکا. سەرۆك وەزیری نوێ پاش هەڵبژێردران یان دانان [انتصاب] دەبێ گرووپێك بۆ پێکهێنانی کابینە ئامادە بکاو هەر لەو کاتەش دا سیاسەتەکانی خۆی گەڵاڵە بکاو بیناسێنێ. لە نیهایەتدا، کابینەی نوێ دەبێ جێی تەئیدی سەرۆکی وڵات بێ. لە هەندێك بواردا ئەندامانی کابینە دەبێ تەئیدی

پارلمانیش به دەست بێنن. لە جۆری دیکەدا سەرۆك وەزیری هەڵبژێردراو [منتخب] لـە گـەڵ ئەندامانی کابینەکەی دەبێ جێـی تەییـدی پارلمـان بـن. لـە دێموکراسییەکانی کـۆنتر دا زۆر پێویستیەك بۆ ئەم تەییدیە نەدەبینرا.

لەو وتووێژانەدا کە دەبێتە هـۆی پێکهـاتنی ئەنجومـەنی وەزیرانـی ئیئتیلافـی، دوو بابـەت گرینگیان هەیە: یەکەم پێکهاتەی دەوڵەتو ئـەوی دیکـە سیاسـەتو پلانـەکانی. زۆر جـار سەرۆكو ڕێبـەرانی پارتەکان لەو وتووێژانەدا بەشداری دەکەنو لـە سـنووری گـشتی سیاسـەتی حیزبەکانی خۆیاندا، هەوڵی سازانو پێك گەیشتن لەگەڵ کەسانی دیکـە دەدەن. لـە کـاتی ئـەم وتووێژانەدا، پارتە سیاسییەکان زۆر جـار یەکیـەتیی خۆیـان لـە بەرانبـەر رکەبـەرەکانیان دا دەپارێزنو لە ناکۆکیی نێوخۆیی خۆ دەپارێزن. لە کاتێکدا کە تەییدی نیهایی پارلمان بـۆ پێـك هێنانی دەوڵەت بە شێوەی فەرمی پێویست بێ، سازانەکانو سیاسەتەکان هەر لـە دەوروبـەری ئەو سنوورانەدا دەبێ کە تەییدی پارلمان رابکێشێ. لـەو سیـستمانەدا کـە ژمـارەی پارتـەکان زۆرن، وتوویێژ بۆ ئیئتیلاف درێژە دەکێشێو نۆرە بە نۆرە لە نێو پارتە جۆراوجۆرەکانـدا بـەڕێوە دەچێ. پێکهێنانی هەیئەتی دەوڵەتی ئیئتیلافی مەرج نیە پاش هەڵبژاردنێکی گـشتی بـەڕێوە بچێ، بەڵکوو لەوانەیە پاش دەست لە کار کێشانەوەی دەوڵەتی پێـشوو، زەروورەتـی هاتبێتـە ئاراوە. لـەو جـۆرە کاتانـەدا لەوانەیـە لـە مـاوەی تەمـەنی پارلمانێکـدا چـەندین ئیئتیلافـی حکوومەتی پێك بێ. هـەروەها لەوانەیـە هەیئـەتی دەوڵـەتێك کـە پێـك هـاتووەو سـەرقاڵی بەڕێوەبەریی وڵاتە، بەبێ ئاڵوگۆڕێکی قووڵ لـەگەڵ هێندێك حیزب ئیئتیلاف پێـك بێنـێ. لـە دەوڵەتە ئیئتیلافیەکاندا، کاتی دابەشکردنی پۆستە وەزارییەکان، مەنـسەبی سـەرۆك وەزیـران زۆرجار دەبرێ بە گەورەترین پارتی. ئـەو پارتانـە کـە لایـەنگری لـە ئـایین دەکـەن، زۆر جـار خوازیاری پۆستی وەزارەتی پەروەردە یان وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایـەتین. پارتـە پارێزگـارو راستـەکان زیاتر مەیلیان بۆ لای وەزارەتی دارایی‌و ماڵی‌و ئابووریەو پارتە رادیکاڵو چەپەکان خوازیاری وەزارەتی کار، دابین کردنی خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی [تأمین و رفـاه اجتمـاعی]و تەندروستی‌و دەرمانن. لە رووی مانەوەو سەقامگیریی سیاسـی، دەوڵەتـە تـاك حیزبییـەکانو زۆرینەکان زۆر جار سەقامگرتووتر لە دەوڵەتی ئیئتیلافین. لە نێـو دەوڵەتـە ئیئتیلافییەکانـدا "ئیئتیلافی تەواو" بناخەیەکی دەوامدارتری بۆ دەوڵەت هەیـە تـاکوو "ئیئتیلافـی ناتـەواو"

(بچۆ بۆ باسی پێکهێنانی ئیئتیلاف).

## کابینەی دەوڵەت

پێشینەی دامەزراوەی کابینە یان هەیئەتی دەوڵەت دەگەڕێتەوە بۆ نەریتی شاکانی ئورووپایی لە سەدەکانی ناوەڕاست دا کە راوێژکارانێکیان لە سێ چین یان پێگەی سەرەکی واتا نەجیب زادەکان [أشراف]، پیاوانی ئایینی و سەربازەکان بە مەبەستی مسۆگەرکردنی دەسەڵاتی خۆیان هەڵدەبژاردن. دەرئەنجام بە پێی رەوتی بەگشتی بوونی سیاسەت و پەرەسەندنی دیوانسالاری نوێ، کەم کەم سیاسەتوانانی پیشەیی لە جێی ئەو راوێژکارانە دانیشتن. لە سەردەمانی نوێدا لەگەڵ جیاکردنەوەی سەرۆکی وڵات (بۆ نموونە شا یان سەرکۆمار) لە سەرۆکی دەوڵەت، کابینە وەك لیژنەی بەڕێوەبەری دەسەڵاتی سەرۆکی دەوڵەت لە هەموو شوێنێك جێی خۆی گرت. دیارە لە هەندێك وڵات وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، سەرۆکی وڵات و سەرۆکی دەوڵەت یەکن. لە گەڵ ئەوەش لە دەستووری ئەو وڵاتەدا هیچ ناوێك لە کابینە نەهاتۆتە ئاراوە. لە ئاکامدا سەرۆك کۆمارەکان دەسەڵاتی خۆیان بە شێوەیەك لە نێو وەزیرەکاندا دابەش ناکەن کە ببێتە هۆی دەسەڵاتی دەستەجەمعی و دامەزراوەیی ئەوان.

شێوەی بەدەستەوە گرتنی وەزارەت یان ئەندامەتیی کابینەی دەوڵەت لە وڵاتەکاندا جۆراوجۆرن، لە فەرانسە، ئاڵمان و ژاپان دا ئەندامی کابینە لە سەرەتادا مووچەخۆری فەرمیی دەوڵەتن و پاشان وەك وەزیر یان ئەندامی کابینە دەچنە کۆڕی سیاسەتوانانی پیشەیی. لە بەرانبەردا لە نەریتی سیاسیی بریتانیا، لە وڵاتگەلێك وەك بریتانیا، کانادا و ئوسترالیا، ئەندامانی کابینە لە پێشدا مووچەخۆی فەرمیی حکوومەت نەبوون، بەڵکوو وەك سیاسەتوانانی پیشەیی دێنە نێو کابینە. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تێکەڵێك لەم دوو شێوە بەرچاو دەکەوێ. وەزیرەکان یان ئەندامانی کابینە خاوەن پۆستی ئیداری نین، هەرچەند لەوانەیە هەندێکیان وەك قایمقام یان ئەندامانی ئەنجومەنەکانی یاسادانان لە هەرێمەکاندا خزمەتیان کردبێ، بەڵام بەگشتی وەك سیاسەتوانانی پیشەیی دەر دەکەون و لەم پێوەندییەدا دیارە لە پێشینەی خزمەتی خۆیانیش کەڵك وەردەگرن. کەوابوو پێوەندیی نێوان پۆستی سیاسی و پۆستی ئیداری لاوازە.

زۆر لە کابینەکان بە شێوەیەك دەربڕی دەسەلاتی پارتەکانو هێزە دەسەلاتدارەکانن. ئەو ڕێژیمانە کە پشتیان بە هێزی سەربازی بەستوە، دیارە زۆر لە وەزارەتە گرینگەکان دەسپێرنە دەست سوپا. لە ولاتگەلێك وەك بریتانیا، ئەو پارتەی کە خاوەن زۆرترین ژمارەی کورسیەکان لە ئەنجومەنی عەوامدا بێ، کابینە پێك دێنێ، بەلام ئەگەر زۆرینەی ئەنجومەنی بە دەستەوە نەبوو، لەوانەیە حکوومەتی کەمینە پێك بێنێ. لەو بارودۆخەدا حیزبە بچووکترەکان بە بێ چاوەڕوانی بەشداری لە کابینەدا پشتیوانی دەکەن. ئەگەر پارتە بچووکەکان خوازیاری بەشداربوون لە کابینەی دەولەتدا بن، "حکوومەتی ئیئتیلافی" پێك دێ. لە ولاتە یەکگرتووەکاندا سەرۆك کۆمارەکان تێدەکۆشن تا وەزیرە دانراوەکان لە هەر وەزارەتخانەیەك دا، لە لای گرووپە بە دەسەلاتەکان لەو بوارەدا جێی پەسند بن. بۆ نموونە وەزیری دارایی دەبێ لە لای گرووپە مالیەکانی ئابووری گرینگ جێی پەسەند بێ. هەروەها سەرۆکی دەولەتەکان زۆرجار لە کاتی پێکهێنانی کابینەکەی خۆیان دا سەرنج دەدەنە پێکهاتەی قەومیو ناوچەییو هەروەها نەخشی ژنانیش لەبەر چاو دەگرن.

## پێکهێنانی ئیئتیلاف یان هاوپەیمانی

ئیئتیلاف یان هاوپەیمانی، کۆمەلێك لە گرووپ یان پارتە سیاسییەکانە کە ئامانجی هاوبەشیان هەیەو بەرژەوەندیی خۆیان بۆ دەست پێڕاگەیشتن بەو ئامانجە بەکار دێننو دەسکەوتەکانی دەرئەنجامی ئەو هاوپەیمانییەش لە نێو خۆیاندا دابەش دەکەن. هاوپەیمانی لە بوارەکانی سیاسیی جۆراوجۆر، یەك لەوان لە نێو ئەنجومەنەکانی یاسادانان دا، لە دەسەلاتی بەڕێوەبەریداو لە نێو ولاتانی سەربەخۆدا پێك دێ. گرینگترین جۆری هاوپەیمانی لە باسی دێموکراسیی پارلمانیدا، هاوپەیمانیی پارتەکان لە نێو دەسەلاتی بەڕێوەبەری دایە. هەر لە دێموکراسییەکانی پارلمانی فرەحیزبی چەمکی هاوپەیمانی بەم مانایە دروستە. لە سیستمە دوو حیزبییەکاندا، وەك بریتانیاو ئەمریکا، کە لەواندا یەکێك لە دوو پارتە سەرەکییەکە زۆر جار دەبنە خاوەن زۆرینەی کورسیەکانی پارلمان، پێویستی بە پێك هێنانی هاوپەیمانی نیە. بەو حالەش لەوانەیە هیچ حیزبێك خاوەنی زۆرینە نەبێ. لە وەها کاتێك دا لەبەر ئەوەی لە دێموکراسیەکانی پارلمانیدا دەبێ زۆرینەیەك لە ئەندامانی پارلمان لە سیاسەتەکانی دەسەلاتی بەڕێوەبەری پشتیوانی بکا، نیاز بە پێك هێنانی هاوپەیمانییەك لە نێوان نوێنەرانی پتر لە

پارتییەك دێتە پێش. کاتێك ئەندامانی کابینە هەموو لە یەك حیزب بن، بەڵام لە پارلماندا لە پشتیوانیی ئیئتیلافێك لە ئەندامانی حیزبەکەی خۆیو حیزبی دیکەو یان نوێنەرانی سەربەخۆ کەڵك وەربگرن، وەها باروودۆخێك "هاوپەیمانیی پارلمانی" پێی دەڵێنو لەگەڵ "هاوپەیمانیی بەڕێوەبەری" کە لەودا هەئیەتی دەوڵەت لە چەند حیزب پێك هاتوە، جیا دەکرێتەوە. لەو سیستمانەدا کە پتر لە چوار پارتی پارلمانیان هەیە جۆرەها شێوە لە هاوپەیمانی لەوانەیە بێتە کایەوە. بەڵام ئەگەر ئەم هاوپەیمانی‌یە یەکەم بەڕادەی پێویست دەنگی موافیق لە پارلماندا بەدەست نەهێنێ، لەوانەیە حیزب یان حیزبگەلی دیکەی بۆ بانگهێشتن بکرێن. ئەم پارتانە دیارە لەوانەیە بانگهێشتنەکە ڕەد یان پەسەند بکەن. پرۆسەی بانگهێشتن کردن بۆ هاوپەیمانی یەکەمین تا ئەو کاتە درێژە دەکێشێ کە چی دی پێویست بە بانگهێشتن نەکاو یان پارتێك نەمابێتەوە کە لێی بگێڕنەوە. سروشتی‌یە کە هەرکام لە ئەندامانی ئیئتیلافی یەکەم جار خاوەن مافی ویتو بۆ وەرگرتنی ئەندامانی دیکەیە.

هاوپەیمانیی بەڕێوەبەری لەوانەیە "هاوپەیمانیی زۆرینەیی"و یان "ئیئتیلافی کەمینەیی" بن. "هاوپەیمانیی زۆرینەیی" پشتیوانیی زۆرینەی ئەندامانی پارلمانی لە پشتە، لە کاتێکدا "هاوپەیمانیی کەمینەیی" لە وەها پشتیوانییەك بێبەشە. ئیئتیلافی کەمینەیی لە وڵاتگەلێك وەك دانیمارك، نۆرویژ، سوئێد، ئیتالیا، فەرانسەو ئیسپانیا باوە. بە ڕواڵەت دێموکراسییە پارلمانییەکانیان پێویستییان بە ئیئتیلافی زۆرینەیە، لەبەر ئەوە حکوومەت دەبێ بتوانێ هەموو کاتێك حیساب لە سەر دەنگی زۆرینە لە بەرانبەر مەترسیی دەنگی وەرگرتنەوەی متمانە بکا. لەگەڵ ئەوەش جاری واش هەیە ئەو پارتانە کە لە هەیئەتی دەوڵەتدا ئەندامێکیان نیە، لەوانەیە لە پارلماندا پشتیوانیی لێ بکەن. بەم پێیە، "هاوپەیمانیگەلی کەمینەیی" دەتوانن سەرەڕای ڕواڵەت لە پشتیوانیی زۆرینە لە پارلماندا کەڵك وەرگرن، هەرچەند لەوانەیە ئەم زۆرینە ناسەقامگیرو لە حاڵی گۆڕاندا بێ. هاوپەیمانە کەمینەییەکان هەر چۆنێك بێ ناسەقامگیرتر لە هاوپەیمانیی زۆرینەیی‌یە، هەرچەند لە دێموکراسییەکانی ئەو سەردەمەدا یەکجار باون.

هەروەها لە نێوان هاوپەیمانییەکان لە ڕووی ژمارەی ئەندامانی پێك هێنەر، جیاوازی دادەنرێ. "هاوپەیمانیی تەواو" هاوپەیمانییەکە کە بەڕادەی پێویست ئەندامی هەیە، واتا ئەندامی زیادی نیە کە بە چوونە دەرەوەیان هاوپەیمانییەکە لێك هەڵنەوەشێتەوە. زۆر جار

ئیئتیلافە لانیکەمەکان، هەر ئەو هاوپەیمانیانەن کە زۆرینەی دەنگەکانی نوێنەرانی ئەنجومەنی یاساداتان بەدەست دێنن. "هاوپەیمانیی زیادی"، هاوپەیمانییەکە خاوەن ئەندامی زیاتر لە ئاستی پێویستەو "هاوپەیمانیی ناتەواو" هاوپەیمانییەکە کە کەمتر لە ژمارەی پێویست ئەندامی هەیە. "هاوپەیمانیی گەورە"، هاوپەیمانییەکە کە لەودا هەموو حیزبە پارلمانییەکان بەشدارییان تێدا بێ. وەها هاوپەیمانییەك زۆرجار لە کاتی قەیراندا پێك دێن. لە زانستی سیاسەتدا، پێش بینی ئەوەی کە لەوانەیە لە چ پارتگەلێك هاوپەیمانی پێك بێ، مشتومڕی زۆرو بەربڵاوی لە تیئۆریی هاوپەیمانیدا خستۆتە ڕێ. لە تیئۆرییە کۆنەکاندا زۆر جار لە سەر "هۆکاری رادە" یان ئەخشی چەندی پارتەکان لە پێك هێنانی هاوپەیمانیەکاندا، تەئکیدی لەسەر دەکرا، لە کاتێکدا لە تیئۆرییە نوێیەکاندا لە سەر هۆکاری چۆنیەتیی هاوچەشنی، واتا نزیکی فیزیکیو ئایدۆلۆژیکیی پارتەکان زیاتر تەئکید دەکرێ. هەر چۆنێك بێ هۆکارە جۆراوجۆرەکان یەك لەوان یاساگەلی هەڵبژاردن، شێوەی هەڵسوکەوتی پارلمانەکان، شێوەگەلی بڕیاردان لە ئەنجومەنی وەزیران، هاوچەشنی بیروڕای حیزبەکانو قورسایی ئەوان لە پێکهێنانی هاوپەیمانیەکاندا کاریگەرییان هەیە.

## شێوەکانی بڕیاردان لە دێموکراسییەکاندا

لە دێموکراسییەکاندا بڕیاردانی سیاسی زۆر جار بە شێوەی دەستەجەمعی بەڕێوە دەچێو لە نێو دامەزراوەگەلی پارلمانەکاندا، کابینەو کۆنوانسیۆنەکانی حیزبیدا جێبەجێ دەبێ. یەکێك لە شێوە زۆر باوەکانو سەرەکی لە بڕیارداندا، دەنگ وەرگرتنە. دەنگ وەرگرتن بۆ بڕیاردان شێوەی جۆراوجۆری هەیە. ساکارترین وێنەی دەنگ وەرگرتن کاتێکە کە هەموو دەنگدەران خاوەن مافی دەنگدانی وەك یەك بنو هەڵبژاردن لە نێوان دوو بابەتی دیاریکراو بێتو زۆرینەی ساکار بۆ وەرگرتنی بڕیار بەس بێت. لە بارودۆخی جیاوازدا لەوانەیە لە جێی زۆرینەی ساکار، زۆرینەی رەها واتا نیو زاید یەك پێویست بێت. بارودۆخی دژوارتر کاتێکە کە زۆرینەی تەواوتر بۆ نموونە دوو لە سێ یا سێ لە چواری دەنگەکان پێویست بێ، هەروەها لەوانەیە بابەتەکانی پێویست بۆ هەڵبژاردن زیاتر لە دوو بێ. بۆ نموونە کاتێك سێ بابەت لە ئارادا بێ، لەوانەیە زۆرینەی ساکار بۆ دەست نیشان کردنی یەك بابەت پێویست بێو دەنگدان لە یەك قۆناخدا تەواو بێت. بەڵام کاتێك زۆرینەی رەها مەرج بێتو ئەگەر هیچ کام لە سێ بابەتەکە

زۆرینەی پێویست بەدەست نەهێنێ، دوو هەڵبژاردە کە زۆرترین دەنگیان هێناوە، لە خولی دووهەمی دەنگەکاندا لە بەرانبەر یەکتردا رادەوەستێن. لەوانەیە لە بنەڕەتدا بڕیاردان بە کۆی دەنگ بدرێ [اتفاق آرا]. ئەو بارودۆخە لە کاتێکدا دەرەتانی جێبەجێبوونی هەیە کە هەموو ئەندامەکان خاوەن دەست رۆیشتوویی وەك یەك لە دیاری کردنی دەرئەنجامەکەدا بن. ئاخرین ئەندامی دژ [مخالف] لە وەها بارودۆخێك دا دەسەڵاتێکی دەست نیشان کەری دەبێ و بە واتایەکی دیکە خاوەن مافی ڤیتویە.

## ئەرك وەخۆگری [مسئولیت پـڕێیری] دەسەڵاتداران و کاربەدەستانی سیاسی

لە دێموکراسییەکاندا کاربەدەستانی گشتی، بەرپرس و وەڵامدەری بڕیارات و کردارێکن کە بەڕێوەی دەبەن. بە بێ چوونە ژێر باری بەرپرسایەتی، دێموکراسی مومکین نیە. هەر بۆیە دیارە دەبێ خەڵك بەگشتی بتوانن لە کاربەدەستان سەبارەت بە کردار و بڕیارەکانیان بپرسنەوە. بە تایبەت ئەوانەی کە لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێن، دەبێ لە بەرانبەر ئەواندا [خەڵك] وەڵامدەر بن. لەگەڵ ئەمەش کاربەدەستانی هەڵنەبژێردراویش بە شێوەی جۆراوجۆر بەرپرسن لە بەرانبەر بڕیارەکانی خۆیاندا.

## بەرپرسیاریی کاربەدەستانی هەڵبژێردراو

ماوەی دیاریکراو بۆ ئەو پۆستانە کە دەبێ بە هەڵبژاردن کەسیان بۆ دابنرێ و بنەمای رکەبەری لە هەڵبژاردن یا پشتوانەی بەرپرساتیی کاربەدەستان لە بەرانبەر خەڵك دایە. لەگەڵ ئەمەش لەم بارەوە کۆسپ و دەست بەستراوەیی بوونی هەیە: یەکەم، خەڵك هەموو کاتێك لە رووی زانست و ئاگاداریی تەواو سەبارەت بە ئەو کەسانە کە هەڵبژێردراون و بابەتە سیاسییەکان لە هەڵبژاردنەکاندا بەشداری ناکەن، لەم بارەوە هەڵبژاردن و هەڵبژێردراویی کاربەدەستان ناچارەن مسۆگەرکەری بەرپرسایەتیی ئەوان لە بەرانبەر هاووڵاتیاندا نیە، دووهەم، وەڵامدەر نەبوونی کاربەدەستان لە بەرانبەر کۆمەڵانی خەڵکدا ناچارەن نابێتە کۆسپی سەر رێی هەڵبژاردنەوەی دووبارە ئەوان، لەبەر ئەوەی زۆر جار کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دارایی بەربڵاو لە هەڵبژاردنەکاندا دەتوانێ وەها کوسپگەلێك لە بەر پێ هەڵبگرێ. زیاتر لەوەش بەو رادەکە دەرەتانی رکەبەری لە هەڵبژاردنەکاندا زۆرتر بێ،دەرەتانی بە بەرپرسن زانینی

کاربەدەستانی هەڵبژێردراوە زۆرتر دەبێو بەو حاڵەش تەنانەت لە هەلومەرجی کێبەرکێی تەواو، ئەگەر هاووڵاتیان دەنگ بە حیزبەکان بدەن (نە بە کاندیدا [پاڵێوراو] وەك تاك) لە کاتی وەهادا بەرپرسایەتیی تاکەکەسی کاربەدەستان تووشی گومان دەبێ. هەروەها پرۆسەی بڕیاردان لە حکومەتە نوێیەکاندا ئاڵۆزە بۆیە ناتوانرێ بە سانایی کەسانێکی تایبەت بە بەرپرسی کردارو بڕیاراتی تایبەت بزانرێ.

## بەرپرسیاریی کاربەدەستانی هەڵنەبژێردراو

یەکێك لەو رێگایانە کە هەستی بەرپرسایەتی لە کاربەدەستانی هەڵنەبژێردراودا پێك دێنێ، کەڵك وەرگرتن لە راپرسیی گشتییە. وەها کاربەدەستانێك بیروڕای گشتی وەك پێوەرێك بۆ خۆشەویستیو رەوایی خۆیان لێك دەدەنەوەو لە کاروباری بڕیاردان سەبارەت بە کێشە گشتییەکان زۆر جار لەبەر چاوی دەگرن. لە دێموکراسییەکاندا زۆر جار ئەو کەسانەی کە لەبەر دەم بیروڕای گشتیدا مشتو مڕ خولقێن بن، دەخرێنە بەر لێپرسینەوە. بەگشتی بیروڕای گشتی یەکێك لە ئامرازە گرینگەکانی پێك هێنەری هەستی بەرپرسایەتی لە کاربەدەستانی سیاسیو چاکسازی لە بڕیاردانو سیاستەکان دایە.

رێگەیەکی دیکە بۆ پێك هێنانی هەستی بەرپرسایەتی لە کاربەدەستاندا، دانانی رێوشوێنو یاساگەلی چاودێر بەسەر هەڵسوکەوتو کرداری ئەخلاقیو کۆمەڵایەتیی کاربەدەستان دایە کە لە ئەگەری لەبەرچاو نەگرتنی ئەوانەدا لەوانەیە بکەونە بەر سزادان. هەروەها کاربەدەستانی سیاسی زۆرجار دەبوایە ئاگادارییەك لە سەر داراییو سامانی خۆیان پێش وەرگرتنی پۆستەکەی بێننە گۆڕو ئەو زانیاریانە بە شێوەی بەردەوامو موستەمەر لە ماوەی لە دەستدا بوونی ئەو پۆستە کامیلی بکەن. گومانی سەرەکی لێرەدا ئەمەیە کە بەدەستەوەگرتنی پۆستی سیاسی لە حکومەتی دێموکراتیك دا نابێ ببێ بە ئامرازێك بۆ کۆکردنەوەی قازانجی تایبەتو کەڵەکەبوونی سامان.

لە زۆر لە دێموکراسییەکاندا هاووڵاتیان بە پێی یاسای پێوەندیدار بە ئازادیی زانیاری مافی خۆیانە زانیاریی پێویست سەبارەت بە ژیانی گشتیو پیشەیی بەرپرسانی سیاسی بەدەست بێنن. بە تایبەت پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵەکان سەبارەت بە رسوایی داراییو ئەخلاقیی بەرپرسان لە دەرەوەی شوێنەکانی حکومەتی، کەڵك وەرگرتن لە وەها ئامرازگەلێك باوە.

هەروەها لە زۆر لە دێموکراسییەکاندا سەرچاوەیەکی فەرمی بۆ پێڕاگەیشتن بە ناڕەزایەتی‌و سکاڵای هاووڵاتیان بە دژی کاربەدەستانی حکوومەتی دامەزراوە. وەها سەرچاوەیەك بۆ یەکەم جار لە سوئێد لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم دامەزراو ناوە سوئێدیەکەی Ombudsman (بە مانای چاودێرو کارگێڕ) لە رۆژئاوادا وەك ناوی وەها سەرچاوەیەك بەکار دەبرێ.

لە هەندێك لە دێموکراسییەکاندا، حکوومەت ناوەندگەلێکی بۆ لێکدانەوەو هەڵسەنگاندن‌و تاوتوێکردنی سیاسەتە گشتییەکان پێك هێناوە. هاووڵاتیان بۆیان هەیە دەستیان بە ئامارو زانیارییەکانی ئەو ناوەندانە رابگا. هەروەها لە هەندێك لە دێموکراسییەکاندا رێگەگەلێك پێش بینی کراوە تا هاووڵاتیان یان نوێنەرەکانیان بتوانن کاربەدەستانی هەڵبژێردراوی خۆیان لەسەر کار لابەرن. ریفراندۆم‌و بزووتنەوە ناڕەزایەتییەکانی هاووڵاتیانیش سەبارەت بە لێکدانەوەی گەندەڵی‌و کەڵکی خراپ وەرگرتنی کاربەدەستان کاریگەرن. بەم شێوە شەفافییەتی بوارە سیاسییەکان لە رێی مسۆگەرکردنی هەست بە بەرپرسایەتی‌کردنی کاربەدەستانی گشتی بەشێوەگەلی جۆراوجۆر لە دێموکراسییەکاندا دابین دەبێ. لەڕاستی‌دا هەست بە بەرپرسایەتی‌کردنی کاربەدەستانی سیاسی لە بەردەم کۆمەڵانی خەڵکدا، گرینگترین پێوەری دێموکراسییە.

یەکێك لە شێوەکانی باو بۆ چاودێریی پارلمان بەسەر دەسەڵاتی بەڕێوەبەری‌دا لە رێگەی لێپێچینەوە [استیضاح]و لەسەر کار لابردنی بەرپرسانی دەوڵەت بەهۆی بەڕێوەبردنی کاروباری نایاسایی‌یە. رەوتی لێپێچینەوە زۆرجار لە ئەنجومەنی نوێنەرانەوە دەست پێ دەکاو بە موحاکمەو لەوانەیە بە مەحکوومیەتی کاربەدەستی جێی باس لە ئەنجومەنی بەرزتر (پیران)دا تەواو ببێت. ریشەی ئەم شێوە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵسوکەوتی پارلمانی بریتانیا لە سەدەی چواردەهەم کە وەك ئامرازێك بۆ بەکارهێنانی چاودێری بەسەر دەسەڵاتی وەزیرەکانی دەست نیشانکراوی شا، لە زۆر لە وڵاتەکاندا لەگەڵ ئەوە کە دەرەتانی لێپێچنەوە لە رووی یاساییەوە هەیە، زۆر جار هەڕەشەی لێپێچینەوە دەبێتە هۆی لەسەر کار لابردنی کاربەدەستانی پێوەندیدارو بە کردەوە لێپێچینەوە بەڕێوە ناچێ. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرکۆمارو جێگرەکانی‌و ئەندامانی هەیئەتی دەوڵەتیش لەوانەیە بە تاوانی "خیانەت، بەرتیل خۆری‌و جینایەتی گەورە" بکەونە بەر لێپێچنەوەو لەسەر کارەکەیان لا ببرێن. ئەنجومەنی نوێنەران لە مافی تایبەتیی خۆی لەم بارەوە دەتوانێ کەڵك وەربگرێ. پاش

ئەوەی کە ئەنجومەنی نوێنەران بە دەنگی زۆرینە کاربەدەستانی دەسەڵاتی بەڕێوەبەرییان خستە بەر لێپێچینەوە، ئەنجومەنی پیران ئەو کەسانە موحاکەمە دەکا. بڕیار لەسەر مەحکومەییەت پێویستی بە زۆرینەی دوو لە سێی دەنگی ئەندامانی ئەنجومەنی پیرانە.

## ٥

# هەڵسوكەوتی دیموكراسی:
# پارتەكان و هەڵبژاردن

ئەگەر ئەوەمان لا پەسەند بێ كە دیموكراسی بە كردەوە بە مانای بەشداریو ركەبەریی سیاسی ژمارەیەك لە گرووپەكانو بەرژەوەندییە ڕێكخراوەییەكان بە مەبەستی دەست بەسەر داگرتنی دەسەڵاتی سیاسیو بەڕێوەبەریی وڵات، بە پێی سیاسەتو هەڵوێستەكانی هەركام لەو گرووپانەیە، ئەو كات پارتە سیاسییەكانو هەڵبژاردن دەبنە ناوەندو ناوكی سەرەكیی ژیانی دیموكراتیك. لەم بەشەدا پرۆسەی دیموكراسی لێك دەدەینەوەو بابەتگەلێكی گرینگ وەك بەشداریی سیاسی، پارتەكانو هەڵبژاردن، سیستمەكانی حیزبیو هەڵبژاردنو گرووپەكانی دەست ڕۆیشتووو بیروڕای گشتی بەكورتی شی دەكەینەوە.

## بەشداریی سیاسی

بەشداریی خەڵك لە سیاسەتدا بە هەر شێوەیەكی مانادار بۆ وەدیهاتنی دیموكراسی پێویستە، هەرچەند بەس نیە. ساكارترین شێوەی بەشداریی سیاسی، دەنگدانی هاووڵاتییانە بە پارتە سیاسییەكان، تاكەكانو سیاسەتەكان. شێوەكانی دیكەی بەشداریی سیاسی بریتین لە تێكۆشانی هەڵبژاردنی، كاریگەری لەسەر سیاسەتوانان پێكهێنانی گرووپگەلی دەست ڕۆیشتووو پارتی سیاسیو . . . هتد. بەشداری لە ڕێگەی مافی دەنگدان لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕۆژئاوا پەرەی سەند. لە سەرەتادا لە ئامریكا مافی دەنگدان لە موڵكدارەكان، پیاوانو سپی پێستەكاندا بەرتەسك كرابوویەوە. لە زۆربنەی وڵاتانی ئورووپاییدا بەشداریی سیاسیو مافی دەنگدان پاش شۆڕشەكانی ساڵی ١٨٤٨ پەرەی سەند. لە زۆر لەو وڵاتانەدا مافی دەنگدانی گشتی لە یەكەمین دەیەكانی سەدەی بیستەم دا درا. لەگەڵ ئەمەش دەنگدانی ژنان لە زۆربەی وڵاتەكاندا دێرتر بەدەست هات. لە بریتانیا ١٩٧٨، لە ئەمریكا لە ١٩٢٠، لە فەرانسە ١٩٤٦و لە سویس لە ١٩٧١دا ژنان مافی دەنگدانیان

پەیدا کرد. لە ئەمریکا نیوەی لە حەشیمەتی رەش پێست تا ساڵی ١٩٦٥ نەیاندەتوانی لە مافی یاسایی خۆیان لە دەنگداندا کەڵك وەربگرن.

بەشداریی سیاسی بە بێ رکەبەری سیاسی، بە بەشداریی دێموکراتیك ناژمێردرێ. لە زۆر لە وڵاتەکاندا پاش رووخانی دێموکراسی، مافی دەنگدان هەر لە جێی خۆیدا ماوەتەوە. لە سیستمگەلی توتالیتێر زۆرینەی نزیك بە تەواوی خەڵك لە هەڵبژاردن دا بەشداری دەکەن‌و دەسەڵات هەروەها لە پاوانی یەك گرووپ یان پارتدا نامێنێتەوە. سیستمە سەرەڕۆکان‌و دیکتاتۆرە جۆراوجۆرەکان خەڵك بە شێوەگەلی جۆراوجۆر دەکێشنە سەر سەندووقی دەنگدان.

دیراسەی بەشداریی خەڵك لە هەڵبژاردنەکانداو دەنگ دان، ساناتر لە شێوەکانی دیکەی بەشداری کردنەو زانیاریی فەرمی زۆرتر لەو بارەوە دەکەوێتە دەست. لە زۆربەی دێموکراسییەکاندا، پێگەی هاووڵاتی پێویستی بە بەدەست هێنانی مافی دەنگدانە، ئەو بیانیانە کە لە وڵاتێکدا نیشتەجێن، مافی دەنگدانیان نیە. لە ئەمریکادا هاووڵاتی بوون لە رووی دەستوورییەوە بە دەنگ دانەوە بەستراوەتەوە، بەڵام هەموو هەرێمەکان لە کردەوەدا بە پێویستی دەزانن. ئاستی بەشداریی تاکەکانی خاوەن مافی دەنگدان لە دێموکراسییەکاندا یەکسان نین. لە ئامریکا نزیك ٥٨ لە سەد لە حەشیمەتی خاوەنی دەنگدان لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢دا بەشدارییان کردو لە روانگەی هەندێك لە کارناسانەوە یەکێك لە هۆکارەکانی ئاستی کەمی بەشداریی خەڵك لە هەڵبژاردنەکاندا، بەهۆی پێویستیی ناونووسین بۆ دەنگدان پێش لە هەڵبژاردن دایە. لە زۆربەی دێموکراسییەکاندا ناونوسین پێویستە. هۆکارێکی دیکە دەرەتانی بەشداری لە جۆرەها هەڵبژاردنە، هەرچەند ژمارەی هەڵبژاردنەکان زۆرتر بێ، ئەگەری دابەزینی ئاستی بەشداری لە یەکێك لەوانەدا زۆر دەبێ. لەسەر یەك خەڵکی ئەمریکا زیاتر لە هەموو دێموکراسییەکانی دیکە مەجالیان بۆ دەنگدان هەیە. لە زۆربەی نزیك بە تەواوی دێموکراسییەکاندا دەنگدان ئازادە، تەنیا لە ژمارەیەکی زۆر کەم دا زۆرەکییەو یان دەنگ نەدان سزای بەدواوەیە. لە ئوسترالیاو بلژیك ئەو کەسانە کە دەنگ نادەن، سزا دەدرێن. لە ئیتالیا لەسەر پێناسەی ئەو کەسانەی کە دەنگ نادەن، مۆری "دەنگی نەداوە"ی لێ دەدەن کە جاری وا هەیە دەبێتە کۆسپ‌و گرفت بۆ دامەزران لە لای حکوومەت یان کەڵك وەرگرتن لە مەزایای دەوڵەتی. یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی کاریگەر لەسەر ئاستی بەشداری لە هەڵبژاردندا، خودی سیستمی حیزبییە. بەو رادەیە کە رکەبەری زۆرتر بێ، بەشداریش دەچێتە

سەر. کاتێك تاقە حیزبێك هەموو جارێك لە هەڵبژاردندا سەر بکەوێ، بەشداری دادەبەزێ. هەروەها سیستمی هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی رێژەیی زیاتر لە سیستمی زۆرینەیی، خەڵك و گرووپەکانی جۆراوجۆر بۆ بەشداری لە هەڵبژاردندا هاندەدا. تەنانەت رۆژی هەڵبژاردنیش لە سەر ئاستی بەشداریکردن کاریگەریی هەیە. لەو وڵاتانەدا کە رۆژی هەڵبژاردنی گشتی رۆژێکی پشوویە، لەسەر یەك بەشداریی خەڵك لە هەڵبژاردنەکاندا زیاتر لەو وڵاتانەیە کە لەواندا رۆژی هەڵبژاردن رۆژی کارکردنە. هەروەها بە پێی ئەو بەڵگانە کە لەبەر دەست دان، لەو وڵاتانە کە پارلمانی تاك ئەنجومەنیان هەیە، بەشداریی زیاتر لەو وڵاتانەن کە پارلمانی دوو ئەنجومەنیان هەیە، لەبەر ئەوەی پارلمانی تاك ئەنجومەنی بە تەنیایی نەخشێکی کاریگەر لە چارەنووسی سیاسیی وڵات دا دەگێرێ. هۆکارەکانی کۆمەڵناسانەش دیارە لە ئاستی بەشداریدا کاریگەرن. دیراسەی ئەم هۆکارانە بە تایبەت لەو وڵاتانەدا کە بەشداریی گشتی لەواندا لە خوارێیە (وەك ئامریکا) دەرئەنجامێکی پڕماناترێك دەدا، لەبەر ئەوەی کاتێك بەشداری بەربڵاو بێ، جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکاندا لەم بارەوە نابینرێ. بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانە کە لەبەر دەست دان، سەبارەت بە دێموکراسییەکانی رۆژئاوایی، لە نێو گرووپە کۆمەڵایەتییەکاندا، پیاوان زیاتر لە ژنان، زۆرینەکانی قەومی زیاتر لە کەمینەکانی رەگەزی، چینەکانی ساماندارو نێونج زیاتر لە چینەکانی خوارێ، کەسانی خیزاندارو کامڵ (تەمەنی نێونجی)، زۆرتر لە کەسانی لاوو سەڵت، کەسانی خاوەن شەهادەی بەرز زۆرتر لەو کەسانە کە خوێندەواریەکەیان لە سەرێ نییەو ئەو کەسانە کە بەستراوە بە پارتەکانن، زیاتر لەو کەسانەی دیکە لە هەڵبژاردنەکاندا بەشداری دەکەن.

هەرچەند بە رواڵەت ئاستی بەشداری، دێموکراسییەکان بەهێزو پتەو دەکا، بەڵام هەندێك لە خاوەن بیران لەم بارەوە گومانیان هەیە. بە بۆچوونی ئەوان ئەو کەسانە کە زۆر جار دەنگ دەدەن، زیاتر لەو کەسانە کە دەنگ نادەن بۆ بنەماکانی دێموکراسی بە پەرۆشن، کەسانێك کە دەنگ نادەن، زۆر جار بڕوایەکی ئەوتۆیان بە دێموکراسی نیە. کەوابوو هاندان و وروژاندنی وەها کەسانێك بۆ بەشداری لە سیاسەتدا لەوانە بوو بۆ دێموکراسی سوودێکی نەبێ. لە یەك نموونەدا واتا ئاڵمان لە ساڵی ١٩٣٣دا پەرەسەندنی بێوێنەی بەشداریی سیاسی لە نێو چوونی دێموکراسیو سەرکەوتنی فاشیستیی لێ کەوتەوە. لەگەڵ ئەمەش سەرکەوتنی نازیەکان تەنیا بەهۆی چوونەسەری بەشداری نەبوو، بەڵکوو ئاڵوگۆڕ لە مەیلی حیزبیو، دەنگدەرانی پێشویش

لەم نێوەدا کاریگەر بوون. پەرەگرتنی بەشداریی گشتی لەوانەیە لە پەرەگرتنی حەز لە بنەماکانی دێموکراسیی نەنوێنێ، بەڵکوو دەرخەری هەستی سەرنەکەوتوویی و ناخۆشحاڵی و داخوازیی گۆڕانکاری رادیکاڵ بێ. کەوابوو لە هەلومەرجی تایبەتدا لەوانەیە پەرەگرتنی بەشداریی هەمووان، بە زیانی دامەزراوە دێموکراتیکەکان تەواو بێت.

بەشداری لە ژیانی سیاسی بۆ خەڵکی، مەسرووفاتێکی هەیە پێویست بە تەرخان کردنی کات و توانایی و سەرچاوە دەکا. دیارە هەر ئەندازە مەسرووفاتی بەشداری کەمتر بێ، ئاستی بەشداری زیاتر دەبێ. لە سیستەمە داخراوو نادێموکراتیکەکاندا زۆر جار تاکەکان بۆ بەشداریی راستەقینە لە سیاسەتدا هەزینەگەلێکی کەم و زۆر قورس دەکەوێتە سەر شانیان. هەرچەند بەشداریی لە سیاسەتدا لە تیئۆرییەکانی دێموکراسیدا جورێك گەورەیی مەدەنی بە حیساب هاتوە، بەڵام تەنیا دەرئەنجامی هەست بە ئەرکی مەدەنی نیە، بەڵکوو زۆر جار هۆکاری دیکەیشی هەیە. بەدەستهێنانی قازانجی ئابووری یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانە. کردەوەی دێموکراسی لە سیستەمەکانی سەرمایەداریدا ناتوانێ لە رۆحی قازانج ویستیەکەی کاریگەری وەرنەگرێ. بەو حاڵەش مەیل و ئەنگیزە بۆ بەشداری ساکار نیە و زۆر جار تێکەڵ و لێك گرێ دراوە. کەوابوو ئاوێتەیەك لە قازانج ویستی، دەسەڵاتخوازی، بەدەستهێنانی پێگە و ئابرووی کۆمەڵایەتی و هەست بە ئارامی لە نوگری بۆ بەشداری سیاسیدا تێکەڵ بە یەك دەبن.

## گرووپگەلی خاوەن قازانج و دەست رۆیشتوو

یەکێك لە کاناڵەکانی بەشداریی رێکخراوەیی لە دێموکراسییەکاندا گرووپگەلی دەست رۆیشتوون. گرووپگەلی خاوەن قازانج و دەست رۆیشتوو، گرووپگەلێکن کە بە شوێن دانانی کاریگەرین لەسەر بڕیاراتی دەوڵەت لە راستای دابین کرانی قازانج و بەرژەوەندیی خۆیان. وەها گرووپگەلێك پێویست ناکا هەر بە مەبەستی گوشار خستنەسەر حکومەت پێك هاتبێتن، بەڵکوو زۆر جار ئەرك و ئامانجی ئابووری و کۆمەڵایەتیی دیکەیان هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا هەوڵ دەدەن گوشار بخەنە سەر کاربەدەستانی دەوڵەتی بە مەبەستی دابین کردنی قازانج و بەرژەوەندیی خۆیان. هەندێ لە خاوەن بیران، گرووپگەلی خاوەن قازانج و دەست رۆیشتوو لە راستای بەردەوامی و مانەوەی دێموکراسیدا دەبینن. لە بەرانبەردا هەندێکی دیکە پێ لەسەر لایەنی پڕزیانی ئەوانە لەسەر دێموکراسی دادەگرن. لە روانگەی داکۆکیکەران، گرووپگەلی

دەست ڕۆیشتوو بۆ خۆیان گرینگترین نیشانەی کۆمەڵگای کراوەو ئازادن‌و کاناڵی ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندویستەکانی گشتیی خەڵك لە ئاستی ژیانی سیاسی دان. هەموو دەستوورە دێموکراتیکەکان، ئازادیی تاکەکان بۆ پێکهێنانی گرووپگەلی دڵخوازی خۆیان تەئیید دەکەن. بە بێ وەها گرووپگەلێك تاك بە تەنیایی ناتوانێ لە مافەکانی خۆی لە بەرانبەر دەم‌و دەزگای بەربلاوی دەوڵەتدا پارێزگاری بکا. گرووپەکانی بەرژەوەندخوازو دەست ڕۆیشتوو ڕەنگدانەوەی سروشتیی جۆراوجۆری‌و ئاڵۆزیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و بوونی چینەکان‌و مەیلە جۆراوجۆرەکان لە کۆمەڵگادان. کۆمەڵگای مەدەنی وەك بناخەی ژیانی دێموکراتیك بە بێ گرووپە بەرژەوەندخوازو دەست ڕۆیشتوو مومکین نابێ. گرووپەکانی خاوەن قازانج سەرچاوەی زانیاریی سیاسەتوانان‌و بڕیاردەرانیشن. هەر بۆیە وەها گرووپگەلێك ئەخشێکی کاریگەر لە "کۆمەڵایەتی‌کردنی" سیاسەتدا دەگێڕن. لە لایەکی دیکەوە گرووپە بەرژەوەندخوازەکان زانیاریی پێویست بۆ ئەندامەکانی خۆشان دابین دەکەن. بەم جۆرە گرووپەکانی خاوەن بەرژەوەندی لە ماباقیی دامەزراوە دێموکراتیکەکان واتا پارتە سیاسییەکان‌و پارلمانەکان پشتیوانی دەکەن.

ڕەخنەیەك کە لەسەر گرووپە دەست ڕۆیشتووەکان دەگیرێ، ئەمەیە کە ئەوانە تەنیا لە پەیجوری دابینکردنی بەرژەوەندیی خۆیان‌و وەها بەرژەوەندیگەلێك لەوانەیە لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵگا بەگشتی یەك نەگرێتەوە. بەڵام دادوەری سەبارەت بە هاوئاهەنگی یان ناهاوئاهەنگی بەرژەوەندیی تایبەت‌و گشتی کێشەیەکی ئاڵۆزە، بۆیە وەها ڕەخنەیەك بۆ باس کردن دەبێ. جگە لەوە هەموو گرووپەکانی دەست ڕۆیشتوو هەر بە شوێن بەرەوپێش بردنی بەرژەوەندیی پیشەیی خۆیان نین، بەڵکوو زۆر لەو گرووپە چالاکانە لە بواری ژینگەپارێزی، تەندروستی، فەرهەنگ‌و ... هتد بە ئاشکرا شوێن بەرژەوەندیی گشتی کەوتوون. هەر چۆنێك بێ لە ژیانی دێموکراتیك دا هاوئاهەنگ کردنی هەموو بەرژەوەندی‌و بەهاکان دژوارە، بەڵکوو نامومکێنیشە. ئابووریزانانی کلاسیك، لە لایەکی دیکەوە بەڵگە دێننەوە کە هەر خودی بەدواچوونی بەرژەوەندی تایبەتی بە شێوەی خۆبەخۆیی بەرژەوەندیی گشتی دابین دەکا، بۆیە ناکرێ ئازادی بە بیانووی پێشگرتن لە بەدواداچوونی بە تەنیا بەرژەوەندی تایبەتی‌و ئەگەر لەوانەش بێ زیانی بۆ کۆمەڵگا هەبێ، بەرتەسك بکرێتەوە. لە نەریتی دێموکراسیی ئەمریکایی‌دا، جیمز مادیسون لایەنگری ئەوپەڕی ئازادی بۆ گرووپە دەست ڕۆیشتووەکان بوو.

هەندێك لە نووسەران لەم بارەوە دێموكراسیی ئامریكایییان وەك دێموكراسیی مادیسۆنی ناو بردوە. لە ئامریكادا گرووپە دەست ڕۆیشتووەكان نەخشێكی بەرچاو لە بڕیاردانە سیاسییەكاندا دەگێڕن. بەو حاڵەش لە هەندێك لە دێموكراسییەكاندا، دەوڵەت بە مەبەستی مسۆگەركردنی ركەبەری ئابووری لە بازاڕی ئازادداو ئازادیی سیاسی، یاساو ڕێسایەك بۆ سنووردارکردنی تێكۆشانی گرووپە دەست ڕۆیشتووەكانی داناوە.

لە هەندێك لە وڵاتەكاندا یاساو ڕێسایەكی توند بۆ ناونووسیی گرووپە دەست ڕۆیشتووەكان بوونی هەیەو بۆ پێشگیری لە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی زیاتر، لە ڕادەی گرووپە دەست ڕۆیشتووەكان، هەوڵگەلێك بۆ بەهێزكردنی پارتە سیاسییەكان دەدرێ. یەكێك لەو پێشنیارانە كە لەم پێوەندییەدا سەبارەت بە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هاتوەتە ئارا، پێكهێنانی پێوەندییەكی نزیكتر لە نێوان ئەندامانی كۆنگرەو پارتە سیاسییەكاندایە، بەم مانایە كە ئەندامانی كۆنگرە بە پێی بەستراوەیی حیزبی خۆیو پشت بەستن بە هەڵوێستەكانی حیزبی هەڵبژێردرێن. هەنووكە ئەندامانی كۆنگرە لە بەرانبەر پارتە سیاسییەكاندا سەربەخۆییان هەیە، چونكو پارتەكان لە دیاریكردنی كاندیداكانی بۆ هەڵبژاردن كونترۆڵێكی ئەوتۆیان نییە. لە ئاكامدا ئەندامانی پارلمان لەگەڵ گرووپە دەست ڕۆیشتووەكاندا پێوەندییەكی نزیكیان هەیەو زۆر پابەندی هەڵوێستە حیزبییەكان نین.

## پارتە سیاسییەكان

حیزب گرنگترین ڕێكخراوی سیاسی لە دێموكراسییەكانی هاوچەرخ دایە. بە بۆچوونی زۆر لە خاوەن بیران دێموكراسی شتێك بێجگە لە ركەبەری حیزبی نییە. هەڵبژاردن بە بێ مونافیسەی پارتەكان بێ مانایە. بەم پێیە حیزبیش بۆخۆی لەسەر چەمكی ركەبەری ڕاوەستاوە. تەنیا لە سیستمی دوو حیزبی یا چەند حیزبیدا مانای حیزبایەتی دەردەكەوێ، سیستمەكانی تاك پارتی سیستمگەلێكی مونافیسەییو دێموكراتیكن [لەوانەیە دێموكراتیك نین دروستتر بێ].

چەمكی حیزب بە مانای گرووپو تاقمی سیاسی، چەمكێكی لە ڕاستیدا مۆدێرنە كە لە ڕۆژئاوادا سەری هەڵدا. یەكەمین پارتە سیاسییەكان بە مانای دروستی وشەكە، لە سەرەتاكانی سەدەی نۆزدەهەم لە وڵاتە یەكگرتووەكاندا دەركەوتن. پاش ئەوە كە

دامەزراوە یاساییەکان سەقامگیریی تەواویان پەیدا کردو بەشی زۆری خەڵك مافی دەنگدانیان وەرگرت، تێکۆشانی پارتەکان پێویستیی پەیدا کرد. لە بریتانیا ریفۆرمی هەڵبژاردن لە ساڵەکانی ١٨٣٣و ١٨٦٨ دەرکەوتنی ئاشکرای پارتە سیاسییەکانی لە گۆڕەپانی سیاسەتی ئەو وڵاتەدا لێ کەوتەوە. پارتە مۆدێرنەکان تەنیا گرووپەکانی نێو پارلمان نەبوون، بەڵکوو لە دەرەوەی پارلمانیش رێکخراوو ئەندامیان هەبوو. بەو حاڵەش ریشەی زۆر لە حیزبەکان لە پارلماندا گوورا[گەشەی کرد]و پەرەسەندنی مافی دەنگدانی گشتی بواری بۆ تێکۆشانی ئەوان لە دەرەوەی پارلمان بەهێز کرد. هەندێك لە پارتەکانیش لە دەرەوەی پارلمان پێك هاتن‌و وەك گرووپگەلی دژ بە دەسەڵات خوازیاری بەشداری لە دەسەڵاتدا بوون. گرینگترین جۆری ئەم پارتانە، پارتە کرێکاری‌و سوسیالیستەکان بوونکە بۆخۆیان لە پەرەپێدانی مافی دەنگدانی گشتی‌دا نەخشیان بوە.

گرینگترین پێوەر بۆ پلەبەندیی پارتە سیاسییەکان، پێوەری ئایدولۆژییە کە لەسەر ئەو بناخانە پارتەکان لەڕاستی رادیکاڵەوە تا چەپی رادیکاڵ ریزبەندی دەکرێن. چەمکەکانی چەپ‌و راست ئاماژە بە دوو بابەتی سەرەکی دەکەن: یەکەم، پاراستن یان گۆڕان لە پێوەندیی ئابووری یان بە مانایەکی روونتر دەست تێوەرنەدان یان دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ژیانی ئابووری لە رووی پاراستن یان دابین کردنی عەداڵەتی کۆمەڵایەتی، دووهەم، جۆری ساختاری دەسەڵات‌و سیستمی سیاسی واتا سیستمی سیاسی دێموکراتیك یان دەسەڵاتخواز. لەو بارەوە پارتە سیاسییەکان بەسەر چوار تاقمی سیاسی‌دا دابەش دەبن:

١) پارتە سیاسییە چەپە دێموکراتەکان، وەك پارتە لیبراڵەکان‌و پارێزگاران‌و دێموکرات کریستانەکان

٢) پارتە سیاسییە چەپە دێموکراتەکان، وەك پارتە سوسیالیستەکانی دێموکرات‌و کرێکاری

٣) پارتە راستە دەسەڵاتخوازەکان، وەك پارتەکانی فاشیست‌و ناسیۆنالیست

٤) پارتە چەپە دەسەڵاتخوازەکان، وەك حیزبە کۆمۆنیستەکان

پارتە سیاسییەکان زۆر جار لە سێ لایەنەوە دەکەونە بەر دیراسە کردن: یەکێك حیزب بەو نەخشە کە لە مەیدانی حکوومەت‌و پارلماندا وەك کۆمەڵەیەك لە کاربەدەستانی گشتی دەردەکەوێ، دووهەم، حیزب بەو نەخشە کە لە دەرەوەی پارلمان وەك رێکخراوێك بۆ

خەباتی هەڵبژاردن دەردەکەوێو، سێهەم حیزب بەو نەخشو رۆڵە کە وەك کۆمەڵێك لە ئەندامانو لایەنگرانو دەنگدەران لە مەیدانی ناوچە هەڵبژاردنەکاندا دەیگێڕێ.

لە روانگەی یەکەم، یەکەم جار پارتە سیاسییەکان بە شێوەی گرووپو تاقمگەلی رێکخراوەیی لە پارلمان یا دەسەلاتی بەڕێوەبەریدا دەرکەوتن. لە زۆر لەو پارتانە کە وەها پێشینەیەکیان بووە، هێشتا بەشی پارلمانییەکەی حیزب، بەشی بە دەسەلاتو گرینگی پارتەکەیە. پارتە پارلمانییەکان وەك ئامرازێك بە مەبەستی رێکخستنی تێکۆشانی پارلمانتارەکانو پێك هێنانی کانالگەلی پێوەندیو زانیاری هەڵسوکەوتیان دەکرد. ئەرکی تایبەتی حیزب لە بواری بەڕێوەبەریدا بڕیاروەرگرتن سەبارەت بە سیاسەتەکانی حکوومەتی، بەڕێوەبردنی ئەو سیاسەتانەو دامەزراندنی کادرگەلی سیاسییە. دەسەلاتی بەڕێوەبەری لە حکوومەتی دیموکراسیدا بە بێ بوونی پارتەکان وێنا ناکرێ. پارتە سیاسییەکان بە شێوەیەکی روو لە گەشە جێی پارلمانەکانو کابینەکانی دەوڵەت لە بواری سیاسەتدا دەگرنەوە. بەرنامەو سیاسەتەکانی حکوومەتی زۆر جار بە هۆی کۆنوانسیۆنگەلی حیزبی دیاری دەکرێ. رادەی هاوبەستەیی ئەندامانی پارتێك لە ئاستی پارلمان لە سیستمە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازن. لە کۆنگرەی ئامریکادا یەکگرتوویی حیزبی لە دەنگداندا کەمتر لە زۆر پارلمانەکانی دیکەی ئورووپاییە. زۆر لە پارتەکان خاوەن جیناحبازیو مەیلی ئایدۆلۆژیی ناوخۆیین کە بەرگری لە یەکگرتوویی ئەوان دەکا. جیناح بەندییەکانی حیزبی زۆر جار روونو رێك خراوەو پشت بەستوو بە بەرژەوەندیی گرووپە جیاوازەکانە، لە کاتێکدا مەیلە حیزبییەکان بە زۆری، رێك نەخراوەو ئایدۆلۆژیکن.

تێکۆشانی پارتەکانی بەدەر لە گۆڕەپانی حکوومەتو پارلمان دیارە بە پێی پارتەکانو وڵاتەکان جۆراوجۆرن. پارتەکان لەم مەیدانەدا جۆری پێکهاتەیی جیاوازیان هەیە. ئەو پارتانە کە تێکەڵێکن لە نوێنەرانی پارلمانو هەندێك کەسانی نەناسراوو رێکخراوەو ئەندامەتی بەدەر لە پارلمانیان نیە، پێیان دەڵێن پارتەکانی "کادیر". ئەو پارتانە کە رێکخراوو ئەندامانی بەربلاویان لە دەرەوەی پارلمان هەیە، لە بەرانبەردا پارتی خەڵکیان پێ دەڵێن [توودەیی]. پارتە خەڵکییەکان زۆر جار هەوڵ دەدەن لە رێگای دامەزرانی ناوەندو سەنتەری جۆراوجۆری فەرهەنگی، ئایینی، فێرکاریو... ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەندامەکانی خۆیان رێكوپێك بکەن. پارتەکانی دیموکرات کریستیان، سوسیال

دێموکراتو کۆمۆنیست لە ئورووپادا زۆر جار لەو جۆرە ڕێکخراوو چالاکیانەیان هەیە. تێکۆشانی ئەو پارتانە کە لە بناخەدا لە دەرەوەی پارلمان دا دامەزرابوون، هەروەها بە شێوەی سەرەکی لە دەرەوەی پارلمان خڕ بوەتەوە. پارتەکانی کرێکاریو سوسیال دێموکرات زۆر جار لە ڕێگای یەکیەتیە کرێکارییەکان ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامان کۆ دەکەنەوە. یەکیەتیە کرێکارییەکانو ڕێکخراوەکانی هاوشێوەیان یارمەتییەکی بەربلاو لە رووی دابین کردنی زانیاری، فێرکاریو ورووژاندنی سیاسیو ... هتد بە پارتەکان دەکەن. جگە لەوانە لە زۆر بواردا ئەندامان حەقی ئەندامەتییەکی کەم دەدەن بە پارتەکە، هەرچەندە لەم دوایانەدا بە پەرەگرتنی دانی یارمەتیی گشتی بە پارتە سیاسییەکان، ڕۆڵی دارایی ئەندامانی دابەزیوە. پارتە خەڵکییە سیاسییەکان هەروەها پێویستیان بە تێکۆشانی حیزبی هەیە تا بتوانن لە بوارەکانی ڕێکخراوەییو ورووژاندنی خەڵکیو ... هەڵسوڕ بن. وەها کەسانی چالاک زۆرجار نەخشی هاندەری ماڵیو یان ئایدیۆلۆژیکیان لە تێکۆشانی خۆیاندا هەیە.

گرینگترین تێکۆشانی پارتەکان لە زەمینەی هەڵبژاردنو بەدەستهێنانی دەنگەکان دایە. کەسانی هەڵسوور لە رووی سیاسییەوە زۆر جار ناسنامەیەکی حیزبی بۆ خۆیان دادەنێنو سەبارەت بە پارتیەك لایەنگری لە خۆ نیشان دەدەنو هەست بە هاوپەیوەندی لەگەڵ دەکەنو هەر ئەم هەست بە هاوپەیوەندییە لەسەر هەڵسوکەوتی هەڵبژاردنو دەنگدانی تاکەکان کاریگەریی دەبێ. هۆکارگەلێکی جۆراوجۆر وەك بەستراوەیی چینایەتی، ئایینی، نەتەوەییو . . . هتد بە نۆرەی خۆیان کاریگەرییان لەسەر تێڕوانینی تاکەکان سەبارەت بە پارتەکان دەبێو دەبنە هۆی پێناسەی حیزبی. پارتە سیاسییەکان زۆر جار لە سەر بنەمای پێکهاتەی کەلێنە کۆمەڵایەتییەکان دەبنە خاوەن کەسایەتی. بە سیاسیبوونی کەلێنەکان دەبنە هۆی پێکهاتنی پارتەکانو پێناسەگەلی حیزبی لە دەوروبەری ئەوانەدا. لە مێژووی ئورووپادا دوو گۆڕانی سەرەکی بوونە هۆی پێکهاتنی کەلێنگەلی کۆمەڵایەتیو گوورانی [تکوین] پارتە سیاسییەکان لە دەوروبەری ئەوان، یەکەم، شۆڕشە نەتەوەیییەکانو دووهەم، شۆڕشی پیشەسازی. شۆڕشگەلی نەتەوەیی لە سەدەی شانزدەهەم بەولاوە بوە هۆی سەرهەڵدانی فەرهەنگو زمانگەلی جیا لە یەكو نەتەوەییو رووداني شەڕو کێشمەکێشی نێوان دەوڵەتو کەنیسە. لە زۆر لە

ولاتەکاندا پارتە سیاسییەکان لە دەوری ئەم کەلێنانە پێك هاتن. شۆڕشی پیشەسازی بووە هۆی سەرهەڵدانی کەلێنگەلی چینایەتیو درز لە نێوان ناوچە شاریەکانو گوندەکاندا کە بە نۆرەی خۆیان کاریگەریی زۆریان لە دامەزراندنی پارتەکاندا بووە. کۆی ئەم کەلێنانە لە گۆرانی [تکوین] ناسنامەی حیزبیی تاکەکان دا کاریگەریی بووەو سەرنج دان بە سەقامگیریو بەردەوامیی ئەو کەلێنانە، ناسنامەی حیزبیش بوەتە خاوەن سەقامگیریو بەردەوامی. لە سەدەی بیستەم دا سەرهەڵدانی کێشەی نوێ وەك هەست بە مەترسیکردنی بەرپرسانو کاربەدەستانو دامەزراوە کەنیسەییەکانو ئایینی لە بەرانبەر پەرەگرتنی فەرهەنگی نوێ، بەهێزبوونی هەستی نەتەوایەتیو ناوچەیی، پەرەسەندنی کۆچبەری نێونەتەوەییو کێشەکانی ژینگەیی، بوەتە هۆی سەرهەڵدانی پارتەکانی ئایینیو نەتەوەیی نوێو هەروەها پارتەکانی دژی کۆچبەریو "پارتە سەوزەکان".

تاقمێکی دیکە لە نووسەران، سەرهەڵدانی پارتەکان لە مێژوودا بە دەرئەنجامی روودانی "قەیرانگەلی گەشەکردن"و هەوڵ دان بۆ وەڵامدانەوە بەوانە دەزانن. قەیرانگەلی پێناسە [هویت]، رەوایی، بەشداریو دابەشکردنی ئابووری دەبنە هۆی پێکهاتنی کەشو هەواو فەزای ئایدۆلۆژیكو پارتەکان ئەم فەزاگەلە پڕ دەکەنەوە. کەوابوو لە مێژوودا، حیزبەکانی ئایینیو لائیك یان سکولار لە دەور قەیرانی پێناسە [Idenlity] پارتەکانی کۆماریخوازو مەلەکی لە دەور قەیرانی رەوایی، پارتەکانی پارێزگارو لیبراڵ لە دەور قەیرانی بەشداریو پارتەکانی سیوسیالیستو کۆمۆنیست لە دەور قەیرانی دابەشکرانی ئابووری پێك هاتن. پارلمانەکانیش کە لە کانگا سەرەکییەکانی پێکهاتنی پارتە سیاسییەکان بوون، وەڵامێکن بۆ قەیرانی رەوایی.

## سیستمگەلی حیزبی

کۆمەڵەی پارتگەلێك کە لە هەڵبژاردندا بەشداری دەکەنو دەچنە نێو پارلمانو دەوڵەت بەدەستەوە دەگرن، سیستمی حیزبی یەك وڵات پێك دێنن. لە پرۆسەی بە دێموکراسی بووندا زۆر جار ژمارەیەکی زۆر لە پارتە بچووکەکان سەر هەڵ دەدەنو ئەگەر دێموکراسی سەقامگیر بوو، ئەو پارتانە لە نێو سیستمی روونترو سەقامگرتووتردا رێك دەخرێن، هەروەك پێشتریش ئاماژەی پێ کرا، تەنیا هەر سیستمگەلی حیزبی مونافیسەیی، بە

دێموکراتیك دەژمێردرێن. سیستمی تـەك حیزبیو نامونافیسەیی ناتوانێ ببێ بە بناخـەی دێموکراسی. لە ریزبەندیی سیستمگەلی حیزبیدا چەند هۆکار دەبێ لەبەرچاو بگیردرێ:

یەکـەم، ژمـارەی پارتـەکان، دووهـەم، رێـژەو پانتـایی ئەوانـە لـە رووی پـشتیوانیی دەنگدەرانو بوونیان لە پارلمانو دەولـەت دا، سـێهەم، ئـەوەرە سـەرەکییەکانی رکەبـەریی نێوان پارتەکان، چوارەم کەلێنە کۆمەلایەتییـەکان کـە ژێرخـانی پارتـەکان پێـك دێـنن‌و، پێنجەم، سەقامگیریو خۆراگری لە شێوەگەلی دەنگدان دا.

ژمارەی پارتەکان ساکارترین پێوەربۆ ریزبەندیی جۆرەکانی سیستمی حیزبییە. لە نێوان ژمارەی پارتەکانو زۆر لە تایبەتمەندییەکانی سیستمی حیزبی، پێوەنـدی هەیە. پارتـەکان لە رووی سیستمی حیزبییەوە بە تاك حیزبی، دوو حیزبیو چەند حیزبی دابـەش دەکـرێن. هـەروەك ئامارەی پـێ کرا، سیستمی تاك حیزبی بـەهۆی ئـەو جیاوازیانـە کـە لـە رووی بنەماکانی ئایدۆلۆژیکیو پێکهاتەی دەسەلات لەگەڵ سیستمەکانی دێموکراسـی هەیانـە، لـەگەڵ سیستمەکانی دوو حیزبیو چەند حیزبی بۆ هەلسەنگاندن نابن. لـە سیـستمە تـاك حیزبییەکاندا هەرچەند لەوانەیە بەشدارییـەکی بـەربلاوی سیاسـیش بـوونی هـەبێ، بـەلام نیشانەی گرینگیی دێموکراسی واتا رکـەبەری بوونی نیە. لـە تاقمێك لـە سیستمە تـاك حیزبییەکاندان هـەر یـەك پـارتی لـە رووی یاسـاییەوە ئیزنـی تێکۆشـانی پـێ دەدرێو رکەبـەرەکان یـان وەلا دەنـرێن یـان سـەرکوت دەکـرێن. لـە هەنـدێکی دیکـەدا، پارتـە رکـەبەرەکان لە رووی یاساییەوە ئیزنی تێکۆشانیان هەیە، بەلام بـە کردەوە دەرفەتێکیان پـێ نادرێ، لە بـەر ئەوەی یەك پارتی بـە سەر ژیانی سیاسیدا سەیتەرەی تەواوی هەیـە. بارودۆخێکی دیکە ئەوەیە کە پارتە رکەبەرەکان هەم یاساییو هەم بە کـردەوە دەرەتـانی رکەبەریو تێکۆشانیان هەیە، بەلام تاکە حیزبێکی دیار لە کردەوەدا سەردەکەوێو هەموو کات دەسەلاتی سیاسی دەگرێتـە دەستی خـۆی. پـارتی کـۆنگرە لـە هیندوسـتانو پـارتی سوسیال دێموکرات لە سوئێد [لـە هەلبژاردنی سـالی ٢٠٠٦دا پـاش دەیـان سـال پـارتی سوسیال دێموکرات لە هەلبژاردنی پارلمانیدا شکستی هێنا] ماوەیـەکی یـەکجار زۆر وەك حیزبی زال دەسەلاتیان لە دەست خۆیاندا راگرتبوو. سیستمی تاکە حیزبیی زال بـەم شـێوە ناکرێ ناوی نادێموکراتیکی لەسەر دابنرێ.

لە سەر یەك سیستەمە تاك حیزبییەكان بە مەبەستی پێكهێنانی یەكیەتیو پێشگیری لە ركەبەری لە نێوان هێزە سیاسییەكان لە هەلومەرجی قەیرانیدا دادەمەزرێن. تاقمێك لە لایەنگرانی سیستمی تاك حیزبی بەلگەیان هێناوەتەوە كە سیستمی سیاسیی دلخواز زیاتر وەك بنەماڵە وایە تا وەك كۆمەلگای مەدەنی، بۆیە سیستمی تاك حیزبی، سیستمێكی سروشتییە.

سیستمە دوو حیزبییەكان لە وڵاتانی ئانگلوساكسوندا بە دەسەڵاتن. زۆر جار چوار تایبەتمەندیی سەرەكی بۆ ئەم جۆرە سیستمانە بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ سیستمە فرەحیزبییەكاندا نا دەبەن: نەرمكێشی لە سیاسەتدانان دا، سەقامگیریی سیاسی، هەڵبژاردنی روونو ئاشكراو بەرپرسایەتی وەئەستۆگرتنی شەفاف، نەرمكێشیو میانەڕەوی لە سیاسەتداناندا لەوە سەرچاوە دەگرێ كە هەر دوو پارتی بە مەبەستی سەركەوتن لە هەڵبژاردندا دەستەو دامێنی دەنگدەرانی میانەڕەو یان نزیك بە میانە دەبن. لەبەر ئەوەی كە لە سیستمگەلی دوو حیزبی پارلمانی، هەموو كات یەك حیزب زۆرینەی پارلمانی لە دەست دایە، دەوڵەت لە دەست حیزبی زۆرینە دایە. وەها دەوڵەتگەلێك لە بناخەدا سەقامگرتووتر لە دەوڵەتە كەمینەكان یان ئیئتیلافین. بەرپرسایەتیش راستەوخۆو شەفاف رووی لە پارتی زۆرینەیە.

هەروەك لە بەشی سیستمەكانی هەڵبژاردن دا دەیبینین، ناوەرۆكی سیستمی هەڵبژاردن لەسەر ژمارەی پارتەكان كاریگەری دادەنێ. لە نێوان سیستمی دوو حیزبیو سیستمی هەڵبژاردنی زۆرینەیی، پێوەندییەكی تارادەیەك مانادار دۆزراوەتەوە. لە بەر ئەوەی ژمارەی ئەو كاندیدایانە كە لە ناوچەی هەڵبژاردنەوە هەڵدەبژێردرێن، لەم نێوەدا كاریگەرە. لە سیستمی هەڵبژاردنی زۆرینەییو پشت بەستوو لە سەر ناوچەی تاك نوێنەری، زۆر جار دوو پارتی سەرەكی دەسەڵات بە دەست دێنن، لە بەر ئەوەی سەركەوتن بۆ پارتە بچووكەكان زۆر دژوارە. لە ئاكامدا، بە شێوەی گشتی دوو حیزب دەچنە پارلمانو پارتەكانی دیكە لە ئاستی هێزی خۆیاندا نوێنەریان دەست ناكەوێ. لە لایەكی دیكەوە ئەگەر تەواوی وڵات وەك یەكەیەكی هەڵبژاردن بێ، بچووكترین پارتەكانیش دەتوانن نوێنەرانێك بە دەست بێنن. لە ئاكامدا ژمارەی پارتەكان زیاد دەكەن. زۆر لە سیستمەكانی هەڵبژاردن كە هەر ناوچەیەك چەند نوێنەری هەبێ، بۆ

دابەش کردنی کورسیەکانی هەر ناوچەیەك لە نێوان پارتەکاندا، لە شێوەی نوێنەرایەتیی ڕێژەیی کەڵك وەردەگرن.

لە لایەکی دیکەوە سیستمگەلی دوو حیزبی، زۆر جار لە وڵاتگەلێك دا پەیدا دەبن کە لە ڕووی پێکهاتەی کەلێنە کۆمەڵایەتییەکان ساکارترن، واتا زۆر جار خاوەن کەلێنێکی گەورەی چالاك و کەلێنەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی لەواندا، ناچالاك و بێ دەنگن. بە پێچەوانە بەو ڕادەیە کە پێکهاتەی کەلێنە کۆمەڵایەتییەکان جۆراوجۆرو ئالۆزتر بێ، ژمارەی پارتەکان زیاتر دەبێ. یەکتر بڕینی کەلێنە چینایەتییەکانی ئایینی، قەومی و . . . هتد، ژمارەی ناوچەکانی ئەمەکناسیی سیاسی و هەروەها ژمارەی پارتەکان دەباتە سەر. لە نێوان سیستمەکانی چەند حیزبیش دا دەکرێ جیاوازی دابنرێ. دەستەیەك لە نووسەران لە دوو بێچمی سیستمی چەند حیزبی باسیان کردوە، یەکەم سیستمی چەند حیزبی میانە کە لەودا ژمارەی پارتە چالاکەکان نێوان سێ تا پێنج لە کەم و زیاد دان [لەرنووسسان]، ئەوی دیکە سیستمی چەند حیزبی ڕادیکاڵی کە لەواندا پتر لە پێنج حیزبی چالاك و سەرەکی بوونیان هەیە. لە سیستمگەلی میانەدا تەیاری ئایدۆلۆژی بەرتەسکترو مەیلی دەنگدەران بۆلای پارتەکانی میانە زیادترە. لەم سیستمانەدا دەوڵەت لە ئیئتیلافی دوو یان چەند حیزب پێك دێ و بەشێوەی گشتی دوو کۆمەڵگەی [بلووك] ڕکەبەر لە بەرانبەر یەکتردا ڕادەوەستن. سیستمی چەند حیزبی میانە لە وڵاتانێك وەك ئاڵمان، وڵاتانی سکاندیناوی، بلژیك و سویس جێی گرتوە.

تایبەتمەندییەکانی سیستمەگەلی چەند حیزبی ڕادیکاڵ، بوونی پارتەکانی دژی ڕێژیم، تەیاری ئایدئۆلۆژی بەربلاوتر لە ڕاستی ڕادیکاڵ تا چەپی ڕادیکاڵ، بوونی ئۆپۆزیسیۆنی "ئەمەك نەناس" و ناسەقامگیریی سیاسی ڕێژەییە. گرینگترین تایبەتمەندی "بە جەمسەر بوون" واتا جیاوازی ئایدئۆلۆژیکی بەرچاو لە نێوان پارتەکان دایە.

پێوەری دووهەم، قورسایی و بایەخی پارتەکان لە ڕووی پشتیوانیی هەڵبژاردنی، بوون لە دەوڵەت و پارلمان، توانایی پێکهێنانی حکوومەتی ئیئتیلافی و ... هتد. کەوابوو ژمارە بە تەنیا بەس نیەو ناتوانرێ بە هەموو پارتەکان قورساییەکی یەکسان بدرێ، بەڵکوو دەبێ پارتگەلێکی چالاك و گرینگ و سەرەکی کە لە ڕووی سیاسییەوە نەخشی یەکلا کەرەوەیان هەیە، لە بەر چاو بگیردرێن. هەندێك دیراسەی سەرەتایی بوونی ٥ تا ١٠ لە

سەدی دەنگەکانی گشتی وەك پێوەر بۆ قورسایی گرینگی حیزبەکان دادەنێن. ئەم پێوەرانە کەوتوونەتە بەر رەخنەی تاقمێك لە خاوەن بیرەکان، لە بەر ئەوەی کە هێندێك لە پارتە بچووکەکان بەڵام یەکلا کەرەوە لە ئیئتیلافەکاندا لە بەر چاو ناگیرێن. بۆیە توانایی بوون لە دەوڵەتی ئیئتیلافیو یان توانایی "بە زۆر داوای بەش کردن" [Tribute] وەك پێوەری قورساییو بایەخی پارتەکان خراونەتە بەر دەست. لانیکەم بەشداری لە وتووێژەکاندا بۆ پێکهێنانی حکوومەت پێوەرە بۆ بایەخو گرینگیی پارتەکان. هەر چۆنێك بێ وەها پێوەرگەلێك ئەوە دەگەیەنێ کە پارتەکانی جێی باس، پێگەیەکی سیاسیی لەبار یان گرینگیان بۆ پێکهێنانی حکوومەت یان ئیئتیلافی حیزبی هەیە. مەبەست "بە زۆر داوای بەش کردن" [باج خواهی ـ Tribute] ئەوەیە کە پارتییەك بتوانێ لە سەر رەوتی پێکهاتنی ئیئتیلافو یان ستراتیژیی وتووێژی باقیی پارتەکانی دیکە کاریگەری هەبێ، بە بێ ئەوەی بۆ خۆی لە وتووێژەکانی تایبەت بە ئیئتیلافدا بەشدار بێت. بۆ نموونە حیزبە کۆمۆنیستەکانی دژ لە رابردوودا لە بەشێك لە وڵاتانی ئورووپایی وەها قورساییەکیان هەبوو.

تەوەرەکانی رکەبەری لە نێوان پارتەکاندا کاریگەریی لەسەر ریزبەندی سیستمی حیزبی دەبێ. ئەو هەڵوێستانە کە پارتەکان لە بەرنامەی چالاکی هەڵبژاردنەکاندا وەریدەگرن، لە بەشێك لە وڵاتەکاندا بە شێوەی سەرەکی مەیلی بۆ لای کێشەی دەست تێوەردان یان دەست تێوەرنەدانی دەوڵەت لە ئابووری، ئاوسان، باجو ... هتد کە دەبێتە هۆی پێکهاتنی گرووپی پارتەکانی چەپو راست بە شێوەی کۆن. لە وڵاتگەلێکی دیکەدا کە بۆ نموونە کێشەی پێوەندیی ئاینو دەوڵەت گرینگە، ریزبەندی سیستمی حیزبیی دیار جۆرێکی دیکە دەبێ. سەرهەڵدانی کێشەگەلێکی نوێ وەك پشتیوانی لە مافی ژنانو کەمایەتییەکان، پیسیی ژینگە، کۆچبەری نێونەتەوەییو ... هتد، لە سەر ریزبەندیی سیستمەکانی حیزبی کاریگەری دادەنێ. لە سەرەتادا بزووتنەوەگەلێکی کۆمەڵایەتیی نوێ وەك بزووتنەوەی ژینگەپارێزی، چەك داماڵینو ... هتد بەدەر لە چوارچێوەی پارتە سیاسییەکانی جێگرتوو، هاتنە کایەوەو دەستیان بە تێکۆشان کرد. دواتر زۆر لە پارتەکانی سیاسی لە بەر ئەوە لە رەوتی گۆڕانکارییەکان بەجێ نەمێنن، هەڵوێستی

پێویستیان سەبارەت بەو بزووتنەوانە کە ناومان بـردن، وەرگـرتو کەوتنـە هاوکـاری لـە گەڵیان.

لـە لایەنگری تاکەکانیش لـە پارتـەکان، هـەم هۆکارگـەلێکی پێکهاتـەییو کـۆن وەك نەتەوەییبوون، ئایینو مەیلی چینایەتی کاریگەرن، هەم ئـۆگری کێـشەگەلێکی نـوێ کـە لـەگەڵ گۆڕانکارییەکانی تکنیکیو ئابووری سەر هەڵ دەدەن. کەلێنە کۆنەکانی ناوەنـدو دەوروبەرن شارو گوند، دەوڵەتو کەنیسەو چینە بالادەستو پایین دەستەکان هەروەها لـە سەر لایەنگری لە هەڵبژاردنەکاندا لە لایەن تاکەکانەوە کاریگـەرنو بـەو پێیـە کـە چـۆن تێکەڵ بنو بە چ جۆرێك ریزبەندیی تایبەت بە خۆوە بگرن، لـە سـەر سیـستمی حیـزبیش کاریگەری دادەنـێن. لـــە وڵاتگـەلی ئەنگلوساکـسون گـرینگترین کـەلێن هـەر کـەلێنی چینایەتییە، لـە کاتێکدا لە دێموکراسییەکانی دیکەدا کەلێنی ئایینو دەوڵەتو ناوەنـدو دەوروبەر هەروا چالاکنو لەسەر ریزبەندیی حیزبی کاریگەریی حاشاهەڵنەگری هەیە. لـــە گەڵ ئەمــەش لـــە دێموکراسییەکانی رۆژئاوایی‌دا کەلێنـەکانی چینایەتی، گـرینگترین کەلێنی کاریگەر لـە سەر هەڵوێستەکانی هەڵبژاردنو ریزبەندیی سیستمەکانی حیزبییـەو بۆیە دەکرێ بوترێ کە گـۆڕانی سـەرەکی لـە شـێوەی دەنگـدان دا لـە دێموکراسـییەکانی رۆژئاوایی‌دا رووی نەداوە. بەو جـۆرەش نەخشی هۆکارەکانی تەمەنو رەگـەز بـە رواڵـەت چالاکتر بوون. پارتە نوێیەکان وەك پارتە سەوزەکان زۆر جـار پشتیوانی لـێ‌کردنیان لـە لایەن بەرەی نوێو لاوەکانەوە بووە، لـە کاتێکدا کـە پارتـە سـەقامگرتووەکان زیـاتر لـە لایـەن گرووپـەکانی بەساڵداچـووو بـــەتەمەن پـشتیوانی‌یان لـــێ دەکـرێ. هـــەروەها هەرووژاندنی سیاسیی ژنان، گۆڕانکارییـەکی بەرچـاوی لـە شـێوەی دەنگدانەکانـدا پێـك هێناوە. بە پێچەوانەی رابردوو وا دێتە بەرچـاو ئێـستا ژنـەکان زیـاتر روویـان لـە پارتـە چەپەکانەو گۆڕانکاریی بەرچاویش لـە شـێوەی دەنگـدانی بەشـە نێوخۆییـەکانی چینـی کرێکاریش دەبینرێ. کرێکارەکانی کەرتی گشتی [دەوڵەتی] کـە کـەمتر لـــە کرێکـارانی کەرتی تایبەت دەکەونە بەر فشاری رکەبەری بازاڕ، زیاتر دەنگ بە پارتەکانی میانـەڕەوو راست دەدەن. پەرەسەندنی نەبەستراوەیی هاووڵاتـیان بە حیزبگـەلی تایبـەت بـــە شـێوەی موستەمەڕو وەرچەرخان لە حیزبێك بۆ حیزبێکی دیکـە لـە هەڵبژاردنەکانـدا یـەکێك لـە دیاردەکانی جێی سەرنجی ئەم دوایانەیە.

## سیستمگەلی هەڵبژاردن

سیستمو ڕێژەی هەڵبژاردن، سیستمێکە کە دەنگەکان دەگۆڕێ بە پۆستو مەنسەبی سیاسی. گرینگترین لایەنەکانی بابەتی سیستمەکانی هەڵبژاردن بریتین لە: نموونە [Formule] هەڵبژاردن (سیستمی زۆرینەی ساکار، زۆرینەی رەها، نوێنەرایەتیی ڕێژەیی)، قورسایی لە رووی ژمارەیی ناوچەکانی هەڵبژاردن (ژمارەی نوێنەرانی هەر ناوچەیەك)، رادەو ئاستی پێویست [حد نصاب Quorum] بۆ هەڵبژاردن (لانیکەمی پشتیوانی کە هەر پارتێك دەبێ بۆ بەدەستهێنانی نوێنەر لێی بکرێ)و پێکهاتەی دەنگدان (دەرەتانی دەنگدان بە زیاتر لە حیزبێك لە هەڵبژاردنەکاندا). بابەتگەلێکی دیکە وەك هەلومەرجی بەدەستهێنانی دەنگدان، شێوەکانی باو لە خۆ کاندیداکردندا، ڕێوشوێنی زاڵ بەسەر مەسرووفاتی خەبات بۆ هەڵبژاردن، ماوەی بە دەستەوەگرتنی مەنسەبو پۆستو ... هتد، بە وردی هەموویان جێی باسی چالاکییەکانی هەڵبژاردنن. هەروەك باس کرا سیستمی هەڵبژاردن لەگەڵ شێوەی گۆڕینی دەنگەکان بە کورسیەکان ڕووبەڕوویە. سیستمەکانی هەڵبژاردن لە دیموکراسییەکاندا بایەخێکی تایبەتیان هەیە، چوونکوو لە دەست نیشان کردنی ئاکامی هەڵبژاردنەکان، ناوەڕۆکی سیستمی حیزبی، ژمارەی پارتە سەرەکییەکان، تاك حیزبی یان ئیئتیلافی بوونی کابینەکانو پتەویی نێوخۆیی پارتە سیاسییەکاندا زۆر کاریگەرن، بە جۆرێك کە بە گۆڕانکاری لە سیستمی هەلبژاردندا دەکرێ گۆڕانی بنەڕەتی لە دیموکراسییەکاندا پێك بهێنرێ.

گرینگترین شێوەی سیستمەکانی هەڵبژاردن شێوەی زۆرینەیی، نوێنەرایەتیی ڕێژەییو نوێنەرایەتیی نیوە ڕێژەییە. لە سیستمی زۆرینەییدا دەکرێ بۆ هەڵبژاردنی سەرکۆمارو نوێنەرانی پارلمان کەڵك وەربگیردرێ. لە هەڵبژاردنەکانی پارلمانیدا لەوانەیە ناوچەکانی هەڵبژاردن یەك نوێنەری یان یەك کورسی یان چەند نوێنەریو یان چەند کورسی بن. ساکارترین بارودۆخ ئەوەیە هەڵبژاردنی یەك نوێنەر (بەڕێوەبەریی یان یاسادانەر) لە ناوچەی تاك نوێنەرییە. لە نێو شێوەکانی زۆرینەیی جۆراوجۆر، سیستمی زۆرینەیی ساکار یان زۆرینەیی ڕێژەیی زۆر باوە. لەم سیستمەدا هەر پاڵێوراوێك زۆرترین دەنگی هێنا، سەر دەکەوێ. کەوابوو زۆرینەی رەها واتا نیوە زاید یەك [نیوە + ١] بۆ سەرکەوتن

پێویست ناکا. ئەم سیستمە لە روانگەی زۆر لە لایەنگرانی دیموکراسیەوە نەخوازراوە، لە بەر ئەوەی بە پێچەوانەی "ڕێوشوێنی ئالتونی زۆرینە" لە دیموکراسی دایەو بە پێی ئەو لەوانەیە کەسێك هەڵبژێردرێت کە زۆرینە دەنگی پێ نەدابێ. لەم روانگەوە سەرکۆمارێك کە کەمتر لە زۆرینەی دەنگەکان بۆ نموونە ۳۰ لە سەدی دەنگەکانی بەدەست هێنابێ، لە رەوایی پێویست بێبەشە. بە مەبەستی دەستەبەرکردنی زۆرینەی رەهای دەنگەکان بۆ سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکاندا فورمەلگەلێکی [Formule] جۆراجۆر خراوەتە ئاراوە. ساکارترینیان ئەمەیە کە هەڵبژاردن ئەوەندە دووپات بکرێتەوە تا یەکێك لە پاڵێوراوەکان زۆرینەی رەها بەدەست دێنێ. بەڵام ئەم شێوە بۆ هەڵبژاردنی گشتی پڕ مەسرەفو نامومکینە. بۆیە ژمارەی هەڵبژاردنەکان لە فورمولێکی دیکەدا لە دوو قۆناخ دا بەرتەسك کراوەتەوە کە بۆخۆی دوو شێوەی جیا لە یەکی هەیە:

یەکەم، شێوەیەکی تێکەڵ لە زۆرینەی ڕێژەییو زۆرینەیی رەها، ئەوی دیکە شێوەی زۆرینەی رەها خولی دووهەم. لە شێوەی یەکەم لە خولی یەکەمی هەڵبژاردندا دەبێ زۆرینەی رەها بێتە دەست، ئەگەر زۆرینە دەست هیچ کەس نەکەوت، لە خولی دووهەمی هەڵبژاردندا، ئەو کەسەی زۆرینەی ڕێژەیی بەدەست بێنێ، سەرکەوتووە. دیارە ئەنجامی ئەم شێوە، دەنگدەرانێك کە نایانهەوێ دەنگەکانیان بە فیڕۆ بچێ، دەنگ بە پاڵێوراوە گرینگەکان دەدەن. هەروەها زۆر لە پاڵێوراوە لاوازەکان لە خولی یەکەم دا، لە خولی دووهەم دا بەشدار ناکەنو پاشگەز دەبنەوە یان ئەگەر ڕێژەیەکی [حد نصاب Quorum] بۆ دەنگهێنان لە خولی یەکەم دا دیاری بکرێ، لە بەشداری لە خولی دووهەمدا رێگەیان پێ نادرێ. لە شێوەی دووهەمدا تەنیا ئەو دوو پاڵێوراوە کە زۆرترین دەنگیان هێناوە، دەمێننەوەو ماباقی وەلا دەنرێن. خولی دووهەم کاتێك بەڕێوە دەچێ کە لە خولی یەکەم دا هیچکام لە پاڵێوارووەکان زۆرینەی رەهایان بەدەست نەهێنابێ. دیارە لەم شێوەدا لەوانەیە پاڵێوراوگەلێکی تارادەیەك بەهێزیش بە سانایی وەلا بنرێن.

یەکێکی دیکە لە شێوەکانی زۆرینەیی، شێوەی لە جێدانانی دەنگەکان لە هەڵبژاردنی یەك خولی دایە. لەم شێوەدا دەنگدەران پاڵێوراوە بە پێی بە چاك زانین ریز دەکەن. لە قوناخی یەکەمی ژمارە کردنی دەنگەکان تەنیا هەڵبژاردەی یەکەم لە بەر چاو دەگیرێن. ئەگەر پاڵێوراوێك زۆرینەی رەهای دەنگەکانی بەدەست هێنا، سەر دەکەوێ، دەنا ئەگەر وا

نەبوو، پالێوراوێك كە كەمترین بە چاك زانینی [ترجیح]ی هێنابێ، وەلا دەنرێ‌و دەنگەكانی وەك هەڵبژاردەی یەكەم نێوان پالێوراوەكان بە پێی تەرجیحاتی دووهەم دابەش دەكرێ. ئەم رەوتە درێژە دەكێشێ تا ئەو كاتە كە یەكێك لە پالێوراوەكان زۆرینەی دەنگەكان بەدەست بێنێ. بۆ نموونە ئەگەر چوار كاندیدای الف، ب، ج‌و د بە شوێن یەكدا ٤٠، ٣٠، ٢٠و ١٠ لە سەدی لە بە چاك زانینەكانی یەكەمیان [ترجیح] بەدەست هێنابێ. لە رەوتی لە جێ دانان، سەرەتا پالێوراوی د وەلا دەنرێ‌و دەنگەكان بە پێی تەرجیجاتی دووهەم دابەش دەكرێن. بۆ نموونە ئەگەر نیوەی لەم تەرجیحاتەی دووهەم بەر ب‌و نیوەی بەر ج بكەوێ، ئەوكات الف، ب‌و ج بە شوێن یەكدا دەبن بە خاوەن ٤٠و ٣٥و ٢٥ لە سەدی دەنگەكان لە قوناخی دوایی ج وەلا دەنرێ دەنگەكانی بە پێی تەرجیحات نێوان باقیی پالێوراوەكان دابەش دەبێ تا دەرئەنجام پالێوراوی خاوەن زۆرینە دەردەكەوێ.

یەكێكی دیكە لە شێوەكانی زۆرینەیی، تێكەڵكردنی شێوەی زۆرینەی ساكار لەگەڵ شێوەی هەڵبژاردەی یەكەمین لە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە. شێوەی باو لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران لە ئەمریكا، بەشداریی نوێنەران لە هەڵبژاردنی بەراییەكە كە بە پێی شێوەی زۆرینەی ساكار كاندیداكانی حیزب دەست نیشان دەكرێن، بەڵام كاندیداكانی دوو حیزبی سەرەكی لە هەڵبژاردنی گشتیدا كە بە شێوەی زۆرینەی ساكار بەرێوە دەچێ، دەستی باڵایان هەیە [غلبە دارند]. بەم شێوە وەها هەڵبژاردنێكی دوو قوناخی، ئەگەری بەدەست هێنانی زۆرینەی رەها بەهۆی كاندیداكانی حیزبی دەباتە سەر. رێوشوێنی زۆرینەی ساكار لە هەڵبژاردنی گشتیدا بە كردەوەی درێژكێشانی سیستمی دوو حیزبی یارمەتی دەداو سیستمی هەڵبژاردنی بەراییش [لە نێو كاندیداكانی هەر كام لە حیزبەكان] پالێوراوە جۆراوجۆرەكان هان دەدا لە جیاتی خۆبەستن بە پارتە بچووكەكان، لە هەڵبژاردنی سەرەتایی دوو حیزبەكەدا بەشداری بكەن.

شێوازێكی دیكەی زۆرینەیی كە لە هەندێك لە ولاتانی ئەمریكای لاتین دا باوە، "شێوەی دەنگدانی دوو فاقی هاوكاتە" كە لەودا پالێوراوی سەركەوتوو، دەبێتە پالێوراوی پارتی سەركەوتوو واتا پارتییەك كە كاندیداكانی لەسەریەك زۆرترین دەنگیان بەدەست هێناوە، ئەو بۆ خۆیشی لە پالێوراوەكانی دیكەی حیزبەكەی خۆی دەنگی زۆرتری هێنابێ. بۆ نموونە ئەگەر پالێوراوەكانی الف‌و ب لە حیزبی یەكەم ٣٠و ٢٥ لە سەدیان بە شوێن یەكدا هێنابێ‌و، ج‌و د

له پارتی دووهەم بە شوێن یەکدا ٣٠و ١٠ له سەدیان بەدەست هێنابێ، پارتی یەکەم لەبەر ئەوەی لەسەر یەك ٥٥ لە سەدی دەنگەکانی بەدەست هێناوە، سەرکەوتوەو پاڵێوراوی ألف وەك بەهێزترین پاڵێوراوی ئەو حیزبە سەر دەکەوێ، هەرچەند ژمارەی دەنگەکانی ئەو کەمتر لە دەنگەکانی پاڵێوراوی ج لە پارتی دوو هەیە.

بە شێوەی گشتی شێوازی زۆرینەیی بە قازانجی حیزبە گەورەکان تەواو دەبێو هەروەها سیستمی دوو حیزبی بەهێز دەکا، چوونکو کاندیداکانی پارتە بچووکەکان لە ناوچەکانی تاك نوێنەری شانسێکی ئەوتۆیان بۆ سەرکەوتن نیە. بۆیە هەڵبژاردن بە شێوەی زۆرینەیی دەبێتە هۆی نەبوونی هاوسەنگیی نێوان ژمارەی دەنگەکانو ژمارەی کورسییەکانی بەدەست هاتوە. بۆ نموونە لە چوار هەڵبژاردنی پارلمانی لە بریتانیا لە ساڵی ١٩٧٩ تا ١٩٩٢ حیزبی پارێزگاران بە شێوەی نێونجی٤٢/٦ لە سەدی دەنگەکانی بەدەست هێناوە، بەڵام ٥٦ لە سەدی کورسیەکانی پارلمانی بە نسیب بووە. پارتی کرێکار ٣٢/٤ لە سەدی دەنگەکانی لەگەڵ ٣٧/٨ لە سەدی کورسیەکانی پێ براوە. بەڵام پارتی سێهەم واتا لیبراڵ دێموکرات ١٩/٩ لە سەدی دەنگەکانی هێناوەو تەنیا ٢/٩ لە سەدی کورسیەکانی پێ براوە.

یەکێك لە هۆکارەکانی هەڵبژاردنی شێوەی نوێنەرایەتی رێژەیی لە لایەن زۆر لە وڵاتەکانەوە بۆ پێشگیری لە وەها ناهاوسەنگییەکە. هەر چۆنێك بێ ئەم شێوە تەنیا سەبارەت بە هەڵبژاردنی دامەزراوەکانی زۆر ئەندام وەك پارلمان بۆ بەڕێوەبردن دەبێو بۆ خۆی لە دوو شێوازدا جێبەجێ دەبێ: یەکەم، شێوازی هەڵبژاردنی نێوان لیستەکانی حیزبیو ئەوی دیکە، هەڵبژاردنی نێوان پاڵێوراوەکان لە رێی دیاریکردنی ئەولەویاتو تەرجیحاتەوە. سیستمی نوێنەرایەتیی رێژەیی لە سەدەی نۆزدەهەم پێك هاتو لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم دا لە لایەن زۆر لە وڵاتانی ئورووپایی کە شێوازی زۆرینەییان بەکار دێنا، بەکاریان هێناو ئێستا باوترین شێوازی هەڵبژاردنە سەبارەت بە پارلمانەکان. شێوازی زۆرینەیی بەگشتی لە بریتانیاو ئەو وڵاتانەدا کە لە ژێر سەیتەرەی ئەودا بوون، باوە (واتا لە ئەمریکا، کانادا، ئوسترالیا، نیوزیلەند، هیند، مالزیو ... هتد). لە نێو ئەو وڵاتانەدا کە بەستراوەیی نەریتی "ئانگلوساکسون"ن، لە هەر شوێنو لە هەر بابەتێك هەڵبژاردنێکی تایبەتی نوێنەرایەتیی رێژەیی بەرێوە دەچێ، جۆری دووەمەکەی بەرێوە دەچێ. سیستمی هەڵبژاردنی باو لە دێموکراسییەکانی دیکەدا، نوێنەرایەتیی رێژەیی لە بێچمی یەکەم (لیستەی

پاڵێوراوەکان)ـە. لە سیستمی نوێنەرایەتیی ڕێژەییدا هەرچی ژمارەی کاندیداکانی شیاو بۆ هەڵبژاردن زۆرتر بن، دەرەتانی بەدەست هێنانی کورسی بەهۆی پارتە بچووکترەکانەوە زیاترە. بە پێچەوانە ناوچەی هەڵبژاردنی بۆ نوێنەرانی کەمتر، کورسییەك بۆ پارتە بچووکەکان پێك دێنن، لەبەر ئەوەی پێکهێنانی هاوسەنگیی نێوان دەنگەکانو کورسیەکان مەبەستی سەرەکی لە بەکارهێنانی نوێنەرایەتیی ڕێژەییە، وڵاتانی پێوەندیدار ژمارەی کورسییەکانی ناوچەی هەڵبژاردنەکانیان زیاد کردوە.

## هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆ

لە بەشێك لە وڵاتاندا دەسەڵاتی بەڕێوەبەریو یان بەشێك لە دەسەڵاتی یاسادانان (ئەنجومەنی دووهەم) بەهۆی نوێنەرانی هەڵبژێردراوی خەڵك لە پارلمانەکانو کولیجەکانی هەڵبژاردن، دیاریو دەست نیشان دەکرێن، واتا ڕاستەوخۆ بەهۆی خەڵك هەڵنابژێردرێن. لە سیستمەکانی پارلمانی دیارە دەسەڵاتی بەڕێوەبەری بەشێوەی ناڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێ. خەڵك نوێنەرانی خۆی لە پارلمان دا هەڵدەبژێریو پارلمانیش سەرۆك وەزیر دەست نیشان دەکاو دەتوانێ لە ڕێی دەنگی بێمتمانەیی لەسەر کار لای بەرێ. لە هەندێك لە دیموکراسییەکانی پارلمانیدا، سەرۆك کۆمار (سەرۆکی وڵات) بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەهۆی پارلمان هەڵدەبژێردرێ. دەسەڵاتی سەرکۆمار لەم بارەوە لە وتوویژ لەگەڵ ڕێبەرانی پارتەکان بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك وەزیرو هەروەها بۆ هەڵوەشاندنی پارلمانی ئەگەر دەرەتانی پێکهێنانی دەوڵەتی نوێ نەبوو، بەرتەسك دەکرێتەوە. لە سیستمەکانی سەرۆکایەتیدا زۆر جار سەرکۆمار کە سەرۆکی دەوڵەتیشە، ڕاستەوخۆ بە هۆی خەڵك هەڵدەبژێردرێ. لە هەندێك بواردا وەك ئەمریکا، سەرکۆمار بەهۆی لیژنەیەکی (کولیج) هەڵبژاردن دەست نیشان دەکرێ. ئەم لیژنەیە هەر بە مەبەستی هەڵبژاردنی سەرکۆمار پێك دێو پاش ئەوە هەڵدەوەشێتەوە. ئەندامەکانی لە نوێنەرانی ئەنجومەنی یاسادانان نین، بەڵکوو هەر بەو مەبەستە لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێن. لەڕاستیدا ئەم هەیئەتە هیچ کات بۆ ڕاوێژ پێك نایەت، بەڵکوو نوێنەرانی هەر هەرێمێك لە ناوەندی ئەو هەرێمەدا دەنگی خۆیان ڕادەگەیەنن. لە هەندێك وڵاتدا ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانای دووهەم بەهۆی ئەندامانی ئەنجومەنی یەکەم بە شێوەی ناڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن. لە فەرانسەو هولەند ئەندامانی ئەنجومەنی پیران [سنا] بەهۆی

ئەنجومەنی یاساداناني ناوچەيی هەڵدەبـژێردرێن. لـە ئاڵمـان سـەرۆك وەزیرانـی هەرێمـەكان، نوێنەرانی خۆیان لـە ئەنجومـەنی دووهـەم (بوندسـترات) دادەنـێن. (لـە هەرێمـەكانی ئاڵمـان سیستمی پارلمانی بە دەسەلاتەو سەرۆك وەزیران بەهۆی پارلمان هەڵدەبژێردرێ).

## چالاكیی هەڵبژاردن

تێكۆشانی هەڵبژاردن كۆمەڵێك چالاكیی سەرنج راكێشانەیە لـە مـاوەی پـێش هەڵبـژاردن‌و دەنگدان بـەهۆی پاڵێوراوانی هەڵبژاردنـەكان كـە لـە رێـی جۆراوجـۆرەوە بەرێـوە دەچـێ‌و تێچووی هەیەو هـەروەها زۆر جار یاساگەلێك بـۆ چـاودێری بەسـەر ئەوانـەدا دادەنـرێ. هـەر تێكۆشـانێك بـۆ هەڵبـژاردن سـێ لای هەیـە: یەكـەم، كاندیـداكانی هەڵبـژاردن، دووهـەم، راگەیەنەكان كە پەیامەكانی هەڵبژاردن دەگوێزنەوەو سێهەم، دەنگـدەران. مـاوەی تێكۆشـانی هەڵبژاردنەكان بە فەرمی لە نێوان مـاوەی تـەواوبوونی پارلمـانی پێشـوو كردنـەوەی پارلمـانی داوایی‌و بـە شێوەی نێونجی نزیك بە مانگێكە. لە زۆر وڵاتدا تێكۆشانی جیددی‌و توند لـە دوو حەوتووی دواییدا چڕ دەبێتەوە.

تێكۆشان بۆ هەڵبژاردنەكان لە رووی پڕوپاگەنـدەو راگەیانـدن‌و رادەی تێـچوو، زۆرجـار لـە چوارچێوەی یاسـاو رێـسایەكی تایبـەت دا بـەرێوە دەچـێ. تێكۆشـانی هەڵبـژاردن لـە رووی راكێشانی تاكەكان بۆ بەشداری لە هەڵبژاردندا زۆر یەكلا كەرەوەیە. بەڵام لـە وڵاتگـەلێك وەك ئیتالیاو بلژیك‌و ئوسترالیا كە دەنگدان زۆرە ملێیەو زۆرجار زیاتر لە ٩٠٪ تاكـەكانی خـاوەن ماف دەنگ دەدەن. كاریگەریی تێكۆشان بۆ راكێشانی خەڵك بۆ بەشداری لە هەڵبژاردنـدا زۆر چارەنووس ساز نیە. لە زۆر لە وڵاتەكانداو لە تێكۆشـانی هەڵبژاردنـدا ریـشوەدان، ترسـاندن‌و زیادە مەسرەفی دەبینرێ. بەڵام دەنگی نهێنی‌و دانانی یاساو رێسای چـاودێری لـە وڵاتگـەلی پێشكەوتوودا دەرەتان بۆ وەها كارگـەلێك كـەم دەكاتـەوە. لـە زۆر وڵاتـدا سـنووردانانێك بـۆ مەسرووفاتی هەڵبژاردن لەبەر چاو دەگیرێ. شێوەگەلی پڕوپاگەندەو راگەیانـدن لـە تێكۆشـانی هەڵبژاردندا بە لەبەرچاوگرتنی پێشكەوتن لە بواری كەرەسەی پێوەندیگرتنی گشتیدا، دیـارە گۆڕانی بەسەردا هاتوە. لە رابـردوودا لایـەنگرانی پارتـەكان یـان كاندیـداكان راسـتەوخۆ بـۆ راكێشانی خەڵك بۆ بەشداری لە هەڵبژاردندا، دەچوونە بەر دەركی ماڵەكان‌و یان لە كۆبوونەوە گشتییەكاندا تەبلیغیان دەكرد. ئێستا كە تلویزیۆن نەخـشێكی گرینگـی لـە راگەیەندنـەكانی

هەڵبژاردندا پەیدا کردوە، سەرهەڵدانی توندوتیژی لە پرۆسەی هەڵبژاردندا دیاردەیەکی ناسراوە، هەر چەند لە وڵاتانی پێشکەوتوودا ئاستی دابەزیوە. لە هەڵبژاردنەکانی وڵاتگەلێك وەك هیندوستانو وڵاتانی ئەمریکای لاتین زۆر جار ژمارەیەك کوژراوو بریندارى لێ دەکەوێتەوە.

بەڕێوەبردنی چاودێری لە ئاستی وڵات یان نێونەتەوەییدا بۆ دەستەبەرکردنی سەلامەتیی هەڵبژاردنو پێشگیری لە توندوتیژی لە زۆر کاتدا دەچێ‌بەڕێوە. لەو هەڵبژاردنانەدا کە لە رووسیەی پاش رووخانی یەکیەتیی سوڤیەتیو لە ئافریقای باشوور پاش تەواوبوونی سەردەمی ئاپارتاید بەڕێوە چوو، ئەو چاودێریانە لە لایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانو کۆمەڵگای ئورووپاوە هەر بەو مەبەستە بەڕێوە چوو. سەبارەت بە مەسرووفاتی زۆر لە هەڵبژاردنەکاندا، چاودێریەکان زۆر سانا نین. دەسترۆیشتوویی دارایىو دەست پێڕاگەیشتن بە راگەیەنە گشتییەکان، زۆر جار دەبێتە هۆی نایەکسانیی پارتەکانو کاندیداکان لە هەڵبژاردنەکاندا. تێکۆشانی هەڵبژاردن لە ئاستی وڵاتدا، پڕوپاگەندە لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا، چەسپاندنی پوستێر[لافیتە]و نووسراوە، سەفەر لە پێناوی هەڵبژاردندا، تێچوونی قورسو گران دەخوازێ. هەوڵدان بۆ کەم کردنەوەی تێچووی بەرنامەکانی هەڵبژاردن لە وڵاتگەلێکی وەك ئامریکاو بریتانیا بە کردەوە بێ‌سوودە. لە دەیەی ١٩٥٠ بەولاوە هەنگاوگەلێك بە مەبەستی دابین کردنی تێچووی تێکۆشانی هەڵبژاردن لە لایەن دەوڵەتەوە هەڵگیراوە. ئەم شێوە هەر ئێستا سەباوەت بە هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماریی لە ئەمریکاو کانادا بەڕێوە دەچێ.

لە تێکۆشانی هەڵبژاردندا، زۆر جار پەیامو دروشمگەلێکی زۆر شەفافو ساکار بۆ راکێشانی خەڵك دەخرێتە بەر دەست. هەر ئەندازە دروشم کورتترو شەفافتر بێ، ئەگەری تێگەیشتنی لە لایەن خەڵکەوە زۆرترە. لەگەڵ ئەوەش زۆر جار راگەیەندراوی بە بەڵگەو دوورو درێژیش بە هۆی کاندیداکان دەردەچێ. کەڵك وەرگرتن لە قسەکردنیش [بۆ جەماوەر] زۆر باوە. لەم دواییانەدا وتووێژی چاپەمەنیو هەروەها رووبەڕووبوونەوەی تلویزیۆنیش وەك ئامرازی پڕوپاگەندە زۆر پەرەی سەندوە. لە دێموکراسییەکانی ئەو سەردەمەدا دروشمگەلی ئابووری وەك چوونە سەری رێژەی گەشەکردن، دابەزاندنی رێژەی ئاوسان، پاراستنی دەستەبەری تەواوی [اشتغال کامل]و ... هتد لە تێکۆشانە هەڵبژاردنەکاندا زۆر زەق بوەتەوە. لە تاقمێك لە وڵاتەکاندا بۆ کاندیداکان ماوەیەکی دیاریکراو بۆ پڕوپاگەندە لە رادیۆو تلویزیۆنەکاندا تەرخان

دەکرێ. لە وڵاتەکانی دیکەدا پاڵێوراوەکان دەتوانن بە پێی دەست ڕۆیشتوویی دارایی خۆیان، کات بۆ بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندن بگرن [لە رادیۆو تلویزیۆن]. ڕاوێژکاری لە تێکۆشانی هەڵبژاردن بە تایبەت لە ئەمریکا زۆر بوەتە باو. "خەباتی نەرێنی [منفی]"یش لە خەباتی هەڵبژاردن دا پەرەی سەندوە. مەبەست لە خەباتی نێگەتیف [منفی] پەردە لادانە لەسەر خاڵە لاوازەکانی رکەبەرەکان لە جیاتی پێداگرتن لەسەر خاڵە بەهێزەکانی خۆیان. هەروەها کەڵك وەرگرتن لە ڕاپرسییە گشتییەکان لە هەڵبژاردنەکاندا زۆر پەرەی گرتوە. بە بۆچوونی زۆر لە بیرمەندان، خەباتی هەڵبژاردن لە زۆر لە وڵاتەکاندا خەریکی بە "ئامریکایی بوون"ـە.

## چاودێری بەسەر هەڵبژاردنەکاندا

چاودێری بەسەر هەڵبژاردنەکاندا بە مەبەستی دەستەبەرکردنی سلامەتیيان، لە هەموو دێموکراسییەکاندا بەکار دەبرێ. چاودێری زۆر جار بەهۆی کاربەدەستانی نێوخۆیی بەڕێوە دەچێ، بەڵام چاودێریی نێونەتەوەییش لەم دواییانەدا پەرەی سەندوە. لە سەرەتادا تەنیا ڕێکخراوەکانی نادەوڵەتی [N.G.O] لە سەر چاودێریی نێونەتەوەیی بەسەر هەڵبژاردنەکاندا چالاك بوون، بەڵام لە دەیەی ١٩٩٠ ڕێکخراوگەلێك وەك ڕێکخراوی وڵاتانی ئەمریکایی‌و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەم پێوەندییەدا چالاکییان دەست پێ کردوە.

چاودێریی نێونەتەوەیی بە تایبەت سەبارەت بەو هەڵبژاردنانە بەڕێوە چووە لە سەبارەت بە چارەنووسی نەتەوەیی وڵاتانی جێی سەرنج یەکلا کەرەوە بوون. ڕێکخراوە نێونەتەوەییە نادەوڵەتییەکان، وەك یەکیەتیی نێوان ئەنجومەنەکان [اتحاد بین المجالس]، گرووپی مافی مرۆڤی نێونەتەوەیی، ڕێکخراوی نێونەتەوەیی پارتە سوسیالیستەکان، ڕێکخراوی نێونەتەوەیی پارتە دێموکرات کریستیانەکان‌و ... هتدیش لە زۆر بواری جۆراوجۆردا بەسەر هەڵبژاردنەکاندا چاودێرییان کردوە. ئەم جۆرە ڕێکخراوانە لە فێرکردنی شێوەی چاودێری بەسەر هەڵبژاردنەکاندا بە پارتە ناوچەییەکان لە خستنە رووی فێرکردنی سیاسی‌و مەدەنی کاریگەر بوون. بوونی ڕێکخراوەکانی نێونەتەوەیی، زۆر جار ڕەوایی دەبەخشێت‌و تا ڕادەیەك سلامەتی‌و دروستیی ئەوانە دابین دەکا.

ڕێکخراوەکانی ناوبراو زۆر جار بە سەر سێ قوناخ لە هەڵبژاردنەکاندا چاودێری دەکەن: یەکەم، چاودێری بە سەر تێکۆشانی هەڵبژاردن لە رووی کەڵك وەرگرتنی هەموو پارتەکان لە

ئیمکاناتی دارایی، دووهەم، چاودێری بەسەر ڕەوتی دەنگدانو ژمارەکردنی دەنگەکان بە مەبەستی کۆنترۆڵی دورستیی هەڵبژاردنو، سێهەم چاودێری بەسەر بەڕێوەبردنی ئاکامەکانی هەڵبژاردن لە دەست بەدەست بوونی دەسەڵاتی نێوان پارتەکان. لە دەیەی ١٩٨٠دا چاودێری بەسەر هەڵبژاردنەکاندا پەرەی سەند. چاودێری بەسەر هەڵبژاردنی فیلیپین لە ساڵی ١٩٦٨، پاناما لە ساڵی ١٩٨٩، نیکاراگوئە لە ساڵی ١٩٩٠و کامبوجیا لە ساڵی ١٩٩٣دا لە نموونە گرینگەکان بوون. ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٩١دا یەکەیەکی بە ناوی یەکەی یارمەتییەکانی هەڵبژاردن دامەزراند کە لە ماوەی یەک ساڵی یەکەمی تێکۆشانی خۆیدا، بە ٢٠ داخواز لە لایەن وڵاتانی ئەندام بۆ چاودێری بە سەر هەڵبژاردندا وەڵامی ئەرێنیی دایەوە.

## ناساندنو هەڵبژاردنی پاڵێوراوەکانی هەڵبژاردن

پارتە سیاسییەکان لە درێژەی پرۆسەگەلێکی ئاڵۆز سەبارەت بە کەسانێک کە وەک کاندیدی هەڵبژاردنی جێی مەبەستیان دەست نیشان دەکرێن، بڕیار دەدەن. پاش ئەوە کاربەدەستانی بەڕێوەبەرو بەرپرسی هەڵبژاردن ئەو کەسانە وەک پاڵێوراوەکانی خاوەن سەڵاحییەت بۆ هەڵبژاردنەکە تەیید دەکەن.

زۆر جار ڕادەی پاڵێوراوەکان بۆ هەڵبژاردن بە پێی هەڵبژاردنەکان زۆر زۆرنو بۆیە توانا و دەرەتانو مەیل بۆ ناسینێکی کورتی ئەوانە بۆخۆی یەکێک لە بناخەکانی فەرهەنگی سیاسیی دێموکراتیکە. لە سیستمە داخراوەکاندا، دەسەڵاتداران لە گرووپێکی بچووکدا بەرتەسک دەبنەوەو خەڵکیش تەنیا بە ناسینی ژمارەیەکی کەم لە تاکەکان لە بیاڤی ژیانی سیاسیدا خوو دەگرن. تەییدی پاڵێوراوانی هەڵبژاردن لە دێموکراسییەکاندا بە دوو شێوەی سەرەکی بەڕێوە دەچێ:

١) لە وڵاتگەلێک دا کە سیستمی هەڵبژاردنی باو سەبارەت بە ئەنجومەنی عەوامی بریتانی واتا سیستمی ناوچەی هەڵبژاردنی تاک ئەندامی بەکار دێنن، شێوازی "داخواز" بەڕێوە دەچێ. لە خودی بریتانیادا ئەو کەسانەی کە خوازیاری بەشداری لە هەڵبژاردنی ئەنجومەن وەک ئەندامن، دەبێ لە ئیدارەی هەڵبژاردنی ناوچەکەی خۆی نامەیی تەییدیەی فەرمی وەربگرێو ناوی خۆیو ئادرێسو پیشەکەی تێدا بنووسن. پاشان ئەو نامە دەبێ بەهۆی یەکێک لە

دەنگدەرانی ناوچەکە وەك "پێشنیاردەر"، یەکێك وەك "پشتیوان"و هەشت دەنگدەری دیکە وەك "وەرگر" [پـذیرندە] واژۆی دەکەن. پاشان نامـەی جێـی بـاس بـدرێ بـە کاربەدەسـتانی بەرپرسی هەڵبژاردنو لەگەڵ ئەوەش رادەیەك پارە وەك ئەمانەت [ودیعە] دەیسپێرێ. ئەم رادە پارەیە ئەگەر کاندید کەمتر لە ٥ لە سەدی دەنگی ناوچەی هەڵبژاردنی بەدەست هێنا، دەچـێتە خەزێنەی دەوڵەت، دوای ئەم قۆناخانە ناوی پاڵێوراوی جێی بـاس دەچـێتە لیـستەی ناوەکـانو لەسەر وەرەقەی دەنگدان دەنووسرێ. تـا سـاڵی ١٩٦٩ یاسـای هەڵبـژاردنی بریتانیـا رێگـەی نەدەدا بەستراوەیی حیزبی لە سەر وەرەقەکانی دەنگدان دا دەربکەوێو پارتەکان دەبوا بۆ خۆیان لە کاتی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن لە نێو خەڵکدا ئەو بەستراوەییەیان رابگەیاندایە. لەڵام پاش ساڵی ١٩٦٩، لەگەڵ گۆڕانی یاساو رێساکانی هەڵبژاردن هـەر کاندیـدا دەتوانـێ بەسـتراوەیی حیزبیی خۆی لانیـزۆر بـە شـەش وشـە دەربـبڕێ. دەرئـەنجام کاندیـداکانی حیزبـە گـەورەکان بەستراوەیی حیزبیـی خۆیـان لەسـەر وەرەقەکانـدا دەنووسـن. سیـستمەگەلێکی هاوشـێوە بـۆ ناساندنی کاندیداکان لە زیلاندی نوێو کانادا هەیە.

٢) لە زۆربەی دیموکراسییەکاندا شێوازی نوێنەرایەتیی رێژەیی بە هێنانی ناوی پاڵێوراوەکان لە لیستەکانی حیزبیدا باوە. لەم شێوازەدا هەر ناوچەیەکی هەڵبژاردن ژمارەیەك لە نوێنـەرانی ئەنجومەنی نوێنەران هەڵدەبژێرێو لیستەی پاڵێوراوەکانی جێی باسـی هـەر پارتیـەك بـۆ ئـەو ناوچەیە لە هەڵبژاردندا رادەگەیەندرێ. لەم جۆرە سیستمانەدا زۆر جار کومیتـەی بەڕێوەبـەری حیزبی جێی باس، لیستەی پاڵێوراوەکانی خۆی بۆ هـەر ناوچـەیەك ئامـادە دەکـاو تەسـلیمی کاربەدەستانی فەرمی بەرپرسی هەڵبژاردن دەکـا بـۆ تەییـد. ئـەم کاربەدەسـتانە، شایـستەیی [صلاحیت] یاسایی پاڵێوراوەکانی هەڵبژاردن بۆ ئەندامەتی لـە ئەنجومـەنی یاسـادانانـدا لێـك دەدەنەوەو تەییدی دەکەن.

شێوەی باو بۆ ناساندنی پاڵێوراوەکانی هەڵبژاردن لە ئەمریکادا تاقانەیە، لـەو وڵاتـەدا لـە رێگای هەڵبـژاردنی بـەرایی پاڵێوراوەکـان (Primary) پاڵێوراوەکـانی هەڵبـژاردن بـە هـۆی دەنگدەران لە درێژەی هەڵبژاردنـەکانی ژێـر چـاوەدێریی دەوڵـەت دەستنیـشان دەکـرێن. هـەر خوازیارێك کە لە رووی یاساییەوە خاوەن مەرجەکانی هەڵبژاردنو ناساندن لە لایەن پارتیەکی تایبـەت وەك پـاڵێوراو ببـێ، داخوازێـك بـۆ تەییـدی کاندیداییەکـەی خـۆی تەسـلیم بـە کاربەدەستانی بەرپرس دەکا. ئەم داخوازە دەبێ بە پێی یاسا ژمارەیەك لە دەنگدەران بۆی واژۆ

بکەن. پاشان بەرپرسانی پێوەندیدار ناوەکانی خوازیارانی کاندیداتۆری لە لایەن هەر پارتێکەوە بۆ هەر پۆستێك لە وەرەقەکانی هەڵبژاردندا چاپ دەکەن. دەنگدەران، ئەولەویەتەکانی خۆیان سەبارەت بە هەر پاڵێوراوێك بۆ هەموو پۆستەکانی جێی باس لە هەڵبژاردنی سەرەتایی لە ژێر چاودێری دەوڵەت دیاری دەکەن. بەرپرسانی هەڵبژاردن ئەو کەسانەی کە زۆرترین ژمارەی دەنگەکانیان بۆ هەموو پۆستەکان بەدەست هێنابێ، وەك پاڵێوراوی رەسمیی حیزبی خۆی تەیید دەکرێ. پاشان ناوی پاڵێوراوەکانو بەستراوەیی حیزبییان بۆ هەڵبژاردنی گشتی لە وەرەقەکانی دەنگداندا دەنووسرێ. لە هەڵبژاردنی گشتیدا، دەنگدەران لە نێو پاڵێوراوانی تەییدکراودا یەکێك بۆ پۆستی جێی سەرنج هەڵدەبژێرن. بەم شێوە بە شێوەی گشتی دیاریکردنی کاندیداکانی هەڵبژاردن بۆخۆی لە رێی هەڵبژاردنی سەرتایی بەرێوە دەچێ کە لە ژێر چاودێریی بەرپرسانی حکوومەتیدا بەرێوە دەچێ.

لە دێموکراسییەکانی دیکەدا، پارتە سیاسییەکان پاڵێوراوەکانی خۆیان بە شێوەی دەوردانەوەی یاسا [فراقانونی]و بەبێ ئاگاداریو دەستێوەردانی فەرمیی بەرپرسانی حکوومەتی دەست نیشان دەکەن. پرۆسەی تەییدی یاسایی پاڵێوراوەکان بۆخۆی پشت بەستوو بەم شێوە لە دەرەوەی یاسا یان سیاسی پاڵێوراوەکان دەناسێنن. ئەم شێوە دەستنیشانکردنە لە ئاستی وڵات، یان هەرێم یان ناوچەدا بەرێوە دەچێ. کەوابوو ئاستی لامەرکەزیی حیزب جێی باس لە شێوەی دەست نیشان کردنی پاڵێوراوەکاندا کاریگەری دەنوێنێ. بەو جۆرەش باوترین شێوەی دیاریکردنی کاندیداکان یەکەم، دیاری کردن بە هۆی کاربەدەستانی حیزبی لە ئاستی ناوچەی هەڵبژاردنەکاندا لە ژێر چاودێریی پایەبەرزانی حیزبی لە ئاستی وڵات یان هەرێمو ئەوی دیکە دەست نیشان کردنی بەهۆی کاربەدەستانی پایەبەرزی حیزبی پاش راگۆڕینەوە لەگەڵ کاربەدەستانی ناوچەکانە. لە پارتەکانی هەندێك وڵاتدا، رێبەرانی حیزب لە ئاستی وڵات دەتوانن کاندیدە دەست نیشان کراوەکان لە ئاستی ناوچەدا رەد بکەنەوە. یان ئەوەی کە رێبەرانی حیزبی دەتوانن کەسانێك بە کاربەدەستانی ناوچە وەك پاڵێوراو پێشنیار بکەن. ئاستی بەشداریی ئەندامانی گشتیی حیزب لە دەست نیشان کردنی کاندیداکانیش لەم پێوەندییەدا کاریگەرە. لە هەندێك وڵات وەك ئیسرائیل، رێبەرانی حیزب هەموو کاندیداکان بۆ هەموو پۆستەکان دەست نیشان دەکەنو ناوەکانیان لە لیستەی کاندیداکاندا دەنووسن.

له لایەکی دیکەوە لە هەندێك لە دێموکراسییەکاندا وەك ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەك دیتمان، لە هەڵبژاردنی سەرەتاییدا هەموو ئەو کەسانە کە بۆ دەنگدان ناونووسییان کردوە، لە رووی یاساییەوە دەتوانن لە نێو خوازیاراندا، پاڵێوراوەکانی حیزبی خۆی هەڵبژێرێ. هەرچەندە رادەی بەشداریکردنی دەنگدەران لە هەڵبژاردنەکانی سەرەتاییدا زۆر جار نیوەی بەشداریکردنە لە هەڵبژارنی گشتیدا، بەو حاڵەش پاڵێوراوەکانی دوو حیزب نە بە هۆی رێبەرانی حیزب، بەڵکوو بەهۆی سەدان هەزار دەنگدەر دەست نیشان دەکرێن. بەشداری لە هەڵبژاردنی سەرەتاییدا هیچ بەڵێنێك ناخاتە سەر شانی دەنگدەران سەبارەت بەو پارتەی دەیهەوێو یان پشتیوانی لە پاڵێواروەکان لە هەڵبژاردنی گشتیدا، لە بریتانیا پاڵێوراوان بۆ هەڵبژاردن بەهۆی کومیتەی ئەندامانی ناوچەیی پارتی لە هەر ناوچەیەکدا دەست نیشان دەکرێن. لە ئاڵمان ئەندامانی ناوچەیی حیزب لە هەر شوێنی دەنگدانێك دا بە پێی دەنگدان، پاڵێوراوەکان دەست نیشان دەکەن.

## بیروڕای گشتی

هەڵبژاردن لە دێموکراسییەکانی ئەو سەردەمەدا لەڕاستیدا گرینگترین ئامرازی رەنگدانەوەی بیروڕای گشتیو داخوازەکانو ئەولەویەتەکانی خەڵکە. هەر بۆیە لە کۆتایی ئەم گوتارەدا بەکورتی ئاماژە بە چەمکی بیروڕای گشتی دەکەین.

بیروڕای گشتی بریتییە لە تێڕوانینەکان بەهاکانو باوەڕەکانی گشتی خەڵك. لە دێموکراسیدا وا دادەنرێ کە بیروڕای گشتی بەشێوەی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەسەر بڕیاردانی سیاسی کاریگەری دادەنێ. لە زۆر ولاّتاندا لە شێوازگەلی پەیبردن بە بیروڕای گشتی، بەڕێوەبردنی ریفراندۆمو روو کردنە دەنگی گشتی سەبارەت بە کێشە جۆراوجۆرەکان لە منداڵ لەبار بردنەوە بگرە تا بەکارهێنانی خواردنەوە ئەلکوهیلەکان [الکلی] کەڵك وەردەگیرێ. لە ولاّتانی ئورووپایی، خەڵك لە پێوەندی لەگەڵ ئەندامانی دەوڵەتەکەیان لە یەکیەتیی ئورووپادا بیروڕای خۆیان دەربڕیوەو دەنگیان داوە. لە ئافریقای باشوور رووکردنە دەنگی گشتی لە پێوەندی لەگەڵ هەڵوەشاندنی سیستمی ئاپارتاید، یەکێك لە هۆکارەکانی پێنانە مەیدانی دێموکراسیی پێك هێنا. بەو حاڵەش تەنیا هەندێك کێشەی گرینگ بۆ ئەوە دەبێ بخرێتە بەردەم بیروڕای گشتی بە شێوەی ریفراندۆم. شێوەی ناسراوی دەربڕینی بیروڕای گشتی هەر ئەو

سیستمەی نوێنەرایەتیە کە یەکێك لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی دیموکراسی پێك دێنێ. بەو جۆرەش دەبێ کاناڵی فەرمیو نافەرمی جۆراوجۆر بۆ بەدەست هێنانی زانیاری بەردەوام لە لایەن نوێنەرانی خەڵکەوە لەسەر بیروڕای گشتی بوونی هەبێ، چاپەمەنییەکان یەکێك لە ئامرازە سەرەکییەکانی رەنگدانەوەی بیروڕای گشتین، هەرچەند ناتوانن نموونەیەك بە تەواوی لە بیروڕای گشتیی خەڵك بخەنە روو. یەکێکی دیکە لە کاناڵەکانی رەنگدانەوەی بیروڕای گشتی، وەك دیتمان، گرووپگەلی خاوەن بەرژەوەندین کە لە زۆر لە دیموکراسییەکاندا کاربەدەستانی گشتی لە کەشو هەوای فیکریی کۆمەڵگا بە تایبەت کێشەگەلی جۆراوجۆر لە باجەوە بگرە تا پاراستنی ژینگە بە ئاگا دێنن. بەو حاڵەش گرووپەکانی خاوەن بەرژەوەندی، زۆر جار بیروڕای بەشگەلێك لە کۆمەڵگا دەخەنە روو کە بۆ رەنگدانەوەی لە بیروڕای گشتیدا بەس نییە. بەو رادەیە کە دەرەتانی پێکهێنانی گرووپگەلی رێکخراوەیی خاوەن بەرژەوەندی [ذی نفع] بۆ بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا زۆرتر بێ، دەرەتانی رەنگدانەوەی بیروڕای گشتی دەچێتە سەر. هەرچەند لەوانەیە هیچ کام لەم کاناڵانە بە تەنیایی بۆ دەربڕینی بیروڕای گشتی بەس نەبن، بەڵام هەموویان لەسەر یەك دەتوانن لە گۆشە نیگای جۆراوجۆرەوە بیروڕای گشتی بنوێنن.

یەکێك لەو بابەتانە کە لە باسکردن لە بیروڕای گشتی دێتە ئاراوە، ئەمەیە کە خەڵك بەگشتی تا چ رادەیەك سەبارەت بە کێشە گشتییەکانی جۆراوجۆر زانیاری بەدەست دێنن. دیارە خەڵك بەگشتی سەبارەت بە هەموو کێشەکان بە یەك رادە زانیاریو ئاگاهییان نییە. کاتێك زانیاریو ئاگاداریی گشتی سەبارەت بە کێشە تایبەتییەکان زۆر بەرتەسك بێ، بیروڕای گشتی لە دەوروبەری دا پێك نایە. پێکهاتنی بیروڕای گشتی پێویستی بە پێوەندییەکانو ئاڵوێری زانیارییە. سەرەڕای ئەوە بیروڕای گشتی لە دەوروبەری هەر بابەتێکی تایبەتدا کاتێك پێك دێ کە لە سەر یەك خۆ ڕسك، هەڵسەنگێندراوو درێژخایەن بێ. ئەو بیروڕایانە کە گرووپگەلی بەدەسەڵات لە رێگای جۆراوجۆرەوە لە کۆمەڵگادا دەیخەنە بەردەستو هەروەها بیروڕای تێپەڕو هەڵنەسەنگێندراو کە بە شێوەیەکی تەمو مژاوی بەرۆکی بەشێك لە کۆمەڵگا دەگرێ، بیروڕای گشتی بە مانای دروستی وشەکە نییە.

لە روانگەی بەشێك لە خاوەن بیران "ئاڵۆزی" زەمینەتی گشتی پێویستی گۆڕانی بیروڕای گشتییە. جگە لە راگەیەنە گشتییەکانو پێوەندییەکان، رووداوگەلی سیاسیی وەك هەڵبژاردنەکان، خەباتی هەڵبژاردنیو ... هتد، فێرکاریی سیاسیی خەڵك دەباتە سەرو

یارمەتی بە پێکهێنانی بیروڕای گشتی بە مانای راستەقینەکەی دەدا. هەروەها پێکهێنانی بیروڕای گشتی بە مانای راستەقینەکەی، تەنیا لە دەوروبەری کێشەگەلێکی گشتیی وەك هەست بە پێناسەی نەتەوەیی، شەڕ، ئاشتیو ... بەڕێوە دەچێ. بەو رادەیە کە بەربلاویی گشتی کێشەکان بەرتەسکتر بێ، بیروڕای گشتی بە بەشێکی سنووردارتر لە کۆمەڵگادا پێوەند پەیدا دەکا. بۆ نموونە سەبارەت بە کێشەکانی خوێندکاری، زۆر جار بیروڕای گشتیی خوێندکاری دادەمەزرێ، هەرچەند بەشگەلێکی دیکەی کۆمەڵگاش لەوانەیە سەبارەت بەو کێشانە داوەری بکات.

لەو رۆژگارەدا شێوەی بیروڕا وەرگرتن بۆ دەربڕینی بیروڕای گشتی، لە زۆر لە دێموکراسییەکاندا بوەتە باو. پێشینەی بیروڕا وەرگرتنی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ تێکۆشانی جۆرج گالوپ لە دەیەی ١٩٣٠ لە ئەمریکاداو پرس‌وڕای گشتی زیاتر لە هەموو وڵاتەکان لە ئەمریکادا بەڕێوە دەچێ. لەو وڵاتەدا سەبارەت بە هەر رووداوێکی سیاسی، ژمارەیەکی زۆر ڕا وەرگرتن بەڕێوە دەچێ. رێبەرانی سیاسی هەڵبژاردەی خەڵكو نوێنەرەکانی پارلمانەکان، بایەخێکی زۆر دەدەن بە بیروڕای گشتی، لەبەر ئەوەی ئەگەر هەڵسوکەوتیان لەوەی کە بیروڕای گشتیی چاوەڕوانی دەکا دوور بکەوێتەوە، ئەگەری هەڵبژاردنی دووبارەیان دادەبەزێ. بەو حاڵەش، لە نێو خاوەن بیران دا جیاوازیی بیروڕا هەیە کە ئایا نوێنەرانی پارلمان هەرکام نوێنەری بیروڕای ناوچەی هەڵبژاردنی خۆیەتیو دەبێ بیروڕای خەڵکەکەی لەبەر چاو بگرێو یان نوێنەری تەواوەتی خەڵكو بەرژەوەندیی گشتییە. رێبەرانی سیاسی زۆر جار بۆ پاساودانی هەڵسوکەوتی خۆی، ئاماژە بە دەرئەنجامی راپرسییەکانی جێی پەسەندی خۆیان دەکەنو بیروڕا وەرگرتنی گشتی بە تایبەت لە ماوەی تێکۆشانی هەڵبژاردندا، بایەخێکی تەواو پەیدا دەکا. ئاکامی ئەم جۆرە بیروڕا وەرگرتنانە یارمەتی بە پاڵێوراوەکان دەکا کە بابەتی جێی سەرنجی خەڵك وەك بابەتی راگەیاندنو هەڵوێست وەرگرو پلانەکانی هەڵبژاردن لەبەر چاو بگرن. لەم رووەوە رێکخراوەکانی بیروڕا وەرگرتنی گشتیش لەسەر ئەو دەست نیشان کردنانە کاریگەرییان هەیە، لەبەر ئەوە بە هەڵبژاردنی پرسیارگەلێکی تایبەت کاریگەری لەسەر ئاکامی بیروڕا وەرگرتنەکە دەبێ.

لە دێموکراسییەکاندا، زۆرێك لە خەڵك لە هەلومەرجی ئاساییدا هەستێکی ئەوتۆ سەبارەت بە کێشە سیاسییەکان لە خۆ نیشان نادەن، بەڵام لە بارودۆخێکی تایبەت یان قەیرانیدا،

کێشەگەلو بابەتگەلێك پەیدا دەبن کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك دەخەنە بیرکردنەوەو تێکۆشانی سیاسی. هەندێك لە کێشەکانیش سەرنجی گرووپەکانی تایبەتو پێوەندیدار رادەکێشن. پاش ئەوەی کە بیرورای گشتی لە رێگەی جۆراوجۆرەوە دەردەبڕێ، ئەخشو بایەخ پەیدا دەکا. لە ئامریکا کاتێك سەرکۆمار بە پێی راپرسییە گشتییەکانی، خۆشەویستییەکی زۆری لە نێو خەڵکدا هەبێ، کۆنگرە زۆر جار لە بەرنامە یاساییەکانی پیشتیوانییەکی زۆر دەکا، لە بەر ئەوەی نوێنەرەکان لە دەرئەنجامی دژایەتی کردن لەگەڵ سەرکۆمار دەترسن. بە پێچەوانە کاتێك خۆشەویستیی سەرکۆمار لەبەر چاو بیرورای گشتی دابەزێ، نوێنەرانی کۆنگرەش زیاتر لایەنی دژایەتی لەگەڵ دەگرن. بەم شێوەیە راپرسیی گشتی لەسەر پێوەندییەکانی سەرکۆمارو کۆنگرە کاریگەریەتی یەکلاکەرەوەی دەبێ.

بە شێوەی گشتی، لە دێموکراسییەکاندا بیرورای گشتی لە رێگەی دەنگدەران، ریفراندۆم، پێوەندیی خەڵك لەگەڵ کاربەدەستانی گشتی، گرووپەکانی خاوەن بەرژەوەندی، چاپەمەنیو راگەیەنەکان، ئەندامەتی لە حیزبو گرووپەکانداو ... هتد رەنگ دەداتەوە. لەگەڵ ئەمەش بە سەرنجدان بە ناوەرۆکی چینایەتیی کۆمەڵگاکانی دێموکراتیكو ناهاوئاهەنگیو جۆراوجۆریی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیی گرووپەکانو جیاوازیی راوبۆچوونی نێوانیان، هەموو کات گرووپگەلێك هەن کە بەرپرسانو یان سیاسەتەکانی باو بە نوێنەری بیرورای خۆیان نازانن. بەو حاڵەش تەنیا لە دێموکراسیدا کە لانی زۆری کاناڵەکانی مومکین بۆ دەربڕینی بیرورای گشتی بوونی هەیەو دەرەتانی هاوئاهەنگیی نێوان بیرورای گشتیو سیاسەتە گشتییەکان دەگەیەنێتە بەرزترین پلە.

## رووکردنە بیرورای گشتی [ریفراندۆم]

هەروەك لە سەرەوە ئاماژە کرا، یەکێك لە ئامرازە گرینگەکانی دەربڕینی بیرورای گشتی، ریفراندۆمە کە بە سەرنجدان بەو بایەخە کە لە زۆر بواردا هەیەتی، بە جیاواز لێکی دەدەینەوە. ریفراندۆم، رووکردنە بیرورای گشتیو راوێژ لەگەڵ هاووڵاتیان سەبارەت بە کێشە گشتییەکانە. زۆر لە ریفراندۆمەکاندا، پرسیارێك دەخرێتە بەردەستو خەڵك وەڵامی ئەرێنی یان نەرێنیی پێ دەدەنەوە. بەرێوەبردنی ریفراندۆم زۆر جار لە دەستووردا پێش بینی کراوە. هەروەك بینیمان، لە دێموکراسییەکانی ئەو سەردەمەدا نوێنەرایەتی وەك بنەماو کەرەسەو ئامرازی بیرورای

گشتییه. بەڵام جارجار وا دەگاتە بەر نەزەر کە ڕاکێشانی ڕەزامەندیو پشتیوانیی ئاشکراو ڕاستەوخۆی هاووڵاتیان لە ڕێگای ڕووکردنە ڕای گشتی بۆ وەرگرتنی بڕیارێک، خوازراوو پێویست بێ. لە هەندێك وڵاتدا ڕووکردنە بیروڕای گشتی وەك ئامرازێك بۆ کۆنترۆڵی گەندەڵی لە نێوان نوێنەرانو سیاسەتوانانی هەڵبژاردەی خەڵك پێش بینی کراوە. یەکێك لەو کەسانە کە هەوڵی زۆری دا بۆ ریفراندۆم ودرو ویلسون سەرکۆماری ئەمریکا لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا بوو. دەوترێ کە نزیك بە نیوەی هەموو ریفراندۆمەکان کە لە سەدەی بیستەم دا بەڕێوە چوونو ژمارەیان دەگاتە هەزار، لە وڵاتی سویس بە ئەنجام گەیشتوون. بۆیە هەندێك ئەو وڵاتە بە وڵاتانی دێموکراسیی ڕاستەوخۆ دەزانن. لە هەندێك لە وڵاتەکاندا لە ئاستی وڵاتدا هیچکات هیچ ریفراندۆمێك بەڕێوە نەچووە، یەك لەوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ژاپۆنو هیند. ریفراندۆم ئەو کاتە بەڕێوە دەچێ کە دەوڵەت یان پارلمان سەبارەت بە کێشەیەکی تایبەت ڕووکردنە بیروڕای گشتی بە پێویست بزانن. لە تاقمێك لە وڵاتەکاندا، چاکسازی لە دەستووردا دەبێ لە ڕێگای ریفراندۆمەوە پەسەند بکرێ. ریفراندۆمەکان لەوانەیە لایەنی ڕاوێژکاری یان ناچار بۆ بەڕێوەبردن ببێ. لە جۆری یەکەمدا سەبارەت بە کێشەیەکی تایبەت لە خەڵك پرسیار دەکرێ، سەبارەت بە جۆری دووهەم دەنگو بۆچوونی خەڵك وەك یاسا وایە. ئەو ریفراندومانە کە بڕیارەکەیان پێویستە بەڕێوە بچێ، بە پێی بابەت لەوانەیە پێویستی بە بەدەست هێنانی زۆرینەیەکی ساکار یان دوو لەسەر سێو یان سێ لە چواری دەنگەکانو یان زۆرینەی ڕەهای تەواوی حەشیمەتی خاوەن ماف بێ. لە بەشێك لە وڵاتەکانی فیدراڵدا وەك سویسو ئوسترالیا، هەم دەنگی زۆرینەی دەنگدەرانو هەم دەنگی زۆرینەی هەرێمەکان بۆ تەییدی ریفراندۆم پێویستە. زۆر جار کاتێك ریفراندۆم بەڕێوە دەچێ کە دەوڵەت یان پارلمان لە وەڵامی ئەرێنیی خەڵك بەرپرسیارە جێی سەرنجە کە دڵنیابنو یان چارەسەری کێشەکە بەهۆی دەزگای حکوومەت دژوارو یان ببێتە هۆی دووبەرەکیی نێوخۆیی (وەك ریفراندوم سەبارەت بە ئەندامەتیی هەندێك لە وڵاتانی ئورووپایی لە یەکیەتیی ئورووپادا).

بە پێی ناوەڕۆکی ریفراندۆمەکان دەکرێ سێ جۆری سەرەکی لێك جیا بکرێنەوە: ریفراندوم سەبارەت بە ڕەوایی حکوومەتەکان، ریفراندوم لە پێوەندی لەگەڵ سەر زەوی وڵاتەکانو ریفراندوم تایبەت بە کێشەی ئەخلاقی. ریفراندومی جۆری یەکەم گرینگترینو باوترین جۆرە، زۆر جار پاش گۆڕانی ڕێژیمەکانو گۆڕانی شۆڕشگێڕانە، بەڕێوەبردنی ریفراندۆم بۆ ڕەواییدان بە

حکوومەتی نویٚ پیٚویستی پەیدا دەکا. هەروەها گۆڕان لە دەستوور، یاسای هەڵبژاردن، دەسەڵاتی ئەنجومەنەکان، مافو دەسەڵاتی پادشاو ... هتد، دەخرێتە بەر ریفراندۆم. نموونەی جۆری دووهەم ریفراندۆم گەلێك بوو کە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی بۆ دەست نیشان کردنی سنوورەکانو سەرزەمینی تاقمێك وڵات بەڕێوە چوو. کێشەی ئەخلاقی وەك تەڵاق، منداڵ لەبار بردنو خواردنی ئەلکولیش زۆر جار دەخرێتە بەردەم ریفراندۆم. جاری وا هەیە کێشەی دیکە وەك شوێنی رئاکتۆرە ئەتۆمییەکان، ئەندامەتی لە رێکخراوەکانی نێونەتەوەییو ... هتدیش ریفراندۆمی بۆ دەکریٚ. دیارە لە رژێمگەلی نادێموکراتیکدا ریفراندۆم کەڵکی خراپی لیٚ وەردەگیردریٚو ئامرازێکە بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی ئەوان.

## ٦
## جۆرەكانی دێموكراسی

جۆرەكانی دێموكراسی بە پێی پێوەرگەلێكی جۆراوجۆر دێتە دەست، بە پێی ئەوەی كە مەبەستمان لە دێموكراسی دابینكردنی ئازادیی تاك، فەزیلەتی مەدەنی، یان یەكسانیی سیاسی بێ، هەڵسەنگاندنی جیاواز لە دێموكراسی دەكەوێتە دەست كە لەوانەیە هەركام جۆرێك دێموكراسی بۆ نموونە دێموكراسیی لیبراڵ یان دێموكراسیی بەشداریی [مشاركتی] (بە مانای روسۆیەكەی) لێ بكەوێتەوە. هەروەها بە پێی ئەوەی كە ئایا بناخەی دێموكراسیی حكوومەتی زۆرینەیە یان حكوومەتی یاسا، جۆری دێموكراسی دەگۆڕێ. بە پێی ئەوەی كە خەڵك راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە سیاسەت‌و حكوومەتدا بەشداری دەكەن، لە دێموكراسیی راستەوخۆ یان دێموكراسیی پشت بەستوو بە نوێنەرایەتی باس دەكرێ. هەروەها بە پێی ئەوە كە ئایا دێموكراسی تەنیا مەبەستی یەكسانیی سیاسیی تاكەكانە، لە رووی بەشداری دەسەڵات‌و یان لەسەر یەكسانیی ئابووریی خەڵك وەك ژێرخانی یەكسانیی سیاسیش تەئكید دەكا، دێموكراسیی لیبراڵ‌و دێموكراسیی كۆمەڵایەتی لە یەك جودا دەكرێنەوە. دێموكراسیی كۆمەڵایەتیش جۆرەها پەل‌و لقی وەك دێموكراسیی پیشەسازی‌و دێموكراسیی پیشەیی لێ دەكەوێتەوە. بە پێی ئەوە كە ئایا بناخەی دێموكراسی، نوێنەرایەتیی خەڵك لە ناوچە جوغرافیاییەكان‌و یان لە گرووپەكانی قەومی‌و ئایینی بێ، جۆری سەرەكی دێموكراسیی باو، دێموكراسیی چەند قەومی‌و ئەنجومەنی جیا دەبێتەوە. هەروەها پێكهاتەی ئایدۆلۆژییەكانی دیكە وەك سوسیالیسم یان كریستیان لەگەڵ دێموكراسی، جورگەلێكی تایبەتی لە دێموكراسی پێك هێناوە.

جۆرەكانی دێموكراسی تا رادەیەك بەهۆی ئەولەویەتێكەوەیە كە لە دێموكراسیدا دەدرێ بە ئازادی یان فەزیلەتی مەدەنی. دێموكراسیگەلی لیبراڵ لەسەر بناخەی ئەولەویەتی ئەندێشەو بەهای ئازادی سەبارەت بە هەموو بەها سیاسییەكانی دیكە دانراوە. لەم چەشنە لە دێموكراسیدا، ئازادی سەرتر لە یەكسانی، فەزیلەتی مەدەنی، خوشگوزەرانی‌و . . . حیسابی بۆ دەكرێ. لەم روانگەوە دێموكراسی تا ئەو جێگەیە دڵخوازە كە ئازادییە سەرەكییەكانی خەڵك خەوشدار نەكا. كەوابوو ئەگەر حكوومەتی دێموكراسی زاڵبوونی فیكری زۆرینە یان بە

تێگەیشتنێکی دیکە دیکتاتۆریی زۆرینەی لێ بکەوێتەوە، دیارە ئازادی لە نێو دەچێ. دێموکراسیی لیبراڵ لەسەر ئەم بنەمایە ئامانجی بیرمەندانی لیبراڵو لیبراڵەکانە. بە بۆچوونی ئەوان تەنانەت کەڵکی خراپ وەرگرتن لە ئازادی باشترە تا کەڵکی خراپ وەرگرتن لە دێموکراسی، هەر چۆنێك بێ دەبێ ئازادی وەك بنەمایەك وەربگیرێ، هەرچەند زیان بە بەهاکانی دیکە وەك رێکیوپێکی [نظم] یەکسانیو دادپەروەری بگەیەنێ.

بیرمەندانی لیبراڵ لە سەر ئەو رایەن کە مرۆڤ بە پێی سروشت تەنیاو خۆ ویست واتا ناکۆمەڵایەتیو نامەدەنییە. مرۆڤەکان بە پێی ئۆگریو پێویستیەکانی سروشتی خۆی دەکەونە رکەبەریو شەڕ لەگەڵ یەکتری، تا ئارامیو ئاسایش بەدەست بێنن. بە واتایەکی دیکە بارودۆخی سروشتی یان پێش مەدەنی مرۆڤەکان بارودۆخێکی شەڕانەیە. کۆمەڵگاو دەوڵەت بۆ مەبەستی خۆپاراستن لە وەها بارودۆخێکی نەخوازراو دێنە ئاراوە، کۆمەڵگا لەم لێکدانەوەدا رەسەنایەتییەکی نیە، بەڵکوو بەرهەمی پەیماننامەیەو وەك دیاردەیەکی دەستکرد هەڵگری خێرو بەرژەوەندیەکی جیاواز نیە کە تاکەکان بیری لێ بکەنەوە. تەنیا شتێك کە وەك بەرژەوەندیی گشتی بۆ باس کردن دەبێ، ئاشتیو ئارامییە، لەبەر ئەوەی ئاشتیو ئارامی پێویستی بە شوێن داچوونی خێرو قازانجی تاکەکەسی بەهۆی تاکەکانە. لەبەر ئەمە ناتوانرێ لە بەرژەوەندیی کۆمەڵ بە مانایەکی زاتیو ئەرێنیو یان لە فەزیلەتی مەدەنی لە شوناسو لەبەرچاوگرتنی ئەو بەرژەوەندیانە قسە بکرێ. کۆمەڵگا رووداوێکی سروشتیو لە پێشدا دارێژراو نیەو پێگەو بەهایەکی زیاتر لەوە کە رەزامەندیو پەیماننامەیی دەبەخشێ، نیە. کەوابوو باسکردن لە روحو بوونی کۆمەڵگا وەك راستییەکی سەربەخۆو سەرتر لە تاك خڵەتێنەرو زەمینەی سەرهەڵدانی ئایدۆلۆژیاو سیستمگەلی دەسەڵاتخوازە.

بەڵام بیرمەندانێك کە نەریتی ژان ژاك رۆسۆ دەکەنە بنەمای ئەندیشەیان، بناخەی سەرەکیی دێموکراسی لە فەزیلەتی مەدەنیو هاووڵاتیدا دەبینن کە نیازی بە شوناسو لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی گشتییە. لەم روانگەوە لە دێموکراسیدا تاکەکان لە هەمانکاتدا هەم دەسەڵاتدارنو هەم لە ژێر دەسەڵاتدان. کەوابوو دەبێ لەگەڵ خێرو بەرژەوەندیی گشتی ئاشنا بن. هاووڵاتیانی بەشدار لە حکوومەت بەسەر کۆمەڵگاو بەسەر خۆیاندا حکوومەت دەکەن، بۆیە خێرو مەسڵەحەتی کۆمەڵگا خێرو مەسڵەحەتی تاکە. حکوومەتی دێموکراسی پێویستی بە ورەی هاووڵاتی یان فەزیلەتی مەدەنی بەم مانایەیە. فەزیلەتی مەدەنی دەبێتە هۆی ئەوە کە

هاوولاتیان قازانجی خۆیان لە قازانجی کۆمەڵگادا بدۆزنەوە. هاوولاتیانی راستەقینە ئەوانەن کە لە ژیانی گشتیدا بوونیان هەیەو تەنانەت بە زیانی کەسیەتیی خۆیان خزمەت بە بەرژەوەندیی گشتی دەکەن. لەم رووەوە فەزیلەتی مەدەنی لەگەڵ گەڕان بە شوێن قازانجی تایبەتو تاکەکەسی ناسازە. دەبێ لە هەرچی نێوان بەرژەوەندی گشتیو تایبەتیی تاکەکان ناسازی پێك دێنێ، دووری بکرێ. دیارە پەروەردەکردنی فەزیلەتی مەدەنی لە تاکەکاندا پێویستی بە فێرکردنی شێوە ئەخلاقیێکە کە رۆسۆ لە کتێبی ئیمیلدا وەسفی کردوە.

بەم شێوەیە تاقمێك لە رەخنەگرانی هاوچەرخ بە رەخنە لە تاك گەرایی یان رەسەنایەتیی تاکی لیبراڵ وەك بناخەی دێموکراسی، لە پێگەی [موضع] بەرژەوەندو خێری کۆمەڵگا وەك راستییەکی رەسەنو راستەقینە باسیان کردوە (ناودارانی ئەم گرووپە السدرمکینتایرو مایکل والتزن). لە روانگەی ئەم رەخنەگرانەوە لیبرالیسمو رەسەنایەتی (تاك)ی ئەو، بنەمای هاوولاتی دێموکراتیكو فەزیلەتی مەدەنی لە نێو دەباو لە بەرانبەردا ناتوانرێ بناخەیەکی راستەقینە بۆ کۆمەڵگای دێموکرات بەدەست بهێنرێ. بە واتایەکی دیکە، لە دێموکراسییەکانی ئەورۆییمدا نیاز بە پەروەردەکردنی فەزیلەت [چاکی Virtue]و هەڵسوکەوتی هاوولاتیەتی بەگشتی لەبەرچاو نەگیراوە. دەرئەنجام کەسانێك کە هەر لە پەرۆشی ژیانی تایبەت بە خۆیانن، لە بەرانبەر دەسەڵاتداریەتی دەوڵەتی بورووکراتیكو سەرمایەداریی هاوچەرخدا پاسیوو بێتوانا وونو هەر چەشنە روحیەو ورەی گشتییان لە دەست داوە. بەم جۆرە ئازادیی لیبراڵی بوو بە خۆ ویستیو، لە نیهایەتدا جۆرێك ملکەچیو گوێڕایەڵی لێ کەوتۆتەوە. تاکە ئازادەکان بەم مانایە کۆیلەگەلێکی شادمانن کە شەرمێونانە خزمەتگوزاریەکانی بواری خۆشگوزەرانی دەوڵەتی بوروکراتیك وەردەگرن. لە ئاکامدا هەستی بەشداریو ئازادیی ئەرێنیو حکومەت بەسەر خۆداو هاوولاتیبوون بە تەواوی لە نێو چووە، لەبەر ئەوە هیچ کەسێك لە ئەندیشەی خێرو قازانجی گشتیی کۆمەڵگەدا نیە، بەڵکوو هەمووان هەر لە بیری قازانجی تایبەتیی خۆیان دان. بەم شێوەیە لە رووی ئەخلاقیشەوە ژیانی لیبراڵگەرایانە پووچو کلۆر بوەتەوەو لە نێوان شوێن کەوتنی ژیانی تایبەتو پاراستنو رێزلێنانی ئەخلاقی گشتی بە ناچاری دژایەتی دەخولقێ. کەوابوو لیبرالیسم لە نیهایەتدا تەریك کەوتنیو تەنیاییو دەستەوەستانی تاکی لێ دەکەوێتەوە. تەنیا رێگای دەربازبوون لەم تەهلووکە، زیندوو نۆژەنکردنەوەی دەسەڵاتداریەتی ئەخلاقی کۆمەڵ وەك بوونێکی جیا لە تاکە.

## دێموکراسیی ڕاستەوخۆ

دێموکراسی بە مانای حکوومەتی خەڵك، لە بەرانبەر دێموکراسی بە مانای حکوومەتی نوێنەرانی خەڵك، دێموکراسیی ڕاستەوخۆ یان بەهێز ناودێر کراوە.

تاقمێك لە نووسەران، دێموکراسیی ڕاستەوخۆیان نە وەك جۆرێك لە دێموکراسی، بەڵکوو بە گەوهەری دێموکراسییان ناو بردوە کە جۆرەکانی دیکە بە لادان لەوان حیسابیان بۆ دەکرێ. بە واتایەکی دیکە، دێموکراسیی ڕاستەوخۆ، دێموکراسی بە مانای ڕاستەقینەی وشەکە دەزانن، لە کاتێکدا دێموکراسی بە مانای حکوومەتی نوێنەرانی خەڵك یان ژمارەیەك لە گرووپەکانی هەڵبژاردوە یان، بە دێموکراسی بە مانای ناواقیعی [مجازی]و خوازراوەکەیەتی. لە دێموکراسی بە مانای حکوومەتی نوێنەرانی خەڵك، دەسەڵاتدارییەتیی خەڵك لە چوارچێوەی دەستوور دەسپێردرێت بە نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵك کە بە کردەوە حکوومەتو نیدارەکردنی کاروباری کۆمەڵگا دەگرنە دەستو لە بەرانبەر خەڵکدا بەرپرسن. کەوابوو خەڵکەکە بە مانایەکی پاسیڤانە خاوەن دەسەڵاتدارییەتی واتا بە سەر کاری دەسەڵاتدارانی هەڵبژاردەی خۆیاندا تەنیا چاودێری دەکەنو بە هەڵبژاردن یان هەڵنەبژاردنی ئەوان سەبارەت بە دەسەڵاتو توانایییان دادوەری بکەن. لە ڕوانگەی لایەنگرانی دێموکراسیی ڕاستەوخۆ یان بەشداریانە، دێموکراسی بە مانای نوێنەرایەتیی دێموکراسییەکی لاواز یان لانیکەمە. لە ئاسنا [Athens] لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین، هەموو هاووڵاتیان هەر حەوت یان دە ڕۆژ جارێك لە ئەنجومەندا کۆ دەبوونەوەو سەبارەت بە کاروبارەکان بڕیاریان دەدا. ئەو دێموکراسییە ڕاستەوخۆیەکە گەندەڵو دەبوو بە حکوومەتێکی بێسەرەوبەرەو نارێکوپێك، ئوکلوکراسی[١] یان حکوومەتی لاتو لووتو هەرچیو پەرچیان پێ دەوت، هەروەك جۆری گەندەڵ بووی مونارشیو ئاریستۆکراسی پێی دەوترا تیرانیو ئولیگاریشی. دیارە لە ئاسنا تەنیا شارومەندان [هاووڵاتیان]، واتا ئەو پیاوانەی کە ڕەگەزی ئاسناییان هەبوو، خاوەن مافی حکوومەت کردن بوونو ئەوانیش یەك لە پێنجی حەشیمەتی شاریان پێك دەهێنا. ژنان، کۆیلەکان لە ڕیزی هاووڵاتیان بەدەر بوون. هەروەك دیتوومانە جورگەلێك لەم ڕەنگە دێموکراسییە لە سەدەکانی پاشتر لە سەرزەوینی ئیتالیا، ئاڵمان، سویسو هولەند سەریان هەڵ دا.

---

[١] Ochlocracy

زۆرێك لە بیرمەندانی سەدەی هەژدەهەم لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە دێموکراسیی راستەوخۆ تەنیا لە دەوڵەت شارە بچووکەکاندا دەرەتانی پێکهێنانی هەیەو لە سەرزەوینی پانو بەرینو پڕحەشیمەتدا ناکرێ بە شێوەی دێموکراسیی راستەوخۆ بەڕێوە ببرێ. هەربۆیە چەمکی دێموکراسیی نوێنەرایەتی بە مەبەستی پاراستنی ئەندیشەی سەرەکیی دێموکراسی لە کۆمەڵگاگەلێکی گەورەدا هاتە ئاراوە کە بە شێوەی دێموکراسیی راستەوخۆ نەدەکرا بەڕێوە ببرێ. لە روانگەی بیرمەندانی چەرخی نوێ لە دێموکراسیی راستەوخۆ نە تەنیا نامومکین، بەڵکوو تەنانەت نەخوازراویش بوو، لەبەر ئەوەی کە بە بۆچوونی ئەوان رووی لە توندڕەویو دیکتاتۆری دەکرد. تاقمێك لە دامەزرێنەرانی جمهووری لە ئامریکادا پێیان وابوو کە دێموکراسیی راستەوخۆ بەشێوەی ئاتنی دەبوە هۆی نائارامیو شەڕو دەمەقاڵەو دێموکراسیی نوێنەرایەتیان وەك ئامرازی پاڵاوتنی دێموکراسی لە کەسانی خەڵك خڵەتێنەرو توندڕەو، بە پێویست دەزانی. لە روانگەی ئەوانەوە لە رێگای دامەزراوەی نوێنەرایەتی ئەوانەی خاوەن کەرامەتی مەدەنی بوون، لە نێو خەڵکدا مەنسەبەکانی حکومەتیان پێ دەگەیشت. لە دێموکراسییەکانی هاوچەرخیشدا هەرچەند جۆرگەلێك لە دێموکراسیی راستەوخۆ وەك ریفراندۆمو راپرسیی گشتی ماوەتەوەو تەنانەت بوارگەلێك بۆ "تلە دیموکراسی"[٢] واتا بەشداریی راستەوخۆ لە دیالۆگو رەوتەکانی بڕیارداندا لە رێگای تیکنۆلۆژیای کامپیوتێریو پێوەندی لە رێگای دوورەوە هاتۆتە گۆڕ، بەڵام زۆر لە خاوەن بیرانی هاوچەرخیش هەروەها دێموکراسیی راستەوخۆ بە هۆکاری خڵەتاندنی خەڵكو حکوومەتی کەسانی نائەهل دەزانن. ساموئیل هانتینگتۆن زانای سیاسیی ئامریکایی لەسەر ئەو بڕوایەیەکە ئەگەر خەڵك زیاد لە پێویست چالاكو خوازیاری بەشداریی راستەوخۆ لە سیاسەتدا بن، کۆڵێکی قورس دەنێتە سەر شانی دێموکراسیو لە پێی دەخەن.

---

[٢] ـ Tele Democracy بەشداریی راستەوخۆی خەڵك لە بڕیارداندا بە یارمەتی ئەو دەرەتانانە کە تێکنۆلۆژیای پێوەندیگرتنی مۆدێرن، خولقاندوویەتی، تلە دیموکراسیی پێ دەڵێن، دەنگدان لەماڵەوەو لە رێی کامپیوتێرو کەڵك وەرگرتن لە بانکە زانیارە بەربڵاوەکان لە بواری سیاسەتو بەرنامەگەلی هەڵبژاردنو هەروەها چوونە نێو وتوێژی راستەوخۆ لە رێگەی پۆستی ئیلێکترۆنیو گۆڕانەوەی بیروڕا بەهۆی تیەکۆنفرانس، هەلومەرجی دەرەتانی ئەم جۆرە لە دیموکراسی بەحیساب دێن. بەم شێوە لەوانەیە دیموکراسیی راستەوخۆ بە بۆنەی تێکنۆلۆژیای مۆدێرنەوە زیندوو بکرێتەوە.

له بەرانبەردا لایەنگرانی دێموکراسیی ڕاستەوخۆ بەڵگە دێننەوە کە ئەم جۆرە دێموکراسییە تەنیا بەهۆی بەشداری ناکەوێتە دەست، بەڵکوو پێویستی بە بارهێنانو فێرکردنی سیاسیی هاووڵاتیان بە مەبەستی پێکهێنانی کەرامەتی مەدەنی لەوان دایە. کەوابوو تەنیا بەهۆی پەروەردەکردنی مەدەنیو ئەخلاقیی هاووڵاتیان، دێموکراسیی ڕاستەوخۆ دەرەتانی بوونی هەیە. مەبەست لە هاووڵاتیان لەم بۆچوونەدا هەر ئەو کەسانە نین کە تەنیا لە بواری ژیانی تایبەتدا چالاکن، بەڵکوو ئاگاو چالاکن لە بواری گشتیدا کە خاوەن زانیاریو ئیرادەی لایەنگری لە بەرژەوەندیی گشتی بن.

گرینگترین فەیلەسووفی سیاسیی مۆدێرن کە دیفاعی لە دێموکراسیی ڕاستەوخۆ کردوە، ژان ژاك ڕۆسۆ بوو. هەروەك دیتومانە بە بۆچوونی ئەو تەنیا ئەو دەسەڵاتداریەتییە ڕەوایە کە هاووڵاتیان هەروا بە ئازادی بیلێنەوەو هیچ شەرتو مەرجێکیان بەسەردا نەسەپێنێ. لە دێموکراسیی ڕاستەوخۆدا هاووڵاتیان لە دانانی ئەو یاسایانە کە خۆیان بەرێوەی دەبەن، بەشدارییان هەیە، واتا گوێڕایەڵی لە یاسا، گوێڕایەڵی لە ئیرادەی خۆیانەو بەم شێوە ئازادیو بەڵێن دانو گوێڕایەڵی وەك یەکیان لێ دێ، ئازادیی ڕاستەوخۆ لە ڕوانگەی ڕۆسۆوە گوێڕایەڵی لە یاسایەکە کە خۆمان دامان نابێ. لە ڕوانگەی خاوەن نەزەرانی دیکەوە دێموکراسیی ڕاستەوخۆ پشت ئەستوور بە ئازادیی ئەرێنی، واتا ئازادی لە کردەوەو هەڵبژاردنە، لە کاتێکدا کە لە دێموکراسیی پشت بەستوو بە نوێنەرایەتیی، ئازادی لە دەست تێوەردانی ئیرادەی سەرەڕۆیانەی کەسانی دیکە زیاتر پەروەردە دەبێ تا لە ئازادیی ئەرێنی. (تۆماس جیفرسۆن)یش هەروەك دیتوومانە لە داکۆکیکارانی دێموکراسیی بەشداریەتیو ڕاستەوخۆ بووو، بەڵگەی دەهێنایەوە کە ئەگەر نەتوانرێ بە مرۆڤەکان پشت ببەسترێ کە بەسەر خۆیاندا حکوومەت بکەن، چۆن دەکرێ پشتی پێ ببەسترێ کە بەسەر خەڵکدا حکوومەت بکەن. بە بۆچوونی ئەو تەنیا دێموکراسیی ڕاستەوخۆ دەتوانێ لەمپەر بێ لە سەر ڕێی سەرهەڵدانی حکوومەتی زۆردارانەو دیکتاتۆری.

گرووپێك لە نووسەرانی هاوچەرخ لە دەرکەوتنی "دێموکراسیی بەشداریەتی" قسە دەکەن کە گەوهەری دێموکراسیی ڕاستەوخۆی تیادا زیاترە. دێموکراسیی بەشداریەتی ئەو جۆرە دێموکراسییە کە هاووڵاتیان لەودا، لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ دێموکراسیی ئاساییدا، نەخشێکی چالاکتر لە ڕەوتی بڕیارەکاندا دەگێڕن. دێموکراسیی بەشداریەتی لەڕاستیدا تێکەڵێك لە

دێموکراسیی دامەزراو لەسەر نوێنەرایەتی‌و دێموکراسیی راستەوخۆ بە مانا کۆنەکەیەتی. لەم رووەوە لە دێموکراسیی بەشداریەتیدا، ژمارەی هەڵبژاردنەکان‌و ژمارەی پۆستەکان بۆ هەڵبژاردنیش زیاترە. هەندێك لەسەر ئەو بڕوایەن کە دێموکراسیی ئەمریکایی بەشداریەتییەکی زۆرتری تێدایە تا دێموکراسییە ئوروپاییەکان. هەروەها لە دێموکراسیی بەشداریەتی ئامادەبوونی چالاکانەی خەڵك لە کێشەکانی تایبەت بە بڕێوەبردنی کاروباری ناوچەیی زۆرترە. لەم شێوە دێموکراسییەدا لە راپرسی‌و ریفراندۆم زیاتر کەڵك وەردەگیری‌و هەروەها هەڵوەشاندنەوەی نوێنەرایەتیی نوێنەران زیاترە.

## دێموکراسیی کۆمەڵایەتی

دێموکراسیی کۆمەڵایەتی ئەو جۆرە لە دێموکراسییە کە لەسەر دابین کردنی خوشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی‌و پێکهێنانی دەوڵەتی خوشگوزەرانی‌و دابەشکردنی سامان لە کۆمەڵگادا بەهۆی دەوڵەت پێ دادەگری. لایەنگرانی دێموکراسیی کۆمەڵایەتی بە شوێن ئەوەدا بوون تاکوو بنەماکانی لیبرالیسم‌و حکوومەتی دامەزراو لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی‌و دەسەڵاتداریەتیی خەڵك لەگەڵ بنەماکانی چاکسازیی کۆمەڵایەتی‌و یەکسانی دابەشکردن پێ لێك بدەن. بە واتایەکی دیکە دێموکراسیی کۆمەڵایەتی ئەو جۆرە دێموکراسییەیە کە تارادەیەك گەوهەری سوسیالیزمی تێدا بێ، بۆیە لە رووی سیاسەتگەلی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری لە نێوەڕاستی لیبرالیسم‌و سوسیالیزمدا هەڵکەوتوە.

کەوابوو دێموکراسیی کۆمەڵایەتی لەسەر بەرپرسایەتیی کۆمەڵایەتیی دەوڵەت پێ دادەگری، هەرچەند لە هەمان کاتدا پارێزەری سیستمی سەرمایەداری بە رەنگێکی هاوسەنگ کراوە. زۆر لە نووسەران ریشەی سەرەتایی دێموکراسیی کۆمەڵایەتی لە ئەندیشەکانی ئیدوارد برنشتاین، مارکسیستی چاوخشێنەرخواز [Revisionist] سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا دەدۆزنەوە کە خوازیاری هەوڵدان بۆ وەدیهێنانی ئارمانجەکانی سوسیالیستی، نە لە رێگای شۆڕش، بەڵکوو بە شێوەی پارلمانی‌و ریفۆرمخوازانە بوو. یەکێکی دیکە لە ریشە سەرەکییەکانی دێموکراسیی کۆمەڵایەتی بۆ بیرۆکەی بزووتنەوەی سوسیالیستی فابین (لە بریتانیا) بەتایبەت ئەندیشەکانی کەسانێك وەك ئیچ. جی ـ ویلز، بیرناردشاوو سیدنی وب دەگەڕێتەوە. دەوڵەتگەلی خوشگوزەرانی سەدەی بیستەم لە رۆژئاوادا لەڕاستیدا لەسەر بناخەی وەها ئارمانج‌و

بنەماگەلێك دامەزراون. لە نوێنەرانی دواتری دێموكراسیی كۆمەڵایەتی لە ئامریكادا بەتایبەت دەبێ لە جان رالزو رونالد دوركین ناو ببرێ كە لایەنگری دادپەروەریی كۆمەڵایەتی دابەشینو دابەشكردنی دادپەروەرانەی سامان بوون. ئەم لێكدانەوە نوێیە لە دێموكراسیی كۆمەڵایەتی لە كۆتاییەكانی سەدەی بیستەمدا لە بەرانبەر نئولیبرالیسمی دێموكراسی لە لای كەسانێك وەك فریدریش فرن هایك فەیلەسووفی ئەمسایی خراوەتە روو كە دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ئابووریو دادپەروەریی دابەشین یان بە پێچەوانەی بنەماكانی لیبرالیسمو بە بێ بەرهەم زانیوە. دیارە هەروەك ئاماژەی پێ كرا، سوسیال دێموكراسی لە بناخەدا نەریتێكی ئورووپایی بووە بۆ لێكدانەوەی ئەمریكاییەكەی زیاتر لە ژێر كاریگەریی تاكخوازیو لیبرالیسمی ئەمریكاییە تا سوسیالیسم. لایەنگرانی دێموكراسیی كۆمەڵایەتی هەر چۆنێك بێ لە مافە كۆمەڵایەتییەكان دیفاع دەكەنو لەسەر ئەو باوەڕەن كە ئەم مافانە لە سەدەی بیستەمدا بایەخیان پێ دراوە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا لەسەر مافە سیاسییەكان، لە سەدەی هەژدەهەم لەسەر مافە مەدەنییەكانو، لە سەدەی حەڤدەهەم لەسەر مافە سرووشتییەكان، پێ داگیرابوو. ئەمە بۆخۆی لێدانەوەیەكی لیبراڵییە لە دێموكراسیی كۆمەڵایەتی، لەبەر ئەوە كە لە جیاتی پێداگرتن لەسەر چەمكی سوسیالیستی، بەرپرسایەتیی كۆمەڵایەتی دەوڵەت لەسەر چەمكی مافەكانی تاك پێ دادەگرێ. تاقمێ لە نووسەران لەم سنوورەش تێدەپەڕنو كەڵك وەردەگرن لە مافە كۆمەڵایەتییەكان بە مەرجی هاووڵاتیبوون بە مانای راستەقینەی وشە لە دێموكراسییەكانی ئەو سەردەمەدا دەزانن. لە نیهایەتدا ئەوەی كە ئەمڕۆ دێموكراسیی كۆمەڵایەتی لێك دەدرێتەوە، شتێك زیاتر لە دیفاع لە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی [رفاهی] نیە. دابینكردنی ئیش بە تەواوی، خزمەتگوزاریی خۆشگوزەرانی، وێكهێنانەوەی كەلێنە چینایەتیەكان لە رێگای سیاسەتگەلی دارایی، بردنەسەری مەسرووفاتی گشتیو ... هتد. گرینگترین هەنگاوەكانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی بووە. دێموكراسیی كۆمەڵایەتی، كە وابوو شتێك زیاتر لە دێموكراسیی لیبراڵو بەو حاڵە كەمتر لە سوسیالیزمە.

## دێموكراسیی پیشەسازی

مەبەست لە دێموكراسیی پیشەسازی، بەكارهێنانی بنەماكانی دێموكراسی لەسەر شێوەی كارو ژیانی چینی كرێكارە. لەم روانگەوە دێموكراسی تەنیا لە ژیانی سیاسیدا بەرتەسك

ناکرێتەوە. بەڵکوو لەسەر ژیانی ئابووریش بۆ بەکارهێنانی دەبێ‌و تەنانەت دەبێ لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووریی کرێکاران کە زۆرینەی خەڵك پێك دێنن، بەڕێوە بچێ. دەستەیەك لە نووسەران مەبەست لە دێموکراسیی پیشەسازی تەنیا بۆ بەشداریکردنی کرێکاران لە بڕیارەکانی ئاسەرەکی‌دا دەزانن. لە وەها تێگەیشتنێکدا کۆنترۆڵی نیهایی دامەزراوەکان لە دەست هەیئەتی بەڕێوەبەری یان سەرمایەدارەکاندا دەمێنێتەوە. بەشێکی دیکە دێموکراسیی پیشەسازی تەنیا کاتێك دەتوانێ وەدی بێ کە کرێکارەکان کۆنترۆڵی دامەزراوە ئابوورییەکان بگرنە دەست.

لە روانگەیەکی دیکەوە، دێموکراسیی پیشەسازی بە مانای بەشداریی کرێکارەکان لە خاوەنداریەتیی بەشێك لە پشکەکان [سهام]و سەرمایەی [Capital] کۆمپانیاکان بە جۆرێکە کە لانیکەم بە قەدەر خاوەن پشکە بچووکەکان لەسەر بەڕێوەبەری‌دا دەست ڕۆیشتوویی‌یان ببێ. هەروەها تاقمێکی دیکە لە لایەنگرانی دێموکراسیی پیشەسازی، خوازیاری بەڕێوەبەریی هاوبەشی نێوان لیژنەی بەڕێوەبەری‌و نوێنەرانی کرێکارەکانن. سەرئەنجام گرووپێکی دیکە تا ئەو جێگە دەچنە پێش کە دێموکراسیی پیشەسازی بە هاوتای کۆنترۆڵی چینی کرێکار بە سەر تەواوەتی سیستمی ئابووری‌سدا وەسف دەکەن. لەسەر یەك هەموو قوتابخانەکانی [مکاتب] دێموکراسیی پیشەسازی خوازیاری چەشنێك لە بەکارهێنانی کۆنترۆڵ لە لایەن کرێکارەکانی سەر بە کارگەکان‌و فابریکەکان دان. هەندێك لە نووسەران لە جیاتی دەستەواژەی "دێموکراسیی پیشەسازی" دەستەواژەی "دێموکراسیی ئابووری" بەڕێوەبەریی [مدیریت] کرێکاری‌و خودموختاریی کرێکارەکانیان بەکار هێناوە. دێموکراسیی پیشەسازی لە ئەدەبیاتی سیاسی‌دا زۆرجار لە گەڵ ئانارشیسم‌و سەندیکالیسمدا لێك گرێ دراون، بەڵام هەموو قوتابخانەکانی سوسیالیستیش بە جۆرێك خوازیاری دێموکراسیی پیشەسازی بوون بۆیە نووسەران ریشەی ئەندیشەی دێموکراسیی پیشەسازی بە یەکسان دەگێڕنەوە. بۆ پرودون بیرمەندی ئانارشیست‌و بۆ کارل مارکس. ئاستێك لە مەبەستە گشتییەکانی دێموکراسیی پیشەسازی، لە دێموکراسییەکانی ئەو سەدەمەدا کاری پێ کراوە. لە نێو وڵاتانی کۆمۆنیستیی پێشوودا، تەنیا یوگوسلاوی، دێموکراسیی پیشەسازی بە مانای روونی، بەکار دەهێنا. جۆرێك لە دێموکراسیی پیشەسازی ئێستا لە وڵاتگەلێك وەك ئاڵمان، ئیسپانیاو ئیتالیا باوە. زۆر لە خاوەن بیران، دێموکراسیی پیشەسازی بە ئامرازێك بۆ نەرمکردنی دێموکراسیی سیاسی لە

سیستمەکانی سەرمایەداریدا دەزانن‌و ئەوەیان بە ڕێگەیەك بۆ سازانی نێوان دێموکراسی‌و سوسیالیزم زانیوە.

## دێموکراسیی کریستیان

حیزبەکانی دێموکرات کریستیان فەلسەفەی سیاسی‌و بنەماکانی بڕواکانیان بە دێموکراسی لە بنەماکانی کریستیانەیت [مەسیحییەت] وەردەگرن. بزووتنەوەی دێموکرات کریستیان بریتی لە حیزبەکان، یەکیەتییەکان، ڕێکخراوەو گرووپە سیاسییە جۆراوجۆرەکان‌و بەتایبەت لە وڵاتانی کاسۆلیك ئایینی ئورووپایی بووە. ریشەی دێموکراسیی کریستیان دەگەڕێتەوە بۆ دژکردەوەی کەنیسەی کاسۆلیك بە کێشەکانی جیهان‌و هەڵوێستەکانی لیبرالیسم، ناسیۆنالیزم‌و سوسیالیزم. لیبراڵەکان، سوسیالیستەکان‌و ڕیفۆرمیستە ئورووپاییەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە، کەنیسەی کاسۆلیکیان بە کوسپی سەر ڕێی گەشەی کۆمەڵایەتی‌و یەکیەتیی نەتەوەیی دەزانی. لە ئاکامدا کاسۆلیك لە پێگەیەکی دیفاعییەوە دەستی دایە تیۆریزەکردنی هەڵوێستە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکانی خۆی. واتیکان پێشتر لە سەدەی نۆزدەهەمدا بنەماکانی لیبرالیسم‌و دێموکراسیی بە فەرمی مەحکووم کردبوو. تاقمێك لە زانایانی ئایینی کاسۆلیك لە بارودۆخی نوێی کۆمەڵایەتیدا داکۆکییان لە مافە مەدەنییەکان، ئازادیی سیاسی‌و جیایی ئایین لە دەوڵەت دەکرد، لە لایەن کەنیسەی کاسۆلیکەوە مەحکووم کران‌و هەندێك ڕێکخراوەی دێموکراتیکی کاسۆلیکیان هەڵوەشاندەوە. لە فەرانسە تەنیا لە دەیەی ١٩٣٠دا بوو کە لەگەڵ دامەزرانی "پارتی دێموکراسیی خەڵکی" دێموکراسیی کریستیان ڕەنگێکی ڕێکخراوەیی پەیدا کرد. ئەم پارتە پاش شەڕی دووهەمی جیهانی وەك "بزووتنەوەی کۆماریخوازی خەڵکی" ناسراو تا ساڵی ١٩٦٩ چالاك بوو.

لە ئاڵمان کاسۆلیکەکان لە دژکردەوەیەك بە چاکسازیی فەرهەنگی ئۆتوفون بیسمارك "پارتی ناوەندیان" پێك هێنا کە لە هەڵوێستەکانی لیبرالیسم‌و سوسیالیزم ڕەخنەی دەگرت‌و خوازیاری وەرگرتنی مەوقیفێك [هەڵوێستەیەك] بەشێوەی کریستیانیلەگەڵ کێشەی چینەکانی لە خوارێ بوو. لە ئیتالیا، لەبەر داگیرکرانی موڵك‌و زەوینەکانی کەنیسەی کاسۆلیك لە ساڵی ١٨٧١دا، پاپ تا نێو واتیکان پاشەکشەی کردو بەشداریی لە سیاسیەتدا بۆ کاسۆلیکەکان یاساخ کرد. دواتر واتیکان دێموکراسیی وەك یەکێك لە حکوومەتە ڕەواکان ناسی. بەڵام لەسەر

ناسینی ئایینی کاسۆلیك وەك ئایینی فەرمیی وڵات پێی داگـرت. واتیکـان رەخنـەی لەسـەر لیبرالیسمو سوسیالیزم هەبووو لە بەرانبەردا لە مافی کرێکارەکان بـۆ پێکهێنـانی یەکیەتییـە کریستیانیەکان پشتگیری دەکردو کەنیسـەی کاسـۆلیك سـەرئەنجام لـە سـاڵی ١٩١٨دا یاسـاخ بوونی بەشداریی کاسۆلیکەکان لە سیاسـەتدا هەڵوەشاندەوەوو بەدوای ویدا "پـارتی خـەڵکی" لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژیای دیموکراسیی کریستیانی دامەزرا. هەر ئـەم پارتـە لـە سـەرەتای گۆرانی پارتی دیموکرات کریستیانی ئیتالیا پاش شەری دووهەمی جیهانی کە تا ساڵی ١٩٩٤ بە حیزبی سەرەکیی دەسەڵاتبەدەستی سەرەکی دەژمێردرا. لەو ساڵەدا رێـبەرانی حیزب بـەهۆی تێوەگلانی حیزب لە گەندەڵیی دارایی بەربڵاو، هەڵیان وەشاندەوەو لـە جێگـەی ئـەو "حیزبـی خەڵکی"یان دامەزراند.

گرینگترین تیوریسینی دیموکراسیی کریستیان ژان مـارتین (١٩٧٣ ـ ١٨٨٢) فەیلەسـووفی کاسۆلیکی فەرانسـەوی بـوو. نـاوبراو لـە بەرهەمـە جۆراوجۆرەکـانی خۆیـدا بەتایبـەت لـە کریستیانو دیموکراسی (١٩٤٢)دا بەڵگەی هێنایـەوە کـە زۆرینـەخوازیی سیاسـی، ئـازادیو "کەسایەتیخوازی" [تشخص Distinction ] مرۆڤ لەسەر بنەما سەرەکییەکانی کریـستیانی راوەستاوە. چەمکی "تشخیص"ی مرۆڤ لە کریستیاندا بە بۆچـوونی ئـەو بـانتر لـە چـەمکی "فردیـت" [Individvality تاکایـەتی] لـە لیبرالیـسم دایـە. لـە روانگـەی مارتینـەوە، دیموکراسی لەبارترین سیستمە بۆ دابینکردنی "تشخص" [Distinction]و ئازادیی مرۆڤـە. لە دیموکراسیدا زۆرینـەخوازی ئایین دەپارێزریو دەوڵەت سەبارەت بـە ئایینـە جۆراوجۆرەکـان نەرمی دەنوێنێ. بە بۆچوونی مارتین هەرچەند خاوەندارییەتیی تایبەتی، مـافێکی سروشـتییە، بەڵام بەرپرسایەتیی کۆمەڵایەتیش پێك دێنیو لەسەر یەك دیموکراسیی کریستیانو پارتـەکانی دیموکرات کریستیان لە فەرانسە، ئاڵمان، ئیتالیا، نەمسا، بلژیك، هولەندو وڵاتگەلی دیکە بە مەبەستی پشتیوانی لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتییـەکانی کەنیسەی کاسۆلیك سەریان هـەڵداو لـە ژێر رۆشنایی بنەماکانی کریستیان کەوتنە دیفاع لە دیموکراسی، مافی مرۆڤ، خۆشـگوزەرانیی کۆمەڵایەتی، ئابووریی تێکەڵاو پشت بەستوو بە سەرمایەداریو یەکیەتیی ئورووپا. لـە پـاش ساڵی ١٩٨٩ پارتە دیموکرات کریستیانەکان لە رووسیەو باقیی وڵاتانی ئورووپای رۆژهەڵاتیش پێك هاتن. پارتەکانی دیموکرات کریستیان خاوەن رێکخراوەیەکی نێونەتەوەییشنو گـەورەترین گرووپی یەکگرتووی پارلمـانی ئورووپـا هەڵکـەوتوو لـە ستراسـبورگ پێـك دێـنن. پارتـەکانی

دێموکرات کریستیان لەسەر یەك پارتگەلێکی نەرمڕۆو مبانەڕەونو لەگەڵ توندڕەوی چەپو راست بەرنگاری دەکەن.

### دێموکراسیگەلی دامەزراو لەسەر بنەمای نوێنەرایەتیی بەرژەوەندیی گرووپەکان

گرووپێك لە لایەنگرانی دێموکراسی لە جیاتیی هەڵبژاردنی نوێنەرەکان بە پێی ناوچەی جوغرافیایی لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی گرووپەکانو رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان پشتیوانیان کردوە. بە بۆچوونی ئەوان گرینگترین بەرژەوەندیی گرووپەکان دەبێ لە رەوتی بڕیاردانی گشتیدا بەشدارییان ببێ. سوسیالیستەکانی پیشەیی خوازیاری وەها دەنگێك لە نوێنەرایەتی بوونو لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم کەوتنە پەیجوری ریفورم لە دێموکراسیدا. لە روانگەی ئەوانەوە دەبوایە لە تەنیشت پارلمانێك تێکەڵ لە نوێنەرانی ناوچە جوغرافیاییەکان، پارلمانێکیش تێکەڵ لە نوێنەرانی پیشەکان، گرووپەکان، رێکخراوەکان، پیشەسازییەکانو ... پێك بێ.

ئەنجومەنی یەکەم دەبوایە لە کێشە گشتییەکانی هەموو گرووپەکانو رێکخراوەکان بکۆڵێتەوە، بەلام ئەنجومەنی پیشەیی سەبارەت بە بەرژەوەندیی هەرکام لەوانەو بە باشترین شێوە دابین کردنیان بڕیار بدا. بنەمای نوێنەرایەتیی بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا لە دێموکراسییەکانی چەند قەومی، پیشەییو ئەنجومەنی کاریگەرە.

## دێموکراسیی چەند قەومی

دێموکراسیی چەند قەومی، سیستمێکە کە لەودا چەند گرووپی قەومی، ئایینی، فەرهەنگی لە دەسەلاتی سیاسیدا شەریکنو لە بڕیارە سیاسییەکاندا بەشدارییان هەیە. چوار تایبەتمەندیی سەرەکی بۆ ئەم جۆرە لە دێموکراسی ناو دەبرێ: ١) بەشداریی نوێنەرانی گرووپەکانی قەومی گرینگ لە رەوتی بڕیاردانـدا، ٢) کەڵك وەرگرتنی ئەو گرووپانە لە ئاستێکی بالای خودموختاری نێوخۆیی؛ ٣) دابەشکردنی دەسەلات بە پێی رێژەی گرینگیی گرووپەکان؛ ٤) دەسەلاتی ویتۆ بۆ گرووپەکانی کەمینە. بەشداریی نوێنەرانی گرووپەکانی قەومی لە بەڕێوەبردنی حکوومەتو بەتایبەت بڕیاردانی بەڕێوەبەری، لەوانەیە بیچمی رێکخراوەیی جۆربەجۆری هەبێ. یەکێك لە شێوەکانی بماو، پێکهێنانی دەوڵەتی ئیئتیلافی گەورە لە دێموکراسییەکانی پارلمان وەك بلژیکە. شێوەی ئەندامەتیی نوێنەرانی گرووپەکانی قەومی

ئایینی گرینگ لە هەیئەتی دەولەتدا بە شێوەیەکە کە سەبارەت بە هەیئەتی دەوڵەتی ٧ کەسی سویس دەبینرێ. لە سیستمی سەرۆکایەتیی لوبنـان، پۆستـە سـەرکییەکان وەك سـەرکۆماریی نێوان گرووپەکانی قەومی، ئایینی جۆراوجۆر دابـەش بـووە، بـەم پێیـە کـە سـەرکۆماری بـۆ کریـستیانەکانی مارونی، سەرۆك وەزیران بـۆ موسـوڵمانەکانی سوننیو سـەرۆکی پارلمـان بـۆ موسوڵمانەکانی شیعەو ... هتد لەبەرچاو گیراوە. بەو حاڵەش دابەشکردنی دەسەڵات لە نێـوان گرووپەکانی قەومی لە سیستمگەلی پارلمانیدا ساناترە تا لە سیستمگەلی سـەرۆکایەتیدا کـە لەواندا دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە دەست یەك کەس واتا سەرکۆمار دایە.

سەبارەت بە خودموختاریی نێوخۆیی، دەسەڵاتی بڕیـاردان لـە مەسـایلی تایبـەت بـە هـەر گرووپێکی قـەومی دەسـپێردرێتە دەسـت هـەمان گـرووپ. ئەگـەر گرووپگـەلی قـەومی لـە ناوچەگەلی جوغرافیایی تایبەتدا جێگرتوو بن، خودموختاریی نێوخـۆیی زۆرجـار بـە شـێوەی سیستمی فیدراڵی دەردەکەوێ. بۆ نموونە لە کانادادا زۆربەی فەرانسەوی زمانەکان لە هـەرێمی کیبك [QUEBEC] خڕبوونەتەوە، ئەگـەر گرووپـەکانی قـەومی لـە رووی جوغرافیاییـیـەوە تێکەڵ بن، لەو کاتەدا خودموختاری دەتوانێ خەسڵەتی ناجوغرافیایی هەبێ. بۆ نموونە بە پێی دەستوور ١٩٦٠ قوبرێس دوو ئەنجومەنی جیا لە یەك بۆ یونانییەکانو تورکەکان، بە دەسـەڵاتی یاسادانانی تایبـەت بە خۆ لە بواری کاروباری تایینی، فەرهەنگیو فێرکاریدا دامەزراندبوو.

مەبەست لە دابەشکردنی دەسەڵات بە گوێرەی بایەخی گرووپە قەومییەکان بەگشتی ئەوەیـە کە پۆستە بەڕێوەبەرییەکانی، پارلمانیو دیوانیو هەروەها دابەشکردنی مەسروفاتی گـشتی بـە پێی حەشیمەتو بایەخی گرووپەکانی قـەومی بـەڕێوە دەچـێ. باشـترین شـێوەی دابینکردنـی نوێنەرایەتی ئەم گرووپانە لە پارلماندا هـەر سیـستمی نوێنەرایـەیی رێژەییـیـە. بـەڵام کاتێـك گرووپـە قەومییـەکان لـە ناوچـە جوغرافیاییـیـەکانی تایبەتـدا کـۆ بووبێتنـەوە، سیـستمی هەڵبژاردنی زۆرایەتی، بە ناوچەی تاك نوێنەریش دەتوانێ مەبەستەکەی جێبەجێ بکا. شـێوەی دیکە ئەوەیە کە ژمارەیەکی دیاریکراو لە کورسییەکانی پارلمـان بـۆ هـەرکام لـە گرووپـەکانی قەومی لەبەرچاو بگیردرێ.

مافی ڤیتۆ لە لایەن کەمینەوە زۆر بوەتە بابەتگەلی زۆر توندوچارەنووس ساز وەك بڕیـاردان سەبارەت بە سیستمی هەڵبژاردن، سیستمی شارەوانییەکانو یاسادانان لە کاروبـاری سیـستمی فێرکاریو کێشە فەرهەنگییەکاندا بەرتەسك دەبێتەوە. بەو حاڵەش مافی ڤیتۆ لەم پێوەندییەدا

زۆرجار بەشێکە لە ڕێکەوتنە نافەرمییەکانی نێوان گرووپە قەومییەکان‌و لە دەستووردا ڕەنگی داوەتەوە.

## دێموکراسیی پیشەیی

دێموکراسیی پیشەیی ئەو جۆرە دێموکراسیەیە کە لەودا ئەنجومەنەکانی نوێنەری کۆمەڵێکی دیاریکراو لە بەرژەوەندییەکان‌و گرووپەکانی پڕبایەخی کۆمەڵگا بە شێوەی فەرمی لە لایەن دەوڵەتەوە ناسراوبن‌و لە قوناخەکانی ڕاوێژکاری، سیاسەتدانان‌و، بەڕێوەبەریی سیاسەتەکاندا دەستیان هەبێ. دێموکراسیی پیشەیی (کە دیارە دەبێ لە دەوڵەتی پیشەیی‌خواز کە لایەنی ئابووریی دەوڵەتگەلی دەسەڵاتخوازو فاشیستی سەدەی بیستەم بووە، جیایی دابنرێ) پاش شەڕی دووهەمی جیهانی لە هەندێك لە وڵاتەکانی ئورووپایی‌دا دامەزرا. لەم دێموکراسییانەدا، ئەنجومەنەکانی سەرەکی وەك یەکیەتییەکانی خاوەن کاریی [کارفرما]، پیشەیی [Professional]، کرێکاری‌و ... هتد پێگەیەکی گرینگ لە ڕەوتی سیاسەتدانانی دەوڵەتی‌دا پەیدا دەکەن‌و لە بەرانبەردا، پشتیوانی ئەندامانی خۆیان لەو سیاسەتانەو بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە دەوڵەت دەستەبەر دەکەن. لەم وڵاتانەدا، لە تەنیشت پارلمان بە مانای فەرمی دەسەڵاتداریەتی، جۆرێك "پارلمانی پیشەییش" [corporation] بوونی هەیە کە بەتایبەت لە بوارەکانی سیاسەتەکانی ئابووری بڕیار دەدەن. هەرچۆنێك بێ لەم دێموکراسییانەدا، هەموو ئەنجومەنەکان‌و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان، خاوەن قورسایی‌و بایەخی سیاسیی وەك یەك لێك نادرێنەوە. نموونەگەلێك لە دێموکراسیی پیشەیی دەتوانین لە نەمساو سوئێدو هوڵەندا بدۆزینەوە.

(٧)

## پاساودان و رەخنەکانی دیموکراسی

دیفاع لە دیموکراسی زۆرجار لە روانگەی قوتابخانەگەلێکی پڕبایەخ وەك لیبرالیسم، پراگماتیسم، رەسەنایەتی قازانج، رێژەگەرایی و ئەقڵگەرایی بەرێوە چووەو لەوانەدا بە هۆکارگەلێك وەك دابینکردنی ئازادیی تاك، مافە سروشتییەکان، بەرژەوەندیی تاك، بەرژەوەندیی گشتی، دابینکردنی سەقامگیریی سیاسی، دەستەبەرکردنی گەشەی ئابووری و ... لە دیموکراسی دیفاع کراوە.

لە بەرانبەردا رەخنە لە دیموکراسی زۆرجار لە لایەن قوتابخانەگەلێکی وەك پارێزگار، هەڵکەوتوو [نخبە]گەرایی، فاشیسم، تێڕوانینەکانی رومانتیك‌و تیۆریگەلی سیاسی ئایینی بەرێوە چووەو لەوانەدا بە هۆکارگەلێك وەك زاڵبوونی نەزانان بەسەر کۆمەڵگدا، دیکتاتۆریی زۆرینە، دابەزاندنی ئەخلاقی کۆمەڵگا، بڵاوکردنەوەی پووچی‌گەرایی، سەرهەڵدانی هەرکی بە هەرکیی کۆمەڵایەتی، زاڵبوونی سەلیقەی عەوامانە، لە نێوچوونی نایەکسانیی سروشتی، یەکسانکردنەوەی کۆمەڵایەتی، زاڵبوونی سەرمایەداری‌و ... هتد، دیموکراسی کەوتۆتە بەر رەخنە.

### دیفاع لە دیموکراسی

پاساوگەلێکی هەمەجۆر بۆ دیفاع لە دیموکراسی خراوەتە روو. خاڵی دەستپێکردنی ئەم جۆرە دیفاعانە جیاوازن‌و دەکرێ ئەوانە بە پێی خاڵی دەستپێکردن، بە چەند چین دابەش بکرێن. دیارە وەها دیفاع کردن‌و پاساودانێك یەکتر دەبڕنەو دەگرنەوەو لە ئەندیشەی سیاسیی بیرمەندان بە شێوەیەکی تێکەڵ دەخرێنە روو.

**روونکردنەوەی دیموکراسی بە پێی نەبوونی دەرەتانی بەدەستهێنانی شوناسی بێ ئەملاوئەولاو یەکلاکەرەوە**

تاقمێك لە فەیلەسووفەکانی کۆن‌و نوێ وەك جان ستوارت میل، برتراندراسل‌و کارل پووپێر لە پێگەی شوناس‌و ناسانەی شکاکانەوە لە دیموکراسی دیفاعیان کردوە. میل لەسەر ئەو بڕوایەدا بوو کە زانست‌و شوناس بە شێوەیەکی گشتی بەرهەمی موعامەلەو پێکەوەهەڵکردنی کۆمەڵایەتی، راوێژو دیالۆگە، دەنا راستی‌و حەقیقەت بە شێوەی عەینی،

ڕەهاو گشتی دەست ناکەوێ. لەبەر ئەوەی کە شكو نەبوونی دڵنیایی [یقین]و لێبڕاویی [قطعیت] دەرخەری بارودۆخی مرۆڤەو هەر شوناسێك بەرهەمی ئاڵۆزو پێکەوە هەڵکردنە، لە ئاکامدا دیموکراسی تەنیا سیستمی لەباری گونجاوە. راسلو پووپێریش بەڵگەیان دەهێنایەوە کە ناتوانرێ بە دڵنیایی تەواوو ڕەها لەسەر کاروبارەکان شوناس بەدەست بهێنرێت. لێبڕاوترین بڕیاریك کە دەکرێ سەبارەت بە یاساو ڕێساکانی زانستی بدرێ، ئەمەیە کە بڵێین کە هێشتا هەڵنەوەشاونەتەوە. کەوابوو شوناسی ئێمە لە توانایی ئێمە بۆ هەڵوەشاندنەوە دایە، نە ئاکامی سەلماندنی بەدڵنیاییو بێئەملاوئەولا. بە بۆچوونی پووپێر "کۆمەڵگای کراوە" دەرئەنجامی بە ناچاریی "جیهانی کراوەیە" ئەوەی کە لە بیاڤی زانستو شوناسدا، پووچ کردنەوە [ابطال] وەك ئامرازی پێشکەوتنی زانستی ئێمە بەڕێوەی دەبا، لە بیاڤی سیاسەتو کۆمەڵگادا لە ئەستۆی "ڕەخنەیە". کۆمەڵگای کراوە، کۆمەڵگایەکی ڕەخنەگرە، تاقمێکی دیکە بەڵگەیان هێناوەتەوە کە لەبەر ئەوەی هیچ پێوەرێکی دیکە بۆ ناسینەوەی ڕاستی [حقیقت] لە ژیاندا دەست ناکەوێ، تەنیا پێوەری گونجاو ژماردنی دەنگی تاکەکان یان ژمارەیە.

## حکوومەت کردن بە سەر خۆدا ڕەواترە تا حکوومەت کردن بەسەر دیکەدا

تۆماس جیفرسۆن دەیگوت کە ئەگەر مرۆڤەکان هەروەك موخالفەکانی دیموکراسی پێیان وایە، ناتوانن بەسەر خۆیاندا حکوومەت بکەن، بە دڵنیاییەوە [بطریق اولی] ناتوانن بەسەر ئەوانی دیکەدا حکوومەت بکەن. کەوابوو حکوومەت کردن بە سەر خۆدا ڕەواترو گونجاوترە تا بە سەر کەسانی دیکەدا. (وینستۆن چرچیل)یش دەیگوت: دیموکراسی پاش جۆرەکانی حکوومەت، باشترین جۆری حکوومەتە. بە واتایەکی دیکە ئەگەر پاساودانێك بۆ حکوومەت هەیە، لە پێشدا بۆ دیموکراسیە پاشان بۆ باقیی جۆرەکانی حکوومەت.

## چارەنووسی دیموکراسی بە پێی یەکسانیی سروشتی مرۆڤەکان

ئەگەر ئەوە بە خۆمان بسەلمێنین کە مرۆڤەکان یەکسان لە دایك دەبن، دەبێ دەرئەنجامی ئەوەش بسەلمێنین کە هەموان مافێکی یەکسانیان لە بەشداری لە حکوومەت بەسەر خۆیاندا هەیە. هەروەها لەبەر ئەوە کە مرۆڤەکان بە پێی سروشت، ئازاد هاتوونەتە جیهانەوە، مافی

خۆیانە سەبارەت بە وەرگرتنی [پـذیـرش] دەسـەڵاتداریەتیی سیاسـیو گوێڕایـەڵی لێـی، ئازادانەش رەزامەندیی یان دژایەتیی خۆیان رابگەیەنن. بەڵگەهێنانەوەی ئەوانەی خاوەن تیۆری پەیماننامەی کۆمەڵایەتی، لەسەر وەها لۆژیکی [مـنطق] راوەستابوو. بـە بۆچـوونی ئـەوان، ئـازادیو یەکـسانی سـەرەتای مافـە، مـاف سـەرەتای تـەوافوقو رەزامەندییـەو تـەوافوقو رەزامەندی پێویستیی پەیماننامەی کۆمەڵایەتی بۆ چوونە ژێر باری دەسەڵاتی حکوومەتە، وەها حکوومەتێك هەر ئەو دێموکراسییەیە.

## پاساوی دێموکراسی بە پێی گوێڕایەڵیی خەڵك لە یاساگەلێك کە خۆیان دایان ناوە

لە روانگەی رۆسۆوە، مرۆڤەکان کە بە ئازادی هاتوونەتە دونیاوە، تەنیا لە دێموکراسی دایـە کە دەتوانن لە هەمانکاتدا کە گوێڕایەڵی حکوومەتن، ئازادیی خۆشیان بپارێزن، لەبەر ئـەوەی لە دێموکراسیدا مرۆڤەکان لە یاساگەلێك پێڕەوی دەکـەن، کـە خۆیـان دایـان نابـێ. کـەوابوو پێڕەوی لە یاساکانی خۆیان هەر ئەو پێڕەوی لە خۆ واتا ئازادییە. کـەوابوو لـە دێموکراسـیدا پێڕەوی لە یاساکانو ئازادی وەك یەكو یەکسانە. لەم هەلومەرجەدا تەنانـەت ئـازادیی خـەڵك قووڵتر بۆتەوەو خەسڵەتی مەدەنیو ئەخلاقیی وەرگرتوە. لە وەهـا روانگەیەکـەوە دێموکراسـی تەنیا حکوومەتی رەواو گونجاوە، لەبەر ئەوە لەودا ئازادیو یاسا وەك یەکن. بە واتایەکی دیکە دێموکراسی تەنیا حکوومەتێکی رەوایە کە لەگەڵ ئازادیی مرۆڤەکان دەسازێ.

## پاساوی دێموکراسی بە پێی بەرژەوەندیو قازانج

جیرمی بنتهام، فەیلەسووفی گەورەی بریتانیایی، بەڵگـەی دەهێنایـەوە کـە ئەگـەر هـەموو مرۆڤەکان ویستو نیازێکی وەك یـەکیان هەیـەو شادیو خەونـەکانیان وەك یـەکن، کـەوابوو دابینکردنی نیازو ویستی هیچ کەس ناتوانێ بەسەر شادیی ئەوی دیکەدا لەسەرتر بێ. کەوابوو ئەوەی کە لە بڕیاردانەکانی گشتیدا دەبێ پێوەر بێ، هەر تەنیا چەندی واتا ژمارەی کەسانێکە کە لە بڕیاردانەکاندا سوودیان پێ دەگا. کەوابوو دێموکراسی حکوومەتێکە کە لـەودا زیـاترین رادەی شادی بۆ زیاترین ژمارەی خەڵك لەبەرچاو دەگیرێ. بە پێی ئەوە کـە ئـەرکی سـەرەکیی حکوومـەت لـە روانگـەی بنتهامیـەوە، دابینکردنـی خۆشـگوزەرانیو بەختـەوەریو قـازانجی

گشتییەو خەڵکیش لە ڕووی لێهاتوویییەوە لە کەڵك وەرگرتن دا وەك یەکن، کەوابوو هیچ شتێکی دیکە بێجگە لەوە کە خەڵك بۆخۆیان پێیان باشە، نابێتە ئامانجی نیهایی حکوومەت. بە وتەی "بنتهام" تیئۆرییەك کە بیهەوێ ئامانجی نیهایی دەوڵەت لە بەرەوپێشبردنی قازانجو شادیی خەڵکدا بێ، ئەوکات ئامانجی نیهایی دەوڵەت لەگەڵ ئامانجی نیهایی ژیانی مرۆڤ یەکسان دەبن.

## پاساوی دێموکراسی بە پێی خێرو ئاسایشخوازیی مرۆڤەکان

ئەگەر دامەزراندنی حکوومەت بۆ دابینکردنو پارێزگاری لە خێرو ویستی خەڵکە، ئەوکات خەڵك بۆخۆیان باش دەزانن چ بە قازانجیانەو چییان دەوێو لەو بارەوە زیاتر لە هەر سەرچاوەیەکی دیکە لێهاتوویی حکوومەت کردنیان (بە سەر خۆیاندا) هەیە.

تیئۆریگەلێکی نوێتر، دێموکراسی لەسەر وەها بناخەیەك حکوومەتی خەڵك سالارییان ڕوون کردۆتەوە. لەم سیستەمەدا دەنگی خەڵك، باترین پێوەرو باشترین ئامرازی هەڵسەنگاندنی ڕەوایی حکوومەتە. هەر بەڵگەهێنانەوەیەك کە سەرچاوەیەکی دیکە جگە لە خودی خەڵکەکە بۆ دەستنیشانکردنی قازانجیان لەسەرتر دابنێ، بە ناچاری دەبێتە حکوومەتێکی نادێموکراتیك، سەرەڕۆ یان تۆتالیتێر.

## پاساوی دێموکراسی بە پێی پێوەندیی دێموکراسی لەگەڵ ئاشتیخوازی

بە پێی ئەم بەڵگەهێنانەوە [استدلال]، ئەگەری ئەوە کە دێموکراسییەکان شەڕیان لە نێودا هەڵبگیرسێ، کەمتر لە ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان حکوومەتە نادێموکراتیکەکاندایە، لەبەر ئەوەی خەڵك بەگشتی لە بنەڕەتدا لەگەڵ شەڕو کێشە نینو ئەگەر لە حکوومەتدا بن، دووری لە شەڕ دەکەن. شەڕە بچووكو گەورەکان زۆرجار بەهۆی دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆو خۆویستو، یان حکوومەتە ئولیگاریشیو داخراوەکانەوە خراونەتە ڕێ.

## پاساوی دیموکراسی لەسەر دەستەبەرکردنی گەشەی ئابووریی سەرمایەداری

بە پێی ئەم بەڵگەهێنانەوە، دیموکراسی پێوەندییەکی مێژوویی نیزیکو تەنانەت یەکلاکەرەوەشی لەگەڵ گەشەی کۆمەڵگای پیشەسازیو پەرەسەندنی ئابووری هەبووە. دیموکراسیو سەرمایەداری هەردوو لەسەر بناخەی ئازادی راوەستاونو، ئازادییش، بە بێ هەرکام لەوانە سەقامگیر نابێ. سەرمایەداری دەرەتانی گەشەی دیموکراسیو، دیموکراسی پێویستیی درێژکێشانی سەرمایەداری بووە. لایەنگرانی قوتابخانەی نئۆلیبرالیسم، دیموکراسیو سەرمایەداری بەم شێوەیە بۆ یەکتری بە پێویست دەزانن. تەنانەت بە پێی روانگەی فردریش فون هایك، فەیلەسووفی بە رەگەز نەمسایی، بازاڕی ئازاد هەروەك سیستمێکی خۆڕسك بە پشتوانەی شوناسنامەی دیموکراسی دەژمێردرێ. دیموکراسیو بازاڕی ئازاد هەردووك دیمەنگەلێك لە سیستمی خۆڕسكو سەرانسەری جیهانن (کاتالاسکی). ئازادیو خاوەندارییەتی، خۆی لە خۆیدا، پێکەوە بەستراون. کەوابوو هەرچەشنە سنووردارکردنێك بۆ خاوەندارییەتی کە لە رێی سوسیالیزم، دەوڵەتی خۆشگوزەرانیو، یان پلان دانانی دەوڵەتییەوە دابنرێ، لەگەڵ ئازادیو سیستمی خۆڕسك بەگشتی ناتەبایە.

## رەخنەکان لە دیموکراسی

دیموکراسی زۆر دەمێکە کەوتۆتە بەر رەخنەو هێرش. بە گۆڕان لە چەمکی دیموکراسیدا، دیارە رەخنەکانیش گۆڕانیان بەسەردا هاتوە. تا پێش شۆڕشی فەرانسە، دیموکراسی بەگشتی لە لای بیرمەندانی سیاسی ناپەسەندو ناحەز بوو. تەنیا لە سەدەکانی ئەم دواییەدا دیفاع لە دیموکراسی گشتگیر بووە. یەکەمین رەخنەکان لەسەر دیموکراسی لە لایەن زانایانی یونانیو بە دژی دیموکراسیی راستەوخۆی یونانی هاتە ئاراوە. دیموکراسیی یونانی راستەوخۆ کە پشتی بە بەشداریی راستەوخۆی هەموو هاووڵاتیان، لە ئەنجومەنەکانو کۆڕوکۆمەڵەکانو دەستاودەستکردنی پۆستە سیاسییەکان لە نێویاندا بوو، سروشتییە لەگەڵ دیموکراسیی ئەو سەردەمەدا کە پشتی بە نوێنەرایەتیو پارتەکان بەستبووە، جیاوازیی سەرەکی هەیە. هیرودت مێژوونووسی گەورەی یونانی، دیموکراسیی یونانی بە حکوومەتی کۆمەڵانی نەزانو خۆویستو هەژار دەزانیو لەسەر ئەو بڕوایەدا بوو کە خەڵك پێویستییان بە پشتیوانیو رێنوێنیی شاکان

هەیە. توسیدید مێژوونوسێکی دیکەی یونانیش پێی وابوو دیموکراسیی ئاتتی بە سانایی دەتوانێ بگۆڕدرێت بە حکومەتی لاتو لووتان کە دەبنە هۆی ترسی خەڵکی زاناو سیاسەتگەلی دەرەوەیی وا دەگرنە پێش کە نەزانانەیە. ئەفلاتوون حکومەتی دیموکراسیی ئاتتی بە بەرپرسی ئیعدامکردنی سوقراتو حکوومەتی خەڵکانێی نەزان دەزانێو ناتوانن لە شوناس بگەنە نموونەو سەمبول، [مُـثُـل]. خەڵکی ئاسایی لە روانگەی ئەفلاتوونەوە، لە گەورەییو کەرامەتی دادپەروەری بێئاگانو تووشی هەواو هەوەسن. بەتایبەت رێورەسمی دەستنیشانکردنی ئەندامانی ئەنجومەنی ٥٠٠ کەسیی ئاتێن بە پێی تیروپشك [قرعـە] لە روانگەی ئەفلاتوونەوە، رەوشێکی نەزانانەو ئەحمەقانە بوو. هەروەها هەروەك کە ناتوانرێ دوکتورو چێشت لێنەر بە پێی تیروپشك هەڵبژێردرێن، ئەوانیش کە لە سیاسەت دەزانن، نابێ بە پێی تیروپشك هەڵبژێردرێن.

دیموکراسی هەروەها لە روانگەی ئەفلاتوونەوە، خەڵەتاندنی خەڵکیو فریودانی [دەماگوژی]ی لێ دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوەی رێبەرانی حکومەتی دیموکراسی شتگەلێك بە خەڵك دەڵێن کە پێیان خۆشە، نە ئەوەی کە پێویستیان پێیان بێ. بەو حاڵەش ئەفلاتوون لەو بەرهەمانەی کە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا نووسیویە، تا رادەیەك روانگەی سەبارەت بە دیموکراسی گۆڕاوەو هەندێك نەرمیی نواندوەو دیموکراسیو مونارشیی وەك توخمە سەرەکییەکانی رژێمە تێکەڵەکان [مرکب] وەسف کردوە. بە بۆچوونی ئەو دیموکراسی باشترین جۆری حکوومەت لە نێوان خراپترین جۆرەکانی حکوومەتە (واتا دیکتاتۆری، ئولیگاریشیو دیموکراسی).

روانگەی ئەرەستوو سەبارەت بە دیموکراسی بەرادەی ئەفلاتوون رەخنەگرانە نەبوو. ئەو تێکەڵێك لە دیموکراسیو ئولیگاریشی لە چوارچێوەی "پولیتی"دا بە باشترین حکوومەتی گونجاو دادەنا، لەبەر ئەوە لەم حکومەتەدا خاوەن سامانەکانو هەژارەکان لە چەوساندنەوەی یەکتر دوور دەبن. بەو حاڵەش باشترین جۆری حکوومەت، لە روانگەی ئەرەستۆوە، حکوومەتی چینەکانی نێونجی بوو کە خەسڵەتی ئەرمڕەوییان هەیە، لە کاتێکدا حکوومەتی دەوڵەمەندەکانو هەژارەکان روو لە توندڕەوی دەکەن. هەر بەو جۆرە سان سیمون سیاسەتوانی ناوداری رومی، دیموکراسیی تۆخ [نـاب] بە هۆکاری گەندەڵی لە ژیانی سیاسیدا

دەزانێو خوازیاری تێکەڵێك لە پێکهاتەی مونارشی، ئاریستۆکراسیو دێموکراسی وەك باشترین جۆری حکوومەت بوو.

ئەندیشەی سیاسیی کریستیان لە سەدەکانی نێوەڕاست بە تەواوی دژی دێموکراسی بوو، زۆر لە زانایانی ئەو سەردەمانە پشتیان بە رەستەگەلێك لە "نووسراوەی پولسی رەسووڵ بۆ رۆمیەکان" لە کتێبی پیرۆزدا دەبەست کە لەودا لە کریستیانەکان داوا کرابوو تا لەو دەسەڵاتانە کە خودا لەسەر ئەرزدا دایناون، پێڕەوی بکەن. خەڵکیش دیاربوو رەعیەتی دەسەڵاتدارانو شاکان بوونو تۆماس ئاکۆئیناس زانای بەناوبانگی سەدەکانی ناوەڕاست، حکوومەتی پادشاهی کە بە یاسا سنووردار بکرێ پێ لە دێموکراسی باشتر بووو حکوومەتی پادشایی هاوتای دەسەڵاتداریەتی خودای بەسەر جیهانی بووندا دەزانی. بۆیە لە روانگەی ئەوەوە دێموکراسی بە دژی سیستمی سروشتی بوو.

رەخنە لە دێموکراسی لە سەدەکانی نوێدا، لە نێو بیرمەندانی ئورووپاییدا هەروا درێژەی هەیە. نیکولوماکیاولی زانای سیاسیی سەدەی شانزەهەم، هەرچەند ئەم پەندە بەناوبانگەی کە دەیگوت: "دەنگی خەڵك دەنگی خودایە" زۆر بە نادروستی نەدەزانی، بەوحاڵەش لەسەر ئەو بڕوایەدا بوو کە خەڵك لە تەنیشت نەجیبزادەکانو دەستڕۆیشتووەکان هەر تەنیا بەشێك لە کۆڵەکەکانی حکوومەت پێك دێنن. لە روانگەی ناوبراوەوە، دێموکراسی سیستمێکی سەقامگرتوو نیەو دەسەڵاتی دەوڵەت ناپارێزێ، حکوومەتی بەدەسەڵات پێویستی بە رێبەرێکە کە سەروسامان بدا بە ژیانی سیاسی. هەر بەم جۆرە تۆماس هابز لە کتێبی لۆیاتان (١٦٥١) لە نێوان جۆرەکانی حکوومەت واتا مونارشی، ئاریستۆکراسیو دێموکراسیدا، مونارشی زیاتر لە هەمووان بە پارێزەری ئەمنو ئاسایشی کۆمەڵگا دەزانی. لە روانگەی هابزەوە، دێموکراسی بە مانای حکوومەتی راستەوخۆی خەڵك لە رێگای ئەنجومەنی گشتیی لە بواری جێبەجێکردندا ناتوانێ بەڕێوە بچێ. بە بۆچوونی ئەو، خەڵکی بەگشتی هەر بە شوێن ئەندیشەی ویستە تایبەتییەکانی خۆیانو بەهۆی خەڵك خڵەتێنە سیاسیو ئایینیەکان هەڵدەخڵەتێن. زۆرترین ئەخشێك کە دەکرێ بۆ خەڵك لەبەرچاو بگیردرێ، ئەمەیە کە سەبارەت بە دەسەڵاتی حاکم رەزامەندیی خۆی رابگەیەنێ. هابز هەروەها خاوەن پیشەکان، گرووپەکانو دامەزراوە مەدەنییەکانی بە "کرمی رێخۆڵەی دەوڵەت" دەزانی.

ڕەخنە لە دێموکراسی پاش شۆڕشی فەرانسە، گەیشتە لووتکەی خۆی. ئیدموند برک لە کتێبی "ڕاوەستانێك لەسەر شۆڕشی فەرانسە (١٧٩٠)، دێموکراسیی وەك شەرمهێنەرترین شێوەی حکوومەت وەسف کرد، لەبەر ئەوە وەها حکوومەتێك هیچ پێوەرێك بە سەرتر لە دەنگ‌و ڕای خەڵك نازانێ. دێموکراسی دوژمنی ئەخلاقە، بەو مانایە کە ئەخلاق بەهۆی عەقڵ‌و حیکمەت دەست دەکەوێ‌و عەقڵ‌و حیکمەت لەبەر دەست خەڵك بەگشتیدا نیە. برك لە بەرانبەردا، خوازیاری حکوومەتی "ئەشرافیەتی سروشتی" بوو. لە ڕوانگەی ئەوەوە گەورەترین گرفتی تیئۆریی دێموکراسی لەمەدا بوو کە یاسای بە هەڵقوڵاو لە ئیرادەی کۆمەڵانی خەڵکدا دەزانی. بەڕای ئەو، دوگماتیسم‌و نەریتەکان ژێرخانی دەسەڵات‌و پتەوی کۆمەڵگان‌و دێموکراسیی شۆڕشگێڕانەو عەقڵگەرایانە بە هێرش کردنە سەر نەریتەکان، بناخەی کۆمەڵگا لەق دەکا. لە ڕوانگە "برك"ەوە، مافی دەنگدان دەبێ هەر بە ئەشراف [نەجیبزادەکان] بدرێ تا هەموو کات دەسەڵات‌و دەستڕۆیشتوویی ئەوان زیاتر لە کۆمەڵانی خەڵك بێ. بنەماکانی یەکسانی، ئازادی‌و مافی مرۆڤ بە تۆخیی نەریتە دێرین‌و جێکەوتووەکان بنکۆڵ ئەکەن. ئازادی‌و یەکسانی لە مانایەکی پەتیدا، ئەندیشەگەلێکی بۆش‌و کولۆرو ناتوانی مافی مرۆڤ لە "سروشتی مرۆڤ" هەڵێنجێنی، لەبەر ئەوە مرۆڤ هەموو کات لە هەناوی کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دەژی. چینەکانی سەرەوە لێهاتوویی زیاتریان بۆ حکوومەتکردن هەیە. لەبەر ئەوەی مەخزەنی عەقڵ‌و فەرهەنگی ڕابردووو پارێزەری نەریت‌و بەهاکان‌و هەڵگری شارستانییەتن. تایبەتمەندیی چینەکانی سەرەوە بۆ حکوومەتکردن، دەرئەنجامی هۆکارە سروشتییەکان نیە، بەڵکوو بەرهەم‌و دەرەنجامی ئەو دەرفەتە باشەیە کە لەبەر دەستیاندا بووە. چینەکانی سەرەوە لە سایەی ئەو پێگەیەی خۆیان لە کۆمەڵگادا، زۆرترین بەشیان لە ئەقڵ‌و فەرهەنگی سەدەکانی ڕابردوو وەچنگ خستوە.

هیگڵ، فەیلەسووفی گەورەی سەدەی نۆزدەی ئاڵمان، چەمکی سەرەکیی دێموکراسی، واتا دەسەڵاتداریەتیی ئیرادەی خەڵکی خستۆتە بەر ڕەخنەی خۆی. بە بۆچوونی ئەو، چەمکی لیبراڵی "خەڵك" وەك کۆمەڵێك لە تاکەکان جیاکراوەو سەربەخۆ، ناڕاست بوو. وەها چەمکێك لە خەڵك دەرهێنراوە [انتزاعی]و ناتوانێ ئیرادەیەکی لە خۆی هەبێ. فەلسەفەی سیاسی هیگل بە تەواوی لەگەڵ چەمکی پەیماننامەی کۆمەڵایەتی وەك بناخەی دێموکراسی دژایەتیی هەبوو.

به بۆچوونی ئەو دەوڵەت یەکێك لە رواڵەتەکانی کووڕانی ئورگانیزمی رۆح لە مێژوودا بووو، ژیانی تاك تەنیا لە نێو دەوڵەتدا مانا پەیدا دەکا.

کارل مارکس‌و فریدریش ئینگلس حکوومەتی دێموکراسیی لیبرالییان بە حکوومەتی بورژوازی‌و سەرمایەداری دەزانی. بە بۆچوونی ئەوان، دێموکراسیی راستەقینە تەنیا بە لەبەین چوونی سیستمی سەرمایەداری‌و دەسەڵاتی چینایەتی واتا لە سۆسیالیزمدا دەگونجێ. دامەزراوەکانی دێموکراسیی بورژوازی وەك هەڵبژاردن، مافی دەنگدانی گشتی تا تێکۆشانی پارتەکان‌و... هتد، تەنیا بیانووپەکن بۆ زاڵبوونی چینی دەسەڵاتدار. لە روانگەی ئەوانەوە، دێموکراسی لەگەڵ دەسەڵاتی چینایەتی یەك ناگرنەوە. بە واتایەکی دیکە دێموکراسیی لیبراڵ‌و بورژوازی بەرادەی پێویست دێموکراسی نیە. چینی دەسەڵاتدار ئایدولۆژیی دێموکراسی وەك ئایدولۆژییەکی درۆزنانە بەسەر چینەکانی ژێر دەستدا دەسەپێنێ. لە روانگەی (مارکس)ەوە، "دێموکراسیی راستەقینە" تەنیا پاش لەنێوبردنی لەخۆنامۆیی مرۆڤەکان لە سۆسیالیزمدا دەستەبەر دەبێ.

رەخنەی مارکس‌و ئینگلس لەسەر دێموکراسی، لە پێگەیەکی چەپڕەوانەو ریفۆرمخوازانەوە دەهاتە ئاراوە، لە لایەکی دیکەوە، رەخنەگەلی زانایانی نوخبەگەرا وەك ویلفوردو پارەتو، گائتانوموسکاو ... هتد لە پێگەیەکی راستڕەوانەو رەشبینانەوە دەهاتە ئاراوە. ویلفوردو پارەتو (١٩٢٣ ـ ١٨٤٨) کۆمەڵناسی ئیتالیایی، لە پێگەیەکی نوخبەگەرانەوە هەڵی دەکوتایە سەر دێموکراسی‌و لە بناخەدا دێموکراسیی بە ناموومکین دادەنا. دەیگوت هەرچەند ورووژاندن‌و دنەدانی کۆمەڵانی خەڵك بەهۆی نوخبەکان [هەڵکەوتون] دەگونجێ، بەڵام هیچ کاتێك حکوومەت ناکەوێتە دەست کۆمەڵانی خەڵك، بەڵکوو هەموو کات گرووپگەلی دەستنیشانکراو دەست بەسەر حکوومەتدا دەگرن. کەوابوو هەموو حکوومەتەکان، تەنانەت دێموکراتەکانیش حکوومەتی نوخبەکانن. تەنیا جیاوازیی دێموکراسییەکان لەگەڵ حکوومەتەکانی دیکە ئەمەیە کە ئەوانە وەك کارتل وان، واتا ئینتیلاف‌و یەکگرتنێك نێوان گرووپە نوخبەکانە. کاری سیاسەت لە دێموکراسییەکاندا دابەشکردنی بەشە پێبراوەکان [امتیازات]ی نێوان وەها گرووپگەلێکی یەکگرتووە. بە بۆچوونی پارەتو، سیاسەت پێڕەوی یاسای پۆلاییینی گۆڕانی نوخبەکانەو کەوابوو، لاوازی‌و بێتوانایی نوخبەکانی حاکم، دەبێتە هۆی بەدەسەڵات گەیشتنی گرووپە نوخبەکانی تازەنەفەس. هەر بۆیە "مێژوو گۆڕستانی

ئەشرافیەتەکانە". سروشتی سیاسەت لە روانگەی پارەتو، زۆرەملێیەو لەم رووەوە ئەوەی کە لایەنگرانی دێموکراسی وەك رەزامەندیو تێگەیشتنو هاندانی خەڵك وەسف دەکەن، جگە لە خەڵەتاندن شتێکی دیکە نیە. کەوابوو دێموکراسی بە مانا ئایدیالەکەی لەگەڵ راستیەکانی ژیانی سیاسی پێوەندییەکی نیەو لە روانگەی گائتانوموسکا (١٩٤١ ـ ١٨٥٨) هەموو حکوومەتەکان بە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەمە کە ناوی دێموکراسی یان حکوومەتی ئەشرافی، یان مونارشیی لەسەر خۆ دابنێن، هەرچۆنێك بێ حکوومەتی کەمینە یان گرووپێکی هەڵبژاردە بەسەر زۆرینەدان. هەموو کۆمەڵگاکان بەسەر دوو بەشی چینی دەسەڵاتدار (کەمینە)و چینی ژێردەست (زۆرینە)دا دابەش دەبن. لە دێموکراسییە رواڵەتییەکانیشدا "نوێنەرەکانی" خەڵك لەڕاستیدا بەهۆی کەمینەگەلێکی رێکخراوەوە دەستنیشان دەکرێن کە بەشێك لە چینی دەسەڵاتدارن. لە روانگەی موسکاوە هەڵبژاردن لە دێموکراسییەکاندا، رکەبەرییەکی نایەکسانی نێوان کەمینەگەلێکی رێکخراوو زۆرینەیەکی بێ رێکخراوە. بەوحاڵەش، موسکا لە ژێر کاریگەریی ئەزموونی فاشیستی لە ئیتالیا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە ناچالاك بوونی کۆمەڵانی خەڵك هەندێك گۆڕیو پێی وابوو کە بوونی کۆمەڵانی خەڵکی وروژێندراو لە ژیانی سیاسیدا بەهۆی دنەدانی گرووپەکانی سیاسی نە تەنیا گونجاو، بەڵکوو زۆر مەترسیخوڵقێنە.

موسکا سەرەڕای بیروڕای خۆی لە رەخنە لەسەر لیبرالیسمو دێموکراسی، لە کردەوەدا لە حکوومەتی پارلمانیو دێموکراتیك، لە بەرانبەر دەستدرێژییەکانی موسولینیدا پشتیوانیی دەکرد. بە بۆچوونی ئەو، باشترین جۆری حکوومەت، حکوومەتێك بوو کە پشت بەستوو لەسەر هاوسەنگیی دەسەڵاتە کۆمەڵایەتییەکان لە بواری سیاسیدا بێ. بەو رادە کە بوونی هێزە کۆمەڵایەتییەکان کە خاوەن سەرچاوەی جۆراوجۆری دەسەڵات وەك سامان، دەسەڵاتی سەربازی، ئایینی، زانستو ... هتد، لە حکوومەتدا زۆرتر بێ، سەقامگیریی سیاسیی زۆرتر دەبێ، بەڵام دێموکراسی بە مانای باو لە روانگەی موسکا، حکوومەتێکی سەقامگرتوو نیە، لەبەرە ئەوەی تەنیا نوێنەری یەکێك لە هێزەکانو بەرژەوەندیی چەندلایەنە واتا کۆمەڵانی بێشتە.

جورج سانتایانا (١٩٥٢ ـ ١٨٦٣) فەیلەسووفی ئیسپانیایی رەگەزی ئامریکایی، دێموکراسی بە حکوومەتی خەڵکی نەزانو بیرتەسك دەزانێ. بە بۆچوونی ئەو، پادشایی، درێژەی سروشتی دەسەڵاتی باوك بەسەر بنەماڵەداو ئەشرافییەتیش لە نێو نەزانیو

لێنەهاتوویی کۆمەڵانی خەڵکدا بوو. ئەو دێموکراسییە بە حکوومەتێکی بەری لە گەورەیی‌و مەزنی‌و شانازی‌و نزیك لە خراپی‌و نەزانی دەزانی. گەورەترین ئەرکی دەوڵەت لە روانگەی سانتایاناوە، پێکهێنانی ئەمن‌و ئاسایش‌و دێموکراسی، کەمترین توانایی لە دەستپێڕاگەیشتن بەو مەبەستە سەرەکییە هەیە. ناوبراو رەستەیەکی بەناوبانگی لە وەسفکردنی حکوومەتی خەڵکدا هەیە بە شێوەی خوارەوە:

"هێزی بیرکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵك، بەرادەی بیری کرمێکە، بەڵام هێزی پەنجەکانی بە قەدەر پەنجەکانی ئەژدیهایەکە. هەرکەس ئەم ئەژدیهایە بکوژێ، دەبێتە پاڵەوان." رێگەی دەربازبوون لە دێموکراسیی خەڵك، حکوومەتی نوخبەکانە کە دەتوانێ هەم وەك حکوومەتی مەلەکی، هەم وەك حکوومەتی ئەشرافی دەربکەوێ.

خوزە ئورتگای گاست (١٩٥٥ ـ ١٨٨٣) فەیلەسوف‌و ئەدیبی ئیسپانیایی لە رەخنەگرانی گەورەی دێموکراسی بوو. ئەو بە پێچەوانەی نوخبەگەراکان کە حکوومەتی کۆمەڵانی خەڵکیان بە نامومکین دەزانی، لەسەر ئەم بڕوایە بوو کە دێموکراسییەکانی هاوچەرخ هەر ئەو حکوومەتانەی کۆمەڵانی خەڵکن. بە بۆچوونی ئەو، دێموکراسی کە بڕیاربوو لە سەرەتادا حکوومەتی یاسا بێ، ئێستا بۆتە حکوومەتی زەوق‌و سەلیقەو هەواو هەوەسی کۆمەڵانی خەڵك. مرۆڤی بەکۆمەڵی هاوچەرخ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا هەڵساوەتە سەر پێ‌و چۆنیەتیی ژیانی مرۆڤایەتیی گەندەڵ کردوە. دێموکراسی خەڵکی، لە روانگەی ئورتگاییەوە، خەسارو کارەساتێکی فەرهەنگییە. لە دێموکراسییە خەڵکییەکاندا، نوخبەکان ئەخشی رێنوێنیکەرو فەرماندەیی خۆی لە دەست داوەو، لە ئاکامدا پێوەگەلی ئەخلاق‌و فەرهەنگ لە نێو چووە. بە بۆچوونی ئورتگای، فاشیسم یەکێك لە دیاردەکانی دێموکراسیی خەڵکی مۆدێرنە. لە سەردەمی مۆدێرندا، هەراو هوریای سەرگێژەهێنەری خەڵکی لە هەموو شوێنێك بیسراوەو کۆمەڵگای خەڵکی بناخەی دێموکراسیی مۆدێرنی پێك هێناوە. دێموکراسی‌و فەرهەنگی ئەمریکایی ئەوڕۆیی بە "بەهەشتی کۆمەڵانی خەڵك" گۆڕاوە.

جیوانی جنتلیە (١٩٤٤ ـ ١٨٧٥) فەیلەسوفی فاشیستی ئیتالیایی لەسەر ئەو بڕوایەدا بوو کە سەرەڕای قسەی لایەنگرانی دێموکراسی، حکوومەتی زۆرینە ناگونجێ. دێموکراسییەکان تەنیا گومانی دەسەڵاتداریەتیی خەڵك پێك دەهێنن، لەڕاستیدا دەسەڵات هەموو کات لەدەست کەمینە دایە. بە بۆچوونی جنتلیە، بەوحاڵەش وشەی دێموکراسی لە سەدەی

بیستەمدا ناوبانگێکی وای دەرکردوە کە هەموو ئایدولۆژیاکانو یەك لەوان فاشیسم، خۆیان بە دێموکراسیی راستەقینەدا دەنێن. بەو تێبینییەوە کە فاشیسم خۆی بە نوێنەری گەلی رێکخراو لە پیشەکاندا دەزانێ، نە نوێنەری زۆرینەیەکی بێقەوارەو بێئیرادەی خەڵك.

مارتین هایدگر (١٩٧٦ ـ ١٨٨٩) فەیلەسووفی ئاڵمانیش لەگەڵ دیفاع لە فاشیسم، رەخنەگرێکی دێموکراسی بوو. هایدگر پاش ساڵی ١٩٣٤، لەگەڵ حیزبی نازی کەوتو زۆر وتاری سەبارەت بە پشتیوانی لە شۆڕشی هیتلێر داو، پێی وابوو کە نازیسم دەتوانێ ئورووپا لە داوی پووچگەرایی دێموکراسیی بورژوازی رزگار بکا. لە روانگەی ناوبراوەوە کۆمەڵگای مۆدێرن تووشی هێزگەلێکی رووخێنەری تێکنۆلۆژیو شارنشینی بووەو خەسڵەتی خەڵکی پەیدا کردوە. بەڵام کۆمەڵگای دڵخواز دەبێ لەسەر بناخەی پلەبەندی، رێکوپێکی [نظم ]و پێگەی کۆمەڵایەتی نۆژەن بکرێتەوە. سیستمی چەند حیزبی، سیستمێکی گەندەڵە، تەنیا سیستمی تاك حیزبی لە ژێر رێبەریی پێشەوایەکی تاك دەتوانێ یەکیەتیی گەل بپارێزێ. تەنانەت پاش شەڕی دووهەمی جیهانیش، هایدگر، لە ساڵی ١٩٦٦دا رایگەیاند کە دێموکراسی ناتوانێ رێگەچارەیەك بۆ جیهانو کۆمەڵگای تکنیك لێدراوی دراوی مۆدێرن بداتە دەست.

لئوئیشتراوس (١٩٧٣ ـ ١٨٩٩) لە روانگەی فەلسەفەی سیاسیی کلاسیکەوە هێرشی کردە سەر نەریتی لیبراڵ دێموکراسیی مۆدێرن. لە روانگەی ئەوەوە، دێموکراسیو لیبرالیسم ناتوانێ لە پێگەی تاك لە بەرانبەر شەپۆلی بێوێنەی تۆتالیتاریسمو بزووتنەوەکانی خەڵکی لە سەدەی بیستەمدا پارێزگاری بکا. ئیشتراوس لە فەلسەفەی رەها لە بەرانبەر رێژەگەرایی، مێژووگەرایی، زانستخوازیو زانستەکانی نوێ بە شێوەی گشتی دیفاعی دەکرد. بە بۆچوونی ئەو لە نێوان فەلسەفەی رەهاو دێموکراسی، لە خۆیدا هیچ پێوەندییەك بوونی نییە. فەیلەسووفەکان ناتوانن لەگەڵ دێموکراسی بسازێن، لەبەر ئەوەی کە دێموکراسی لەسەر یەکسانیی هەمووان پێ دادەگرێو فەیلەسووفەکان کەبەڕاستی داوای تاپۆکردنی شوناس بۆ خۆیان دەکەن، قەبووڵی بکەن.

( ٨ )

# تێپەڕبوون بۆ دێموکراسی و دوورەدیمەنی [چشمانداز] داهاتووەکەی

نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم، پێشکەوتنی بەرچاوی لە سەقامگیریی دێموکراسی بەخۆوە بینیبوو. تاقمێك لە نووسەران لە شەپۆلێکی نوێ لە دێموکراتیزاسیۆن باس دەکەن کە لە کۆتاییەکانی دەیەی (١٩٧٠)وە دەستی پێکردووەو دەرئەنجامە زۆرێك لە وڵاتانی لە ئەمریکای لاتین، ئورووپای رۆژهەڵاتی، ئاسیاو ئەفریقای گرتۆتە خۆ. ئەزموونی سیستمگەلی تۆتالیتێر، تاك حیزبی و دەسەڵاتخوازی راست و چەپ، بە درێژایی سەدەی بیستەم بەرەورووی تێکشکان و نسکۆی یەك لەدوای یەکدا بوو، لەگەڵ هەمووی ئەمانە دێموکراسی، هەروەها رووبەڕوو لەگەڵ دوژمنان، مەترسییەکان و تەنگوچەڵەمەی جۆراوجۆرە. هەروەها هێشتا فاشیسم، نیوفاشیسم، دەسەڵاتخوازی، نەریتخوازی، فەندامێتالیزم خوازی، پارێزگاری و سەربازیگەری، هەڕەشە لە دێموکراسی و ژیانی دێموکراتیك دەکەن. لە لایەکی دیکەوە رەوتی نوێی "بەجیهانیبوون"یش کوسپەگەلێکی نوێی بۆ دێموکراسی بە مانا باوەکەی پێك دێنێ. لەم گوتارەدا پێشکەوتنی شەپۆلەکانی دێموکراسی و ئەو ناستەنگانە کە بەر بە شەپۆلەکان دەگرن و دەیگێڕنەوە، لێك دەدەینەوە.

## شەپۆلەکانی دێموکراسی

مەبەست لە شەپۆلەکانی دێموکراسی، کۆمەڵێك گۆڕانکارییە کە لە ناوچەیەکداو یان لە ئاستی جیهاندا بەرەو دێموکراسی زیاتر روو دەداو پاش ئەوەی گەیشتە لووتکەی خۆی، دەبێتە هۆی سەقامگیری و پتەوبوونی دێموکراسی، لانیکەم لە چەند وڵاتدا. رەوتی پەرەگرتنی دێموکراسی، خاوەن سەنتەرگەلێکی کات و شوێن بووە، هەر بۆیە بە شێوەی شەپۆل چۆتە پێش، دیارە سەبارەت بە زەمان و کات و مەوداکانی زەمانی، رووداني شەپۆلەکانی دێموکراسی لە نێو خاوەن رایاندا، جیاوازیی بیروڕا هەیە، بۆ نموونە سامویل هانتینگتۆن، زانای سیاسیی ئەمریکایی، باسی لە سێ شەپۆلی دێموکراسی کردوە: یەکەم لە ساڵی ١٨٢٨ تا ساڵی ١٩٢٦، دووهەم لە شەڕی جیهانیی دووهەم تا دەیەی ١٩٦٠و سێهەم لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠ بەدواوە. فیلیپ شیتر، نووسەرێکی دیکەی ئەمریکایی باسی لە چوار شەپۆل کردوە: یەکەم شەپۆلی "بەهاری ئازادی" لە ئورووپا کە لە ساڵی ١٨٤٨ دەستی پێکرد، بەڵام درێژەی نەکێشاو لە ساڵی ١٨٥٢ زۆربەی ئەو وڵاتانە کە رەوتی دێموکراسی گرتبوونیەوە، گەڕانەوە سەر دۆخی جارانی خۆیان. شەپۆلی دووهەم لە دەوروبەری شەڕی یەکەمی جیهانی و پاش شەڕ هاتە ئاراوە، تێکڕمانی ئیمپراتۆری رووسیەو

ئەمسا بووە هۆی پەیدابوونی دەوڵەتگەلێکی نوێ کە لە سەرەتادا روویـان لـە دیموکراسی کـرد. کۆماری وایمار بوو بە جێنشینی ئیمپراتـوریی ئاڵمـانو لـە زۆر وڵاتـی دیمـوکراتیکی ئـورووپـای رۆژئاوایی‌و باکووریش، مافی دەنگدان پـەرەی گـرتو حیزبـە نوێیـەکان هاتنـە نێـو گۆڕەپـانی بەشداری‌و رکەبەریی سیاسییەوە. شـەپۆلی سـێهەم، پـاش شـەڕی دووهـەمی جیهـانی رووی دا، دیموکراسیگەلێکی نوێ لە ئاڵمانی رۆژئاواو ئیتالیا دامەزرانو زۆر وڵاتانی ئورووپایی گەڕانـدەوە دۆخی دیموکراتی جارانی خۆیان. جگە لەوانە، رەوتی رامالینی ئیستعمار، شـەپۆلی دیموکراسی بۆ دەرەوەی ئورووپا ملی ناو پەرەی سەند، هەروەها رژێمگەلێکی دیموکراتیك لە ژاپـۆنو کـورەی باشووری دامەزران.

سەرئەنجام شەپۆلی چوارەمی دیموکراسی، لەگەڵ کودیتای سەربازیی پورتەگاڵ لە ٢٥ی نیسانی ١٩٧٤ بە دژی دەوڵەتی دیکتاتۆری ئـەو وڵاتـە [سـالازار] دەسـتی پـێکرد. بـە شـوێن ئـەودا، گۆڕانکارییەکی هاوشێوە، لە یونانو هەندێك لە وڵاتانی ئامریکای لاتین روویان دا. ئەم شـەپۆلە لە روانگەی نووسەری ناوبراوەوە هەروەها درێژەی هەیە. بە بۆچوونی ئەم نووسەرە، شەپۆلی چوارەم لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ شەپۆلەکانی پێشووتردا، جیهانگیرتر بووەو، وڵاتانی ئورووپـای جنـووبی، ئەمریکای لاتین، ئاسیا و ئورووپای رۆژهەڵاتی لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٧٤ ـ ١٩٨٩ لە خۆ گرتوە.

ئەم شەپۆلە لە ئاستێکی نزمتردا، هەندێك لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشی خـستۆتە ژێـر کاریگەریی خۆی. جگە لەوە، کاریگەریی شەپۆلی چوارەم، لەبارەی قوولیشەوە زۆرتـر بـووەو لـە ئاکامدا گەڕانەوە بۆ بـارودۆخی پێـشتر کـەمتر رووی داوە. قـووڵترین گۆڕانکـاری لـە وڵاتگـەلی کۆمۆنیستیی پێشوودا رووی داوە. پاڵەپەستۆ بۆ پەرەپێدان بە دیموکراسی لـە وڵاتگـەلی دیکـە وەك: چین، پیرۆ، تایلەندو ئێرانیش زۆر هەست پێکراوە.

لـە روونکردنـەوەی روودانـی شـەپۆلەکانی دیموکراسـی زۆر لـە نووسـەران پـشت بـە تیئـۆری "تەشەنەکردن" [اشاعە] دەبەستن، بەم مانایە کە تێپەڕینی سەرکەوتووانە بۆ دیموکراسی لە هـەر وڵاتێکدا، دەبێتە نموونە بۆ وڵاتەکانی دیکە. بەتایبەت وڵاتانی دراوسێ لە یەك ناوچەدا ناتوانن لە کاریگەریی گۆڕانکارییە سیاسییەکان لە وڵاتانی یەکتردا زۆر خۆیان بپارێزن. ئەم گومانە سەبارەت بە شەپۆلی چوارەم بە روالەت مانادارتر دێتە بەرچـاو. لەبـەر ئـەوە هـیچ رووداوێکـی جیهـانیی هاوبەش وەك شەڕو ... وڵاتانی جێی باسی ناچـار بـە گـۆڕان نـەکردوە. پەرەسـەندنی پێوەندییـە نێونەتەوەیییەکانیش دیارە رەوتی تەشەنەکردنەکەی بە هەڵمەتتر کردوە.

تیئۆرییـەکی دیکە کە سەبارەت بە شەپۆلەکانی دیموکراسی هاتۆتـە ئـاراوە، تیئـۆریی "هێـزی بزوێنـەر"ە. بە پێی ئەم تیئۆرییـە لەگەڵ پەرەگرتنی دیموکراسی لـە هـەر وڵاتێـکدا، پاڵەپەسـتۆی

رووداوە نێونەتەوەییەکان، لە هەمان راستادا، هێزێکی زۆرتر پەیدا دەکا. وڵاتگەلێك کە دێرتر پەیوەست بە شەپۆلی دێموکراسییەوە دەبن، دەکەونە ژێر فشارێکی زۆرترو لە لایەك تێچووی "ئەزموونو هەڵە"ی کەمتر دەدەنو هەر ئەمە بۆخۆی هۆکارێکە بۆ دنەدان. یەکێك لەو هۆیانە کە ئەم تیئۆرییە دەسەلمێنێ، ئەوەیە کە بە سەرکەوتنی شەپۆلی دێموکراسی لە وڵاتێکدا، گرووپەکانو رێکخراوگەلێك بۆ پشتیوانی لە مافی مرۆڤ، مافە کەمینەکان، پشتیوانی لە بزووتنەوە دێموکراتیکەکان لە وڵاتانی دیکەو ... پەیدا دەبن کە هێزێکی بزوێنەری زیاتر دەدەن بە شەپۆلی دێموکراسی. بە پەرەگرتنی شەپۆلی چوارەم، دێموکراسی لە دەیەی ١٩٩٠، پێکهاتەیەکی بەربڵاوی لە دامەزراوەکان، ئەنجومەنەکان، بزووتنەوەکانو رێکخراوەکان لە ئاستی نێونەتەوەییدا بۆ پشتیوانی لە بڵاوبوونەوەی شەپۆلی ئەم دوایانەش سەری هەڵدا. بە واتایەکی دیکە زەمینەی نێونەتەوەیی بزووتنەوەی دێموکراسی بەم شێوەیە بەهێز بووە. بە پێی ئەم تیئۆرییە، ئەوەی کە لە پەرەسەندنی دێموکراسیدا گرینگو یەکلاکەرەوەیە، نە چەمکی دەرهێنراوی "تەشەنەکردن"، بەڵکوو واقیعیەتی بەرچاوی تێکۆشانی وەها گرووپو رێکخراوگەلێکی نادەوڵەتی لە ئاستی نێونەتەوەییدایە. لەم روانگەوە تیئۆریی تەشەنە ناتوانێ پەرەگرتنی شەپۆلی دێموکراسی لە ناوچە پرشو بڵاوەکانی جیهان، بۆ نموونە لە باشووری ئورووپا تا رۆژهەڵاتی ئاسیا روون بکاتەوە.

بەو حاڵەش تیئۆریی تەشەنە لە نێوخۆی ناوچەگەلێك کە لە رووی فەرهەنگییەوە لە یەکە دەچن، مانادارترە. بۆ نموونە گۆڕانەکانی کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ بەرەو دێموکراسی لە ئەمریکای لاتین کەمو زۆر لە ژێر کاریگەریی یەکتردا روویان دا. لەگەڵ ئەمەش سیستمی دێموکراتیکی شیلی لە ژێر دەسەڵات ژێنراڵ پینوشە لە بەرانبەر گۆڕانەکانی ناوچە لە دەیەی ١٩٨٠دا راوەستا. مەیل بۆ لای دێموکراسی لە وڵاتانی ئورووپای رۆژهەڵاتی لە دەیەی ١٩٨٠ یەك لەدوای یەك زیاتر شێوەی تەشەنەو لاساییکردنەوە پشت راست دەکەنەوە. هەرچەند هۆکاری سەرەکیی دەستپێکردنی شەپۆلی دێموکراسی لە ناوچەدا، گۆڕان لە سیاسەتی دەرەوەو سەربازیی یەکیەتیی سۆڤیەت لە سەردەمی گورباچۆفدا بوو. هەروەها دەتوانین بڵێین کاریگەریی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان لە چوارچێوەی ناوچە جوغرافیاییو فەرهەنگییەکان، زیاترو دڵنیاترە.

ئەوە کە وەك بە جیهانیبوون، واتا رەوتی پەرەسەندنی بازاڕی جیهانی، بە نێونەتەوەییبوونی سەرمایە، لاوازبوونی دەسەڵاتداریەتیی دەوڵەتەکانو پەرەگرتنی پێوەندییە فەرهەنگییەکان لە ئاستی جیهانیدا، وەسف دەکرێ. ئەویش سورشتێیە کە لە بەرین بوونەوەی شەپۆلی دێموکراسی کاریگەر بووە. ناڕەزایەتیی دەوڵەتەکان سەبارەت بە دەستێوەردانی دەرەکی لە کاروباری نێوخۆیی

یان بەشێوەیەکی روو لە گەشە مانای خۆی لە دەست دەداو جیاوازیی نێوان بواری سیاسەتی نەتەوەیی‌و نێونەتەوەیی تووشی لێڵی‌و تەمومژی روو لە زیادبوون دەبێ.

هەر لەم پێوەندییەدا، رێکخراوگەلی ئابووریی نێونەتەوەیی، وەك سندووقی نێونەتەوەیی دراوی‌و بانکی جیهانی، بەخشینی باوەڕپێکراوی [اعتبار]و ئەندامەتی دەبەستنەوە بە مەرج‌و بەڵێنی سیاسیی تایبەت کە یەك لەوانە لەبەرچاوگرتنی مافی مرۆڤ، چاکسازی لە دامەزراوە سیاسییەکانداو بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی دێموکراتیك بەتایبەت جێی ئاماژەکردنە. بۆ نموونە یەکیەتیی ئورووپا ئەخشێکی گەورەی لە پتەوترکردنی دێموکراسی لە ئورووپای باشووری‌و رۆژهەڵاتی‌دا هەبوەو ئیمکانی وەرگرتنی ئەندامی نوێی وەك ئامرازێکی گرینگ لەم پێوەندییەدا بەکار هێناوە.

تیۆریی هەڵبژاردنی ئەقڵانی [گزینش عقلانی] روونکردنەوەیەکی دیکە سەبارەت بە رەوتی دێموکراتیزاسیۆن دەداتە دەست. لەم روانگەوە، دێموکراسی لە بارودۆخی مێژوویی تایبەت‌و تا رادەیەك نایاب پەیدا دەبێ کە لەودا دوو مەرج کەوتبێتە دەست، یەکەم دەسەڵاتداری سەرەڕۆو حکومەتی دەسەڵاتخواز رووخابێ، دووهەم ئەو دژبەرانە کە دەسەڵاتیان دەکەوێتە دەست، کۆمەڵێك لە گرووپگەلێکی ناهاوسەنگ بن‌و لە نێویاندا رێبەرێکی بەدەسەڵات‌و زاڵ‌و یان پارت‌و گرووپێکی زاڵ نەبێ. ئەگەر هیچ کام لە گرووپەکان بەسەر ئەوانی دیکەدا سەرنەکەون، ئەگەری سەرهەڵدانی دوو بارودۆخ لە ئارادایە: یەکەم کێشمەکێش‌گەلێکی بێ‌پسانەوە لە نێوان هێزە یەکسانەکانداو، دووهەم، رێکەوتن لەسەر پێکەوە ژیان. رێگەی دوایی رێخۆشکەری سەرهەڵدانی دێموکراسی‌یە. کەوابوو کاتێك دێتە دی کە گرووپە پرش‌وبڵاوەکانی یاریکەرانی سیاسی لەگەڵ سەرچاوەی دەسەڵات تارادەیەك یەکسان، ئامادەی هاوکاری‌و هاوژیانی لەگەڵ یەکتر بن. رێگەی پێشگرتن لە دامەزراندنی دووبارەی حکومەتی نادێموکراتیك یان پاوانخواز، لەبەرچاوگرتن‌و ئامادەکردنی مەرجگەلێك بۆ نەهێشتنی زاڵبوون‌و دەسەڵاتی هەرکام لە گرووپەکان لەسەر یەکترداو پێشگرتن لە پاوانی ئەو گرووپە بەسەر سەرچاوەکانی دەسەڵات دایە. لە هەلومەرجی دەرەتانی تێپەڕین لە رژێمی پاوانخواز بۆ حکومەتی دێموکراتیك زۆرجار کۆمەڵێك لە گرووپەکان‌و هێزە سیاسییەکان چالاکن‌و، لەوانەیە لە نێوانیاندا رێکەوتن یا ناتەبایی بوونی هەبێ. رێکەوتن بۆ تێپەڕین بۆ دێموکراسی، بەستراوەتەوە بەو ئیئتیلافانە کە گرووپە جۆراوجۆرەکان لەوانەیە بچنە نێوی. هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دێموکراسی لەم بارودۆخەدا هەڵگری کێشەی نێوان حکومەت (گرووپی بەدەسەڵات)و نەیارانی لە لایەك‌و نێوان گرووپەکانی بێ‌دەسەڵات بەڵام یەکگرتوو (گرووپەکانی موخالیف) کە خوازیاری دێموکراسین. موخالیفەکانی حکومەتی پاوانخوازو گرووپی

زاڵ بەسەر دوو دەستەدا دابەش دەبن: میانەڕەوەکانو توندڕەوەکان. لە لایەکی دیکەوە، لایەنگرانی حکوومەتی پاوانخوازو گرووپی بەدەسەڵات، ئەوانیش بەسەر دوو تاقمدا دابەش دەبن: توندڕەوەکنو ریفۆرمیستەکان. تێپەڕین بۆ دیموکراسی بەستراوەتەوە بە ئیئتیلافی نێوان ئەم بەشو گرووپانە. بۆ نموونە ئەگەر میانەڕەوەکان لە بەشی دژبەرەکانداو ریفۆرمخوازەکان لە بەشی داکۆکیکارانی حکوومەت، مەیلیان بۆلای هاوکاری ببێ، زەمینە بۆ تێپەڕبوون ئامادەتر دەبێ.

## هەڵسەنگاندنی نیشانەکانی دیموکراسی

دیراسەی رەوتی دیموکراتیزاسیۆن، پێویستیی بە هەڵسەنگاندنی دیموکراسیو یان هەڵسەنگاندنی نیشانەکانی بەرەوپێشچوونی دیموکراسییە. نیشانەکانی دیموکراسی، بەرادەی دیموکراتیك بوونی حکوومەتو سەقامگیریی مافو ئازادییەکانی دیموکراتیك ئاماژە دەکا. رادەی دیموکراتیك بوونی حکوومەت بەرادەی وەئەستۆگرتنی بەرپرسایەتیی دەسەڵاتدارانو دەرەتانی بەشداریو کێبەرکێ لە ژیانی سیاسیدا بەستراوەتەوە. دیارە پێویستیی دیموکراتیك بوونی حکوومەت، بەم مانایە لە ئارادابوونی ئازادییە مەدەنیو سیاسییەکان بەتایبەتی ئازادیی هزرو ئەندیشەو بەیانو کۆبوونەوەیە. دیاریکردنی ئاستی بەرەوپێشچوونی دیموکراسی بە پێی ئەم نیشانانە، لە لایەنە جۆراوجۆرەکانەوە بەڕێوە چووە. لە هەندێك لە دیراسە سەرەتاییەکاندا، وڵاتان یان بە تەواوی دیموکراتیکن، یان بەناو دیموکراتیك بەحیساب دەهاتنو ئاستێکی نێوەنجی لەبەرچاو نەدەگیرا. لە دیراسەکانی پاشتر لەسەر پلەبەندیی دیموکراتیزەبوونی وڵاتەکان پێدادەگیرا. تایبەتمەندیی دیراسەکانی ئەم دواییە ئەوەیە کە چالاکبوونی سیستەمە سیاسییەکانو رەوتی دیموکراتیزاسیۆن لەوانەدا لەبەرچاو دەگیرێ. دیموکراسیی سیاسی بە مانای سەرەوە، لەوانەیە مەیلی جیاوازو گۆڕان لە سیستەمە سیاسییەکانی ئێستادا بوونی هەبێ. رژێمێکی سیاسیی تایبەت، لەوانەیە لە هەمان کاتدا خاوەن توخمەکانی دەسەڵاتخوازانە، ئولیگاریشیكو دیموکراتیك بێ. کەوابوو سەبارەت بە زۆر لە وڵاتەکان ناکرێ بوترێ لە سەدا سەد لە بیچمی وڵاتانی دیموکراتیك یان نادیموکراتیك جێیان گرتوە، بەڵکوو تێکەڵێك لە توخمە [عناصر] جۆراوجۆرەکان لەوانەدا پەیدا دەبێو هەروەها هەموو کات دەبێ سەرنج بدرێتە ئەگەری گۆڕان لەوانەدا. کەوابوو دەبێ گرووپێك لەبەرچاو بگیردرێ کە لە لایەك تایبەتمەندییەکانی دیموکراسیی لانیزۆرو، لە لایەکی دیکەوە تایبەتمەندییەکانی دیموکراسیی لانیکەم، لە خۆ گرتووەو پاشان ئەزموونی سیاسیی وڵاتەکان لە نێو ئەو گرووپەدا [طیف] لێك بدرێتەوە. بە کەڵکوەرگرتن لە وەها رەوشتێك

دیراسەی هەڵسەنگاندنی نێوان سیستمە سیاسییەکان بە کەڵکوەرگرتن لە ئامارو زانیاری چەندی دەگونجێ.

لە لایەکی دیکەوە بۆ هەڵسەنگاندنی دێموکراسی، پێوەرگەلی عەینیو زیهنی کەڵکی لێوەردەگیرێ.لە سەردەمە سەرەتاییەکانی پەرەسەندنی زانستی سیاسەی نوێ، زۆرتر پێوەرە زیهنییەکان بەکار دەبران، بەم مانایە کە نووسەران هەندێك تایبەتمەندیی گشتی (وەك ئازادیی چاپەمەنی، بایەخی راستەقینەی پارلمان، پێوەندیی دەسەڵاتەکانو ... هتد) وەك پێوەرو نیشانەگەلی دێموکراسی لەبەرچاو دەگیرانو ناوەرۆکی دێموکراتیکی رێژیمەکان لەسەر ئەو بناخانە دیاری دەکران. لە ناوەڕاستەکانی سەدەی بیستەم بەملاوە، رادەی بەشداریی خەڵك لە هەڵبژاردنەکاندا، رادەی رکەبەریی ئایدولۆژیك، پێکهاتەی حیزبی پارلمان، ئاستی هەڵبژاردەبوونی دەسەڵاتدارانی سیاسیو ... هتد بە نیشانەی عەینی زیاد کران. کەڵکوەرگرتن لە نیشانەکانی عەینی، دیراسەی گرووپی [ طیف]ی دێموکراسی یان هەڵسەنگاندنی دێموکراسی سانا دەکا. بەو حاڵەش نیشانەکانی عەینی لەوانەیە خەوشدار بنو دەرەتانی هەڵسەنگاندنی وات نەداتە دەست. حکوومەت لەوانەیە لە ئامارو زانیارییەکانی تایبەت بە هەڵبژاردن دەست وەربدا. هەروەها ئامارو ژمارە بە تەنیا ئەگەری فێڵو تەڵەکەی شاردراوە لە پشتی هەڵبژاردنەکاندا ئاشکرا ناکا. هەندێك لە حکوومەتەکان بۆ دانی رەوایی بە خۆیان لە فێڵو ئامادەکاریی جۆراوجۆر بۆ راکێشانی خەڵك بۆ سەر سندووقەکانی دەنگدان کەڵك وەردەگرن. هەروەها شێوەی خۆ کاندیدکردنی تاکەکان بۆ هەڵبژاردنو ئەگەری کۆسپەکانی سەر رێ بە تەنێ لە رووی ئاماری هەڵبژاردنەوە هەستی پێ ناکرێ. کەوابوو ئامارو نیشانەکانی عەینی ناتوانن رەنگدانەوەی تەواوی ناوەرۆکی سیستمە سیاسییەکان بنو، لەم بارەوە لە پێوەرگەلێکی زیهنی کە بە پێی زانیارییە گشتییەکانو دادوەرییەکان، بۆ نموونە ئاستی ئازادیی راستەقینەی چاپەمەنییەکانو یان ئاستی سەرکوتی سیاسی کە دەکەوێتە دەست، بۆ کامڵکردنی زانیارییە ئامارییەکان کەڵك وەردەگرن. بە شێوەی گشتی هەڵسەنگاندنی وردتری دێموکراسی پێویستیی بە کەڵك وەرگرتن لە نیشانەگەلی عەینیو زەینی هەیە.

## دوورمەدیمەنیی داهاتوو [چشماندا ز آیندە]

هەنووکە سیستمی دێموکراسی، زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە لە ئاستی جیهانیدا پەرەی گرتوە. لەگەڵ ئەوەش، دێموکراسی لەگەڵ مەترسیو هەڕەشەگەلێکیش بەرەورووییە کە سەقامگیریو پتەوترکردنی دەسکەوتە دێموکراتیکەکان لە دوایین شەپۆلی دێموکراسی لەگەڵ کەندوکوسپو

دژواری رووبەڕوو دەکا. بە پێچەوانەی تێگەیشتنی تاقمێك لە نووسەران، دێموکراسی تەنیا بەهۆی تەشەنەی نێونەتەوەیی لە ڕێگای شەپۆلەکانی دێموکراسی یان نەخش و کاریگەریی یەکلاکەرەوەی دامەزراوەو ڕێکخراوە نێونەتەوەیییەکان سەقامگیر نابێ، بەڵکوو پێویستی بە گۆڕانی مەرجە لەبارەکانی نێوخۆییە. ئەندیشەو هێزەکانی دژی دێموکراتیك لە نێوخۆ زۆرجار لە بەرانبەر شەپۆلە جیهانییەکانی دێموکراسیدا رادەوەستن. دیارە دێموکراسی پێویستی بە بارودۆخی لەباری کۆمەڵایەتی، ئابووری،و فەرهەنگی نێوخۆیی هەیەو سەرهەڵدانی ئەم مەرجانەش تارادەیەك بەهۆی خەبات و چالاکیی دێموکراتیك مومکین دەبێ. دامەزراندنی دێموکراسی بەتایبەت پێویستی بە گۆڕان لە پێکهاتەو پێوەندییەکانی دەسەڵاتی نەریتییەو دیارە هێزەو بەها کۆنەکان لە بەرانبەر وەها گۆڕانێکدا رادەوەستن. کەوابوو دووڕەدیەنیی دێموکراسی لە هەموو شوێنێك بەستراوەتەوە بە کردەوەو هەڵبژاردنەکانی گرووپە دەسەڵاتدارەکان و گرووپەکانی ژێر دەستی دەسەڵات.

مەرجی سەرەکیی درێژەکێشانی دێموکراسی ئەوەیە کە هیچ گرووپێك جگە لە نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵك، مافی حکوومەت و بڕیاروەرگرتنی نەبێ، کەوابوو دەسەڵاتی گشتی یان ڕێژەیی هەر یاریکەرێکی سیاسی هەڵنەبژێردراو بۆ دێموکراسی، سنووربەندییەکی سەرەکی پێك دێنێ. هەر بۆیە دەسەڵات و دەستڕۆیشتوویی سپا لە سیاسەتداو هەروەها دەستڕۆیشتوویی [نفوذ] یاریکەرانی دەرەکی بەسەر حکوومەتە دێموکراتیکەکانداو یان گرووپەکانی فشارو ڕێکخراوگەلی نهێنیی و توندوتیژخواز زیان بە دێموکراسی دەگەیەنن. لە لایەکی دیکە بەجیهانیبوون، پەرەگرتنی پێوەندییەکان، بە نێونەتەوەییکردنی بازاڕو سەرمایە، بزووتنی روو لە زیادی سەرمایەی دارایی و هەر هۆکارێکی دیکەش کە دەسەڵاتی بڕیاردانی بەرپرسانی سیاسی هەڵبژاردەی لە ئاستی وڵاتدا بەرتەسك کردەوە. سنووربەندییەك [محدودیت] کردەوەی دێموکراسی پێك دێنن. بەم مانایە پەرەگرتنی بەستراوەیی نێونەتەوەیی، هەڕەشەیەکە بۆ دێموکراسی و خۆبژێویی [خودکفایی] سیاسی وڵاتەکان دادەبەزێنێ.

زۆرێك لە نووسەران خێرابوونی ڕەوتی بەجیهانیبوون[١] وەك سەرهەڵدان و پەرەگرتنی دامەزراوە سیاسییەکانی جیهانی، بەرزبوونەوەی بایەخی مافە نێونەتەوەیییەکان و ڕێکخراوگەلی نێونەتەوەیی و پەرەسەندنی دەسەڵات و دەستڕۆیشتوویی دامەزراوەکانی پیشەسازی و دارایی سەرەوەی نەتەوە [فراملی] وە هەڕەشەیەك بۆ سەر کردەوەی دێموکراسی لە ئاستی دەوڵەتی

---

(١) - Golobalization

نەتەوەیی وەسف کراوە. کاریگەریی ڕەوتەکانی بەجیهانیبوون لەسەر لاوازیی دەسەڵاتداریەتیو خودموختاریی دەوڵەتی نەتەوەیی بە مانای کەمبوونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت لە کاروباری نێوخۆییداو گواستنەوەی دەسەڵاتی بڕیاردان سەبارەت بە زۆرێک لە کێشەکان بۆ بازاڕەکانی داراییو دراویو کۆمپانیاو بانکە جیهانییەکانە، لەم ڕوانگەوە دێموکراسی دەسەڵاتی نوێنەرانی خەڵك لە بڕیاردانەکاندا تووشی دەست بەستراوەیی سەرەکی دەکا.

مەبەست لە بەجیهانیبوون، کۆمەڵێك لە ڕەوتەکانی تکنیکی، ئابووری، سیاسیو فەرهەنگی لە دوایین دەیەکانی سەدەی بیستەم دایە. گۆڕانکارییە تکنیکییەکان بریتین لە گۆڕانی تکنیکی زانیاریو پێوەندیی، پەرەگرتنی تۆڕی کامپیوتێری، پەرەگرتنی تێکنۆلۆژیی پێوەندییەکانی بازرگانیو دارایی، گۆڕان لە تێکنۆلۆژیای قرمرسەناعی، سەرهەڵدانی ڕاگەیەنەکانی پێوەندیی نوێو ... هتد کە هەموویان دەبنە هۆی کورتبوونەوەی مەوداکانو بچووکتربوونەوەی جیهان. لەم بارەوە، تاقمێك لە نووسەران باسیان لە سەرهەڵدانی "گوندی جیهانی" کردوە. گۆڕانکارییە تکنیکییەکانی ناوبراو ئاڵوگۆڕی بەرچاوی لە ئابووری، بازرگانی داراییی نێونەتەوەییدا پێك هێناوە. دامودەزگا ئابوورییە نێونەتەوەییەکان لە بازاڕی جیهانیدا دەسەڵاتێکی ڕوو لە زیادبوونیان پەیدا کردوە. میزانییەی زۆر لەم دامودەزگانە زۆرتر لە میزانییەی هەر دەوڵەتێکی نەتەوەییە. وەها دامودەزگاگەلی "بێدەوڵەت"ن، واتا بە هیچ دەوڵەتو نەتەوەیەك بەستراوەیی یاساییو سیاسییان نیەو، هەموو جیهان وەك بازاڕی خۆیان لێك دەدەنەوە. سەرهەڵدانی وەها ڕێکخراوگەلێك دەبنە هۆی لاوازیو لەبەرچاونەگرتنی سنوورە سیاسییەکانی نێوان دەوڵەتەکان. هەروەها دامەزراوە ئابووریو سیاسییە نێونەتەوەییەکان کە بەسەر دەوڵەتەکاندا بڕیار دەدەن، پەرەیان سەندوە. سندووقی نێونەتەوەیی دراوی، بەخشینی نێونەتەوەیی، بانکی جیهانی، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانو ... هتد بوون بە یاریکەرانی سەربەخۆی سیاسی لە گۆڕەپانی جیهانیدا. سەرهەڵدانی هەندێك کێشەی جیهانگیر وەك کێشەکانی ژینگەپارێزی، حەشیمەتیو تەندروستی کە تەنیا لە ئاستی جیهانیدا بۆ لێکۆڵینەوە دەبن، یارمەتیدەرن بۆ پێکهاتنی ڕێکخراوگەلی جیهانی.

هەروەك ئاماژە کرا، کاریگەریی بەجیهانیبوون لەسەر دەسەڵاتداریەتیی دەوڵەتەکان، لە ڕووی باسی دێموکراسی کەوتۆتە بەر سەرنج. لەم ڕوانگەوە، دەوڵەتە نەتەوەییەکان زۆر لایەنی گرینگ لە دەسەڵاتداریەتیی خۆیان لە بڕیارداندا سەبارەت بە کێشە سەرەکییەکانی وڵاتی خۆیان لەدەست دەدەن. بەوحاڵەش، ئاستی کاریگەرییەکە لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا جیاوازە. لاوازکردنی دەسەڵاتداریەتیی نەتەوەیی، لە پرۆسەی بەجیهانیبووندا ناچارەنو بێنەملاونەولا شێوەی یاساییو

روالّەتی نیە، بەلّکوو توانایی بەکردەوەی دەولّەتە نەتەوەپەرستەکان بەرتەسك دەکاتەوە. تەنانەت زۆرجار لە نێوان دەسەلاّتی روالّەتی‌و فەرمی دەولّەتی نەتەوەیی‌و راستییەکان کاریگەریی رەوتی بەجیهانی‌بوون لە سنووردارکردنەکەی‌دا، ناهاوئاهەنگی بەرچاو دەکەوێ. بۆ نموونە بە نێونەتەوەیی‌بوونی روو لە زیادی رەوتەکانی ئابووری، لە کردەوەدا لەگەلّ توانایی روالّەتی دەولّەتی نەتەوەیی لە بڕیاروەرگرتن سەبارەت بە کاروباری ئابووریی نێوخۆیی دژایەتی پەیدا دەکا. دەسەلاّتداریەتی‌و خوموختاری زۆر لە ولاّتانی روو لە گەشە لە ژێر کاریگەریی پرۆگرامەکانی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەی سندووقی نێونەتەوەیی دراویی لەم سالاّنەی دواییدا تووشی لاوازی‌و دەست بەستراوەیی جیددی بووە. یەکیەتیی ئورووپا دەسەلاّتداریەتی‌و دەسەلاّتی دەولّەتە نەتەوەیی‌یەکانی ئەندامی خۆی، هەم لە رووی یاساداناو‌و هەم لە رووی پێوەندیی دەرەکی زۆر بەرتەسك کردۆتەوە. ئێستا بڕیارە سەرەکییەکانی ئابووری لە کۆمیسیۆنی ئورووپا دەدرێ، هەروەها ئەخشی گرووپەکانی دەسەلاّتی ناوچەیی وەك رێکخراوی پەیمانی ئەتلّەسی باکووری پاش شەڕی سارد، تەنانەت بەرچاوتریش بووە. گواستنەوەی زۆر لە ئەرکەکانی تایبەتی دەولّەتە نەتەوەیی‌یەکان لە پلەی جۆراوجۆردا بۆ کەرتی تایبەت یان رێکخراوو دامەزراوەکانی ناوچەیی، مەیدانی دەسەلاّتداریەتیی دەولّەتەکانی بەرتەسکتر کردۆتەوە.

هەولّی بەشێك لە ولاّتەکان بۆ پەرەپێدانی هاوکارییە ناوچەیی‌یەکان، بۆخۆی دژکردەوەیەك بووە لە بەرانبەر رەوتی لاوازکردنی دەسەلاّتداریەتیی نەتەوەیی‌و کاریگەرییەکانی بەجیهانی‌بوون. لەگەلّ پەرەگرتنی ئەم جۆرە کاریگەرییانە کێشەی سەرەکیی دێموکراسی، واتا راکێشانی رەزامەندیی خەلّك لە لایەن حکوومەت لە کاروباری بڕیاروەرگرتندا تووشی گرفت دەبێ. لەبەر ئەوەی کە دەولّەتی نەتەوەیی بۆخۆی ناچارە بەرژەوەندییەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی‌و جیهانی لە بوارگەلی جۆراوجۆردا لەبەرچاو بگرێ. ئیتر هاوولاّتیان بە مانای کۆن خاوەن "دەسەلاّتداریەتی" نابن. لە بارودۆخی بەجیهانیبووندا حکوومەتە نەتەوەیی‌یەکان زۆرتر دەکەونە ژێر کاریگەریی هۆکارە جیهانییەکان هەتا کۆدەنگ‌و رای گشتیی خەلّك. سیاسەتی هاوسەنگی پێکهاتەیی هەروەك ئاماژە کرا، نموونەیەکی جێی سەرنج بووە لەم بوارەدا. قەیرانەکان‌و چوارچێوەگەلی ئابووریی جیهانی، بەم شێوەیە توانایی‌و لێهاتوویی حکوومەتە نەتەوەیی‌یەکان لە گرتنی هەلّوێستە جۆراوجۆرەکان لەم چوارچێوانەدا کەم دەکاتەوە. هەروەها لە لایەکی دیکەوە لەگەلّ پەرەگرتنی پێوەندییە فەرهەنگییەکان‌و پێوەندە نێونەتەوەیی‌یەکان بەشگەلێکی سەرەکی لە ژیانی هاوولاّتیان لە ژێر چاودێری‌و کۆنترۆلّی حکوومەتە نەتەوەیی‌یەکان دێتە دەر.

شەڕو قەیرانە ئابووریو کۆمەڵایەتییەکانیش زۆرجار مەترسیگەلێگ بۆ سەر دێموکراسی پێك دێنن. هەست بە لێنەهاتوویی دەوڵەت لە خەبات دژی قەیرانەکانو کۆنترۆڵی ئاوسانی دراویو بێکاریو، یان کۆتاییهێنان بە شەڕە نێوخۆییو جیهانییەکان، بە ناچاری ئابێتە هۆی رەخساندنی دەرفەتی زیاتر بۆ بەشداریی پارتو گرووپە نەیارەکانی حکوومەت. لە وەها بارودۆخێکدا هیچ هێزێکی سیاسی توانای چارەسەرکردنی قەیرانەکانی نابێو دەرئەنجام دەرەتانی بەشداریو رکەبەریی دێموکراتیك کەم دەبێتەوە.

بە پێچەوانە، لە بارودۆخی قەیراندا، زەمینە بۆ دەرکەوتنی گرووپگەلی توندڕەوی خەڵکی لەبارتر دەبێ.

نەبوونی توانای دێموکراسییەکان بۆ چارەسەری قەیرانەکان زۆرجار دەبێتە هۆی پەرەگرتنی مەیلی خەلکی بۆ لای گرووپە توندڕەوەکان. حکوومەتگەلی نادێموکراتیك جا چ سەربازی، فاشیستی، تۆتالیتێرو ... هتد بێ، زۆرجار لە هەلومەرجی قەیرانی ئابووری، کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی، دەرەتانی سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە.

یەکێك لەو هەڕەشە گرینگانە کە لە سەدەی بیستەمدا بۆ دێموکراسی پەیدا بووە، مەیلی ئایینەکان بۆ دەستێوەردان لە ژیانی سیاسییە. زاڵبوونی کۆمەڵایەتیو سیاسیی ئایین، بە شێوەیەك ببێتە هۆی پەرەگرتنی روحیەی نەمانی لێبوردەییو پێکەوە هەلکردن، لە گەشەی بەهاکانی دێموکراتیك بەرگری دەکا. زۆرجار دەستێوەردانی بەربلاوی ئایین لە سیاسەتدا، کۆسپی گەورە بۆ دێموکراسیو بەهاکانی پێك دێنێ. دێموکراسی خۆی لە خۆیدا، پێویستیی بە جیایی دەسەلاتی سیاسی لە دەسەلاتی ئایینییەو، بوارو بیاڤی ئاسایی [عرفی] لە بواری ئایینییە. لە کاتێکدا کە یاسای خودایی لە هەموو بوارەکاندا وەك دەسەلاتدار لێك بدرێتەوە، ئیتر شوێنێك بۆ یاسادانانو راوێژکاریو کێبەرکێ نامێنێتەوە. حکوومەتی ئایینی لە بناخەدا لەگەڵ ئاسانکاری نیەو ئەندیشەو رایگشتیی خەڵك بە مەترسی بۆ بیاڤی پیرۆزی سیاسەت لێك دەداتەوە. جگە لەوە حکوومەتی ئایینی لەسەر جیاوازیدانانی نێوان دیندارانو بێدینەکان پێ دادەگرێ، لە کاتێکدا کە دێموکراسیدا ناتوانێ وەها جیاوازییەك بسەلمێنێ. هەر ئەم جیاییدانانە کۆسپە لەسەر رێی ناسینی مافەکانی هاوولاتیبوون یەکسان بۆ هەمووانو سەرهەڵدانی چەمکگەلێك وەك بێگانە، ناخۆیی [غیرعرفی]و هاوولاتی پلەدووی لێ دەکەوێتەوە کە دیارە ناتوانن بەشێك بن لە کۆمەلگای هاوولاتیان بن.

یەکێك لە مەترسییە گەورەکانی سەدەی بیستەم بۆ سەر دێموکراسی کە سەری هەڵ داوە، فاندامێنتالیزمی [Fundamentalism] ئایینییە. بناژۆخوازی، بە سیاسیکردنی ئایین وەك

ئایدۆلۆژیی حکوومەتی ئایینی لە بەرانبەر حکوومەتی مەدەنی نائایینیی‌یە. فاندامێنتالیزم لە ئایینە جۆراوجۆرەکاندا بەتایبەت کریستیان، یەهوودییەت، ئیسلام‌و ئایینی هیندو سەری هەڵداوە. فاندامێنتالیستەکان لە هەموو شوێنێك بەهاو قورسایی گشتیی بنەماکانی دێموکراسی‌و لیبرالیسمی رۆژئاوایی رەد دەکەنەوەو لەگەڵ زۆرینەخوازی بە بەها[ارزشی]و لێبوردەیی باوەڕی دژایەتی دەکەن. فاندامێنتالیستەکان نە تەنیا لەگەڵ دێموکراسی، بەڵکوو لەگەڵ نوێگەرایی رۆژئاوایی بەشێوەیەکی گشتی، دوژمنی دەکەن‌و بەشوێن هێنانەکایەی شێوەیەکی دیکە لە ژیان لە جێی شێوەی ژیانی دێموکراتیکن. ئەوانە لە جیاتیی ئازادی، فەردییەت، یەکسانی، مافەکان‌و دەسەڵاتداریەتیی خەڵك، لە دەسەڵاتداریەتیی دامەزراوە نەریتی‌و ئایینییەکان، لەسەرتربوونی دینداران بەسەر بێدینان‌و دەسەڵاتداریەتیی خوداو یاساکانی خوداو ئەرکی خەڵك لە بەرانبەریاندا، دیفاع دەکەن. لە روانگەی ئەوانەوە، پێکهاتەی دەوڵەتی نەتەوەییش، ئامرازێکە بۆ سەقامگیرکردنی دێموکراسی‌و دەسەڵاتداریەتیی خەڵك لە بەرانبەر دەسەڵاتداریەتیی خوداداو هەربۆیە دەبێ لە نێو بچێ. بەم شێوەیە فاندامێنتالیسم دوژمنی دێموکراسی‌و رێی دەربازبوون لێیەتی. فاندامێنتالیسم ئایدۆلۆژیی سیاسیی تیئۆکراسییەو لەم رووەوە دیارە لەگەڵ ئایدۆلۆژیی دێموکراسی، واتا لیبرالیسم بە شەڕ دێ.

دەرئەنجام ئەمەیە کە ئاڵۆزیی پێکهاتەی دەوڵەت لە دێموکراسییەکانی ئەو سەردەمەدا بۆخۆی مەترسی‌یەکە بۆسەر دێموکراسی. زیادبوونی ئەرکە تایبەتییەکان‌و رێکخراوگەلی حکوومەتی، بوونەتە هۆی ئاڵۆزیی روو لە زیادبوونی حکوومەتگەلی دێموکراتیك‌و دەرئەنجام ئەم پرسیارە هاتۆتە پێش کە ئایا دەرەتانی بەشداریی راستەقینەی هاووڵاتیان لە پرۆسەکانی سیاسەتدانا لە وەها بارودۆخێکدا هەر بوونی هەیە؟ ئایا حکوومەتی ئاسایی لە کێشەگەلی زانستی‌و تکنیکییەکی ئاڵۆز کە لە رەوتی بڕیارداندا دێتە ئاراوە، تێدەگەن؟ ئاڵۆزیی دەوڵەت هەم لە رووی پێکهاتەوە، هەم لە رووی کردەوەوە جێی سەرنجە. لەگەڵ پەرەگرتن‌و زیادبوونی ئەرکە تایبەتییەکان، سروشتی‌یە رێکخراوەکان‌و دامەزراوەکانی بەستراوە بە حکوومەتیش پەرە دەستێنن. دەوڵەتەکان ئێستا کە هەر بەستراونەتەوە بە بەڕێوەبردنی کارە تایبەتییە نەریتییەکان، واتا دابینکردنی ئارامی‌و ئاسایش‌و پێڕاگەیشتن بە کاروباری شەڕو ئاشتی، بەڵکوو ئەرکگەلێکی دیکەش وەك خۆشگوزەرانی، زانستی توێژینەوە، پەرەپێدان، پلان دانان، تەندروستی‌و ... هتد بەڕێوە دەبەن. یەکێك لە کێشەکانی تایبەت بە ئاڵۆزبوونی زیاتری دەوڵەتەکان، گرفتی ناسینی بیاڤی دەوڵەت لە بیاڤی تایبەتە. زۆر لە رێکخراوەکانی دەوڵەتی لە بنەڕەتدا ئەرکی تایبەت بەڕێوە دەبەن. بە تیکەڵبوونی بیاڤی گشتی‌و تایبەتی، بەرپرسایەتیی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە

بەرانبەر دەسەڵاتی یاساداناندا کێشەوار دەبێ. یەکێك لە ناکامەکانی ئەم بارودۆخە پەرەسەندنی پێوەندییە نافەرمییەکانی نێوان کۆمیتەکانو دامەزراوە یاساییو بەڕێوەبەرییەکان لەگەڵ گرووپەکانی خاوەن بەرژەوەندیو دەستڕۆیشتووە. وەها پێوەندییەك زۆرجار لەبەر چاوی بیروڕای گشتی دەشارێتەوەو بەرپرسایەتی ویستی دەوڵەت کەم دەکاتەوە.

زۆر لە سیاسەتە گشتییەکان لە دیموکراسییەکانی ئەو سەردەمەدا، لە وەها پێوەندییەکەوە سەرچاوە دەگرێ. بەم شێوەیە دەوڵەت لە تەنیشت روخساری دیموکراتیكو گشتیی خۆی، روخساری تایبەتیو نیوەشاراوەش پەیدا دەکا. یەکێك لە ناکامەکانی پەرەسەندنی ئەم جۆرە پێوەندییانە، لاوازکردنی دەسەڵاتی یاسادانانە. بە زیادبوونی ئاڵۆزیی کێشەکان، نەخشی هەیئەتی دەوڵەت لە بڕیاروەرگرتنیشدا زۆرتر رواڵەتیتر دەبێ. هەر بەو شێوە خەڵکی ئاساییو ناپسپۆڕ کەمتر دەتوانن لە بڕیاروەرگرتنەکاندا رای خۆیان دەربڕن. لەگەڵ زیادبوونی ئاڵۆزی، رێکخراوەکانی دەوڵەتی بەشێوەی لە کۆنترۆڵدەرچوو، زیاد دەبنو پەرە دەستێنن، بە بێ ئەوەی کە لە هەمان کاتدا کارلێهاتوویییان زیاتر ببێ. لەسەر یەك ئاڵۆزی کۆسپگەلێك لە بەردەم بەشداریی گشتیی بەرپرسایەتی وەئەستۆگرتنی دەوڵەت پێك دێنێ.

لەو کومەڵگایەدا کە هاوبەشیی و کێبەرکیی سیاسی لە پەرەسەندن دایە و کومەڵانی خەڵک بەگەرم و گوڕی لە مەیدانی تێکوشانی سیاسی دا بەشداری دەکەن، پێویستی بە فێر کردنی مەدەنی بە شیوەیەکی روو لە گەشە دەردەکەوێ.
مەبەست لە فێرکردنی مەدەنی، گواستنەوەی ئەو زانیاری و روانگەیانەیە بە کومەڵانی خەڵک کە ئەوان هەرچی زیاتر بۆ بەدەستهێنانی پلە و پیگەی شارومەندی کومەڵگاکانی خەڵک سالاردا ساز و ئامادە بکا، بابەتی سەرەکی فێرکردنی مەدەنی لەو زانیاری و ئاکایی یانە پێک دێ کە لە زانستی سیاسەتدا لە دەوری یەک خڕ دەبنەوە. ئەگەر بکرێ بڵێین کە سروشتی سیستمی سیاسی لە هەر وڵاتیک دا بەستراوەتەوە بە تێروانینی زۆرینەی خەڵکەکەیەوە، لەوەها حالەتیکدا فیرکردنی زانستی سیاسی لە پانتایی یەکی بەرینتر لە ناوەندە زانستی و زانکویەکان، دەتوانی بەسەر سروشتی سیستمە سیاسیەکاندا کاریگەری دابنی. سیستمە سیاسیە مودیرنەکان لەهەر چەشنیک بن پێویستی یان بە پشتگیری و دەنگی ئەرینی زۆرینەی خەڵکەکە هەیە کە وابووپاسینیزمی سیاسی و خەریک بوونی بیری کومەڵانی خەڵک بە کاروباری پێوەندیدار بە ژیانی تایبەتی یەوە، هیم پلەی شارومەندی وەک بەهرەیەکی مەدەنی سیاسی دادەبەزینی، هەم لە پەرەگرتنی باری گشتی ژیان پێشگیری دەکا. فێرکردنی مەدەنیء سیاسی و دانی زانیاری پیویست لەوانەیە بتوانی پێش لە پەرەگرتنی بارودوخیکی وەها بکا.

D.١//

چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر